# رِيَاضُ الصَّالِحِين

مِنْ كَلاَمِ سَيِّدِ المُرسَلِين (صلى الله عليه وسلم)

باخچەی پیاوچاکان لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)

دانراوی

ئیمامی نەوەوی (شرف الدین یحیى)

وەرگێڕانی

نوری فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆتەوە و سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە

٣-٤

# رياض الصالحين

من كلام سيد المرسلين ( صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم )

باخچەی پیاوچاكان لەفەرموودەكانی پێغەمبەر (د.خ)

دانراوی:

ئیمامی نەوەوی ( شرف الدين يحيى )

وەرگێڕانی

نوری فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی كردووە

٣ / ٤

بەرگی سێهەم - چاپی سێهەم



.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★


📖 ناوی کتێب: ﴿ رياض الصالحين﴾

📖 دانراوی: ئیمامی نەوەوی

📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان

📖 پێداچوونەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی: محمود أحمد محمد

📖 تیراژ: ۳۰۰۰ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: (۱۷۵- ساڵی ۲۰۰٦ز)

📖 چاپو دیزاین: (روبار حسين).

📖 ساڵی چاپ: ۱٤۲۷ ك -۲۰۰٦ز

بسم الله الرحمن الرحيم

## (١٦٢) خێر کردن و پاڕانەوە بۆ مردوو - باب صدقة لميت والدعاء له

**قال تعالى: (والذين جاء وا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالأيمان) سورة الحشر: ٥٩/١٠.**

**واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: ئەو فەیئو ماڵی تالانییە کە خودا ڕەخساندی بۆ پێغەمبەری خۆی، دەکرێ بەسێ بەشەوە: بەشێکی بۆ کۆچکاران (موهاجیرین)، وەبەشێکی تری بۆ یاریدەدەران (ئەنصار)، وە بەشێکی تری بۆ ئەو موسوڵمانانەیە کە لەپاش ئەوانەوە دەچنە ڕیزی موسوڵمانانەوە لەهەموو چەرخێکا، ئەمانەیش ڕەوشێکی شیرینو باشیان هەیە، حاڵیان وایە دەپاڕێنەوە لەخودا بۆ پێشینانی بەڕەحمەت چووی خۆیانو دەڵێن: خودایە! ئەی پەروەردگاری نازدارمان! بەڕەحمەتو بەخشندەیی خۆت لەئێمەیشو لەو پێشینانی بەڕەحمەت چوانەیشمان ببوورە، کەلەپێش ئێمەوە بوونو بوون بەپێشەواو سەرمەشق بۆئێمە، لەبۆ باوەڕی ساخ بەخودا.**

**١/ ٩٤٨- ١/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ رَجُلًا قَالَ: لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ فَهَلْ لَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا قَالَ: نَعَمْ). متفق عليه.** [1]

**عائیشە** (ڕەزای خوای لێ بێ)، **دایکی موسوڵمانان، هاوسەری حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: پیاوێ بە حەزرەتی گوت: دایکم کوتوپڕ عەمری خودای کرد، وادەزانم ئەگەر مەودای قسەکردنی ببوایە، ڕاسپێری دەکردو خێرێکی بۆ خۆی دیاری دەکرد، جا ئایا ئێستا خێری دەگا ئەگەر من لەجیاتی خۆی خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی** (دروودی خوای لەسەر بێ)**: ئا، خێری بۆ بکە، پێی دەگا (ش).**

**٩٤٩/٢- ٢/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ: إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ). رواه مسلم.** [2]

---

[1] **بوخاری (١٣٨٨) و موسلیم (١٠٠٤).**

[2] **موسلیم (١٦٣١).**

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: کاتێ ئادەمیزاد دەمرێ، هەموو کردەوەیەکی کۆتایی دێ، ئەم سێ شتە نەبێ: یەکەم: خێرێکی نەبڕاوە (وەك کارێزو مزگەوتو شتی وەقف) دووەم: زانینی بەسوود (وەك دانانی کتێبی باشو پێگەیاندنی فەقێو قوتابیو شاگردی بەسوودو بەکەڵك بۆ گەلی ئیسلام) سێیەم: منداڵو وەچەیەکی باش کەدوعاو نزای باشی بۆبکا (م).

**(١٦٣) باسکردنی مردوو بە چاکە - باب (ثناء الناس على الميت)**

١/ ٩٥٠- ٣/ عَنْ أَنَسِ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قالَ: ( مَرُّوا بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا فَقَالَ النَبِيّصَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَبَتْ ثُمَّ مَرُّوا بِأُخْرَى فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرًّا فَقَالَ وَجَبَتْ فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مَا وَجَبَتْ قَالَ هَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا فَوَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ وَهَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا فَوَجَبَتْ لَهُ النَّارُ أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ). متفق عليه.[٣]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: تەرمێ بەسەریانا تێپەڕی، خەڵکەکە وەسپی باشییان دەکرد، پێغەمبەری خودایش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بوو بە ماڵ، جا تەرمێکی تریش تێپەڕی خەڵکەکە بەخراپە ناویان هێنا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەوە: بوو بە ماڵ! عومەری کوڕی خەتابیش گوتی: قوربان! مەبەستت چییە؟ کەدەفەرمووی بوو بەماڵ؟

فەرمووی: ئەو کەسەی کەئێوە وەسپی باشی ی بکەن بەهەشت دەبێ بەماڵی، وەئەو کەسەی کەئێوە باسی خراپی ی بکەن دۆزەخ دەبێ بەماڵی، ئێوە شایەتانی خودان لەسەر رووی زەوی. لە تاج دا دەفەرموێ: گفتەی نەسائی ئاوایە: فریشتە لەئاسمان شایەتی خودانو ئێوەش لەزەوی شایەتی خودانو شایەتی بۆ هەرکەس - یا لەسەر هەرکەس - بدەن، خودا بەپێی ئەوە پاداشی باشی - یا خراپی - دەداتەوە (ش/ج).

دەمێ بوو بیرم لەوە دەکردەوە کەدەبێ هۆی چی بێ کەوا ئەم گەلی کوردە خوداپەرستە موسوڵمانە چاكو پاکە هەمیشە وا لەم ئێشو ئازارەدا لەژێر چەمۆڵەی رەشی رۆژگاردا دەناڵێنێ، سەرنج دەدەی تابڵێ ی خواناسو بەدینە، خۆ

---

[٣] بوخاری (١٣٦٧) و موسلیم (٩٤٩).

خوانەخواستە لەبەر بەدینی نییە کەوا حاڵی بێ حاڵە. ئەی دەبێ لەبەرچی بێ؟ ئێستا بۆم دەرکەوت، بەپێ ی چەمكو مەفهوومی ئەم فەرموودە پیرۆزەیە هۆی ئەم حاڵی ڕەشی خۆمانە خۆمانین، خۆمان لەخۆمان بووین بەشایەتو، قەت زمانمان بۆ خۆمان خێر نایەنێو ددانی خێر بەخۆماندا ناهێنین، بۆ ئەمو ئەو بووین بەبلوێرو شایەر، بۆ خۆشمان بووین بەزەمکەرو خوسپار، شەوو ڕۆژ، وەختو ناوەخت، بەڕاستو بەدرۆ، بەهەقو ناهەق، لەسەر مینبەر، لەوەعزدا، لەخوتبەدا، لە مزگەوت، لە بازاڕ، لە دووکان، لە ماڵ، هەر کوردەو زەمی کورد دەکاو ئەوەی دەیلێ نایلێتەوە، براینە! زمانتان لەسەر گوتەی خێر رابهێنن، وەك پێشینان دەفەرموون: دەریا بەسەگ گڵاو نابێ، میللەتی کوردیش وەك دەریا وایە، بەتاكو تەرای خراپ ناوی پیس مەکەن، ئێوەیش وەك حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) گەشبین بنو ڕەشبین مەبن، جارێ پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لەگەڵ دەستەیەکا، بەلای کەلاکی سەگێکی توپیودا تێ پەڕین، خەڵکەکە هەموویان لووتی خۆیان گرت: یەکی دەیگوت: پەکوو لە بۆگەنی، یەکێ تر دەیگوت: وەی لەچاوی دەرپۆقیوی، حەزرەت عیسایش (سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەوە بۆ سەرنجی ددانەکانی نادەن چەندە سپی یە!. تا کەسانی نەشارەزا ئەدەبی قورئانو فەرموودەی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) نەڵێن: چۆن تەشبیهی حاڵی کورد دەکرێ بەچۆنێتی ی کەلاکی سەگێ، عەرزی ئێوەی ئازیزم دەکەم: کەخودا لەقورئاندا تەشبیهی شاری قودسی پیرۆزی رووخاوی کردووە بەحاڵی کەلاکی کەرێکی تۆپیو، وەك دەفەرموێ: (أو كالذي مر على قرية وهي خاوية على عروشها) بەقەرە/ ٢٥٩/٢. مەبەست لەم داستانە ئەمەیە: عوزەیر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەدا بەلای شاری قودس دا، بەختە نەصر وێرانی کردبوو، فەرمووی. تازە ئەمە لەکوێ ئاوەدان دەبێتەوە! جا خودا مراندی لەدوای سەد ساڵ زیندوی کردەوەوپێ ی فەرموو: هەمووشتێ بۆ خودا ئاسانە، تۆ سەد ساڵی ڕەبەقە مردووی ئەوا وەك جارانی خۆت زیندوم کردیتەوە، نانو ئاوەکەشت تەماشا کە وەك خۆیان ماون یەك دەنك تێك نەچوون، حاڵی زیندوو بوونەوەی شاری قودسیش وەك حاڵی زیندو بوونەوەی کەلاکی ئەم کەرە تۆپیوەی تۆ وایە، کەئەوە سەد ساڵە تۆپیوەو ئیسكو پرووسکی پەردو بڵاو بۆتەوە، ئەوجا وەك جاری جارانی گۆشتو پێستەکەی دەکەینەوە بەبەرداو زیندوی دەکەینەوە.

دەی کەواتە با ئێمەیش لەحاڵی خۆمان نائومێد نەبین و، ئەوەندە بەهەق و ناهەق زەمی خۆمان نەکەین؟، سابەشکو خودای مەزن دڵ وەدەروون و زمانمان لەسەر هەقپەرستی رابهێنێ و بەتیشکی قورئان دڵ و چاومان رۆشن بکاتەوەو حاڵی گەلەکەمان باش بکاو رووی رەحمەتی خۆی بکاتە وڵاتە بێ ناز کەوتووەکەمان، کوردستانیش وەك قودسی پیرۆز زیندوو بکاتەوەو خۆشیو خۆشگوزەرانی و ئاسایش و ئاشتی تیا بڵاو بکاتەوەو، وەك بەهەشت بەنووری قورئان کون و قوژبنی رووناك بکاتەوە (وەرگێر).

٢/ ٩٥١- ٤/عَنْ أَبِي الْأَسْوَدِ ﷺ قَالَ: (قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ وَقَدْ وَقَعَ بِهَا مَرَضٌ فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَمَرَّتْ بِهِمْ جَنَازَةٌ فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْرًا فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَجَبَتْ ثُمَّ مُرَّ بِأُخْرَى فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْرًا فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَجَبَتْ ثُمَّ مُرَّ بِالثَّالِثَةِ فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا شَرًّا فَقَالَ وَجَبَتْ فَقَالَ أَبُو الْأَسْوَدِ فَقُلْتُ وَمَا وَجَبَتْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ قَالَ قُلْتُ كَمَا قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ فَقُلْنَا وَثَلَاثَةٌ قَالَ وَثَلَاثَةٌ فَقُلْنَا وَاثْنَانِ قَالَ وَاثْنَانِ ثُمَّ لَمْ نَسْأَلْهُ عَنْ الْوَاحِدِ). رواه البخاری.[٤]

ئەبولئەسوەد (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ مەدینە، پەتایێ داکەوتبوو، لەخزمەتی عومەردا (رەزای خوای لێ بێ) دانیشتم، تەرمێ لەوێوە ڕەت بوو، خەڵکەکە وەسپی باشییان دەکرد، عومەریش (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مسۆگەر بوو، لەپاشا تەرمێکی تریش تێپەڕ بوو خەڵکەکە باسی خاوەنەکەیان بەخراپە دەکرد، عومەریش گوتیەوە: مسۆگەر بوو، ئەبولئەسوەد دەفەرمویٚ: منیش گوتم: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! چی مسۆگەر بوو؟ فەرمووی: ئەوە دەڵێم کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی. هەر موسوڵمانێ چوار کەس شایەتی باشی بۆ بدەن خودا دەیباتە بەهەشت.

منیش عەرزیم کرد: ئەی سێ کەس شایەتی بۆبدەن چۆنە؟ فەرمووی: سێ کەسیش شایەتی بۆ بدەن هەروا، گوتم: ئەی دوان؟ فەرمووی: دوانیش هەروا، بەڵام بۆیەکێ لێمان نەپرسی. (ب/تاج)

---

[٤] بوخاری (١٣٦٨)

**چەن خۆشە مردن گەر بەڕوو سووری**
**بچیە دیوانی خوداو حوزوری**
**پتر ناسوودەی تاپتر دووری**
**لەبەزمی دونیاو سازو سەمتووری**

**(وەرگێڕ)**

**(١٦٤) باسی خێری منالّ مردن - باب فضل من مات له أولاد صغار**

١/ ٩٥٢- ٥/ عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: النَبِيّصَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَا مِنْ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ يُتَوَفَّى لَهُ ثَلَاثٌ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللّٰهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ). متفق عليه.[5]

**ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ سێ منالّی بمرن، ڕەسیدە نەبووبن، بێگومان کەخودا لەسایەی ڕەحمەتی خۆیەوەلەبەرخاتری ئەو منداڵانە دەیباتە بەهەشت. (ش= شەیخان= بوخاری و موسلیم).**

٩٥٣/٢- ٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا يَمُوتُ لِأَحَدٍ مِنْ الْمُسْلِمِينَ ثَلَاثَةٌ مِنْ الْوَلَدِ تَمَسُّهُ النَّارُ إِلَّا تَحِلَّةَ الْقَسَمِ). متفق عليه.[6]

**وتحلة القسم قول الله تعالى: (وان منكم الا واردها) والورود هو العبور على الصراط، وهو جسر منصوب على ظهر جهنم، عافانا الله منها.**

**لەئەبوهورەیرەوە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ سێ منالّی بمرن مەگەر بۆ ئاهی سوێن بچێتە دۆزەخ؟ (ش) پێشەوای نەوەوی - پڕ گۆڕەکەی لەنوورو ڕەحمەت بێ - دەفەرموێ: مەبەست لەئاهی سوێن (تحلة القسم) لەم فەرموودەیەدا ئەو سوێنەیە کەلەم ئایەتە پیرۆزەیە دەفەهم ڕێتەوە، کە دەفەرموێ: (وإن منكم إلا واردها كان على ربك حتما مقضيا) - ٧١/١٩- واتە: کەس نییە لەئێوە کەبەناو دۆزەخ دا نەڕوا نەچێتە ناوی، ئەو چوونە**

---

[5] بوخاری (١٢٤٨) و موسلیم (٢٦٣٤) بەڵام موسلیم لەئەبوهورەیرەوە گێڕاویەتیەوە.

[6] بوخاری (١٢٥١) و موسلیم (٢٦٣٢).



دۆزەخە هەموانی (عمومی) یە بڕیارێکی خودانووسەو ڕەتبوونەوەی بۆ نییە. دەفەرموێ: مەبەست لەڕۆیشتن بەناو دۆزەخا، لەم شوێنەدا بەپەڕینەوەی سەرپشتی پردی صیراطە، خۆی لەدەستی قوتارمان بفەرموێ.

**(١٦٥) باسی گریان و ترس لە کاتی تێ پەڕبوون بەلای گۆڕی ستەمکاران و جێگەی سەرنگووم بوونیاندا هەروەها سوننەتە مرۆڤ لەوکاتەدا وا خۆی نیشان بدا کە زۆر داماوی خودایەو هۆشیار بێ و لەوە بێ ئاگا نەبێ**

**باب ( البكاء والخوف عند المرور بقبور الظالمين ومصارعهم واظهار الافتقار الى الله تعالى والتحذير من الغفلة عن ذلك)**

١/٩٥٥- ٧/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا تَدْخُلُوا عَلَى هَؤُلَاءِ الْمُعَذَّبِينَ إِلَّا أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا بَاكِينَ فَلَا تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ لَا يُصِيبُكُمْ مَا أَصَابَهُمْ). متفق عليه. وفي رواية لاتدخل مساكن الذين ظلموا أنفسهم أن يصبكم ما أصابهم الا أن تكونوا باكين. ثم قنع رأسه وأسرع السير حتى أجاز الوادى: [٧]

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەتو یارانی، کاتێ دەگەنە خاکی حیجر، کەناسراوە بەوڵاتی ئەموودی هۆزی حەزرەتی صالح پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەیارانی دەفەرموێ: بەگریانەوە نەبێ مەچنە ناو ئەم سزابارانەوە، تەنانەت ئەگەر گریانتان نەدەهات ئەوە مەڕۆنە ناویان، نەبادا ئێوەیش بەدەردی ئەوان بچن. لەگێڕانەوەیەك دا فەرمووی: لەغەزای تەبووکدا، کاتێ حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەحیجرەوە تێپەڕ بوو، فەرمووی: بەگریانەوە نەبێ مەڕۆنە ناو هەوارگەو شوێن هەواری ئەو ستەمکارانەوە، کەبەهۆی بێ باوەڕی خۆیانەوە زۆرو ستەمو ناهەقی یان لەخودی خۆیان کردبوو، هەتا ئێوەیش بەدەردی ئەوان نەچن و ئەو قۆرتەی بەسەر ئەوان هات بەسەرئێوەیش نەیێ. فەرمووی: ئینجا پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **سەری خۆی داپۆشیو بەخێرایی ڕۆیشت تالەدۆڵەکە تێپەڕ بوو.**

---

[٧] بوخاری (٢٩٤٩) و (٢٩٥٠).

## نامەی دەستوورەکانی ڕێبواری

### (١٦٦) (سوننەتە سەفەرکردن لەڕۆژی پێنج شەممەدا بێ، بەتایبەت سەرلەبەیانی ڕۆژی پێنج شەممە، یا سەرلەبەیانی هەر ڕۆژێکی تربێ)

### كتاب(آداب السفر) - باب استحباب الخروج يوم الخميس واستحبابه أول النهار

**٩٥٦/١- ٨/ ( سمعت كعب بن مالك يحدث بحديثه حين تخلف عن..)** [٨]

**ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە بەدوورو درێژی ڕمت بوو، فەرمووده دوورو درێژەکەی کەعبی کوڕی مالیك** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لەگێڕانەوەیەکی شەیخەین دا** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **دەفەرموێ: کەم وادەبوو کە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەغەیری ڕۆژی پێنج شەممەدا دەربچێ بۆ ڕێڕەوی‌و سەفەر.**

**٢/ ٩٥٧- ٩/عَنْ صَخْرٍ الْغَامِدِيِّ ﷺ عَنْ النَبِيّصَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قَالَ: (اللّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا وَكَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً أَوْ جَيْشًا بَعَثَهُمْ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ وَكَانَ صَخْرٌ رَجُلًا تَاجِرًا وَكَانَ يَبْعَثُ تِجَارَتَهُ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُهُ). رواه أبوداود والترمذي وقال حديث حسن.** [٩]

**صەخری کوڕی وەداعەی غامدی کەخۆی هاوڕێی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بووە، فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: (خودایە! ئیش‌و کاری سەرلەبەیانیانی ئۆمەتم پیرۆز کەو پیت‌و فەڕی تێ خە) فەرمووی: دەستووری حەزرەتیش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وابوو کاتێ لقێ سوپای بەلایەکا دەنارد، یالەشکرێکی گەورەی دەنارد بۆ شوێنێ لەسەرەتای ڕۆژەوە دەیناردن، هەروا فەرموویشی: صەخر خۆیشی پیاوێکی بازرگان بوو، ئەویش دەستووری وابوو لەسەرەتای ڕۆژەوە بازرگانی یەکەیی دەخستەڕێ، بەهیوای ئەم بەرەکەتە، صەخر تەواو دەوڵەمەند بوو بوو، وەماڵ‌و سامانی زۆر بوو بوو. (د/ت: ح/ح).**

---

[٨] بڕوانە (٢١/٩ ز- ٢ ب - ١ل - ٢٨) واتە: بڕوانە ژمارە (٢١/٩) زنجیرەی دووەم کەدەکەوێتە بەرگی یەکەمەوە لاپەڕە بیست‌و هەشت وە هەروەها.

[٩] ئەبوداود (٢٦٠٦) و تیرمذی (١٢١٢).

**(واپەسندە ڕێبوار هەوڵ و مشووری هاوڕێ بخوات: وەهاوڕێیان لەناو خۆیاندا یەکێکیان بکەن بەسەرگەورەو دەمراستی خۆیانو بەگوێ ی بکەن)**

**باب استحباب طلب الرفقة وتأميرهم على أنفسهم واحدا يطيعونه**

١/٩٥٨- ١٠/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِـيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي الْوَحْدَةِ مَا أَعْلَمُ مَا سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ). رواه البخاري.[١٠]

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم لەبارەی مەترسییەکانی کاتی تەنیایی یەوە ئەو خەڵکەی تریش بیزانن وەك من دەیزانم ئیتر هیچ کەسێ، چ پیادە، چ سوار، بەشەو بەتەنها بەبێ هاوڕێ نەدەڕۆیشت (ب).**

٢/٩٥٩- ١١/عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الرَّاكِبُ شَيْطَانٌ وَالرَّاكِبَانِ شَيْطَانَانِ وَالثَّلَاثَةُ رَكْبٌ). رواه أبو داود والترمذي والنسائي بأسانيد صحيحة.[١١]

**عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە، لەباپیری باوکیەوە ﷺ فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ( تاقە سوارێ تاقە شەیتانێکە، دوو سوار دوو شەیتانن، کەبوون بەسێ سوار دەبن بەدەستەسوار). (د/ت/ ن - بەسێ سەنەدی صەحیح)**[١٢]

٣/ ٩٦٠- ١٢/عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا خَرَجَ ثَلَاثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ). رواه أبو داود باسناد حسن.[١٣]

**ئەبو سەعیدی خودریو ئەبوهورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرموویان: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ( کاتێ سێ کەس بەیەکەوە دەڕۆن بۆ سەفەر با لەناو خۆیانا یەکێکیان بکەن بەسەرگەورەی خۆیان (د - س/حەزرەت).**

---

[١٠] بوخاری (٢٩٩٨)

[١١] ئەبو داود (٢٦٠٧) وتیرمذی (١٦٧٤) مونذیري دەفەرموێ: نەسائیش گێڕاویەتیەوە، پێدەچێ لە(سونەنولکوبرا) یدا گێڕابێتیەوە.

[١٢] سەرجەلەی عەمر ئاوایە: عەمری کوڕی شوعەیبی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص. جا عەمر لەشوعەیبی باوکیەوە ڕوایەت دەکا، شوعەیبیش لەباپیری خۆیەوە - کەعەبدوڵلای کوڕی عەمرە - ڕوایەت دەکا. (وەرگێڕ).

[١٣] ئەبوداود (٢٦٠٨).

٩٦١/٤- ١٣/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنْ النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (خَيْرُ الصَّحَابَةِ أَرْبَعَةٌ وَخَيْرُ السَّرَايَا أَرْبَعُ مِائَةٍ وَخَيْرُ الْجُيُوشِ أَرْبَعَةُ آلَافٍ وَلَنْ يُغْلَبَ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا مِنْ قِلَّةٍ). رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث حسن.[١٤]

ئیبنو عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: باشترین هاوڕا ئەوانەن کەژمارەیان چوار کەس بێ، وەباشترین لق (سەرییە) ئەوەیە کەژمارەیان چوارسەد کەس بن، وەباشترین سوپا ئەوەیە کەژمارەیان چوار هەزار کەس بن، ژمارەی سوپایش کەگەیشتە دوازدە هەزار کەس، یا پتر، ئیتر لەبەر کەمی نابەزن.

واتە: ئەگەر سوپای دوانزە هەزار کەسی لەشەڕدا بەزین و شکان ئەوە لەبەر کەمییان نییە، بەڵکوو لەبەر شتێکی ترە، وەك بەخۆنازین و گوناهباری و شتی تری لەم بابەتە (د/ت: ح/ح).

**(١٦٨) (باسی دەستووری ڕێکردن و شوێنی دابەزین و شەو مانەوەو خەوتن لەسەفەردا، وەوا پەسەندە کەڕێبوار، ئەگەر بۆی دەلوا ـ شەو ڕەوی بکاو، بەنەرمی جووڵانەوە لەگەڵ وڵاخ دا سوننەتە، هەروا ڕەچاور کردنی سوودی وڵاخ سوننەتە، دروستیشە کەسێکی تر لەپاشکۆوە سووار بکرێ، ئەگەر وڵاخەکە وزەی ئەوەی هەبێ، ئەگەر لەبارەیاندا نەبوو ناڕەوایە، فەرمان دەکرێ بەوکەسەی کەدرێغی دەکا دەربارەی وڵاخ کەناهەقی لێ نەکاو مافی خۆیی پێ بدا)**

٩٦٢/١-١٤/عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ فَأَعْطُوا الْإِبِلَ حَظَّهَا مِنْ الْأَرْضِ وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي السَّنَةِ فَأَسْرِعُوا عَلَيْهَا السَّيْرَ وَإِذَا عَرَّسْتُمْ بِاللَّيْلِ فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ فَإِنَّهَا مَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْلِ). رواه مسلم.[١٥]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر لەکاتی لەوەڕدا سەفەرتان کرد، ماوەی وشتر بدەن کەبەشی خۆی لەو لەوەڕە بلەوەڕێ، خۆ ئەگەر وشکەساڵیش بوو، لەوەڕ نەبوو، ئەوا خێرا لێخوڕن هەتا زووبگەنە ماڵەوەو، وڵاخەکان لەڕێ ئەوەندەی تر لەڕو لاوازنەبن، ئەگەر بەشەویش لاتان دا بۆ شەو وچان، یا بۆ سەرخەو شکاندن، لەچەقی ڕێگەکە دوور بکەونەوە،

[١٤] ئەبو داود (٢٦١١) و (١٥٥٥).

[١٥] موسلیم (١٩٢٦).

چونكه بەشەو ڕێگەوبان، لەبەر رووتی‌و ئاسانی، دەبێ بەجێگەو ڕێگەی جرۆجانەوەرو مارو مێروو (م).

٢/٩٦٧-١٥/ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا كَانَ فِي سَفَرٍ فَعَرَّسَ بِلَيْلٍ اضْطَجَعَ عَلَى يَمِينِهِ وَإِذَا عَرَّسَ قُبَيْلَ الصُّبْحِ نَصَبَ ذِرَاعَهُ وَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى كَفِّهِ). رواه مسلم.[16]

ئەبوقەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران لەڕێڕەویدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کاتێ بەشەو شەووچانی دەگرت، لەسەر لای راستی رادەکشاو دەخەوت، وەلێ ئەگەر بەرەبەیان لای بدایە ئەوا سووکە سەرخەوێکی دەشکان‌و، تاخەوێکی قورس داینەگرێ دەچوو ئانیشکی راستی دادەداو سەری لەسەربەری لەپی دادەنا (م). ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: زاناکان دەفەرموون: بۆیە وای کردووە، تاخەوی قورس داینەگرێ، نەبادا نوێژی ی بەیانی بچێ، یا لەسەرەتای کاتەکەیەوە فریای نەکەوێ.

٣/ ٩٦٤- ١٦/ عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (عَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ فَإِنَّ الْأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ) [17] رواه أبو داود باسناد حسن.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: شەو بگرن بەدەمەوەو شەو لەناو لەبەرە بەیانا بکەونەڕێ، یا لەشەودا ڕێ بکەن، چونکە بەشەو تەنگی زەوی دەکێشرێ! (د ـ س/ حەزرەت).

٤/ ٩٦٥- ١٧/ عَنْ أَبُو ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيُّ ﷺ قَالَ: (كَانَ النَّاسُ إِذَا نَزَلُوا مَنْزِلًا قَالَ عَمْرٌو كَانَ النَّاسُ إِذَا نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْزِلًا تَفَرَّقُوا فِي الشِّعَابِ وَالْأَوْدِيَةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ تَفَرُّقَكُمْ فِي هَذِهِ الشِّعَابِ وَالْأَوْدِيَةِ إِنَّمَا ذَلِكُمْ مِنْ الشَّيْطَانِ فَلَمْ يَنْزِلْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنْزِلًا إِلَّا انْضَمَّ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ). [18] رواه أبو داود بأسناد حسن.

---

[16] موسليم (٦٨٣).

[17] ئەبو داوود (٢٥٧١).

[18] ئەبو داوود (٢٥٤٨).

ئەبو ئەعلەبەی خوشەنی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێش دا مەردومەکە کەلەدابەزینگایێ، دادەبەزین پرژو بلاو دەبوونەوە بەناو ئەو شیوو دۆڵو ڕێچکانەدا، کەلەوناوەدا هەبوون، تا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم پرژو بلاو بوونەوەیەتان، کەبەناو ئەم شیوو دۆڵو ڕێچکانەدا دابەش دەبن، ئا ئەم کارە ناشرینانەتان لەشەیتانەوەیەو دەسیسەی ئەوە!.

فەرمووی: ئیتر لەوەدوا لەهەر لایێ لایان دەدا گلێر دەبوونەوەو پاڵیان دەدا بەپاڵی یەکتری یەوەو هەوارگەکانیان لەپەنا یەکتری دا بوو. (د ـ س/حەزرەت).

٥/ ٩٦٦- ١٨/ وعَنْ سهيلِ بن عمرو، وقيل سهلِ بنِ الربيع بنِ عمرو الأنصاري المعروف بأبن الْحَنْظَلِيَّةِ ﷺ قَالَ: (مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَعِيرٍ قَدْ لَحِقَ ظَهْرُهُ بِبَطْنِهِ فَقَالَ اتَّقُوا اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ الْمُعْجَمَةِ فَارْكَبُوهَا صَالِحَةً وَكُلُوهَا صَالِحَةً). رواه أبو داود باسناد صحيح.[19]

سەهلی کوڕی عەمری ئەنصاری، کەهەندێ کەس دەڵێن: سەهلی کوڕی ڕەبیعی کوڕی عەمری ئەنصاری، کەناسراوە بەئیبنولحەنظەلییە، کەخۆی یەکێکە لەدەستەی پەیمانی خۆش نوودی (بەیعەتوڕیضوان) ﷺ دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وشترێکی لەڕو لاوازی وای دی، کەسکی نوسابوو بەپشتیەوە، فەرمووی: لەبارەی ئەم ئاژەڵو پادارە بەسەزمانانەوە لەخودا بترسنو زۆرو نارەواییان لێ مەکەنو، برسیو توونی یان مەکەن، دەی کەوابوو کاتێ سوارییان پێ بکەن کەبەکەڵکی سواریی دێن، وەکاتێ گۆشتیان بخۆن کەگۆشتەکەیان بەدەردی خواردن دەخوات (د ـ س/ص).

٦/٩٦٧- ١٩/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ قَالَ: (أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَلْفَهُ ذَاتَ يَوْمٍ فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثًا لَا أُحَدِّثُ بِهِ أَحَدًا مِنْ النَّاسِ وَكَانَ أَحَبُّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِحَاجَتِهِ هَدَفًا أَوْ حَائِشَ نَخْلٍ قَالَ فَدَخَلَ حَائِطًا لِرَجُلٍ مِنْ الْأَنْصَارِ فَإِذَا جَمَلٌ فَلَمَّا رَأَى النَّبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَنَّ وَذَرَفَتْ عَيْنَاهُ فَأَتَاهُ النَّبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَسَحَ ذِفْرَاهُ فَسَكَتَ فَقَالَ مَنْ رَبُّ هَذَا الْجَمَلِ لِمَنْ هَذَا الْجَمَلُ فَجَاءَ فَتًى مِنْ الْأَنْصَارِ فَقَالَ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ أَفَلَا تَتَّقِي اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهِيمَةِ الَّتِي مَلَّكَكَ اللَّهُ إِيَّاهَا فَإِنَّهُ شَكَا إِلَيَّ أَنَّكَ تُجِيعُهُ وَتُدْئِبُهُ) رواه أبوداود كرواية البرقانى.[20]

---

[19] ئەبو داوود (٢٥٤٨).

[20] موسلیم (٣٤٢).

عەبدوللای کوری جەعفەر، کەناسناو (کونیە) ی ئەبوجەعفەرە فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) رۆژێ لەپاشکۆی خۆیەوە سواری کردم، فەرمایشتێکی بەنهێنی پێ فەرمووم، بۆ کەسێ نەگێڕمەوە، وەباشترین شتێکیش کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بۆ سەراو خۆی لەپاڵدا حەشار بدایە بارستایی‌و بەرزاییی‌و شوورەی باخە خورما بوو. ئیمامی موسلیم (رەزای خوای لێ بێ) ئاوا بەکورتی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، بەڵام ئیمامی بەرقانی بەهەمان ئیسنادو ڕشتە گێڕاویەتیەوەو ئەمەی لێ پتر کردووە (رەزای خوای لێ بێ): جا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) رۆیشتە ناو حەساری باخە خورمای پیاوێ لەیاریدەدەران، وشترە نێرەیەکی لێ بوو، کە وشترەکە پێغەمبەری دی غوربەتی هەڵساو کورکاندی‌و هۆن هۆن فرمێسك بەهەردوو چاوەکانیدا هاتەخوارەوە! جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) چوو بۆلای‌و دەستی هێنا بەسەر دوگ‌و بە بناگوێ یدا، ئیتر وشترەکە کوڵی گریانی نیشتەوە. جا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خاوەنی ئەم وشترە کێ یە؟ ئەرێ ئەم وشترە نێرە هی کێیە؟ جەهێڵێ لەیاریدەدەران ـ هات گوتی: قوربان! هی منە. فەرمووی: ئەدی ئەوە بۆ لەخودا ناترسی، لەبارەی ئەم ئاژەڵە بەسەزمانەوە، کەخودا تۆی کردووە بەخاوەنی، ئەوەتانێ لەلای من هاواریەتی لەدەستت‌و سکاڵات لێ دەکا: کەتۆ هەم برسی دەکەیت‌و هەم سەرو مڕئیشی پێ دەکەیت‌و وچانی نادەی! ئەبوداودیش (رەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەی دەق وەك بەرقانی گێڕاوەتەوە.[٢١]

٢٠-٩٦٨/٧/ وعَنْ أَنَس ﷺ قالَ: ( كنا إذا نزلنا منزلا لا نسبح حتى نَحُلَّ الرحـال). رواه أبوداود باسناد صحيح على شرط مسلم.[٢٢]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ لەدابەزینگایێ لامان دەدا هەتا بارمان نەخستایە نوێژمان نەدەکرد. ( ئەبوداود ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە بەپێ ی مەرجی موسلیم. واتە: ئەو پیاوانەی کەئەبوداود، بەڕێز بەرودووا، ئەم فەرموودەیەیان لێوە روایەت دەکا، هەمان ئەو پیاوانان کە موسلیم ـ لەصەحیحی موسلیم دا ـ روایەتی حەدیثی لێوە کردوون، بەڵام حەدیثێکی تر نەوەك ئەم

[٢١] خۆزگەم بەو وشترە ٢٠٠٠/١١/١٢ (وەرگێڕ).
[٢٢] ئەبو داوود (٢٥٥١).

حەدیثەی بەردەستمان.. (وەرگێڕ). ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: مەبەست ئەوەیە: هەرچەند زۆر بەتەنگی نوێژی سوننەتەوە بووین، بەتایبەتی نوێژی دیاری هەواری نوێ (سنة تحية المنزل)، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا حەوانەوەی وڵاخەکانمان لەلا لەپێشتر بوو لەپێشخستنی ئەو نوێژانە.

## (١٦٩) باسی کۆمەکی هاوڕێ: باب اعانة الرفيق

وفي الباب أحاديث كثيرة كحديث: (والله في عون العبد ماكان العبد في عون أخيه)، وحديث (كل معروف صدقة) وأشباهها.

← بۆ حەدیثی (والله في عون العبد ماكان العب في عون أخيه) (بڕوانە ٢/٢٤٥ز-٢٩.

← بۆ حەدیثی (كل معروف صدقة) بڕوانە: (١٨/١٣٤ز-١٣)

١/٩٦٩- ٢١ [٢٣]

٢/٩٧٠-٢٢/ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَنَّهُ أَرَادَ أَنْ يَغْزُوَ فَقَالَ يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ إِنَّ مِنْ إِخْوَانِكُمْ قَوْمًا لَيْسَ لَهُمْ مَالٌ وَلَا عَشِيرَةٌ فَلْيَضُمَّ أَحَدُكُمْ إِلَيْهِ الرَّجُلَيْنِ أَوْ الثَّلَاثَةِ فَمَا لِأَحَدِنَا مِنْ ظَهْرٍ يَحْمِلُهُ إِلَّا عُقْبَةٌ كَعُقْبَةِ يَعْنِي أَحَدِهِمْ قَالَ فَضَمَمْتُ إِلَيَّ اثْنَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةً قَالَ مَا لِي إِلَّا عُقْبَةٌ كَعُقْبَةِ أَحَدِهِمْ مِنْ جَمَلِي). رواه أبوداود.[٢٤]

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) کەدەیویست بچێ بۆ غەزا، دەیفەرموو: ئەی گەلی کۆچکاران و یاریدەدەران! بزانن هەندێ لەبرادەرانتان، کەلەگەڵماندا دێن بۆئەم غەزایە حاڵ و ماڵێکی وایان نییەو خاوەن هۆزو خزمی داراو دەوڵەمەند نین، لەبەرئەوە بەپیادەیی دێن، دەی ئێوەیش بەمەردانە بجوڵێنەوەو هەرکەسەتان دوو پیاو یان سێ پیاو لەم بێ وڵاخانە بخاتە تەك خۆی. فەرمووی: ئیتر کەس نەدەما کەوڵاخەکەی هەر بۆخۆی بێ، وڵاخدارو بێ وڵاخ حاڵیان چوون یەك بوو، بەسەرە بەرودوا، سواری وڵاخە ناوکۆی یەکە

---

[٢٣] بڕوانە (٣/٥٦٦ز- ٦٣ ب – ٢ل – ١٢١).

[٢٤] ئەبو داوود (٢٥٣٤).

دەبوون، گوتی: من بەش بەحاڵی خۆم دوو کەسم، وەك ئەوان بەسەرە، بەرودوا سواری نێرە وشترەکەم دەبووم (د).

٣/٩٧١-٢٣/ وَعَنْهُ ﷺ قالَ: كانَ رَسولَ اللهِ ﷺ يتخلف في المسير، فيزجي الضعيف ويردف ويدعوا له). رواه أبوداود باسناد حسن.[٢٥]

دیسان فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو کاروان و لەشکردا خۆی دەخستە دواوە، زەبوونەکانی لێ دەخورِی و پیادەی بێ وڵاخی دەخستە پاشکۆوەو نزای باشی بۆ دەکردن. (د ـ س/حەزرەت).

## (١٧٠) لەکاتی سواربوونی وڵاخ دا، بەتایبەتی لەسەفەردا: چی بڵێ باشە
## باب مايقول إذا ركب دابته للسفر

قال الله تعالى: (وجعل لكم الفلك والأنعام ما تركبون* لتستووا على ظهوره ثم تذكروا نعمة ربكم إذا استويتم عليه وتقولوا سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين، وانا الى ربنا لمنقلبون) (الزخرف ـ ١٢/٣٤ـ ١٤)

واتە: خودای مەزن فەرموویەتی: خودای گەورە ئەو خودا بێ چوونەیە کەئەم حەمکە شتگەلەی لەنەبوون دروست کردووە، مەگەر هەرخۆی بزانێ کەچەند جۆرن، وەلەناو خۆیاندا زۆربەیان جووتی یەکن وەك نێرومێ، تەڕو وشك، گەرم و سارد، خودا هەمیشە بەچاوی میهر سەیری ئێوە دەکا، ئەوەتا نیعمەتی زۆری رژاندووە بەسەرتاندا، وەك ئەوە کەشتیو گەمیو خۆشرِۆو فرِۆکەو وشترو ماین و شتی تری لەم بابەتانە بۆ سوودی ئێوە دروست کردووە، لەکاتی پێویست سواری پشتیان دەبن، بەوپەڕی فەرەحی یەوە وەك لەسەر تەخت و بارەگا دابنیشن ئاوا لەسەر پشتیان دادەمەزرێن، دەی ئێوەیش چاکەی خوداتان لەبەرچاو بێ و لەسەر هەموو چاکەیێ سوپاسی بکەن و هەمیشە یادی پیرۆزی، شەکری سەرزارتان بێ، جاکاتێ سواری سەرپشتیان بوون ئەم گوتە پیرۆزە بەدڵ و بەکوڵ بڵێن: (سبحان الذی سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين، وأنا الى ربنا لمنقلبون) پاکی و نەنگی و بێ گەردی بۆئەو خودا گەورەیەیە کەبەکەرەمی خۆی ئەم ئاژەڵ و پاپۆرو دەستگا گەلەی بۆ

[٢٥] ئەبوداوود (٢٦٣٩).

ئێمە رام هێناوەو ئاوا بەئاسانیو بەخۆشی سواریان دەبین، ئەمە لەسایەی ئەوەوەیە، دەنا ئێمە دەرەقەتیان نەدەهاتینو ئەمە لەوزەی ئێمەدا نەبوو، مەرد ئەو مەردەیە کەلەخۆی بایی نەبێ، بۆیە ئێمە لەم حاڵی سەرکەوتنو زاڵبوونەدا بەسەر ئەم جێ سواری یانەدا ئەوەمان لەبیرە کەزوو یادرەنگ، بەرەو گۆڕی نەویو قووڵ، گلێر دەبینەوەو لەوێ بەملکەچی دەچینەوە بەردەستی خودای بەتەوانا، بەتایبەت لەم سەفەرەدا، ڕێ ی تێ دەچێ کەلەم ڕێگەیە بگلێینو بمرینو بگەڕێینەوە بۆلای خودا.

**سەرنجێ**: دەلالەت چەند جۆری هەیە: وەك دەلالەتی لەفظیو دەلالەتی تەضەممونیو دەلالەتی ئیشارات، سەرچاوەی تەفسیری ئایەتیش یەکەم قورئان خۆیەتی، وەك گوتراوە: ان القرأن يفسر بعضه بعضا، دوەم حەدیثو ئەثەرە، سێیەم ئاشکرا بوونی زۆر شتی نهێنی یە لەسرووشتدا، دەق وەك خەبەرپێدانی قورئان لەکاتی خۆیدا، کەئەو دەمە ئەم جۆرە شتانە هێشتا بەبەلگەی زانستی نەچەسپێندرابوون، ئەم دیاردەیە لەم رۆژگارەی ئێمەدا پەرەی سەندووە، بەڕاستی سەرنجی ئادەمیزاد بەرەو ئیعجازی قورئان رادەکێشێ، بۆ نموونە وەك: یەکپارچەیی بوونەوەر (وحدة الكون)، گەورەبوونو کشهاتنی بوونەوەر بەبەرەبەرە، (تمدد الكون)، سووڕانەوەو خولانەوەو جموجووڵی خۆرومانگو ئەستێرەو زەوی، جووتیو نێرو مێ یی لەهەموو شتێکا، موتوربە بوونی هەور، قۆناغەکانی پەیدابوونی بێچوولەو سك، جیایی سەر پەنجەکانی ئادەمیزاد، .. تاد، بەڕاستی ئێمە ئێستا لەو سەردەمەدا دەژین کەسینی ئیستیقبال لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەنجەی بۆ درێژ دەکا. کە دەفەرموێ: (سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم انه الحق) (فصلت ـ ٤١/٥٣).

واتە: زۆر بەزووریی پێیان نیشان دەدەینو بەلگەی گەورە گەورەی زۆری ئێمە، لەهەموو لایێ، لەسەرو لەخوار، لەدوورو نزیك، بەچاوی خۆیان دەیبینن، کەئەو نیشانەو بەلگانە هەندێکیان وان لەناو خودی خۆیاندا، وەك کۆئەندامی سوورانی خوێنو عەجایباتی چاوو دڵو ئەمانە، جا ئەو دەمە باش باش بۆیان روون دەبێتەوە کە ئەم قورئانە هەقەو راستەو فەرمایشتی خودایە. یائەم ئایەتە: (وقل الحمد لله سيريكم آياته فتعرفونها) (نەمل ـ ٢٧/٩٣).

جاپاش ئەم روونكردنەوەيە، لە خزمەت ئێوەی ئازيزدا عەرزم ئەمەيە: بەووردی سەرنجی ئايەتەكەو وشەكانیو جۆری دەلالاتەكانیو فەرموودەكانی ئەم بابەتەی بەر دەستمانو ئەم ئايەتانەی كە ئێستا من دەيان نووسم، لەبەرئەوەی كەپەيوەندييان بەواتای گشتی ئەم ئايەتەوەهەيە، بەووردی سەرنجی ئەمانە هەموو بدەن بەيەكەوە جۆشيان بدەن، دەبينن وشە بەوشەی تەفسيرەكەی بەندە لەقورئان خۆیو لەحەديثو ئەثەرو دەلالاتی جياجيای وشەكان وەرگيراوە، سەرەرای ئەوەيش بەهرەم لەم تەفسيرانە وەرگرتووە: بەيزاوی، جەلالەين، شوببەر، مەواهيبورەحمان، تەفسيری خالّ، تەفسيری كوردی لەسەر كەلامی خوداوەندی. كەواتە لەخودا بەزيادبێ تەفسيری ئايەتەكان لەبەشی تەفسير بەرەئيی شەخصی نينو پەيرەوی ياساو دەستوورەكانی تەفسير نووسينم تيادا كردووە. سوپاس بۆ خودا، ئەمەش هەندێكە لەو ئايەتانەی كەدەبن بەتەفسير بۆئەم ئايەتە: سا كەم يا زۆر: (ومن الأنعام حمولة وفرشا* والانعام خلقها لكم فيها دفء ومنافع ومنها تأكلون* ولكم فيها جمال حين تريحون وحين تسرحون* وتحمل أثقالكم الى بلد لم تكونوا بالغيه الا بشق الأنفس ان ربكم لرؤف رحيم* والخيل والبغال والحمير لتركبوها وزينة ويخلق مالا تعلمون) (نەحل ١٦/ ٥ ـ ٨) مامۆستا مەلا كەريم[٢٦] ـ خودای گەورە دەست بەتەمەنی پيرۆزی بگرێو سەربەرزی دينو دنيای بفەرموێ ـ لە مەواهب الرحمن دا، لەتەفسيری ئەم ئايەتەدا دەفەرموێ: أو ايماء اعجازي لما خلقه الله في عالمنا من السيارات والطيارات والغواصات البحرية والنهرية والمكائن والأجهزة... الخ. ئايەتێكی وەك: (وخلقنا لهم من مثله ما يركبون) (يس/٣٦ ـ ٤٢) (سبحان الذى خلق الازواج كلها مما تنبت الارض ومن انفسهم ومما لايعلمون) (يس/ ٣٦ ـ ٣٦) لەحەديثی صەحيح دا دەفەرموێ (درورودی خوای لەسەر بێ) : (أرأيت قوما من أمتي يركبون ظهر البحر كالملوك على الأسرة). (وەرگێڕ)

١/٩٧٢- ٢٤/ عَنْ ابْنَ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجًا إِلَى سَفَرٍ كَبَّرَ ثَلَاثًا ثُمَّ قَالَ سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ

[٢٦] لەدوا سەفەری بەغدام دا، لە ٢٠٠٠/١١/٨ دا، لەهۆدەكەی خۆی، لە حەزرەتی شێخ ـ قدس الله سره العزيز ـ بە خزمەتی گەيشتم، دەستو پێم ماچ كرد (وەرگێڕ).

وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى وَمِنْ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِي الْمَالِ وَالْأَهْلِ وَإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ وَزَادَ فِيهِنَّ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ). رواه مسلم.[٢٧]

**ئیبنوعومەر** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کاتێ دەردەچوو بۆسەفەر، لەسەر پشتی وشترەکەی ڕێك جێگیر دەبوو، سێ جار دەیفەرموو: (الله اکبر) دوا ئەوە دەیفەرموو: (سبحان الذی سخر لنا هذا وما کنا له مقرنین، وأنا إلی ربنا لمنقلبون، أللهم أنا أسألك في سفرنا هذا البر والتقوی ومن العمل ماترضی اللهم أنت الصاحب في السفر والخليفة في الأهل، اللهم انی اعوذ بك من وعثاء السفر، وكآبة المنظر وسوء المنقلب في المال والأهل):**

**ئەو کەسەی ئەمەی بۆئێمە رام کردووە بێ نەنگو بێ گەردە، ئەمە لە سایەی رەحمەتی ئەوەوەیە، دەنا ئێمە دەرەقەتی ئەمە نەدەهاتین، بێ گومان شەلەباوانو کوێرە باوان، پەناو پاسارمان هەر لای خودایەو بەداماوی دەچینەوە بەر دەستی خۆی!**

**خودایە! لەم سەفەرەماندا خێرو چاکەو تەقواو لەخودا ترسانمان بەنصیب بفەرموو، هەروەها کارێکیش کەجێگەی رەزامەندی تۆبێ، خودایە! ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بفەرموو، وەتەنگی زەویمان بۆ بکێشەو ڕێگەی دوورمان بۆ نزیك بکەرەوە، خودایە! هاوڕێی تەواو لەسەفەردا هەر خۆتی، خۆتیش چاودێری کەسو کارمانی! پەروەردگارم! پەنا دەگرم بەتۆ لەرەنجو مەینەتی ڕێگەوبانو سەفەر، وەلە چوونەوە بەسەر دیمەنی خراپو حاڵی ناخۆشیماڵو منداڵو خێزاندا، وەلەوەیش کەبەپەستیو دڵتەنگی لەم سەفەرەیەم بگەڕێمەوە. فەرمووی: کاتێ دەشگەڕایەوە هەر ئەمانەی دەخوێند، بەڵام ئەمەی لێ زیاد دەکردن: (آیبون تائبون عابدون لربنا حامدون) ئەوا بەپشت بەستن بەخودا دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوەمان لەگوناهەکانمان پەشیمانین، هەمیشە بەندەیی ساخ بۆ خودای پەروەردگارمان دەکەینو لەسوپاسو ستایش درێغی ناکەین (م).**

---

[٢٧] موسليم (١٣٤٢).

٩٧٣/٢- ٢٥/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا سَافَرَ يَتَعَوَّذُ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْنِ وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ). رواه مسلم.[٢٨]

عەبدوڵڵای کوڕی سەرجەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەتەشریفی دەچوو بۆ ڕێبواری پەنای دەگرت بەخودا بەم شتانە: دەیفەرموو: ( أعوذ بالله وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْنِ وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ): پەنا دەگرم بەیەزدان لەڕەنجو مەینەتی ڕێگەوبانو سەخڵەتی سەفەرو لەوە کەبەپەستیو دڵتەنگی لەم سەفەرە بگەڕێمەوەو لەتەرابوون لەشارەزا بوون لەسەرشۆڕی پاش سەربەرزیو، لەئاهونوزوولەی ستەمبارو، لەچوونەوە بەسەر دیمەنی خراپو حاڵی پەشێوی ماڵو منالو خێزاندا (م).

٧٤/٣-٢٦/ عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ قَالَ: (شَهِدْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَأُتِيَ بِدَابَّةٍ لِيَرْكَبَهَا فَلَمَّا وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الرِّكَابِ قَالَ بِسْمِ اللَّهِ فَلَمَّا اسْتَوَى عَلَى ظَهْرِهَا قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ ثُمَّ قَالَ سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ ثُمَّ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ قَالَ سُبْحَانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ ثُمَّ ضَحِكَ فَقِيلَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ قَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ كَمَا فَعَلْتُ ثُمَّ ضَحِكَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ قَالَ إِنَّ رَبَّكَ يَعْجَبُ مِنْ عَبْدِهِ إِذَا قَالَ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي يَعْلَمُ أَنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ غَيْرِي).[٢٩] رواه أبو داود والترمذى وقال: حديث حسن، وفي بعض النسخ: حسن صحيح، وهذا لفظ أبي داود.

عەلی کوڕی ڕەبیعە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەکن عەلی بووم، وڵاخەکەیان هێنا بۆی، لەکاتی سوواربووندا، کەقاچی نایە ناو ئاو زەنگییەکەوە سێ جار فەرمووی: (بسم الله: بەناوی خودا سوار دەبم) کە قیت دانیشت لەسەرپشتیو تەواو دامەزرا فەرمووی: ( الحمد لله، سوپاس بۆ خودا) ئەوجا سێ جار فەرمووی: ( الله أكبر: خودا

---

[٢٨] موسلیم (١٣٣٤).

[٢٩] ئەبو داوود (٢٦٠٢) و تیرمیذي (٣٤٤٣).

له هەموو کەسێ گەورەترە) ئەوجا فەرمووی: (سبحانك انی ظلمت نفسي فاغفر لي، انه لايغفر الذنوب الا أنت): بێ گەردو بێ نەنگی، پاكو پیرۆزی، راستە کە من زۆرو ستەمم لە خودی خۆم کردووە، وەلێ لەرەحمەتی تۆوا چاوەڕوان دەکەم کەلەتاوانم خۆش بی، ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیەکە خۆت نەبێ کەسی تر رادەی ناکەوێ کەلەتاوانی بەندەکان خۆش بێ. لەپاشا پێکەنی، منیش عەرزیم کرد: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! لەبەرچی پێ دەکەنی؟ فەرمووی: جارێ پێغەمبەرم بینی ئەوەی کرد: عەرزیم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! لەبەرچی پێ دەکەنی؟ فەرمووی: پەروەردگاری تۆ - پاكو پیرۆزبێ (سوبحانەهو) - زۆر خۆشی دێ لەوە کەبەندەی خۆی بلێ: رب اغفر لی ذنوبي، وەلحاڵ بزانێ کە کەسی تر رادەی ناکەوێ کە لە تاوان خۆش بێ جگە لەخۆم. (د/ت: ح/ح - تاج).

**(١٧١) سوننەتە کە ڕێبوار سەرکەوتە سەر ملەو گردو ئەمانە ئەڵلاهوکبەر بکاو کەگەیشتە ناو شیوو دۆڵ و ئەمانەو داپەڕی بەرەو خوار، سوبحانەڵلا بکا بڵێ: (سبحان الله: یەزدانی پاك خودایەکی پیرۆزە). وەلێ لەکاتی ئەڵلاهوئەکبەر کردن و یادو ذیکر کردنی تردا زۆر پێ لەدەنگ بەرز کردنەوە هەڵ نەبڕێ**

**باب المسافر اذا صعد الثنايا وشبهها وتسبيحه اذا هبط الأدوية ونحوها: والنهي عن المبالغة برفع الصوت بالتكبير ونحوه**

١/٩٧٥-٢٧/ عَنْ جابرْ ﷺ قالَ: ( كُنا اذا صعدنا كبرنا، وإذا نزلنا سبحنا). رواه البخاری.[٣٠]

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: ئێمە لەسەردەمی حەزرەتدا** (درودی خوای لەسەر بێ) **کەسەردەکەوتینە سەر بەرزاییو ملەو گردو یاڵو تەپەو لوتکەو شاخوکێو دەمانگوت: ئەڵلاهوئەکبەر، کەلەمانەیش دادەپەڕین بەرەو نزماییو نشێویو دەمانگوت: ( سبحان الله: خودا خودایەکی پاكو پیرۆزە) (بوخاری. هەزار رەحمەت لەگۆڕی نازدار).**

٢/٩٧٦-٢٨/ وعن ابن عمر ﷺ قال: كانَ النَبِـيّﷺ وجيوشه اذا علوا الثنايا كبروا واذا هبطوا سبحوا) رواه أبو داود بأسناد صحيح.[٣١]

---

[٣٠] بوخاری (٢٩٩٣).

[٣١] ئەبوداوود (٢٥٩٩).

**ئیبنوعومەر** (رەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر خۆی و لەشکرەکانی** (درروودی خوای لەسەر بێ) **جاران کە سەردەکەوتنە سەر ملەو بەرزایی ئەللاھو ئەکبەریان دەکرد، کاتێکیش کەدادەپەڕینە خوارەوە سوبحانەللایان دەکرد، عیلمی حەدیث ـ یا بڵێین: زانستی فەرموودە، یا فەرموودە شووناسیَ.**

**عیلمێکی گەورەی سەربەخۆیە، کەم کەس لە خوێنەرانی ئەم بابەتە کتێبە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا سەری لێ دەردەکا، یا ئاگای لێیەتی، یا بگرە لێ ی تێ دەگا، مامۆستا مەلا کەریمی بیارە (خودای گەورە پایە بەرزتری بفەرموێ) کتێبێکی جوانی بەناوی (ڕێگەی ڕەهبەر) لەم عیلمەدا داناوە بۆ کەسی خۆی بەهرە بەخشە مەبەستم لەم گوتەیە ئەمەیە: خوێنەری ئازیزی ئەم ریاضە پیرۆزە، بۆئەوەی کەپشتەستووربێ لەبەهێزیی فەرموودەکان، ئەوەندەی بەسە کەئیمامی نەوەوی** (رەزای خوای لێ بێ) **ئەم کتێبەی داناوە، ئیتر ئەم وردە بابەتانەی کەلەدوایی حەدیثەکەدا باس دەکرێ، بۆ ئەھلی ئیختیصاصە، وەلێ ئەم ڕەمزو نیشانانەیش کەبەندە لە دوا تەرجەمە کوردییەکەوە دەینووسم بێ سوودا نابێ، بەڵام لە سەر ئەساسی ئەم ڕەمزو نیشانانە حوکم بەپایەی بەهێزیو بێ هێزی حەدیثەکە بکرێ. وەلێ فەرموودەکانی نەوەوی** (رەزای خوای لێ بێ) **کەلەدوایی فەرموودەکانەوە تەقییمو تەصنیفی حەدیثەکانی پێ دەفەرموێ، ئەوە نرخی تەواوی خۆی هەیەو دەبێ بەشایەتو بەلگە لەسەر ئەوە کە نەوەوی** (خوا لێی ڕازی بێ) **خۆی ئەو حەدیثە، بە صەحیح، یا بەحەسەن، دادەنێ مایەوە سەر ئەم خاڵە، کە خوێنەری ئاسایی ئەم دوو زاراوە بەیەك شت دادەنێ، بەڵام مەرج نییە وابێ، زاراوەی (ئیسنادی صەحیح) و (حەدیثی صەحیح) عومومو خوصوصی مینوەجهییان لەبەین دایە، چونکە هەیە ئیسنادەکەی نەگەیشتۆتە پایەی صەحیح. وەك حەدیثی: (البیعان بالخیار) کە یەعلای کوڕی عوبەید، لە سوفیانی ثەوری، لەکوڕی دینار، لەئیبنو عومەرەوە، لە حەزرەتەوە** (درروودی خوای لەسەر بێ) **ڕوایەتی کردووە، ئەمە گەرچی ئیسنادەکەی موعەلەلە بەڵام مەتنی حەدیثەکە صەحیحە، لەسەرەتای دامەزراندنی عیلمی ڕوایەتو ئوصولی عیلمی حەدیث دا، ڕستەی دوعاو نزا، بۆ پێغەمبەرو صەحابیو تابیعیو زاناو پێشەوایانی ئیسلام جیا جیابوو، وەلێ لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا وشەی** (رەزای خودای لێ بێ) **کە جاران تایبەت بوو بۆنزا بۆ صەحابی، ئێستا موسامەحەی تیادا کراوەو بۆ پایەبەرزانی تریش بەکاردەهێنرێ (وەرگێڕ).**

٢٩-٩٧٧/٣/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْن عُمَرَ ﷺ (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا قَفَلَ مِنْ غَزْوٍ أَوْ حَجّ أَوْ عُمْرَةٍ يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ مِنَ الْأَرْضِ ثَلَاثَ تَكْبِيرَاتٍ وَيَقُولُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ صَدَقَ اللّٰهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ). متفق عليه. وفي رواية لمسلم: إذا قفل من الجيوش والسرايا أو الحج والعمرة[٣٢]

ئيبنوعومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەغەزا دەگەڕایەوە، یا لەحەج یا لەعەمرە، کەسەر دەکەوتە سەر لاشانێ، یا سەریاڵێ، سێ جار ئەڵڵاهوئەکبەری دەکردو ئینجا دەیفەرموو: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ صَدَقَ اللّٰهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ):

هەر خودا خودایەو بەس! هیچ خودایەکی تر نییە، موڵكو دارایی و پاشایەتیو سەلطەنەتو سوپاسو ستایش هەمووی لەڕاستی دا بۆ ئەوە، وە ئەو خودایەکی وایە دەستی دەڕوا بەسەر هەموو شتێکاو تەواناى هەموو شتێکی هەیە ئەوا لەسایەی خوداوە دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوەمان، پەشیمانین لەگوناهەکانمان، هەمیشە بەندەیی ساخ بۆ خودای پەروەردگارمان دەکەینو، لەسوپاسو ستایشی درێغی ناکەین، خودا بەڵێنی خۆی هێنایەدی، موحەممەدی بەندەی خۆی سەرخستو بەتەنیا خۆیو بەس ئەو کافرانەی کەبەلەشکرێکی گەلێ زۆرەوە گەلە کۆمەکەیان لەئیسلام کردبوو، ژێری خستنو شکاندنی (ش) لەگێڕانەوەیەکی موسلیم دا (خوا لێی ڕازی بێ): جاران حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) یا لەگەڵ کۆمەڵێ شەڕکەرا دەگەڕایەوە، یا لەحەجو عەمرە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەم ذیکرەی دەخوێند.

٣٠-٩٧٨/٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ (أَنَّ رَجُلًا قَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُسَافِرَ فَأَوْصِنِي قَالَ عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللّٰهِ وَالتَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ فَلَمَّا أَنْ وَلَّى الرَّجُلُ قَالَ: اللّٰهُمَّ اطْوِ لَهُ البعيد وَهَوِّنْ عَلَيْهِ السَّفَرَ). رواه الترمذي وقال حَدِيثٌ حَسَنٌ.[٣٣]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دەمەوێ سەفەربکەم، پەندم دادەو ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: هەمیشە ترسی

---

[٣٢] بوخاری (٦٣٨٥) و موسلیم (١٣٤٤).

[٣٣] تیرمیذی (٣٤٤١).

خودات لەدڵدابێ‌و خۆت لەنافەرمانی ئەو زاتە مەزنە بپارێزەو لەتەقوای خودا بێ ئاگا مەبە، وەلەسەر هەموو بەرزاییەکیش ئەڵلاهو ئەکبەر بکە. کاتێکیش پیاوەکە ڕۆیشت حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) ئەم نزایەی بۆی کرد، فەرمووی: (اللَّهُمَّ اطْوِ لَهُ البعيد وَهَوِّنْ عَلَيْهِ السَّفَرَ) خودایە! تەنگی زەوی بۆ بکێشەو دووری بۆ نزدیك بکەرەوە، ئەم سەفەرەی بۆ ئاسان بفەرموو. (ت:ح/ح).

٣١-٩٧٩/٥/ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: (كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكُنَّا إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى وَادٍ هَلَّلْنَا وَكَبَّرْنَا ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُنَا فَقَالَ النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لَا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا إِنَّهُ مَعَكُمْ إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ). متفق عليه.[٣٤]

ئەبوو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەسەفەرێکدا، لە خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) خۆیدا بووین، بەدەم ڕێگەوە گشت جارێ کەلەشیوێ سەردەکەوتینە سەریاڵ‌و بەرزایی، تەلیلەو ئەڵلاهوئەکبەرمان دەکردو بەدەنگی بەرز دەمان گوت: (لا إله إلا الله)، (الله أكبر) تاڕۆژێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! دڵتان بە خۆتان بسووتێ خۆ ئێوە بانگی کەڕو نادیارو شتی وا ناکەن، تا ئاوا زیادە ڕەوی لەدەنگ بەرز کردنەوەدا بکەن، ئێوە هاوار لەخودا دەکەن، خودایش ئاگای لەخشەی مارو مێرووەو، هەمیشە لەگەڵتان دایەو نزیکەو دوور نییە، کەواتە: بەشێنەیی‌و بەهێواشی ئەم ذیکرانە بکەن! (ش).

## (١٧٢) نزاکردن لەسەفەردا سوننەتە - باب استحباب الدعاء في السفر

٣٢-٩٨٠/١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لَا شَكَّ فِيهِنَّ دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ وَدَعْوَةُ الْوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ). رواه أبوداود والترمذي، وقال: حديث حسن، وليس في رواية أبي داود على ولده.[٣٥]

---

[٣٤] بوخاری (٦٣٨٤) و موسلیم (٢٧٠٤).

[٣٥] ئەبوداوود (١٥٣٦) وتیرمیذی (٣٤٤٢).

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەم سێ دووعایە: بەبێ گومان، گیرادەبن: یەکەم: نزای زۆرلێکراوی ستەم دیدە (دووعای مەزڵووم) دووەم: نزای ڕێبوار، سێیەم: نزای باوکو دایك لەمنداڵی خۆیان. (د/ت:ح/ح).**

**(١٧٣) نزای ترسان لەکەسێ یان لەشتێ - باب مایدعو به إذا خاف ناسا أو غیرهم**

**١/٩٨١-٣٣/ عَنِ أبي موسى الأشعري ﷺ ( أنَ رَسولَ اللهِ ﷺ كانَ إذا خافَ قوماً قالَ: أللهمَ انا نجعلك في نحورهم ونعوذ بك من شرورهم). رواه أبوداود والنسائي بأسناد صحيح.[٣٦]**

**ئەبو موسای ئەشعەری** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: جاران حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ئەگەر ترسی لەهۆزێ، یا لەتاقمێ ببوایە دەیفەرموو: (أللهمَ انا نجعلك في نحورهم ونعوذ بك من شرورهم) خودایە! خۆت دەکەین بەکۆڵیانەوەو تیری قودرەتی تۆ دەنێنین بە سینگو بەرۆکیانەوەو، پەنا دەگرین بەپەنای تۆ لەشەڕو وەزەنیان! (د/ن ـ س/ ص).**

**(١٧٤) نزای چوونە هەواری تازەو دابەزین لەجێگەیێ - باب مایقول إذا نزل منزلا**

**١/٩٨٢-٣٤/ عَنْ خَوْلَةَ بِنْتَ حَكِيم السُّلَمِيَّةَ ﷺ تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ نَزَلَ مَنْزِلًا ثُمَّ قَالَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللّٰهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ) رواه مسلم.[٣٧]**

**خەولەی کچی حەکیم** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرکەسێ کاتێ دەچێتە جێگەیێ بڵێ: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللّٰهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ) پەنا دەگرم بەپیرۆزییو بەرەکەتی ووشەو فەرمایشتە تەواو تەواوەکانی خودا ـ مەبەست صیفەتی ئەزەلی کەلامی خودایە ـ (وەرگێڕ) لەشەڕی ئەوەی کەخودا خۆی دروستی کردووەو شەڕێ لێ دەوەشێتەوە، هەرکەسێ کاتێ دەڕواتە**

---

[٣٦] ئەبوداوود (١٥٣٧) مونذیری دەفەرموێ نەسائیش گێڕاویەتیەوە پێ دەچێ لە (السنن الكبرى) دا گێڕابیەتەوە.

[٣٧] موسلیم (٢٧٠٨)

**شوێنێ ئەمە بڵێ، ئیتر هیچ شتێ زیانی پێ ناگەیەنێ هەتا لەو شوێنە دەگوێزێتەوە(م).**

**٢/٩٨٣-٣٥/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا سَافَرَ فَأَقْبَلَ اللَّيْلُ قَالَ: يَا أَرْضُ رَبِّي وَرَبُّكِ اللّٰهُ أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شَرِّكِ وَشَرِّ مَا فِيكِ وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيكِ وَمِنْ شَرِّ مَا يَدِبُّ عَلَيْكِ وَأَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ أَسَدٍ وَأَسْوَدَ وَمِنَ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ وَمِنْ سَاكِنِ الْبَلَدِ وَمِنْ وَالِدٍ وَمَا وَلَدَ). رواه أبوداود.[٣٨]**

**عەبدوللای کوڕی عومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **کە ناسراوە بە ئیبنوعومەر (ڕەزای خودا لەخۆی و لەبابی) فەرمووی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کەدەچوو بۆ سەفەر، کە شەو دادەهات دەیفەرموو: (يَا أَرْضُ رَبِّي وَرَبُّكِ اللّٰهُ أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شَرِّكِ وَشَرِّ مَا فِيكِ وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيكِ وَمِنْ شَرِّ مَا يَدِبُّ عَلَيْكِ وَأَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ أَسَدٍ وَأَسْوَدَ وَمِنَ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ وَمِنْ سَاكِنِ الْبَلَدِ وَمِنْ وَالِدٍ وَمَا وَلَدَ).**

**ئەی زەوییەکە! خودای من و تۆ یەکە، پەنا دەگرم بەخودا لەشەڕو زیانی تۆو، لەشەڕی ئەوەی کە لەسەرپشتی تۆ دەخشێو دەڕوا، وەپەنا دەگرم بەتۆ ئەی خودایە! لەزیانی شێرو ڕەشمارو، لەمارو دوپشكو لەخێوو جندۆکەی وڵاتو لەشەیتانو لەوەچەی شەیتانو، لە هەموو زاوزێکەرێ! (د).**

### (١٧٥) سوننەتەکانی کاری ڕێبوار تەواو بوو بەزوویی بگەڕێتەوە بۆلای کەسو کاری
### باب استحباب تعجيل المسافر الرجوع الى أهله إذا قضى حاجته

**١/٩٨٤-٣٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَنَوْمَهُ فَإِذَا قَضَى نَهْمَتَهُ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ). متفق عليه.[٣٩]**

**ئەبوهورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: سەفەر پارچەیێ لەسزاو مەینەتەو کوڵێ ئەرکو ئازارە، ئەوەتا نانو ئاوو خەوو خۆراکتان لێ هەراسان دەکا، دەی کەواتە کەمەبەستی سەفەرەکەتان هاتەدی بەبێ درەنگ بگەڕێنەوە بۆلای کەسوکارتان (ش).**

---

[٣٨] ئەبوداوود (٢٦٠٣).

[٣٩] بوخاری (١٨٠٤) و موسلیم (١٩٢٧).

## (١٧٦) وا سوننەتە پیاو کەلەسەفەر گەڕایەوە بە ڕۆژ بگاتە ماڵەوە، نا پەسەندە کەبەشەو لەناکاودا بکا بەماڵا مەگەر لەبەر ناچاری
## باب استحباب القدوم على أهله نهارا وكراهته بالليل لغير حاجة

١/٩٨٥-٣٧/عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّٰهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمْ الْغَيْبَةَ فَلَا يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلًا). وفي رواية: (نَهَى النَبِيّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَطْرُقَ أَهْلَهُ لَيْلًا). متفق عليه.[٤٠]

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێکتان ماوەیەکی زۆر دابڕان لەکەس و کارتان، بەشەو لەناکاوا مەدەن بەسەریانا. لەگێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی نەدەدا کەپیاو بەشەو لەناکاوا خۆی بکا بەماڵا، مەبەستی ئەوەبێ کەژنەکەی تاقی بکاتەوە ئایا ناپاکی لێ دەکا یانا، یا لەهەڵەو سەرسمی خێزانی خۆی بگەڕێ (ش).

## (١٧٧) ڕێبوار لەکاتی گەڕانەوەداو لەکاتی دیتنی شاری خۆیدا چی بڵێ
## باب مايقول إذا رجع وإذا رأى بلدته

فيه حديث أبن عمر السابق في باب تكبير المسافر اذا صعد الثنايا: فەرموودەکەی ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەم بابەتەیە: کە حەدیثی دووەمی باسی (تکبير المسافر إذا صعد الثنايا) یە، زنجیرەی/١٧١ (بڕوانە ٢/٩٧٦-١٧١)

١/٩٨٨-٣٨/ وعَنْ أَنَسْ ﷺ قالَ: أقبلنا مَعَ النَبِيّ ﷺ حتى إذا كنا بظهر المدينة قالَ: (آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ فَلَمْ يَزَلْ يَقُول حَتَّى قَدِمْنا الْمَدِينَةَ). رواه مسلم.[٤١]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خوای لەسەر بێ) کەگەڕاینەوە کاتێ گەیشتینە بەرابەر مەدینەو مەدینەمان لێوە دەرکەوت حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ) ئیتر حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) هەر ئەم فەرمایشتەی دەفەرموو تاگەیشتینەوە ناو شاری مەدینەی پیرۆز (م).

---

[٤٠] بوخاری (١٨٠١) و موسلیم (٧١٥).

[٤١] بوخاری (٣٠٨٨) و موسلیم (٢٧٦٩).

**(١٧٨) واسوننەتە كەڕێبوار كەگەیشتە جێ لەپێشدا بچێ بۆ مزگەوتەكەی دراوسێ ی ماڵەكەی و لەوێ دوو ركات نوێژی دیاریی مزكەوت بكا، ئەوجا بچێتەوە بۆ ماڵەوە**
**باب استحباب ابتداء القادم بالمسجد الذي في جواره وصلاته فيه ركعتين**

**١/٩٨٩-٣٩/ فەرموودەكەی كەعبی كوڕی مالیك كەلەپێشەوە رابوورد، لەبەرگی یەكەم دا زنجیرەی دووەم (بڕوانە ٢١/٩ - ز ٢ ب - ١ ل - ٢٨)**

**(١٧٩) سەفەركردنی ئافرەت بەتەنیا خۆی، كە كەسێكی خۆی لەگەڵدا نەبێ ناڕەوایە**
**باب تحريم سفر المرأة وحدها**

١/٩٨٩-٤٠/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ إلا مع أذى عليها). متفق عليه.[٤٢]

**ئەبوهورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (درورودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: بۆ هیچ ئافرەتێ ڕەوا نییە - ئەگەر باوەڕی ساغی بەخواو رۆژی دوایی هەبێ - كەماوەی رۆژە ڕێ یەك بڕوات بۆسەفەر، مەگەر كەسێكی خۆیی لە گەڵ دابێ (ش).**

٢/٩٩٠-٤١/عَنْ ابْنَ عَبَّاس ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ يَقُولُ: (لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ وَلَا تُسَافِرْ الْمَرْأَةُ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي خَرَجَتْ حَاجَّةً وَإِنِّي اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا قَالَ انْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ). متفق عليه.[٤٣]

**ئیبنوعەبباس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: بەگوێچكەی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت دەیەفەرموو** (درورودی خوای لەسەر بێ)**: نابێ پیاوی بیانی دوو بەدوو لەگەڵ ژنی بیانی دا كۆببنەوە، مەگەر ژنەكە، خۆیی و مەحرەمی لەگەڵ دا بێ، پیاوێ گوتی: ئەی رەوانە كراوی یەزدان! دەسا من ژنەكەم بەتەنیا دەرچووە بۆ حەج و خۆشم ناونووس كراوم بۆ چوون بۆ فیسارە غەزا. فەرمووی: بڕۆ لەگەڵ ژنەكەت حەج بكە (ش).**

---

[٤٢] بوخاری (١٠٨٨) و موسلیم (١٣٣٩).

(٤٣) بوخاری (١٧٦٢) و موسلیم (١٣٤١).

بسم الله الرحمن الرحيم

## نامەی گەورەیی قورئانی پیرۆز

## (١٨٠) باسی گەورەیی قورئانخوێندن

## كتاب فضائل القرآن - باب فضل قراءة القرآن

١/٩٩١-٤٢/ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لِأَصْحَابِهِ). رواه مسلم. [٤٤]

**ئەبو ئومامە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: بەگوێ ی خۆم گوێم لێ لە حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: قورئان بخوێنن، چونکە لەڕۆژی قیامەتا قورئان دێ، لە سەر شێوەیەکی وا خەڵکی مەحشەر بە چاوی خۆیان دەیبینن، دەبێ بەتکاکارو بۆ هاوڕێیانی خۆی ( مەبەست لەهاوڕێیانی ئەو کەسانەن کەلەجیهانی یەکەما فێری دەبن‌و دەوری دەکەنەوەو ڕەفت (عەمەل) ی پێ دەکەن ـ وەرگێڕ (م).**

٢/٩٩٢-٤٣/ عَنْ النَّوَّاسَ بْنَ سَمْعَانَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (يُؤْتَى بِالْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَهْلِهِ الَّذِينَ كَانُوا يَعْمَلُونَ بِهِ تَقْدُمُهُ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَآلُ عِمْرَانَ وَضَرَبَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلَاثَةَ أَمْثَالٍ مَا نَسِيتُهُنَّ بَعْدُ قَالَ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ ظُلَّتَانِ سَوْدَاوَانِ بَيْنَهُمَا شَرْقٌ أَوْ كَأَنَّهُمَا حِزْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ تُحَاجَّانِ عَنْ صَاحِبِهِمَا). رواه مسلم. [٤٥]

**نەوواسی کوڕی سەمعان** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: گوێم لە حەزرەت بوو** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: ڕۆژی قیامەت قورئان‌و یارانی قورئان دەهێنن، مەبەست لەیارانی ئەو کەسانەیە کەلەم جیهانەدا ڕەفت (عەمەل) ی پێ دەکەن، سوورەتی بەقەرەو سورەتی ئالی عیمران وەپێش قورئانەکە دەکەون، حاڵیان وایە لەسەر دۆست‌و یارانی خۆیان دەکەنەوەو لەسەریان هەڵ دەدەنێ! (م). ئێمە کە موسوڵمانین باوەڕمان بەم جۆرە شتە هەیە چونکە ئەمەو وێنەی ئەمە غەیبەو ڕازو نهێنیی یەکی خوایی یە، عەقڵ‌و هۆش دەرکی شتی وا ناکاو پەیی پێ نابا، تا لەو دنیا هەستی پێ دەکاو تەسلیم دەبێ. (وەرگێڕ)**

---

[٤٤] موسلیم (٨٠٤).

[٤٥] موسلیم (٨٠٥).

٩٩٣/٣-٤٤/ عَنْ عُثْمَانَ ﷺ عَنَ النبِـيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلّمَ الْقُرْآنَ وَعَلّمَهُ). رواه البخارى.[٤٦]

عـوثمـانى كـوڕى عـەففان (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: باشترین کەسی ئێوە ـ ئەی گورۆهی قورئانپەروەران! ـ ئەو کەسەیە کەهەم خۆی فێری قورئان دەبێو هەم خەڵکی تریش فێری قورئان دەکا (بوخاری رەحمەت لەگۆڕی نازداری).

٩٩٤/٤-٤٥/ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ: رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) الذي يقرأ القرآن وهوَ مَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ وَالّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ). متفق عليه.[٤٧]

لەعائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە ـ دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەهاوسەرانی بێ ـ لە پێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ: ئەو قورئانخوێنەی کەبەرەوانی قورئانی لەبەرەو رەفتاری پێ دەکا، ئەوە لەپایەی ئەو فریشتە بەرێزە پایە بەرزە خێر خواو پیرۆزانەدایە کەلەجیهانی بالاداو، لەعالەمی مەلەکوت دا سەرپەرشتی قورئان دەکەنو خودا لەم دوو ئایەتەدا باسی ئەم ئەرکە پیرۆزەی ئەوانی کردوە: کە دەفەرموێ: (بأيدي سفرة * كرام بررة) (٨٠/١٥-١٦) واتە: ئەم قورئانە لەجیهانی بالاداو بەدەستی چەند فریشتەیەکی بەرێزی بەرزی خێرۆمەندی فەرمانبەری خوداوەن. حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو کەسەشی کەخەریکە دەیخوێنێو بەرە بەرە لەبەری دەکا، بەڵام هێشتا زمانی تەتەڵەی تیا دەکاو بەگران بۆی لەبەردەکرێو قاڵی نەبووە تیادا، ئەمەیش لەباتی پاداشێ دوو پاداشی بۆ هەیە، پاداشێ لەباتی خوێندنەکەی، پاداشێ لەباتی دەم تەتەڵە کردنەکەی (ش).

٩٩٥/٥-٤٦/ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْأُتْرُجَّةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ لَا رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الّذِي

---

[٤٦] بوخاری (٥٠٢٨).

[٤٧] بوخاری (٤٩٣٧)و موسلیم (٧٩٨).

يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ). متفق عليه.[٤٨]

ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: وێنەی ئەو موسوڵمانەی کەقورئان دەخوێنێو لەهەمان کاتا کاری پێ دەکا وەك لیمۆ وایە هەم بۆنی خۆشەو هەم تامی خۆشە، وێنەی ئەو موسوڵمانەی کە قورئان زۆر نەخوێنێ، بەڵام کاری پێ بکا، وەك خورما وایە هەرچەند بۆنی نییە بەڵام تامی خۆشە، وێنەی پیاوی دوو ڕووی قورئانخوێن وەك ڕێحانە وایە هەرچەندە بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە! وێنەی دووڕووی قورئان نەخوێنیش وەك گوژاڵك وایە، بۆنی خۆشی نی یەو تامیشی تاڵو ناخۆشە (ش).

٧/٩٩٧-٤٧/ عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أنَ النَبِيّﷺ قالَ: (إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ) رواه مسلم.[٤٩]

عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا بەم نامەی خۆیە کە قورئانی پیرۆزەکەسانێو کۆمەڵانێ بەرز دەکاتەوە، پایە بەرزیی لای خۆییان پێ دەبەخشێ، هەروا کەسانێ تریش کەشایستەی ئەو ڕێز لێنانەن بەهۆی ئەم قورئانەوە نزمیان دەکاتەوە (م).

٧/٩٩٧-٤٨/ عَنَ ابنْ عمر (رضي الله عنهما) عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ). متفق عليه.[٥٠]

ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە رابوورد، زنجیرەی شەست فەرموودەی یەکەم. بەڵام لێرەدا لەجیاتی: (رجل أتاه الله الحكمه) ئەمەیە: (رجل أتاه الله القرآن) یە. بڕوانە ژمارە (٥٧٢ب ـ ٢ ل ـ ١٢٦).

٨/٩٩٨-٤٩/ عَنْ الْبَرَاءِ بنَ عازبْ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ وَعِنْدَهُ فَرَسٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ فَجَعَلَتْ تَدُورُ وَتَدْنُو وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ مِنْهَا فَلَمَّا أَصْبَحَ

[٤٨] بوخاری (٥٠٥٩)و موسلیم (٧٩٧).

[٤٩] موسلیم (٨١٧).

[٥٠] بوخاری (٧٣)و موسلیم (٨١٥) بڕوانە (٥٤٤)و (٥٧٢).

أَتَى النَبِـيّصَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ). متفق عليه.(٥١)

بەڕای کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ (کە ئوسەیدی کوڕی حوضەیر دەبێ) سوورەتی کەهف َدەخوێنێ، لەوکاتەدا ماینەکەی لەلایەوە بەدوو گوریس بەسرابۆوە، لەکاتی قورئانخوێندنەکەدا پەڵە هەورێ بەسەریدا دەداو دەیگرێتە ناوو دەست دەکا بەگڕ خواردن بەدەوریاو لێی نزیك دەبێتەوە، ماینەکەشی کەئەمە بینێ سڵی لێ دەکاو هەڵدەسڵەمێتەوە، جا بۆ بەیانی هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەمەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (دروودی خوای لەسەر بێ): ئەوە ئارامیو فریشتەی ئاسایش بوون، لەبەرخاتری قورئانەکە داباریون! (ش).

٩/٩٩-٥٠/عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللّٰهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا لَا أَقُولُ الم حَرْفٌ وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلَامٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ). رواه الترمذى وقال حديث حسن صحيح.(٥٢)

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) کەناسراوە بەئیبنو مەسعود دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ پیتێ لەقورئان بخوێنێ بەوپیتە چاکەیەکی بۆ هەیە، چەن وشە بخوێنێ یا چەن ئایەتو سوورەت بخوێنێ، لەباتی گشت پیتێ لەپیتەکان یەك چاکەی بۆ هەیە، پاداشی چاکەش یەك بەدەیە، بگرە پتریش، وەك خودا دەفەرموێ: (ومن جاء بالحسنة فله عشر أمثالها) (٦/١٦٠) هەرکەسێ چاکەیێ بکا دە قاتی ئەوە یابەبێ شومار پاداشی باشی بۆهەیە، دەی من نالێم (الم) یەك پیتە، بەڵکوو ئەوە سێ پیت، ئەلیف پیتێکە، وە لام پیتێکە، وە میم پیتێکە، بەم پێ یە بەتەنیا وشەی (الم) بخوێنێ سێ چاکەی بۆ دەنووسرێ (تـح/ ح/ ص).

١٠/١٠٠٠-٥١/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (إِنَّ الّذِي لَيْسَ فِي جَوْفِهِ شَيْءٌ مِنْ الْقُرْآنِ كَالْبَيْتِ الْخَرِبِ). رواه الترمذى قال هذا حديث حسَنٌ صَحِيحٌ.(٥٣)

---

(٥١) بوخاری (٥٠١١)و موسلیم (٧٩٥).

(٥٢) تیرمیذی (٢٩١٢).

(٥٣) تیرمیذی (٢٩١٤).

**ئیبنوعەبباس** (رەزای خودا لەخۆیو بابی بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەر دڵێ شتێ لەقورئانی تیانەبێو خاڵی بێ لەیادو ذیکری خودا، وەك کەلاوە کۆن وایە! (ت:ح/ ح/ ص).**

١٠٠١/١١-٥٢/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُقَالُ: (لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا). **رواه أبو داود، وقال حديث حسن صحيح.**[٥٤]

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص - ڕەزای خودا لەخۆیو لەبابی - فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لەبەهەشتا بەقورئانخوێن دەڵێن: قورئانت چەندە لەبەرە بیخوێنەو بەپایەکانی بەهەشتا سەرکەوە، وە چۆن لەجیهان دا قورئانت بەتەرتیل دەخوێند لێرەیش هەروەها بەئارامیو مۆڵەتو لەسەرخۆ بیخوێنە، تا بەهەشتی یەکان گوێ ی لێ بگرن، چونکە پایەی تۆ لەو شوێنەدایە، کەدوا ئایەت دەخوێنێ، دیارە کەهەتا زیتری لەبەربێ پایەی لەبەهەشتا بەرزتر دەبێ. (د/ ت: ح/ ح/ ص).**

## (١٨١) فەرمانکردن بەدەور کردنەوەو ئاگادار کردنی قورئان و، هەڕەشە کردن لەوکەسەی خەریکە لەبیر خۆی دەباتەوە

## باب الامر بتعهد القرآن والتحذير من تعريضه للنسيان

١٠٠٢/١-٥٣/عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (تَعَاهَدُوا هَذَا الْقُرْآنَ فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَلُّتًا مِنْ الْإِبِلِ فِي عُقُلِهَا). **متفق عليه.**

**ئەبو مووسا** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: سەرەوکاریو ئاگاداری قورئان بکەنو هەمیشە دەوری بکەنەوە، دەسا بەوکەسە کەگیانی منی بەدەستە، کەیەزدانی پاکە، قورئان زووتر لەبیر دەچێتەوە کاتێ دەوری نەکرێتەوە، هەتا وشتر کەبەلەسە دەبێ کاتێ لەپەت بەردەبێ بەرەڵلا ببێ!!(ش)**

---

[٥٤] ئەبو داوود (١٦٦٤)و تیرمذی (٢٩١٥).

٢/١٠٠٣-٥٤/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآن كَمَثَلِ صَاحِبِ الْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ). متفق عليه.[٥٥]

ئیبنو عومەر - ڕەزای خودایان لێ بێ - لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: قورئانخوێن وەك خاوەن وشتری مەڕ بەندكراو وایە، چۆن ئەو ئەگەر سەرپەرشتی وشترەكانی بكا ئەوە لەدەستی ناچن‌و بەدەستیەوە دەمێنن، ئەمیش هەروەها ئەگەر دەوری قورئانەكەی بەگەرمی بكاتەووە لەبیری ناچێتەوە (ش).

**(١٨٢) سوننەتە لەكاتی قورئانخوێندن دا قورئانخوێن بەپێ ی تەوانا دەنگی خۆی خۆش بكاو دەم‌و قوڕگی خۆی پاك بكاتەوە. سوننەتە داوای قورئانخوێندن لەدەنگ خۆش بكرێ و گوێی لێ بگیرێ**

**باب القراءة من حسن الصوت بالقرآن وطلب القراءة من حسن الصوت والاستماع لها**

١/١٠٠٤-٥٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَا أَذِنَ اللّٰهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيّ حَسَنِ الصَّوْتِ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ). متفق عليه.[٥٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا لەهیچ شتێ وا بەحوسنی ڕەزا گوێ ناگرێ وەك گوێ لە پێغەمبەرێكی دەنگخۆش، كەبەئاوازی خۆش‌و بەمەقامی جوان قورئان بخوێنێ‌و بەشەوقەوە دەنگی لێ هەڵبڕێ! (ش).

٢/١٠٠٥-٥٦/ عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (قَالَ لَهُ يَا أَبَا مُوسَى لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ). متفق عليه.[٥٧]

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەی ئەی ئەبو موسا! بەڕاستی خودا دەنگ‌و ئاوازێكی خۆشی پێ داویت، دەڵێی دەنگ‌و ئاوازە خۆشەكەی داوود پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێ) (ش).

وفي رواية مسلم أن رسول الل ﷺ قالَ لهُ: (لو رأيتني وأنا استمع لقراءتك البارحة):

---

[٥٥] بوخاری (٥٠٣١)و موسلیم (٧٨٩).

[٥٦] بوخاری (٥٠٢٣)و موسلیم (٧٩٢).

[٥٧] بوخاری (٥٠٤٨)و موسلیم (٧٩٣) و (٢٣٧).



**لەگێڕانەوەیەكی ئیمامی موسلیم دا** (ڕەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی پێی: بریا دوێ شەو لەشوێنێكەوە چاوت لێم دەبوو، كەچۆن گوێم شل كردبوو بۆ ئەو قورئانەی كە بەو دەنگە خۆشەت دەتخوێن، دیارە دەوركردنەوەكەی تۆم پێ خۆش بوو، تۆیش بەگوێ گرتنەكەی من كەیفت دەهات.**

**٣/١٠٠٦-٥٧/ عَنْ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: (سَمِعْتُ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَرَأَ فِي الْعِشَاءِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ فَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ صَوْتًا مِنْهُ). متفق عليه.**[٥٨]

**بەڕای كوڕی عازیب** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ گوێم لێ بوو لە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەنوێژی خەوتنانا، لەڕكاتێكیانا، سوورەتی (والتین والزیتون) ی دەخوێند، كەسی ترم نەدیوە وەك ئەو ئاوا دەنگی خۆش بێ (ش).**

**٤/١٠٠٧-٥٨/ وعَنْ أبي لبابة بشير بنْ عَبدالمنذير ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: (مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ لَيْسَ مِنَّا) رواه أبو داود باسناد جيد.**[٥٩]

**ئەبو لوبابە بەشیری كوڕی عەبدولمونذیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: كاتێ قورئان دەخوێنن، ئەوەی بەسۆز كردنو دەنگی خۆشو بەنقامو مەقام قورئان نەخوێنێ لەئێمە نییە (د ـ سند جید).**

**٥/١٠٠٨-٥٩/ [٦٠] فەرموودەی (اقرأ علی القرآن) [٦١]**

---

[٥٨] بوخاری (٧٦٩)و موسلیم (٤٦٤)، (١٧٧)

[٥٩] ئەبو داوود (١٤٧١).

[٦٠] بڕوانە (٤٤٦/١ ز ـ ٥٤ ب ـ ٢ ل ـ ٣٢).

[٦١] ڕۆژی هەینی لەمزگەوتی حاجی كاك ئەحمەدی شێخ ـ ڕەزای خودای لێ بێ ـ نوێژی هەینیم كرد، بەڕاستی شوێنو مەقامی وا پیرۆز جێگەی خورۆشانو هاتنە جۆشی كوورەی ڕەحمەتی خودایە. حاجی مەلا موحەممەدی حاجی قادری گەچ فرۆش ـ حافظ یەكەمی سەرمەحفەلە ـ بەدەنگێكی خۆشی بەتەئسیری بەسۆز، عەشەرەیەكی داوود ئاسایی خوێند، بەئارەزو نقامو مقامێكی پڕجۆشو خورۆشو پڕ پێزو سۆز، تابڵێی دڵ لاوێنو دڵ نەرمكەر، بەچریكەیەكی كەمێ خەماویو گریناوی!
هەرزا ڕەحمەت لەگۆڕت حاجی قادر، كوڕی ڕەحمەت ئاوا دەبێ، دەڵێ ی بولبولی سەر گوڵزاری مەرقەدی حاجی كاك ئەحمەدی شێخە! فەقێ بووم لەمزگەوتی شێخ مەحموودی قەرەچێوار گەلێ جار

## (١٨٣) هاندان لەسەر چەند سوورەتێك و چەند ئايەتێكی تايبەتی
## باب في الحث على سور و آيات مخصوصة

١٠٠٩/١-٦٠/ عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى ﷺ قَالَ: قالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَلَا أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنْ الْمَسْجِدِ فَأَخَذَ بِيَدِي فَلَمَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْرُجَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ قُلْتَ لَأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنْ الْقُرْآنِ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ).رواه البخاري.[٦٢]

**ئەبو سەعيدی رافيعی كوڕی ئەلوعەللا** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هۆشيار بە! لەپێش ئەوەدا كەلە مزگەوت بچيتە دەرێ سوورەتێكت پێ نيشان دەدەم كە گەورەترين سوورەتە لەناو قورئاناو خێرو پاداشی زياترە، ئيتر حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەستی گرتم‌و دەستمان كرد بەڕۆيشتن،**

---

ئەم حاجی قادرە، پڕ سەرسينييەك نان‌و چێشتی دەڕازانەوەو بەڕيشی سپی يەوە خۆی دەهێنا بۆمان، فەقێش ـ گەرچی دڵپاكن ـ مەشهوورە دەم شڕو هارو هاجن، هێشتا مام حاجی دوور نەدەكەوتەوە ئێمە دەچووين قسەمان بەكەنيشكەكانی دەگوت، كەچی ئەو ماڵ وێرانە، چونكە شتەكەی بۆ خودا بوو، نەيدەبردە سەر خۆی‌و نەيدەگرتە دڵ‌و بۆ سبەينێ بەقەرەوانەيەكی گەورەترەوە دەهاتەوە، لەباتی گلەيی بكاو بڵێ: ئەرێ بۆ واوا دەڵێن: بەزەردەخەنەيەكی مەعنادارەوە دەيفەرموو: توخوا كاكە: كەدووعام بۆ دەكەن با خۆم گوێم لێ نەبێ! ئەی هەزار رەحمەتت لێ بێ. جارێكيش دەرويش قادرێ هەبوو، زۆر بەدين‌و بەڕەحم بوو، گەڕيدە بوو، ژن‌و ماڵی نەبوو، كەمێ شێتۆڵكە بوو، زۆرتر بەسەر قەبرسانەكانەوە دەگەڕاو، بەشەو دەهاتەوە بۆ مزگەوت، پارەو پووڵی لەكەس وەرنەدەگرت، بێجگە لەنان، زستانان لەكەڵەكە بەردی دەوری قسنەكانا بۆقی سڕی دەدۆزيەوەو بۆی دەگرياو، دەيخستە باخەڵی، كاتێ لەبەر سوپەی مزگەوت بۆقەكە گەرمی دەبۆوە، لەباخەڵی دەردەپەڕی‌و هەراو زەنايەكی دروست دەكرد لەناو نوێژكەرەكانا! جا جارێ كات رەمەزان بوو، حاجی قادر ئێوارێ بەربانگی هێنا بۆ دەروێش قادرو پێی گوت: دەروێش قادر بەربانگم بۆ هێناوی؟ گوتی: بيبە هۆ ئالەوێ بۆم دابنێ، حاجی قاديش وای كرد، پاش جەماعەت حاجی قادر پێی گوتەوە: (دەرويش قادر! ئەوە بەربانگەتە، وامن دەڕۆم!). گوتی: حاجی قادر! ئەگەر لەبەر خوا بۆت هێناوم ئەوا خودا پێی دەزانێ، ئەگەر لەبەر منيش هێناوتە هێشتا لێيم نەخواردووە، بڕۆ بيبەرەوە!!) حاجی قاديش ـ هەزار رەحمەتيان لێ بێ ـ پڕ قورگی بوو لەگريان‌و گوتی: (ئەی هەزار ئاقڵی وەك منت بەقوربان بێت!!) (وەرگێڕ)

[٦٢] بوخاری (٥٠١٣) و (٥٠١٥).

خەریکبوو لەمزگەوت دەربچین عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تر فەرمووت: سوورەتێکت پێ نیشان دەدەم گەورەترین سوورتە لەقورئاندا: فەرمووی ئەو سوورەتە: (الحمد لله رب العالمين)ە، کە ناویشی (السبع المثانى) یە، هەروەها ناویشی (القرآن العظيم)ە، کە خودا داوێتی بەمن. وەك لەم ئایەتەدا دەفەرمویٚ: (ولقد آتيناك سبعا من المثاني والقرآن العظيم) (٧٨/١٥) واتە: بەڕاستی ئێمە حەوت ئایەتی قورئانمان داوە بەتۆ کەلەهەموو رۆژو شەوێکا چەن جار لەناو نوێژدا دووپات دەکرێنەوە، سەرەڕای ئەم حەوتەی دووبارە پاتەیش باقی قورئانم پێ داوی، کە گشتی قورئانێکی گەورەیە، بەتایبەت ئەم حەوتەی دووپاتەیە سەرچاوەی قورئانەو دایکانەی ئایەتەکانی نامەی خودایە (ب).

٢/٤-١٠١٠-٦١/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: (قَالَ: النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَصْحَابِهِ أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ فِي لَيْلَةٍ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ وَقَالُوا أَيُّنَا يُطِيقُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ قل هو الله أحد الله الصَّمَدُ ثُلُثُ الْقُرْآنِ). رواه البخارى.[٦٣]

ئەبو سەعیدی خوداری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەدحی سوورەتی (قل هو الله أحد) دا فەرمووی: بەو کەسە کەگیانی منی بەدەستە، ئەم سوورەتە لەبەر گەورەیی‌و پیرۆزیی خۆی هاوتای سێیەکی قورئان دەکا! لەگێڕانەوەیەکا: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەهاوڕێیانی خۆی فەرموو: کەستان دەتوانن کەسێیەکی قورئان لەشەوێکا بخوێنن؟ یارانیش - ڕەزای خودایان لێ بێ - ئەوەیان بەلاوە زەحمەت بوو، لەبەر ئەوە گوتیان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! کێمان ئەوەی لەبارەدا هەیە، کەسمان لەتوانامان‌دا نییە. فەرمووی: دەبزانن سورەتی (قل هو الله أحد * الله صمد) هاوتای سێیەکی قورئان دەکا (ب).

٣/١٠١١-٦٢/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ (أَنَّ رَجُلًا سَمِعَ رَجُلًا يَقْرَأُ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ يُرَدِّدُهَا فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ). رواه البخارى.[٦٤]

---

[٦٣] بوخاری (٥٠١٣) و (٥٠١٥).

[٦٤] بوخاری (٥٠١٣).



دیسان فەرمووی: شەوێ پیاوێ هەر سوورەتی (قل هو الله أحد) دەخوێنێو دیسانەوە دووبارەی دەکاتەوە، پیاوێکی تر گوێی لەم کارە دەبێ، بۆ سبەینێ دەچێتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەی عەرز دەکا، وەك بڵێی پیاوەکە خوێندنی ئەم سوورەتە بەتەنها خۆی بەکەم دابنێ وابوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەو کەسە کەڕەوانی من والەدەسیا ئەم سوورەتە لەبەر گەورەیی و پیرۆزیی خۆی هاوتای سێیەکی قورئان دەکا (بوخاری، ڕەحمەتی خودا لەگۆڕی نازداری).

٤/١٠١٢-٦٣/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ). رواه مسلم.[٦٥]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەوەسپو شانی سوورەتی (قل هو الله أحد) دا فەرمووی: ئەم سوورتە خۆی دەدا لەسێیەکی قورئان (موسلیم، ڕەزای خودای لێ بێ).

٥/١٠١٣-٦٤/ وعَنْ أَنَس ﷺ أنَ رَجلاً قالَ: يا رسول الله إني أحب هذه السورة: (قل هو الله أحد) قالَ: ان حبها أدخلك الجنة). رواه الترمذي، وقال: حديث حسن، ورواه البخاری في صحيحه تعليقا.[٦٦]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەڕاستی من ئەم سوورەتی (قل هو الله أحد)م زۆر خۆش دەوێ، فەرمووی: دەبزانە خۆشەویستی ئەم سوورەتە دەتباتە ناو بەهەشت! (ت: ح/ح).

٦/١٠١٤-٦٥/ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَلَمْ تَرَ آيَاتٍ أُنْزِلَتْ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطٌّ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ). رواه مسلم.[٦٧]

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پێم: دەزانی کەوا ئەم شەو چەن ئایەتێکم بۆ هاتوون، کەهەرگیز شتی وا گەورەو

---

[٦٥] موسلیم (٨١٢).

[٦٦] تیرمیذی (٢٩٠٣) بوخاری (٧٧٤).

[٦٧] موسلیم (٨١٤).

نایاب نەبینراوە، کە ئەم دوو سوورەتەن: سوورەتی: (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) (م).

٧/١٠١٥-٦٦/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَعَوَّذُ مِنْ الْجَانِّ وَعَيْنِ الْإِنْسَانِ حَتَّى نَزَلَتْ الْمُعَوِّذَتَانِ فَلَمَّا نَزَلَتَا أَخَذَ بِهِمَا وَتَرَكَ مَا سِوَاهُمَا) رواه الترمذيوقال حديث حسن.[٦٨]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێش دا هەتا سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) نەهاتبوون، یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو، پەنای دەگرت بەپەنای خودا لەوەزن‌و زیانی بەرەی جنۆکەو شەیاطینی‌و لەچاوێنی ی چاوپیسی مرۆڤ، دەیفەرموو: (اللهم اني أعوذ بك من الجان وعين الانسان: خودایە! من پەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی بەرەی جنۆکەو لەچاوێنی چاوپیسی مرۆڤی چاوپیس) بەڵام کاتێ ئەم دوو سوورەتە دابەزین ئیتر ئەمانەی کرد بەویردو بەدووعای حیفظو وازی لەوانی تر هێنا (ت: ح/ح).

٨/١٠١٦-٦٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ سُورَةً مِنْ الْقُرْآنِ ثَلَاثُونَ آيَةً شَفَعَتْ لِرَجُلٍ حَتَّى غُفِرَ لَهُ وَهِيَ سُورَةُ تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ) رواه أبو داود والترمذى وقال: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وفي رواية أبي داود (تشفع).[٦٩]

لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: سووڕەتی لەقورئاند هەیە، سیی ئایەتی ڕێکە، ناوی سوورەتی (تبارك الذي بيده الملك)ە، ئەم سوورەتە تکاو، شەفاعەت دەکا لەلای خودا، بۆ ئەو پیاوانەی کەلەبەری دەکەن‌و هەمیشە دەیخوێنن، هەتا خودا لەبەرخاتری ئەو لێیان خۆش دەبێ (د/ ت: ح/حەزرەت ـ تاج).

٩/١٠١٧-٦٨/ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ قَرَأَ بِالْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ).متفق عليه.[٧٠]

---

[٦٨] تیرمیذی (٢٠٥٩).

[٦٩] ئەبوداوود (١٤٠٠) و تیرمیذی (٢٨٩٣).

[٧٠] بوخاری (٥٠٠٩) و موسلیم (٨٠٨).

ئەبومەسعوودی بەدری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بەشەو دوو ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی بەقەرە ئەو شەوە ئەوەی بۆ نوێکردنەوەی باوەڕو تازە کردنەوەی پەیمان لەگەڵ خودادا بەسە (ش) ئەمە ئەو دوو ئایەتەیە: (آمن ارسول بما أنزل اليه من ربه والمؤمنون، كل آمن باالله وملئكته وكتبه ورسوله، لانفرق بين أحد من رسوله، وقالوا سمعنا وأطعنا غفرانك ربنا وإليك المصير * لايكلف الله نفسا الا وسعها لها ما كسبت وعليها ماكتسبت، ربنا لاتؤاخذنا ان نسينا أو أخطأنا، ربنا ولا تحمل علينا اصرا كما حملته على الذين من قبلنا، ربنا ولا تحملنا مالا طاقة لنا به، واعف عنّا واغفر لنا، وارحمنا أنت مولانا فانصرنا على القوم الكافرين) (٢/٢٨٥-٢٨٦).

تەفسیری ئەم دوو ئایەتەم بەکوردی لە کۆتایی سوورەتی بەقەرەدا، لەتاج دا نووسیوە، بۆ کەسێ بیەوێ تەماشای بکا بێ سوود نابێ (بڕوانە تاج/ ٦/ ٥٨ ف ـ ٦٤) (وەرگێڕ).

١٠/١٠١٨-٦٩/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنْ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ). رواه مسلم.[٧١]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ماڵەکانتان مەکەن بەگۆڕخانەی چۆڵو هۆڵ، هەر ماڵێ سورەتی بەقەرەی تیا بخوێنرێ شەیتان سڵی لێ دەکاو لێی بەلەسە دەبێ! (م).

١١/١٠١٩-٧٠/ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَعَكَ أَعْظَمُ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ، قَالَ فَضَرَبَ فِي صَدْرِي وَقَالَ وَاللَّهِ لِيَهْنِكَ الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ). رواه مسلم.[٧٢]

ئوبەیی کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ئەی باوکی مونذیر! ئایا دەزانی لەو قورئانەی کە لەبەرتە کام ئایەتی گەورەترە؟ گوتم: ئایەتەلکورسی (الله لا إله الا هو الحي القيوم) گوتی: کەوام گوت:

---

[٧١] موسلیم (٧٨٠).

[٧٢] موسلیم (٨١٠).

**حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) سووكێ دەستی دا بەسینگماو فەرمووی: ئافەریم بۆ خۆت، بەخودا پێكات، كەواتە عیلمت پیرۆزبێو زانستت خۆش بێ ئەی باوكی مونذیر! (م/ تاج).**

١٢/١٠٢٠-٧١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (وَكَّلَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحِفْظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ فَأَتَانِي آتٍ فَجَعَلَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ وَقُلْتُ وَاللَّهِ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ وَلِي حَاجَةٌ شَدِيدَةٌ قَالَ فَخَلَّيْتُ عَنْهُ فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ النَّبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ شَكَا حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالًا فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَعُودُ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّهُ سَيَعُودُ فَرَصَدْتُهُ فَجَاءَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ دَعْنِي فَإِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ لَا أَعُودُ فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ شَكَا حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالًا فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ فَرَصَدْتُهُ الثَّالِثَةَ فَجَاءَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ وَهَذَا آخِرُ ثَلَاثِ مَرَّاتٍ أَنَّكَ تَزْعُمُ لَا تَعُودُ ثُمَّ تَعُودُ قَالَ دَعْنِي أُعَلِّمْكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهَا قُلْتُ مَا هُوَ قَالَ إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ حَتَّى تَخْتِمَ الْآيَةَ فَإِنَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنْ اللَّهِ حَافِظٌ وَلَا يَقْرَبَنَّكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ زَعَمَ أَنَّهُ يُعَلِّمُنِي كَلِمَاتٍ يَنْفَعُنِي اللَّهُ بِهَا فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ مَا هِيَ قُلْتُ قَالَ لِي إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ مِنْ أَوَّلِهَا حَتَّى تَخْتِمَ الْآيَةَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ وَقَالَ لِي لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنْ اللَّهِ حَافِظٌ وَلَا يَقْرَبَكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ وَكَانُوا أَحْرَصَ شَيْءٍ عَلَى الْخَيْرِ فَقَالَ النَّبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ تَعْلَمُ مَنْ تُخَاطِبُ مُنْذُ ثَلَاثِ لَيَالٍ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ لَا قَالَ ذَاكَ شَيْطَانٌ). **رواه البخاري.**[٧٣]

---

[٧٣] بوخاری (٥٠١٠).



ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاگاداریو سەروکاریی زەکاتی سەر فترەی رەمەزانی پێ سپاردم، جا زەلامێ هات دەستی کرد بەخۆراك بردن لەکۆمەڵەی سەرفترەکە، بەگوێل دەیمالی یە ناو کۆشی، منیش گرتمو گوتم: بەخودا دەتبەم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تا تۆڵەی ئەو تاوانەیەت لێ بستێنێ. بەڵام کابرا پاڕایەوەو گوتی: ئەمە هی ئاتاجو نەبووانە، منیش نەبوو ئاتاجمو گەلێ نەدارمو سەرەڕای ئەوەیش خێزانێکی زۆری ڕەشو رووتم بەسەرەوەیە. لەبەر ئەوە منیش وازم لێی هێنا، بۆ بەیانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ئەبوهورەیرە! ئەرێ دوێ شەو چیت لەدیلەکەت کرد؟ گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! سکاڵای لەدەست نەبوونیو بەسەراکەوتنی خێزانی زۆر کرد، منیش بەزەییم پیادا هاتەوەو بەرەڵایم کرد، فەرمووی، ئەدی ئەوە درۆی لەگەڵ کردووی، دیسان دێتەوە، ئیتر لەبەر فەرمایشتەکەی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) زانیم کەدێتەوە، جا خۆم لێ ی داگرت تا هاتەوەو دەستی کردەوە بە لامشت لێدان لەخۆراکەکە، منیش گرتمەوەو گوتمەوە: بەخودا دەتبەم بۆ دادگا، بۆلای پێغەمبەری خودا، ئەو خۆی دەزانێ مافت چییە، گوتی: ئەمجارەیش وازم لێ بێنەوەمەم بە، ئەمە خۆشی هی نەداراو ئاتاجانەو منیش نەدارو ئاتاجمو کۆشێ خێزانی رەشو رووتیشم بەسەردا کەوتووە، بەخودا ئیتر نایەمەوە، ئیتر منیش بەزەییم پیادا هاتەوەو وازم لێی هێنایەوە، بۆ سبەینێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەوە: ئەی ئەبوهورەیرە! دیلەکەتت چی لێ کردەوە؟ گوتم: قوربان! دیسانەوە سکاڵای لەدەست نەبوونی کردو دەیگوت خێزانی زۆری بەسەرەوەیە، ئیتر منیش رەحمم پێی جوڵاو بەرەڵایم کردەوە، فەرموویەوە:ئەوە درۆی لەگەڵ کردوویت، هەمدیس دێتەوە! جا لەشەوی سێیەما خۆم بۆ مەڵاس داو خۆم لێ داگرت، تا هاتەوەو هەمدیسان دەستی کردەوە بەلالەویچ دان لە رزقەکە، منیش پڕم پیادا کردو گرتمەوەو گوتم: ئەمجارەیان دەتبەم بۆ دادگا بۆلای پێغەمبەری خودا، ئەمە سێ جارە تۆ ئەم درۆیە دەکەی، گوایە ئیتر نایەیتەوە، کەچی هەمدیسان دێیتەوە، کەچی گوتی: ئەگر وازم لێ بێنی چەند وشەیەکی سووکەڵەو کەمت فێردەکەم، کەخودا بەهۆی ئەوانەوە سوودو قانزانجت پێ دەگەیەنێ، گوتم: کامانەن؟ گوتی: کاتێ دەچیتە سەر نوێنی خەوتنەکەت ئایەتەلکورسی بخوێنە، کە ئایەتی (الله لا إله الا هو الحي القيوم)ە، هەتا کۆتایی دەوری بکەرەوەو ئایەتەکە بەتەواوی بخوێنە، ئیتر لەتەرەف خوداوە پاسەوانێکت بۆ دیاری دەکرێ ئێشکت



دەگرێ، وەتا بەیانەکی شەیتان توخنت ناکەوێ، جا بۆ سبەینی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) کەلە خوداوە ئاگاداریی حاڵەکە کرابوو، پێی فەرمووم: ئەرێ دوێ شەوێ دیلەکەتت چی لێکرد؟ عەرزیم کرد قوربان! ئەی رابەری موسوڵمانان! بەقسەی خۆی چەند ئایەتێکی پێ نیشان دام گوایە ئەو ئایەتانە ئەو سوودەم پێ دەگەیەنێ، جا منیش بەرەڵڵایم کرد، فەرمووی: کام ئایەتە؟ گوتم: کاتێ دەچیتە سەرنوێن، ئەیەتەلکورسی لەسەری ئایەتەکەوە بخوێنە تاکۆتاییەکەی کە ئەم ئایەتەیە (الله لا إله الا هو الحي القيوم)ە، دەیگوت: ئیتر لەلایەنی یەزدانەوە پاسەوانێ بەدیارتەوە دەبێ، وەتا بەیانی شەیتانو جنۆکە نزیکت ناکەون، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵێ ئەم قسەیەی راستە کەبەتۆی گوتووەو ئەمە یەکێکە لەسوودو بەهرەکانی ئەایەتەلکورسی. وەلێ ئەم دیلەی تۆ خۆی درۆزنە، ئەی ئەبوهورەیرە! ئەدی دەزانی کەئەمە سێ شەوە تۆ لەگەڵ کێ دا گوفتو گۆ دەکەی؟ گوتم: نەء، نازانم، فەرمووی: ئەوە شەیاتینی بوو! (بوخاری رەحمەت لەگۆڕی نازداری).

١٣/١٠٢١-٧٢/ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: (مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْف عُصِمَ مِنْ الدَّجَّالِ). رواهما المسلم.[٧٤]

ئەبو دەرداء (رەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ دە ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتی کەهف لەبەر بکا خودا لە ئاژاوەی ججاڵ دەیپارێزێ (م) لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیم دا: دەفەرموێ: دە ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی کەهف لەبەربکا... تاد.

١٤/١٠٢٢-٧٣/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: (بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعَ نَقِيضًا مِنْ فَوْقِهِ فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ هَذَا بَابٌ مِنْ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ فَقَالَ هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الْأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلَّا الْيَوْمَ فَسَلَّمَ وَقَالَ أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ فَاتِحَةُ الْكِتَابِ وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلَّا أُعْطِيتَهُ). رواه مسلم.[٧٥]

ئیبنوعەبباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ جوبرائیل (درودی لەسەربێ) سەری هەڵبڕیو فەرمووی: ئەوە چرکەی دەرگایەکی ئاسمان بوو، ئەوەتی هەیە

---

[٧٤] موسلیم (٨٠٩).

[٧٥] موسلیم (٨٠٦).

نەکراوەتەوە، ئەمڕۆ نەبێ، فریشتەیەکی لێ هاتەخوارەوە، جوبرائیل فەرمووی: ئەم فریشتەیش ئەمڕۆ نەبێ، قەت دانەبەزیوە بۆ سەر زەوی، جا فریشتەکە هاتە خزمەتی حەزرەتو سڵاوی کردو فەرمووی: ئەی موحەممەد! موژدەبێ لێت، خودا دوو چرای زۆر رووناکی داوە بەتۆ، کەلەپێش تۆدا شتی وانایابی بەهیچ پێغەمبەرێکی تر نەبەخشیوە، یەکێکیان سوورەتی فاتیحایە، کە کەدێباچەی قورئانە، ئەویتریان ئاخرو ئۆخرو کلکەی سوورەتی بەقەرەیە، هەر کەسێ پیتێ لەم دوو سوورەتە درەخشانە بخوێنێ پاداشی باش باشی لەسەر وەردەگرێ. (موسلیم، رەزای خودای لێ بێ).

## (١٨٤) کۆبوونەوەو کۆمەڵ بوون لەسەر دەورکردنەوەی قورئان سوننەتە
## باب استحباب الاجتماع على القراءة

١٠٢٣/١-٧٤/ فەرموودەی (من نفس عن مؤمن كربة...) [٧٦]

## (١٨٥) باسی گەورەیی و پیرۆزی دەستنوێژ - باب فضل الوضوء

قال تعالى: (يا أيها الذين آمنوا إذا قمتم الى الصلاة فاغسلوا وجوهكم وأيديكم الى المرافق وامسحوا برؤسكم وأرجلكم الى الكعبين، وان كنتم جنبا فاطهروا، وان كنتم مرضى أو على سفر أو جاء أحد منكم من الغائط أو لامستم النساء فلم تجدوا ماء فتيمموا صعيدا طيبا وامسحوا بوجوهكم و أيديكم منه، ما يريد الله ليجعل عليكم من حرج ، ولكن يريد ليطهركم وليتم نعمته عليكم لعلكم تشكرون) (٦/٥)

واتە: خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ئەی کەسانێ کەباوەڕتان هێناوە بە ئایینی ئیسلام! کاتێ ویستتان بچن بەلای نوێژەوە روخسارو دەمو چاوتان بشۆرن، ئینجا دەستەکانتان بشۆرن هەتا ئانیشك، ئینجا دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتانا، لەپاشا هەردوو قاچتان بشۆرن هەتا دەگاتە هەردوو قولاپەکانتان، ئەگەر لەشیشتان پیس بوو ئەوە خۆتان بشۆرنو غوسڵی خۆتان دەکەن، خۆ ئەگەر وارێکەوت نەخۆش بوونو نەتان دەتوانی ئاو بەکار بهێنن، یاخود لەسەفەردا بوونو ئاوتان دەست نەدەکەوت، چ لەم سووڕەتانەدا لەشتان پیس بێ، یا بێ

---

[٧٦] بڕوانە (٢٤٥/٢ز- ٢٩ ب - ١ ل - ٢١٦) بوخاری (٢٦٩٩).

دەستنوێژ بن، وەیاخو یەکێ لەئێوە لەسەر ئاو هاتەوەو بێ دەستنوێژ بوو، یاخود دەستتان دا لەپێستی ژنانو بێ دەستنوێژ بوون، وە یاخود دروست بوون لەگەڵ ژندا، وە ئاوتان دەست نەکەوت بەکاری بێنن بۆ لابردنی بێ دەستنوێژی یا لەشپیسی، ئەوە لەهەموو ئەم صوورەتانەدا قەستی هەلگرتنی گڵێکی پاك بکەنو لەتۆزی ئەو گڵە پاکە دەست بهێنن بەدەمو چاوتاناو بەدەستتانا، خودا بەدانانی ئەم یاساو دەستوورانە بۆ ئێوە قەستی ئەوە نییە کە بارتان گران بکاو تووشی تەنگوچەڵەمەتان بکا، بەڵام خواستی ئەوەیە کەپاكو خاوێنتان بکاتەوەو بەهرەی خۆیتان بۆ تەواو بفەرموێ، دەی ئێوەیش بەئەمەك بنو سوپاسی بەهرەو نازی خودای خۆتان بکەن.

١٠٢٤/١-٧٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: ( سَمِعْتُ النَبِيّصَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ يَقُولُ إنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ فَمَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ). متفق عليه.[٧٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: لەڕۆژی قیامەتا ئۆمەتی من پێیان دەڵێن: قەشی چوارپەل سپی، بەهۆی نەسەرو شوێنەواری دەستنوێژەوە، چونکە جێگەی دەستنوێژ لەڕوخسارو ئەندامەکاندا، بەنوور دەدرەوشێتەوە، دەی لەبەر ئەم، بەهرەیە تا دەتوانن گەشیو پەل سپێتی خۆتان زۆرتر بکەن (ش).

١٠٢٥/٢-٧٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قال: ( سَمِعْتُ خَلِيلِي (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَقُولُ: (تَبْلُغُ الْحِلْيَةُ مِنْ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الْوَضُوءُ). رواه مسلم.[٧٨]

دیسان فەرمووی: لە پێغەمبەری خۆشەویستی خۆمم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): هەتا کوێ ئەندامی موسوڵمان ئاوی دەستنوێژ بیگرێتەوە، لەقیامەتا هەتا ئەوێ خشڵی تێ دەکا (م).

١٠٢٦/٣-٧٧/ عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفّانَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ). رواه مسلم.[٧٩]

---

[٧٧] بوخاری (١٣٦) و موسلیم (٢٤٦).

[٧٨] موسلیم (٢٥٠).

[٧٩] موسلیم (٢٤٥).

عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار فەرمووی: هەرکەسێ دەسنوێژێ بە جوانی بشۆرێ گوناهەکانی لەهەموو لەشی دەردەچن، هەتا لەژێر نینۆکەکانیشیەوە دێنە دەرەوە (م).

٧٨-١٠٢٧/٤/ عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: (رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مِثْلَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ قَالَ مَنْ تَوَضَّأَ هَكَذَا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَكَانَتْ صَلَاتُهُ وَمَشْيُهُ إِلَى الْمَسْجِدِ نَافِلَةً). رواه مسلم.[٨٠]

جارێ ئیمامی عوثمان ﷺ دەستنوێژێکی جوانی تێرو تەسەلی گرتو فەرمووی: بەچاوی خۆم چاوم لێ بوو حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەسنوێژێکی ڕێكو پێکی جوانی گرت، دەق وەك ئەم دەستنوێژەی من، ئەوسا فەرمووی: هەرکەسێ دەسنوێژێکی ئاوا جوان بشۆرێ، خودای گەورە لەهەرچی گوناهی لەوەبەری هەیە خۆش دەبێ، ئیتر ئەو نوێژەی بەو دەستنوێژە دەیکاو چوونەکەی بۆ مزگەوت دادەنرێن بە خێری زیادە، چونکە گوناهی پێوەنەماوە هەتا ببێ بەکەفارەتی (م).

٧٩-١٠٢٨/٥/ حەدیثی : (اذا توضأ العبد المسلم أو المؤمن). بڕوانە: (١٢٩).[٨١]

٨٠-١٠٢٩/٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَتَى الْمَقْبُرَةَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ وَدِدْتُ أَنَّا قَدْ رَأَيْنَا إِخْوَانَنَا قَالُوا أَوَلَسْنَا إِخْوَانَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أَنْتُمْ أَصْحَابِي وَإِخْوَانُنَا الَّذِينَ لَمْ يَأْتُوا بَعْدُ فَقَالُوا كَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ لَمْ يَأْتِ بَعْدُ مِنْ أُمَّتِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلًا لَهُ خَيْلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ بَيْنَ ظَهْرَيْ خَيْلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ أَلَا يَعْرِفُ خَيْلَهُ قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ فَإِنَّهُمْ يَأْتُونَ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ الْوُضُوءِ وَأَنَا فَرَطُهُمْ عَلَى الْحَوْضِ ). رواه مسلم.[٨٢]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چوو بۆسەر گۆڕستانی بەقیع، فەرمووی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ: سلاوتان لێ بێ، مەبەستم لەو موسولمانانەیە کەئەم گۆڕستانە بووە بەماڵی دوارۆژیان، دروودو سلاوتان لێ بێ ئەی دانیشتوانی شاری خامۆشان! ئێمەیش ـ خوا

---

[٨٠] موسلیم (٢٢٩).

[٨١] بڕوانە (١٢٩/١٣ ز ـ ١٣ ب ـ ١ ل ـ ١٢٨)، موسلیم (٢٤٤).

[٨٢] موسلیم (٢٤٩).



حەزكا - دەگەینەوە پێتان، ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خۆزگەم براكانی خۆشمان دەبینی، یارانیش فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بۆچی براكانت زیاد لەئێمە كێی ترن؟ فەرمووی: ئێوە براو هاوڕێو یارمن، بەلاّم براكانمان ئەو موسوڵمانانەن كەهێشتا نەهاتوونەتە جیهانەوەو جارێ لەدایك نەبوون، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە چۆن ئەوانە لەئۆمەتت دەناسیتەوە كەهێشتا لەدایك نەبوونو لەجیهانا نایان بینی؟ خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پێم بڵێن ئەگەر پیاوێ رەوگەماینێكی ماڕۆی چوارپەل سپی هەبێ، لەناو ڕەوگەماینێكی رەشی پەتی دا بێ، ئایا رەوگەكەی خۆی ناناسێتەوە؟ گوتیان: بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆشەویست فەرمووی: دەسا ئۆمەتی منیش لەقیامەتا كەدێن بۆلام خۆم لەسەر حەوزی كەوسەر چاوەنواڕیان دەكەم هەموویان قەشو ماڕۆو چوارپەل سپینو ئەو شوێنانەی ئەندامیان كەئاوی دەستنوێژ دەیانگرێتەوە سپیو گەشو جوانن! (م).

٨١-١٠٣٠/٧/ حەدیثی (ألا أدلكم على ما يحموا الله به الخطايا).

٨٢-١٠٣١/٨/ فەرموودەی (الطهور شطر الايمان).

٨٣-١٠٣٢/٩/ وعَنْ عمَر ﷺ قالَ: قالَ: رسول الله ﷺ (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ أَوْ فَيُسْبِغُ الْوَضُوءَ ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ). رواه مسلم. وزاد الترمذی: (اللهم اجعلنی من التوابين واجعلنی من المتطهرين).[٨٣]

عومەری كوڕی خەطاب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەركامێ لەئێوە دەسنوێژێ بەجوانی بگرێ، كاتێ لەدەسنوێژەكە بۆوە بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ) شایەتی دەدەم كەلەخودا بەولاوە خودای تر نییە، خودایەكی تاقی تەنیایەو كەسی لەڕەنگ نی یە، وەشایەتی دەدەم كە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە فەرمووی: هەركامێ لەئێوە ئەمە بكا ئیتر هەر هەشت دەرگاكانی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە، بەئازەووی خۆی لەكامیانەوە حەز بكا دەچێتە ژوورەوە. (م) تیرمیذی ئەمەشی لێ پتر كردووە:

---

[٨٣] موسلیم (٢٣٤) و تیرمیذی (٥٥).

(اللهم اجعلنى من التوابين واجعلنى من المتطهرين) خودایه! بمكه بەتەوبەكارو بەیەكێ لەوانە كەخۆیان پاكو خاوێن ڕادەگرن.

بڕوانە (٤٣٨/٢٨ ز - ٥١ ب - ٢ ل - ٢١) فەرموودەكەی عەمری كوڕی عەبەسە كەلەباسی (الرجاء)و (بر الوالدین) دا رابوورد، دواهەمین فەرموودە لە هەر دووباسەكە.

## (١٨٦) باسی گەورەیی و خێری بانگ دان - باب فضل الأذان

١٠٣٣/١-٨٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا). متفق عليه.[٨٤]

لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر ئەو خەڵكە دەیانزانی خێری بانگدانو ڕیزی یەكەمی نوێژی جەماعەت چەنێ گەورەیە، وەچاری تریان نەبوایە جگە لەوە كەتیرو پشكیان لەسەر بكەن، ئەوا تیرو پشكیان لێ دەكردن، جا پشكی كێ دەربچوایە ئەوە بانگی دەدا، یا ئەوە لەڕیزی یەكەما دەوەستا، ئەگەر دەشیانزانی كەخێری نوێژی جەماعەتی خەوتنانو بەیانیان چەنێ گەورەیە ئەگەر بەگاگۆڵكەش بوایە دەهاتن بۆیان (ش).

١٠٣٤/٢-٨٥/عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قالَ: (سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ). رواه مسلم.[٨٥]

موعاوییە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەزاری حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆیم بیست دەیفەرموو: لەڕۆژی قیامەتا، بانگدەران لەهەموو كەس گەردنیان بەرزترە! (م).

١٠٣٥/٣-٨٦/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ قَالَ لَهُ: (إِنِّي أَرَاكَ تُحِبُّ الْغَنَمَ وَالْبَادِيَةَ فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلَاةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ فَإِنَّهُ لَا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلَا إِنْسٌ وَلَا شَيْءٌ إِلَّا

---

[٨٤] بوخاری (٦١٥) و موسلیم (٤٣٧).

[٨٥] موسلیم (٣٨٢).

شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ: أَبُو سَعِيدٍ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه البخاري.[٨٦]

**عەبدوڕەحمانی کوڕی صەعصەعە گوتی: ئەبو سەعیدی خودری** (ڕەزای خوای لێ بێ) **پێ ی گوتم: دەتبینم تۆ حەزت لەماڵاتو مەڕداریو دەشتە، جا هەرکاتێ لەناو مەڕو ماڵاتەکەتا بوویتو بانگت دا، یا لەو دەشتە بوویتو بانگت دا، تەواو دەنگ لەبانگەکە هەڵبڕە، چونکە بۆ خۆم لەخۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو: هەرچی لەقەرەی دەنگی بانگدەردابێو بی بیستێو گوێی لێ بێ، خوا جنۆکە بێ، خوا مرۆڤ بێ، خوا شتێ تر بێ، لەڕۆژی قیامەتا ئەو شایەتیەی بۆ دەدا. (بوخاری، ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).**

٤/١٠٣٦-٨٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لَا يَسْمَعَ التَّأْذِينَ فَإِذَا قَضَى النِّدَاءَ أَقْبَلَ حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ حَتَّى إِذَا قَضَى التَّثْوِيبَ أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ يَقُولُ اذْكُرْ كَذَا اذْكُرْ كَذَا لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ لَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى). رواه البخاري.[٨٧]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کاتێ بانگ دەدرێ بۆ نوێژ، شەیتان هەڵدەتوڕێنێو جرت لێ دەدا، هەتا گوێی لەبانگەکە نەبێ، کەبانگەکە تەواو دەبێ دیسان دێتەوە تاقامەت دەکرێ بۆ نوێژ ئەوجا هەڵ دەتوڕێنێتەوە، کە قامەت تەواو دەبێ دیسان دێتەوەو دەچێتە بنکلێشەی پیاوەوەو پێی دەڵێ: بیر لەمە بکەرەوەو بیر لەوە بکەرەوە، وە ئەو شتانەی وەبیر دێنێتەوە کەلەوەوپێش لەبیری نەمابوون، هەتا سەرەنجام بەڕادەیەکی وا دڵی بێ ئاگا دەکا، کەنازانێ چەن ڕکات نوێژ دەکا (ش).**

٥/١٠٣٧-٨٨/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِذَا سَمِعْتُمْ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ لِي الْوَسِيلَةَ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لَا تَنْبَغِي إِلَّا

---

[٨٦] بوخاری (٦٠٩).

[٨٧] بوخاری (٦٠٨).

لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ فَمَنْ سَأَلَ لِي الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ). رواه موسليم.[88]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ فەرمووی: گوێم لەخۆشەویست بوو، دەیفەرموو (درودی خوای لەسەر بێ): کاتێ گوێتان لەبانگ دەبێ بانگدەرەکە چی دەڵێ ئێوەش ئەوە بڵێنەوە، لەپاشا صەلاوات لەدیاری من بدەن، چونکە ئەوەی یەك صەلاوات لەدیاری من بدا خودای گەورە لەباتی ئەوە دە رەحمەت دەڕێژێ بەسەریدا، لەپاش ئەوەیش داوای پایەی (الوسیلە) م لەخودا بۆ بکەن، کەیەکێکە لەپایە هەرە بەرزەکانی بەهەشت، دانراوە بۆ بەندەیەکی فرە باش لەبەندە هەرە باشەکانی خودا، وە بۆ ئەو نەبێ بۆ کەسی تر دەست نادا، وەمن ئومێد دەکەمو هیوام هەیە کەخۆم ئەو بەندەیە بم، جا ئەوەیش بزانن ئەو کەسەی داوای ئەم پایەی ئەلوەسیلەیە لەخودا بکا بۆمن ئیتر تکاو شەفاعەتی منیش بۆ ئەو سەردەگرێ! (م).

٨٩-١٠٣٨/٦/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا سَمِعْتُمْ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ). متفق عليه.[89]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ گوێتان لەبانگ دەبێ بانگبێژ چی دەفەرموێ ئێوەیش وشە بەوشە لەشوێن ئەوەوە گوتەکەی ئەو بڵێنەوە(ش).

٩٠-١٠٣٩/٧/ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ) رواه البخاری.[90]

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ : هەرکەسێ دوا بەدوای بیستنی بانگ بڵێ: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ) ئەی خودایە! ئەی خاوەندی ئەم

---

[88] موسليم (٣٨٤).

[89] بوخاری (٦١١) و موسلیم (٣٨٣).

[90] بوخاری (٦١٤).



بانگەوازە تەواوە، کەبرێتی یە لەم بانگ‌و قامەتە پیرۆزە، ئەی پەروەردگاری ئەم نوێژە پایەدارە دا بەستراوە! ببەخشە بە موحەممەد پایەی هەرەبەرزی ئەلوەسیلەو پلەی هەرە گەورەی ئەلفەضیلە، وەبیبەرە ئەو بارەگا پەسەندەی کەخۆت بەڵێنیت پێی داوەو رەوانەی ئەوێی بفەرموو، کەمەقامی شەفاعەتی گەورەیە. هەرکەسێ لەم کاتەدا ئەو نزایە بڵێ، لەرۆژی قیامەتا تکای من بۆ ئەو قبووڵ دەبێ (ب).

٨/١٠٤٠-٩١/ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ). رواه موسليم.[91]

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ لەوکاتەدا کەبانگ دەبیستێ بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا) شایەتی دەدەم کەهەر خودا خودایەو بەس، تاک‌و تەنیایەو هیچ هاوەڵ‌و هاوبەشی نییە، وە هەروەها شایەتی دەدەم کە موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) بەندەو پێغەمبەری ئەوە، یەزدانی پاکم بەخودا قبوڵەو موحەممەدم بە پێغەمبەر قبووڵەو ئیسلامم بەدین‌و ئایین قوبووڵە، هەرکەسێ لەوکاتەدا ئەمە بڵێ خودا لەگوناهی خۆش دەبێ(م).

٩/١٠٤١-٩٢/ عَنْ أَنَسْ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُول الله ﷺ: (الدعاء لايرد بين الأذان والإقامة). رواه أبوداوود والترمزي، وقال حديث حسن.[92]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نزاو دووعا لەناوەندی بانگ‌و قامەت دا رەت نابێتەوە! (د/ت: ح/ح).

## (١٨٧) باسی گەورەیی نوێژ: باب فضل الصلاة

قال الله تعالى: (إن الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر) (عەنکەبوت/٤٥)

---

[91] موسليم (٣٨٦).

[92] ئەبو داوود (٥٢١) و تيرميذی (٢١٢).

واته: بەڕاستی نوێژ بەری تاوان‌و خراپەو بێ شەرعی دەگرێ.

١٠٤٢/١-٩٣/عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْس مرات هل يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شيئ؟ قَالُوا لَا يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ قَالَ فَذَلِكَ مِثْلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا). متفق عليه.[٩٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەری نازدارو خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو: پێم بڵێن ئەگەر جۆگە ئاوێ لەبەردەرگای یەکێکتانا بێ، وە هەموو ڕۆژێ پێنج جار خۆی تیادا بشۆرێ ئایا هیچ چڵکی پێوە دەمێنێ؟ یاران فەرموویان نەء، هیچ چڵکی پێوە نامێنێ، خۆشەویست فەرمووی: دە ئەمە وێنەی ئەم پێنج نوێژە فەرزەیە، کەخودا گوناهیان پێ دەکوژێنێتەوە (ش).

١٠٤٣/٢-٩٤/ فەرموودەی (مثل صلوات خمس كمثل نهر جار غمر) بڕوانە: (٤٢٩).[٩٤]

١٠٤٤/٣- ٩٥/ فەرموودەی (أن رجلا أصاب من امرأة قبلة).[٩٥]

١٠٤٥/٤-٩٦/ فەرموودەی (الصلوات الخمس والجمعة الى الجمعة).[٩٦]

١٠٤٦/٥-٩٧/ عَنْ عُثْمَانَ بنْ عفان ﷺ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَا مِنْ امْرِئٍ مُسْلِمٍ تَحْضُرُهُ صَلَاةٌ مَكْتُوبَةٌ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهَا وَخُشُوعَهَا وَرُكُوعَهَا إِلَّا كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا قَبْلَهَا مِنْ الذُّنُوبِ مَا لَمْ يُؤْتِ كَبِيرَةً وَذَلِكَ الدَّهْرَ كُلَّهُ). رواه مسلم.[٩٧]

عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو: هەر موسوڵمانێ کاتێ کەنوێژی لێ دەبێ، بەجوانی دەسنوێژی بۆ بگرێ‌و بەسەرکزی‌و بە مل کەچی بەجوانی جێ بەجێ ی بکا ئەوا دەبێ بەکەففارەت‌و بڕێتی ئەو گوناهانەی کەلەوەپێش کردوونی، بەمەرجێ

---

[٩٣] بوخاری (٥٢٨) و موسلیم (٦٦٧).

[٩٤] بڕوانە (٤٢٩/١٨ ز۔ ٥١ ب ۔ ٢ ل ۔ ١٧) موسلیم (٦٦٨).

[٩٥] بڕوانە (٤٣٤/٢٣ز ۔ ٥١ ب ۔ ٢ ل ۔ ٢٠)

[٩٦] بڕوانە (١٣٠/١٤ ز ۔ ١٣ ب ۔ ١ ل ۔ ١٢٨)

[٩٧] موسلیم (٢٢٨).

کەگوناهی گەورە نەبن! ئەم مەرحەمەتەیش هەتا هەتایە هەر بەردەوام دەبیّ‌و هەر دەمێنێ (م).

## (١٨٨) باسی گەورەیی نوێژی بەیانی و عەصر

١٠٤٧/١-٩٨/ ← (ب ـ ١ ز ـ ١٣ ل ـ ف ـ ) حەدیثی: (من صلی البردین دخل الجنة).[٩٨]

١٠٤٨/٢-٩٩/عَنْ أَبِي زهير عُمَارَةَ بْنِ رُؤَيْبَةَ ﷺ قَالَ: (سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا يَعْنِي الْفَجْرَ وَالْعَصْرَ).رواه مسلم.[٩٩]

ئەبو زوهەیر: عومارەی کوڕی روەیبە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە خۆشەویستم بیست دەیفەرموو (درودی خوای لەسەر بێ): ئەو کەسەی نوێژی پێش خۆرکەوتن‌و نوێژی پێش خۆرئاوا بوون بکا ناڕواتە ناو ئاگری دۆزەخەوە مەبەستی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەم دوو نوێژە بەیانی‌و عەصرە (م).

١٠٤٩/٣-١٠٠/ فەرموودەی (من صلی الصبح).[١٠٠]

١٠٥٠/٤-١٠١/عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلَائِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلَائِكَةٌ بِالنَّهَارِ وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي فَيَقُولُونَ تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ). متفق عليه.[١٠١]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چەن فریشتەیێ بەشەوو چەن فریشتەیەکی تر بەرۆژ بەرودوا بەدیارتانەوەن‌و بەسەرە ئێشکتان دەگرن، وە هەردوولایان لە نوێژی بەیانی‌و نوێژی عەصردا یەکدەگرن‌و یەکتری دەگۆڕن، جاکاتێ ئەو تاقمە فریشتەیەی کەوا شەو لەدیارتان بوون سەردەکەونەوە بۆ خزمەتی خودای پەروەردگار، لێیان دەپرسێ ـ هەر چەند

[٩٨] بوخاری (٥٧٤) و موسلیم (٦٣٥) بڕوانە (١٦/١٣٢ز ـ ١٣ ب ـ ١ ل ـ ١٢٩).

[٩٩] موسلیم (٦٣٤).

[١٠٠] بڕوانە (١١/٢٣٢ز ـ ٢٧ ب ـ ١ ل ـ ٢١٠).

[١٠١] بوخاری (٥٥٥) و موسلیم (٦٣٣).

کەخۆی باشتر حاڵیان دەزانێ - دەفەرموێ: کەئێوە هاتنەوە ئەو بەندانەی من چییان دەکرد؟ دەڵێن: کەئێمە چووین بۆلایان ئەوان هەر نوێژیان دەکرد کە ئێمەش هاتینەوە لەلایانەوە، ئەوان هەر نوێژیان دەکرد(ش).

١٠٥١/٥-١٠٢/عَنْ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللّٰهِ ﷺ قالَ: (كُنَّا عِنْدَ النَبِيّصَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ نَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ فَقَالَ أَمَا إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا لَا تُضَامُّونَ أَوْ لَا تُضَاهُونَ فِي رُؤْيَتِهِ فَإِنْ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لَا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا). متفق علية، وفي رواية: فنظر الى قمر ليلة أربع عشر.[١٠٢]

جەریری کوڕی عەبدوڵلای جەبەلی فەرمووی: شەوێ لە خزمەتی حەزرەتدا بووین، شەوی چواردە بوو، تەماشایەکی مانگی کردو فەرمووی: چۆن ئێستاکە بەئاسانیو ئاسوودەیی هەمووتان ئەم مانگی چواردەیە دەبینن، لەقیامەتیشدا ئاوا خودای خۆتان دەبینن‌و لەدیتنی دا تووشی هیچ زەحمەتێ نابن، دەی بەئومێدی شاد بوون بەم بەهرە گەورەیە تا دەتوانن ئاگاداری نوێژی بەیانیو نوێژی عەصر بن‌و مەیان چوێنن (ش).

١٠٥٢/٦-١٠٤/ عن بُرَيْدَةَ ﷺ قالَ: إِنَّ النَبِيّ(صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ( مَنْ تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ حَبِطَ عَمَلُهُ).رواه البخاري.[١٠٣]

بورەیدە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ نوێژی عەصر نەکا کردەی ئەوو بردەی با (ب).

## (١٨٩) باسی خێروگەورەیی هاموشۆ کردنی مزگەوت - باب فضل المشي الى المسجد

١٠٥٣/١-١٠٤/ فەرموودەی (من غدا الى المسجد أو راح).[١٠٤]

١٠٥٤/٢-١٠٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللّٰهِ لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللّٰهِ كَانَتْ خَطْوَتَاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً وَالْأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً).رواه مسلم.[١٠٥]

---

[١٠٢] بوخاری (٥٧٣) و موسلیم (٦٣٣).

[١٠٣] بوخاری (٥٥٣).

[١٠٤] بوخاری (٦٦٢) و موسلیم (٦٦٩). بڕوانە (١٢٣/٧از - ١٣ ب - ١ ل - ١٢٥).

ئـەبو هـورەيـرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـسـت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: هەرکەسێ لەماڵەوە خۆی پاك بکاتەوەو بەپاکی بچێ بۆ خانەیێ لەخانەکانی خـودا بـۆ ئـەوەی فـەرزێ لەفـەرزەکانی خـودا بـەجێ بێنـێ، ئـەوە هـەر هـەنگاوێ دەنـێ بەقاچـێکی گونـاهێکی لـێ هـەڵ دەوەرێو بـەو قاچـەکەی تـری پایـەیێ بڵنـد دەبێتەوە!(م).

٣/١٠٥٥-١٠٦/ فەرموودەی (كارن رجلا لا أعلم رجلا أبعد من المسجد منه).[١٠٦]

٤/١٠٥٦-١٠٧/ فەرموودەی (أراد بنو سلمة أن ينتقلوا قرب المسجد).[١٠٧TM]

٥/١٠٥٧-١٠٨/ عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِنَّ أَعْظَمَ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلَاةِ أَبْعَدُهُمْ إِلَيْهَا مَمْشًى فَأَبْعَدُهُمْ وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الْإِمَامِ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ الَّذِي يُصَلِّيهَا ثُمَّ يَنَامُ). متفق عليه.[١٠٨]

ئـەبو مووسـا (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـسـت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: مـەردوم کـاتێ دەڕۆن بـۆ نوێـژ هـەتا ڕێگەکـەیان دوورتـر بـێ خێـرو پاداشـیان گەورەترە، ئەو کەسەشی کە چاوەڕوانی نوێژ دەکا هەتا بە کۆمەڵێ (بەجەماعـەت) بیکا لەگەڵ پێشنوێژدا ئەوە پاداشی گەلێ گەورەترە لەوکەسەی کە نوێژەکەی دەکاو دەخەوێ (ش).

٦/١٠٥٨-١٠٩/ عَنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بَشِّرْ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). رواه أبو داود والترمذي.[١٠٩]

بورەیدە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوانەی کـەوا لـەتاریکایی شـەودا بەگـەرمی هاموشـۆی مزگـەوت دەکـەن لـەزمانی منـەوە مـژدەی ڕۆشنایی تەواویان بدەنێ، بۆ ڕۆژی قیامەتیان (د/ت).

٧/١٠٥٩-١١٠/ فەرموودەی (ألا أدلكم على ما يمحوا...)[١١٠]

---

[١٠٥] موسليم (٦٦٦).

[١٠٦] بڕوانە (١٣٧/٢١ز- ١٣ ب - ١ ل - ١٣١) موسليم (٦٦٣).

[١٠٧] موسليم (٦٦٥) و بوخاری (٦٥٥) بڕوانە (١٣٦/٢٠ ز - ١٣ ب - ١ ل - ١٠٨).

[١٠٨] بوخاری (٦٥١) و موسليم (٦٦٢).

[١٠٩] ئەبو داوود (٥٦١) تيرميذی (٢٢٣).

٨/١٠٦٠-١١١/عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا رَأَيْتُمْ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسْجِدَ فَاشْهَدُوا لَهُ بِالْإِيمَانِ قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللّٰهِ مَنْ آمَنَ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ) الاية).رواه الترمذي وقال: حديث حسن.[111]

ئـەبو سـەعيد (ڕەزای خوای لێ بێ) لـە پێغەمبـەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: كـاتێ دەبينن كەوا پياوێ خووی گرتووە بەهاموشۆی مزگەوتـەوە، ئـيتر شـايەتی ئيمـانو باوەڕی تەواوی بۆ بدەن كە ئەو پيـاوە خـاوەن ئيمانـە، چونكە خـودای گـەورە لـەم بارەيەوە دەفەرموێ: (إنما يعمر المساجد لله من آمن بالـه واليـوم الآخـر واقـام الصـلاة وآتى الزكاة ولم يخش الا الله فعسى أولئك أن يكونوا من المهتدين) (١٨/٩).

واتە: بەڕاستی كەسێ مزگەوتی مـاڵی خـودا ئـاوەدان دەكاتـەوەو دروسـتی دەكـا، كەباوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوا ڕۆژ هەبێ، وە هـەروەها بـەڕێكو پێكـی نوێـژ بكاو بـەجوانی زەكـات بـدا، وە لەبەرئـەوەی كـەباوەڕی وەهايـە خێـرو شـەڕ هـەر لـەلای خودايـە، لـەخودا نـەبێ لەكەسـێ تـر نەترسـێ، جـا ئـەم كەسـانە كەئەمـە ڕەوشو حاڵيانە هيوا وايە لەوخودا پێداوانە بـن كـە شـارەزای ڕێگـەی ڕەزای خـوداو ڕێگـەی بەختەوەريی هەردوو دنيا بوون (ت:ح/ح).

## (١٩٠) باسی گەورەيی چاوەنواڕيی كردنی نوێژ - باب فضل انتظار الصلاة

١/١٠٦١-١١٢/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَا يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاةٍ مَا كَانَتْ الصَّلَاةُ تَحْبِسُهُ لَا يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْقَلِبَ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا الصَّلَاةُ). متفق عليه.[112]

ئـەبو هـورەيرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: چەندەی چاوەنواڕی نوێـژ بكـەنو سـاغ لەبـەر نوێـژ نەچـنەوە بـۆلای كـارو ئـيشو كەسوكارتان ئەوەيشتان هەر بەنوێژ بۆ دادەنرێ (ش).

---

[110] بروانە: (١٣١/١٥از- ١٣ ب - ١ ل - ١٢٨).

[111] تيرميذی (٣٠٩٢).

[112] بوخاری (٦٤٧) و موسليم (٢٧٥).

٢/١٠٦٢-١١٣/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ مَا لَمْ يُحْدِثْ تَقُولُ اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لَهُ اللّٰهُمَّ ارْحَمْهُ) رواه البخاري.[١١٣]

**دیسان فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەتا بەدەستنوێژەوە لەو جێگەدا بمێننەوە کەنوێژی تیا دەکەن فریشتە بۆتان دەپاڕێنەوەو دەڵێن: خودایە! هەڵەی ببۆشەو لەگوناهی خۆش بە، خودایە! میهرەبانی لەگەڵ دا بنوێنەو رەحمی پێ بکە (ب).**

٣/١٠٦٣-١١٤/ عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قالَ: أنَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَخَّرَ لَيْلَةً صَلَاةَ الْعِشَاءِ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ بَعْدَ مَا صَلَّى فَقَالَ صَلَّى النَّاسُ وَرَقَدُوا وَلَمْ تَزَالُوا فِي صَلَاةٍ مُنْذُ انْتَظَرْتُمُوهَا).رواه البخاري.[١١٤]

**ئەنەس** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: شەوێکیان، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هەتا نیوە شەو نوێژی خەوتنانی دواخست، ئینجا کەنوێژی کرد رووی تێ کردین‌و فەرمووی: مەردوم نوێژی خۆیان کردو خەوتن، وەلێ ئێوە لەو حەلەوە کەچاوەڕوانی ئەم نوێژە دەکەن هەر بەنوێژ بۆتان حلێب بوو تا ئێستا (ب).**

### (١٩١) گەورەیی نوێژی بەکۆمەڵ - باب فضل صلاة الجماعة

١/١٠٦٤-١١٥/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً) متفق عليه.[١١٥]

**ئیبنوعومەر** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: نوێژی جەماعەت بیست‌و حەوت پلە گەورەترە لەنوێژی تەنیا (ش).**

٢/١٠٦٥-١١٦/ **فەرموودەی (صلاة الرجل في الجماعة تزيد على صلاته في سوقه وبيته بضعا وعشرين درجة).**[١١٦]

---

[١١٣] بوخاری (٦٤٧) و (٦٥٩).

[١١٤] بوخاری (٥٧٢) و (٦٦١).

[١١٥] بوخاری (٦٤٥) و موسلیم (٦٥٠).

[١١٦] بڕوانە (١٠/١٠از - ١ ب - ١ ل - ١٥).

٣/١٠٦٦-١١٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ أَعْمَى فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى الْمَسْجِدِ فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُرَخِّصَ لَهُ فَيُصَلِّيَ فِي بَيْتِهِ فَرَخَّصَ لَهُ فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ قَالَ نَعَمْ قَالَ: فَأَجِبْ).رواه مسلم.[١١٧]

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێكی بێ چاو هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چاوساقم نیە دەستم رابكێشێ بۆ مزگەوت، ئایا ڕێگەم دەدەی كەلەماڵەوەم نوێژەكانم بكەم؟ خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەپێشەوە ڕێگەی دا، كەلەماڵەوە نوێژەكەی بكا، بەلام لەپاشا كە پیاوەكە بەرەوماڵ گەڕایەوە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بانگی كردەوەو پێی فەرموو: كاتێ بانگ دەدرێ بۆ نوێژ گوێت لێ یەتی یانا؟**

**گوتی: بەڵێ گوێم لێیەتی، فەرمووی** (دروودی خوای لەسەر بێ): **دەوەرە بەدەنگی بانگەكەوە! (م).**

٤/١٠٦٧-١١٨/ وَعَنْ عَبْدالله، وقيلَ: عمرو بنْ قَيس المعروف بابن أم مكتوم المؤذن ﷺ أنهُ قَالَ: (يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْمَدِينَةَ كَثِيرَةُ الْهَوَامِّ وَالسِّبَاعِ فَقَالَ النَّبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَسْمَعُ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ فَحَيَّ هلا)رواه أبو داوُد وَكذا باسناد حسن ومعنى حيملا = تعال.[١١٨]

**عەبدوڵلا، كەناوی ئیبنوئەممو مەكتوومە، كە بانگدەری پێغەمبەر بوو، كەبەقسەی هەندێ كەس ناوی عەمری كوڕی قەیس بووە، عەبدوڵلا عەرزی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەكاو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! مەدینە جانەوەرو دڕندەی زۆرەو منیش بێ چاوم ئایا دەبێ كەنەیەم بۆ جەماعەتو لەماڵەوەم نوێژ بكەم؟ حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: چونكە گوێت لەبانگەو (حی علی الصلاة) و (حی علی الفلاح) بە گوێ ی خۆت دەبیستی دەبێ بێ ی بۆ جەماعەت (د - س/حەزرەت).**

---

[١١٧] موسلیم (٦٥٣).

[١١٨] ئەبو داوود (٥٥٣).

٥/١٠٦٨-١١٩/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ يُحْتَطَبُ ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيَؤُمَّ النَّاسَ ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ . متفق عليه.[119]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەو کەسە کە ڕەوانی منی وا لەدەستا، کەیەزدانی پاکە، نیازم هەبوو کە بڵێم کۆمەڵێ چیلکەو دار کۆبکرێتەوە، ئەوجا فەرمان بدەم کە قامەت بۆ نوێژ بکرێ‌و بەپیاوێ بڵێم کە پێشنوێژی یەکە بکا، وە خۆشم چەند پیاوێ بەباوشە دارەوە لەگەڵ خۆم ببەم‌و بڕۆم بۆ گیانی ئەو پیاوانە کەنایەن بۆ نوێژی جەماعەت، وە ماڵەکانیان بەئاگر بسوتێنم بەسەریاندا (ش/تاج).

٦/١٠٦٩-١٢٠/ عَنْ ابن مسعود (رضي الله عنه) قَالَ: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَلْقَى اللَّهَ غَدًا مُسْلِمًا فَلْيُحَافِظْ عَلَى هَؤُلَاءِ الصَّلَوَاتِ حَيْثُ يُنَادَى بِهِنَّ فَإِنَّ اللَّهَ شَرَعَ لِنَبِيِّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُنَنَ الْهُدَى وَإِنَّهُنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى وَلَوْ أَنَّكُمْ صَلَّيْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ كَمَا يُصَلِّي هَذَا الْمُتَخَلِّفُ فِي بَيْتِهِ لَتَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ وَلَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ لَضَلَلْتُمْ وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَتَطَهَّرُ فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ ثُمَّ يَعْمِدُ إِلَى مَسْجِدٍ مِنْ هَذِهِ الْمَسَاجِدِ إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِكُلِّ خَطْوَةٍ يَخْطُوهَا حَسَنَةً وَيَرْفَعُهُ بِهَا دَرَجَةً وَيَحُطُّ عَنْهُ بِهَا سَيِّئَةً وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنْهَا إِلَّا مُنَافِقٌ مَعْلُومُ النِّفَاقِ وَلَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يُؤْتَى بِهِ يُهَادَى بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ حَتَّى يُقَامَ فِي الصَّفِّ).رواه مسلم. وفي رواية له: قال: إن رسول الله ﷺ علمنا سنن الهدى: الصلاة في المسجد الذي يؤذن فيه.[120]

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ حەز دەکا کەسبەینێ بەموسوڵمانی بچێتەوە دیوانی خودای گەورە، بائەم نوێژە فەرزانە بەرێك‌و پێکی لەو جێگایانە بکا کەبانگیان تیا دەدرێ بۆیان، وەك مزگەوت‌و نوێژگاو ئەمانە، چونکە ئەو خودا گەورەیە ڕێگەی ڕاستی ڕەوشتە ڕاستەکانی بۆ پێغەمبەری ئێوە داناوە، کەپێیان دەگوترێ: (سونەنولهودا: شەقامەڕێی شارەزایی) وە ئەم نوێژانەیش لەم شەقامە ڕێگەی ڕەوشتە ڕاستانەن، دەی ئەگەر بێت‌و ئێوەیش بیکەن بەپیشەو

[119] بوخاری (٦٤٤) و موسلیم (٦٥١).

[120] موسلیم (٢٥٦) و (٢٥٧).

لەماڵەوە نوێـژ بکـەن و چـاو لـەم کابرایـە بکـەن کەتـەرکی جەماعـەتی کـردووەو لەماڵەوە نوێژ دەکا، ئەوە دەگەیەنێ کەتـەرکی سوونەت و رەوشـتی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەکـەن، تـەرك کردنـی رێگـەی رەهبـەریش دەق گـومڕایی و سەرلێشێوانە. ئەوەی کەمن لەیارانی خۆمانم دیوە، کـەسمان لەنوێـژی جەماعـەت دوا نـەدەکـەوت، مەگەر کەسێ بەئاشکرا دوورووو موونافیق بووایە، پیاوی وایان بەلارە لارە دەهێنا بۆ نوێژی جەماعەت بەدوو پیاو دەچوونە بنباڵی، تانـاو ڕیزەکـە (م) لەگێڕانەوەیـەکی تـری موسـلیمدا: فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) شـەقامە ڕێکـانی شـارەزایی ئاییـنی هەموو فێرکردووین، یەکێ لەوانە کردنی بەنوێژە بەکۆمـەڵی لەمزگـەوتێکا کەبانگی تیابدرێ.

٧/١٠٧٠-١٢١/ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَا مِنْ ثَلَاثَةٍ فِي قَرْيَةٍ وَلَا بَدْوٍ لَا تُقَامُ فِيهِمْ الصَّلَاةُ إِلَّا قَدْ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمْ الشَّيْطَانُ فَعَلَيْكَ بِالْجَمَاعَةِ فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ من الغنم الْقَاصِيَةَ قَالَ زَائِدَةُ). رواه أبوداود بأسناد حسن.[١٢١]

ئـەبو دەرداء (رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لـە حـەزرەتم ژنـەوت (درودی خـوای لەسـەر بـێ) دەیفەرموو: هەرکاتێ سێ موسوڵمان، یـا پـتر لەسێ موسوڵمان، لەشـوێنێکا یـەکیان گرت، خوا گونـد نشـین بـن خـوا کۆچـەری، وەنوێـژی جەماعـەت نەکـەن، ئـەوە بـێ گومان کەشەیتان زاڵ بووە بەسەریانداو فریـوی داون، دەی ئـەی پیـاوی موسـوڵمان! حازری جەماعەت بەو هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵ بەو گەل جێ مەهێڵە، چونکە گورگ ئەو مەڕە تەرایە دەخوات کە لەگەلە بڕەبێ (د ـ س/ح).

### (١٩٢) باسی هاندان لەسەر ئامادەبوونی جەماعەتی بەیانی و عیشا
### باب الحث على حضور الجماعة في الصبح والعشاء

١/١٠٧١-١٢٢/ عَنْ عثمان بن عفان ﷺ قال: (سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ). رواه مسلم.وفي رواية الترمذى عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ:

---

[١٢١] ئەبو داوود (٥٤٧).

قَالَ: رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (مَنْ صَلّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ كَقِيَامِ نِصْفِ لَيْلَةٍ وَمَنْ صَلّى الْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ كَقِيَامِ لَيْلَةٍ). قال الترمذى حديث حسن صحيح.[١٢٢]

عوثمانى كوڕى عەففان (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: لەخۆشەويستم بيست (درودى خواى لەسەر بێ) دەيفەرموو: هەركەسێ نوێژى خەوتنان بەكۆمەڵ بكا، ئەوە وەكوو تانيوە شەو نوێژ بكا وايە، ئەگەر ئەوكەسە نوێژى بەيانيشى بەكۆمەڵ بكا ئەوە وەكوو ئەوە وايە كەئەو شەوە هەتا بەيانى هەر شەونوێژ بكا (م).

٢/١٠٧٢-١٢٣/ فەرموودەى (ولو يعلمون ما في العتمة . . .).[١٢٣]

٣/١٠٧٣-١٢٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: النَبِـيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (لَيْسَ صَلَاةٌ أَثْقَلَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ مِنْ الْفَجْرِ وَالْعِشَاءِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا). متفق عليه.[١٢٤]

ديسان ئەبوهورەيرە (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (درودى خواى لەسەر بێ) فەرمووى: هيچ نوێژێ وەكوو نوێژى بەيانىو خەوتنان لەسەر شانى ناپاك قورسو گران نييە، وەڵێ ئەگەر دەيانزانێ كەچى خێروبێرێكى گەورەيان تياداية، ئەگەر بەگاگۆڵكەيش بوايە خۆيان دەگەياندنێ (ش).

## (١٩٣) باسى فەرمان كردن بەئاگادارى كردنى نوێژە فەرزەكان و هەڕەشەكردنى سەخت لەتەرك كردنيان

## باب الأمر بالمحافظة على الصلوات المكتوبة وانهي الا كيد والوعيد الشديد في تركهن

قال الله تعالى: (حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى) (البقرة ـ ٢٣٨/٢)

واتە: خوداى گەورە دەفەرموێ: ئاگادارى هەموو نوێژە فەرزەكانتان بكەن، بەتايبەتى نوێژى مەشهوور بە (الصلاة الوسطى) كەنوێژى عەصرە. وقال تعالى: (فان تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة ، فخلوا سبيلهم) (التوبة ـ ٥/٧) واتە: خوداى

---

[١٢٢] موسليم (٦٥٦) وتيرميذى (٢٢١).

[١٢٣] بڕوانە (١٠٣٣/١ز ـ ١٨٦ ل ـ )

[١٢٤] بوخارى (٦٥٧) و موسليم (٦٥١).

**گەورە دەفەرموێ: دەی ئەگەر لەکوفر دەستیان هەلگرتو تەوبەی بەڕاستی یان کردو بەڕێك و پێکی و بەجوانی نوێژیان کرد، زەکاتیان دا، ئەوا ڕێگەیان بەرەلاَ کەن، حاڵیان حاڵی تێکڕای موسوڵمانانە.**

**١٠٧٤/١-١٢٥/ حەدیثی (أي ألأعمال أفضل . . .).**[١٢٥]

**١٠٧٥/٢-١٢٦/** عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالْحَجِّ وَصَوْمِ رَمَضَانَ). **متفق عليه.**[١٢٦]

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئیسلامەتی لەسەر ئەم پێنج بنیاتە دامەزراوە: (شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ: بەزمان شایەتی دەدەمو بەدڵ باوەڕ دەکەم کەهەر یەزدانی پاك خودایەو هیچ خودای تر نییەو، موحەممەد** (درودی خوای لەسەر بێ) **پێغەمبەرو فروستادەی خودایە. دوەم: ڕاگرتنی نوێژو کردنیەتی بەڕێك و پێکی، سێیەم: زەکات دان، چوارەم: حەج کردن، پێنجەم: ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان (ش).**

**١٠٧٦/٣-١٢٧/ فەرموودەی:** (أمرت أن أُقاتل الناس).[١٢٧]

**١٠٧٧/٤-١٢٨/ فەرموودەی:** (إنك تأتي قوماً من أهل الكتاب).[١٢٨]

**١٠٧٨/٥-١٢٩/** عَنْ جَابِرًا ﷺ قالَ: سَمِعْتُ النَّبِيّ(صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلَاةِ). **رواه مسلم.**[١٢٩]

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: جیاوازی نێوانی پیاوی موسوڵمان و پیاوی بتپەرستو بێ بڕوا نوێژ نەکردنە، کەتەرکی نوێژی کرد جیاوازی نامێنێ لەگەڵ بێ بڕوا (م).**

---

[١٢٥] بوخاری (٥٢٧) و موسلیم (٨٥). بڕوانە بەرگی یەکەم ل/٢٥٧، ز/٤٠ ژ/١١/٣١٢.

[١٢٦] بوخاری (٨) و موسلیم (١٦).

[١٢٧] بوخاری (٢٥) و موسلیم (٢٢) بڕوانە: (١/٣٩٠ز - ٤٩).

[١٢٨] بڕوانە: (٦/٢٠٨ز - ٢٦ ب - ل - ١٩٥).

[١٢٩] موسلیم (٨٢).

٦/١٠٧٩-١٣٠/ عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلَاةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ) رواه الترمذي وقال: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.(١٣٠)

**بورەیدە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: جیاوازی نێوانی ئێمەو نێوانی ئەوان پەیمانی نوێژ کردنە، جا ئەوەی نەیکا بێگومان کافرو بێ بڕوا دەبێ (ت: ح/ ح/ص).**

٧/١٠٨٠-١٣١/عَنْ شَقِيقِ بنْ عَبْدالله التابعي المتفق على جلالته ﷺ قَالَ: (كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَا يَرَوْنَ شَيْئًا مِنْ الْأَعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ غَيْرَ الصَّلَاةِ). رواه الترمذي في كتاب الايمان باسناد صحيح.(١٣١)

**شەقیقی کوڕی عەبدوڵلا، تابیعی بوو، واتە: لەچینی دوەمی موسوڵمانان بوو، لەپاش چینی پێغەمبەرو یارانی، کەپیاوێکی تابلێی بەقەدرو هێژاو موسوڵمانێکی چاکی پاك بوو، کەکەس لاری لەمەزناهی ئەو نەبوو، ئەم شەقیقە فەرمووی: بیرو باوەڕی یارانی موحەممەد** (دروودی خوای لەسەر بێ) **وابوو: نەکردنی نوێژ نەبێ نەکردنی کارێکی تر بەکوفر دانانرێ (ت: س/ ص).**

٨/١٠٨١-١٣٢/عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: قَالَ: رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلَاتُهُ فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ فَإِنْ انْتَقَصَ مِنْ فَرِيضَتِهِ شَيْءٌ قَالَ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَيُكَمَّلَ بِهَا مَا انْتَقَصَ مِنْ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ يَكُونُ سَائِرُ عَمَلِهِ عَلَى ذَلِكَ).رواه الترمذي وقال حديث حسن.(١٣٢)

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ڕۆژی قیامەت، نوێژ یەکەم کردەوەی ئادەمیزادە کەلەسەری موحاسەبە دەکرێ، جا پەروەردگاری گەورەو سەروەرمان - هەرچەند خۆشی باشتر کارەکە دەزانێ، بەڵام لەبەر حیکمەتێ - بەفریشتەکانی دەفەرموێ: تەماشای دەفتەری نوێژی ئەم**

---

(١٣٠) تیرمذی (٢٦٢٣).

(١٣١) تیرمیذی (٢٦٢٤).

(١٣٢) تیرمیذی (٤١٣).

بەندەیەم بکەن ئایا بەتەواوی نوێژی کردووە یابەناتەواوی، ئیتر ئەگەر بەتەواوی نوێژی کردبێ ئەوا بەتەواوی بۆی دەنووسرێ، بەڵام ئەگەر بازێ نوێژی چووبوو، یا هەندێ نوێژی ناتەواوی‌و کەمووکوڕی هەبوو ئەوا خودا دەفەرموێ: تەماشا بکەن بزانن ئایا ئەم بەندەیەی من نوێژی سوننەتی هەیە وەسوننەتەکانی نوێژی جێ بەجێ کردووە؟ جا ئەگەر سەرمایەیەکی سوننەتی هەبوو ئەوا دەفەرموێ: ناتەواویی فەرزەکانی ئەم بەندەیەم لە سوننەتەکانی تەواو بکەن. لەپاش نوێژ موحاسەبە دەکرێ لەسەر زەکات، ئەویش هەروەها بەم شێوەیە، ئیتر هەموو کردەوەکانی تریشی بەئەم پێ یە لێ وەردەگیرێ (ت: ح/حەزرەت ـ تاج).

**(١٩٤) خێروگەورەیی ڕیزی یەکەم و، فەرمانکردن بە پڕکردنەوەی کەلەبەری ڕیزەکانی پێشەوە - باب فضل الصف الاول - والامر باتمام الصفوف الأول وتسويتها والتراص فيها**

١/١٠٨٢-١٣٣/ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ( أَلَا تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ تَصُفُّ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا قَالَ يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الْأُوَلَ وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ).رواه مسلم.[١٣٣]

جابیری کوڕی سەموورە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەرێ بۆ ڕیز نابەستن، لەناو نوێژدا، لەچەشنی ڕیزبەستنی فریشتەکان لەلای پەروەردگاریان، کەکاتێ ڕیز دەبەستن بۆ خودا پەرستی؟ عەرزیان کرد: قوربان! فریشتەکان لەلای پەروەردگاریان چۆن ڕیز دەبەستن؟ فەرمووی: ڕیزەکانی پێشەوە ڕیز بەڕیز تەواو دەکەن‌و لەڕیزدا پاڵ دەدەن بەیەکەوە (م).

٢/١٠٨٣-١٣٤/ فەرموودەی: (لو يعلم الناس ما في النداء).[١٣٤]

٣/١٠٨٤-١٣٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا وَشَرُّهَا آخِرُهَا وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا) رواه مسلم.[١٣٥]

---

[١٣٣] موسلیم (٤٣٠).

[١٣٤] بڕوانە (١٠٣٣/١ز ـ ١٨٦ ب ـ ٣ ل . ..).

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: باشـترین ڕیـزی پیـاوان ڕیـزی یەکەمیانـە، خراپترینیشیان دوا ڕیزیانـە، وەباشـترین ڕیزی ژنان دواڕیزیانە، وەخراپترین ڕیزیشیان هەوەڵ ڕیزیانە (م).

٤/١٠٥٨-١٣٦/عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى فِي أَصْحَابِهِ تَأَخُّرًا فَقَالَ لَهُمْ تَقَدَّمُوا فَأْتَمُّوا بِي وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ لَا يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ حَتَّى يُؤَخِّرَهُمْ اللَّهُ)رواه مسلم.[١٣٦]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) تەماشای کرد واهەندێ کەس لەیارانی، کەخاوەن پایەو ڕێزبوون، لـەڕیزدا چوونەتە دواوە، فـەرمووی: وەرنـە پێشـەوە ئێـوە پـەیڕەویی مـن بکـەن، وە بائـەوانیش کەلەپشـتی ئێـوەوەن پـەیڕەویی ئێـوە بکـەن و بـەهۆی جموجـووڵی ئێـوەوە پـەیڕەوی بکـەن، کۆمەڵێ دەیکەن بەپیشەو هەر دوادەکەون، هەتا خـودایش لەپایـەو پاداشـی بـاش دا دەیانخاتە دواوە (م).

٥/١٠٨٦-١٣٧/ فـەرموودەی (کـان . .. یمسـح مناکبنـا في الصـلاة .. .) بڕوانـە: (٢/٣٤٩ز ـ ٤٤ ب ـ ١ ل ـ ٢٨٠) [١٣٧].

٦/١٠٨٧-١٣٨/ عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنْ النَّبِـيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: (سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ). متفق عليـه. وفي روايـة للبخـاري فـان تسوية الصفوف من اقامة الصلاة.[١٣٨]

ئەنـەس (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (درووودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: ڕیزەکانتان ڕێك بخەن و باڕیزەکان ڕێك و پێك بێ و لارو خوارو خێچ نـەبێ، چونکە ڕێکخستنی نوێژ بەشێکە لەتەواوی نوێژ! (ش) لەگێڕانەوەیەکی بوخاریدا: چونکە ڕێکخستنی ڕیزەکان بەشێکە لەجێ بەجێ کردنی نوێژ بەڕێکوپێکی.

---

[١٣٥] موسلیم (٤٤٠).

[١٣٦] موسلیم (٤٣٨).

[١٣٧] بوخاری (٧٢٣)و موسلیم (٤٣٣).

[١٣٨] بوخاری (٧٢٣)و موسلیم (٤٣٣).

٧/١٠٨٨-١٣٩/عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: (أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَجْهِهِ فَقَالَ أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَتَرَاصُّوا فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي).رواه البخاري بلفظه ومسلم بمعناه. وفي رواية للبخاري: (وكان أحدنا يلزق منكبه بمنكب صاحبه وقدمه بقدمه).[١٣٩]

**دیسان ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: قامەتی نوێژ کرا، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **رووی تێ کردین و فەرمووی. ڕیزەکانتان راست بکەنەوەو پاڵ بدەن بەیەکتری یەوە، چونکە من لەپشتی سەریشمەوە چاوم لێتانە (ب/م) لەگێڕانەوەیکی تری بوخاریدا: ڕیزەکانتان راست بکەنەوە، چونکە من لەپشتی سەریشمەوە چاوم لێتانە ئیتر ئێمەیش شانمان دەنووسان بەشانی یەکتری یەوەو قاچیشمان دەلکان بەقاچی یەکتری یەوە.**

٨/١٠٨٩-١٤٠/ (لتسون صفوفكم أو . . .).[١٤٠]

٩/١٠٩٠-١٤١/ عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَخَلَّلُ الصَّفَّ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَى نَاحِيَةٍ يَمْسَحُ صُدُورَنَا وَمَنَاكِبَنَا وَيَقُولُ لَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ يَقُولُ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصُّفُوفِ الْأُوَلِ). رواه أبو داود باسناد حسن.[١٤١]

**بەڕائی کوڕی عازیب** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەم پەڕی ڕیزەوە تائەوپەڕی ڕیز، دەکەوتە ناو ڕیزەکەوەو، دەستی دەهێنا بەسینگماناو، بەشاناناو ڕێکی دەخستین‌و دەیفەرموو: ناڕێك مەوەستن، ئەگینا ناڕێکی‌و ناکۆکیتان تێ دەکەوێ، وەگەڵێ جاریش دەیفەرموو: خوداو فریشتەکانی خودا رەحمەت دەڕێژن بەسەر ڕیزەکانی پێشەوەدا (د: س/ح).**

١٠/١٠٩١-١٤٢/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَقِيمُوا الصُّفُوفَ وَحَاذُوا بَيْنَ الْمَنَاكِبِ وَسُدُّوا الْخَلَلَ وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ لَمْ يَقُلْ عِيسَى بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ وَلَا تَذَرُوا فُرُجَاتٍ لِلشَّيْطَانِ وَمَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللَّهُ وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ اللَّهُ). رواه أبو داوود باسناد صحيح.[١٤٢]

---

[١٣٩] بوخاری (٧١٨)و موسلیم (٤٣٤).

[١٤٠] بڕوانە (٥/١٦٠از. ١٦ ب ـ ١ ل ـ ١٤٩).

[١٤١] ئەبو داوود (٦٦٤).

[١٤٢] ئەبو داوود (٦٦٦).

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕیزەکان ڕاست بکەنەوەو شان لەئاستی شانی یەکتری بگرنو کەلەبەرو بۆشایی پڕبکەنەوەو مەهێڵن ڕیزەکان لارو خوارو کەل بن، یا کەلەبەریان تیابێ، وەبەنەرمی بچن بەدەستی برای خۆتانەوە، ئەگەر دنیا بوو لەدواوە ڕایانکێشان بۆلای خۆیان تابەتەنیا نەوەستن لەکاتی نوێژی جەماعەت دا، وەهیچ کەلیو بۆشایی مەهێڵنەوە بۆ شەیتان، وەئەوکەسەی کەلیی ڕێزێ پڕبکاتەوە خودایش بەڕەحمەتی خۆی ئەو بەسەر دەکاتەوە، وە ئەوکەسەی ڕیزێ ببچڕێ خودایش پەیوەندی لەگەڵ ئەودا دەپچڕێنێ (د ـ س/ ص).

١١/١٠٩٢-١٤٣/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رُصُّوا صُفُوفَكُمْ وَقَارِبُوا بَيْنَهَا وَحَاذُوا بِالْأَعْنَاقِ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَرَى الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ مِنْ خَلَلِ الصَّفِّ كَأَنَّهَا الْحَذَفُ). حديث صحيح رواه أبو داود على شرط مسلم.[١٤٣]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕیزەکانتان ڕێك خەنو شان بدەن بەشانی یەکتریيەوەو، نێوانی ڕیزەکان لەیەکەوە نزدیك بکەنەوە، با نێوانی هەموو دوو ڕیزی نزیکەی سێ باڵ بێو، شانو ملتان لەئاستی یەك بگرن، دەسا بەوکەسە کەگیانی منی وا لەدەسا شەیاطینی دەبینم خۆیان دەکەنو بەناو کەلەبەرو بۆشایی ناوڕیزەکانا، دەڵێی کارژۆڵەو بەرخۆڵەی ڕەشکەڵەن، یا دەڵێی ئەو ڕەگەزە گەلە ڕەشکەڵە بوودەڵەیەن، کە لەیەمەنو حیجاز هەن (د ـ ح/ ص).

١٢/١٠٩٣-١٤٤/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ فَمَا كَانَ مِنْ نَقْصٍ فَلْيَكُنْ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ). رواه أبو داود.[١٤٤]

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕیزەکان یەك لەدوای یەك تەواو بکەن، بەم ڕەنگە ڕیزی پێشەوە تەواو بکەن، ئینجا بەسەرە ڕیزەکانی پاش ئەو، جا ئەگەر ناتەواویی یەك هەبوو، بابکەوێتە ڕیزی هەرە پاشاوە (د ـ س /ح).

---

[١٤٣] ئەبو داوود (٦٦٧).

[١٤٤] ئەبو داوود (٦٧١).

١٣/ ١٠٩٤-١٤٥/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِنَّ اللّٰهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى مَيَامِنِ الصُّفُوفِ). [١٤٥] رواه أبو داود بأسناد على شرط مسلم، وفيه رجل مختلف في توثيقه.

عائيشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خوداو فریشتەکانی خودا صەلاوات دەدەن لە سەرلای ڕاستی ڕیزەکانی نوێژ (د ـ س/ص).

١٤/ ١٠٩٥-١٤٦/ عَنْ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: (كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُول اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ يُقْبِلُ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ قَالَ: فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ أَوْ تَجْمَعُ عِبَادَكَ). رواه مسلم.[١٤٦]

بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران کەلەپشت پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) نوێژمان دەکرد: حەزمان دەکرد کەلەلای ڕاستی یەوە بین، چونکە لەلای ڕاستیەوە رووی تێ دەکردین، بەگوێی خۆم گوێم لێ ی بوو دەیفەرموو: (رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ أَوْ تَجْمَعُ عِبَادَكَ) خودایە! لەسزای ڕۆژی قیامەتی خۆت بمپارێزە، ئەو ڕۆژەی کەبەندەکانی خۆت بۆ پاداش دانەوە زیندوو دەکەیتەوە! یا راوی گوتی: فەرمووی: یوم تجمع عبادك: ئەو ڕۆژە کەبەندەکانی خۆت بۆ پاداش دانەوە کۆدەکەیتەوە (م).

١٥/ ١٠٩٦-١٤٧/عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (وَسِّطُوا الْإِمَامَ وَسُدُّوا الْخَلَلَ). رواه أبو داود.[١٤٧]

ئەبو هرەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێشنوێژ بخەنە ناوەڕاستتانەوەو لەشانی ڕاستو لەشانی چەپیەوە لەپشتیەوە دابمەزرێن، وەکەلێو کەلەبەری ڕیزەکانیش پڕبکەنەوە (د ـ ح/ حەزرەت).

---

[١٤٥] ئەبو داوود (٦٧٦).

[١٤٦] موسلیم (٧٠٩).

[١٤٧] ئەبو داوود (٦٨١).

**(١٩٥) باسی خێرو گەورەیی سوننەتە دامەزراوەکانی نوێژە فەڕزەکان، وە روون کردنەوەی لای کەم و لای هەرەباشیان و لای مامناوەندیی یان**
**باب فضل السنن الراتبة مع الفرائض وبيان أقلها وأكملها وما بينها**

١٠٩٧/١-١٤٨/ عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ (رضي الله عنها) عَنْ النَبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا قَالَتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُصَلِّي لِلَّهِ كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعًا غَيْرَ فَرِيضَةٍ إِلَّا بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ أَوْ إِلَّا بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ).رواه مسلم.[١٤٨]

ئوممو حەبیبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم (دروودی خوای لەسەر بێ) بیست دەیفەرموو: هەر بەندەیەکی موسوڵمان هەموو ڕۆژێ دوانزە ركات نوێژی سوننەت بكا بۆ خودا، سەرەڕای نوێژە فەڕزەکان، مسۆگەر کەخودای گەورە لەبەهەشتا کۆشکێکی بۆ دروست دەکا (م).

١٠٩٨/٢-١٤٩/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْجُمُعَةِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ). متفق عليه.[١٤٩]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم نوێژە سوننەتانەم کردووە: دوو ركات لەپێش نیوەڕۆوە، وە دووركات لەپاشیەوەو، دوو ركات لەپاش نوێژی هەینی یەوە، دوو ركات لەپاش شێوانەوەو دوو ڕكات لەپاش نوێژی خەوتنانەوە (ش).

١٠٩٩/٣-١٥٠/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ ثَلَاثًا لِمَنْ شَاءَ). متفق عليه.[١٥٠]

عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دووجار لەسەریەك فەرمووی: لەبەینی هەموو بانگو قامەتێکا نوێژێکی سوننەت هەیە لەسەری جاری سێهەما فەرمووی: ئەمە بۆکەسێ ئارەزووی کردنی ئەم نوێژەی هەبێ (ش ـ ڕەزای خودایان لێ بێ).

---

[١٤٨] موسلیم (٧٢٨) و (١٠٣).

[١٤٩] بوخاری (١١٦٥) و موسلیم (٧٢٩).

[١٥٠] بوخاری (٦٢٧) و موسلیم (٧٢٩).

**(١٩٦) دوو ڕكاته دامەزراوەكانی پێش نوێژی بەیانی - التأكيد على ركعتي سنة الصبح**

١/١١٠٠-١٥١/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيَّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ لَا يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ). رواه البخاری.[151]

**عائیشـه** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فـەرمووی: حـەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەسـتووری وابـوو هەمیشە چوار ركات نوێژی سوننەتی لەپێش نوێژی نیوەڕۆوە دەكرد، وە هەروەها دووركاتیش لەپێش نوێژی بەیانی یەوە (بوخاری. ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).**

٢/١١٠١-١٥٢/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (لَمْ يَكُنْ النَّبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُدًا عَلَى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ). متفق عليه.[152]

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هیچ سوننەتێكی تری وەك دووركاتە سوونەتەكەی پێش نوێژی بەیانی ئاوا بەباشی سەرۆكاری نەدەكرد! (ش - ڕەحمەت لەگۆڕیان).**

٣/١١٠٢-١٥٣/ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا).رواه مسلم: وفي رواية: لهما أحب إلي من الدنيا جميعا.[153]

**دیسـان لەعائیشـەوە لـە حەزرەتـەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفـەرموێ: دووڕكاتـە سـوننەتەكەی پـێش نوێـژی بـەیانی لەهـەموو موڵـكو سـامانی دنیـا باشـترن (م) لەگێڕانەوەیەكا: ئەم دووە لەباری دڵی منـا لەهـەموو موڵـكو سـامانی ئـەم جیهانـە خۆشەویست ترن.**

٤/١١٠٣-١٥٤/ وعن أبي عبدالله بلال بن رباح (رضي الله عنه) مؤذن رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيُؤْذِنَهُ بِصَلَاةِ الْغَدَاةِ فَشَغَلَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا بِلَالًا بِأَمْرٍ سَأَلَتْهُ عَنْهُ حَتَّى فَضَحَهُ الصُّبْحُ فَأَصْبَحَ جِدًّا قَالَ فَقَامَ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ وَتَابَعَ أَذَانَهُ فَلَمْ يَخْرُجْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا خَرَجَ صَلَّى بِالنَّاسِ وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَائِشَةَ شَغَلَتْهُ بِأَمْرٍ سَأَلَتْهُ عَنْهُ حَتَّى أَصْبَحَ جِدًّا وَأَنَّهُ أَبْطَأَ عَلَيْهِ بِالْخُرُوجِ فَقَالَ إِنِّي كُنْتُ رَكَعْتُ رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ أَصْبَحْتَ جِدًّا! قَالَ: لَوْ

---

[151] بوخاری (١١٨٢).

[152] بوخاری (١١٦٩) و موسلیم (٧٢٤) رقم (٩٤).

[153] ئەبو داوود (١٢٥٧).

أَصْبَحْتُ أَكْثَرَ مِمَّا أَصْبَحْتُ لَرَكَعْتُهُمَـا وَأَحْسَـنْتُهُمَا أَجْمَلْتُهُمَـا). رواه أبـو داود باسـناد حسن.[١٥٤]

ئەبوعەبدوڵلا: بیلالی کوڕی رەباح (ڕەزای خوای لێ بێ) کەیەکێك بوو لەبانگدەرانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەئاگاداری بکەمەوە، تا تەشریف بێنێ بۆ مزگەوت نوێژی بەیانیمان بۆ بکا، بەلام عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئیشێکی دا بەسەرماو بەپرسیار لەوبارەیەوە تەواو خەریکی کردم هەتا تەواو رۆژ رووناك بووە، ئەوجا چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ)و پەیتا پەیتا ئاگادارم دەکردەوە، کەدرەنگە تەشریف بێنێ بۆ نوێژ، وەلێ حەزرەت درەنگ هات، کەهات بەرنوێژی یەکەی بۆ خەڵکەکە کرد، منیش عوزر خواهیم بۆ هێنایەوەو عەرزیم کرد: کەهۆی دواکەوتنی من ئەوە بوو عائیشە کارێکی دابەسەرماو بەپرسیاری زۆر لەوبارەیەوە تەواو خەریکی کردم. حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: من دوو ڕکاتە سوننەتەکەی بەیانیم دەکرد منیش عەرزیم کرد: قوربان! گەلێ درەنگ بوو، بەزەینم دەبوو گرنگیت بەفەرزەکە بدایە نەك بەسوننەتەکە. فەرمووی: گریمان لەمەیش پتر درەنگ بوایە، من ئەو دوو رکاتە سوونەتەم گەلێ بەجوانیو شیرینی دەکرد! (د ـ س/حەزرەت).

**(١٩٧) دوو ڕکاتی نوێژی سوننەتی سوکەڵە لەپێش نوێژی بەیانی دا سوننەتە، کاتەکەی کەیەو چی سوورەتێکیان تێدا دەخوێنرێ**

**باب تخفيف ركعتي الفجر وبيان مايقرأ فيهما وبيان وقتيها**

١/١١٠٤-١٥٥/عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: (أن النَبِيّ ﷺ كـان يصـلي خفيفتين بين النداء والاقامة من صلاة الصبح). متفق عليه وفي رواية: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ فَيُخَفِّفُ حَتَّى إِنِّي أَقُولُ هَلْ قَـرَأَ فِيهِمَـا بِـأُمِّ الْقُرْآنِ). وفي رواية مسلم: كان يصلي ركعتي الفجر اذا سمع الأذان، ويخففهما. وفي رواية: اذا طلع الفجر.[١٥٥]

---

[١٥٤] بوخاری (١١٦٩) و موسلیم (٧٢٤) رقم: (٩٤).

[١٥٥] بوخاری (٦١٩) و موسلیم (٧٢٤).

عائيشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دوو ركات نوێژی سووكەڵەی لەنێوان بانگو قامەتی بەیانی دا دەكرد. (ش) لەگێڕانەوەیەكی تری شەیخەین دا: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوەندە بەگورجی دووڕكاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی دەكرد، تەنانەت لەدڵی خۆمەوە دەمگوت: چۆن فریای خوێندنی فاتیحا دەكەوێ. لەگێڕانەوەیەكی موسلیم دا: هەركە گوێ ی لەبانگ دەبوو، وەڵامی بانگەكەی دەدایەوە، ئەوجا گورج دووڕكات نوێژی شەبەقی سووكەڵەی لەپاش شەبەق دەكرد.

٢/١١٠٥-١٥٦/ وعن حفصة (رضي الله عنها) أن رسول الله ﷺ (كان إذا أذن المؤذن للصبح وبدأ الصبح صلى ركعتين خفيفتين).[١٥٦]

حەفصەی كچی ئیمامی عومەر (رەزای حوایان لێ بێ) كە هاوسەری حەزرەت بوو (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جاران حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دووڕكاتی سووكەڵەی لەپاش بانگی بەیانی دەكرد، كاتێ كەبەیانی دەدا (ش) لەگێڕانەوەیەكی موسلیم دا: جاران كەشەبەقی دەدا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەپێش نوێژی فەرزی بەیانی دا تەنیا دوو ركات نوێژی سووكەڵەی دەكردو بەس.

٣/١١٠٦-١٥٧/ عَنْ ابْنَ عُمَرَ ﷺ قالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ كَأَنَّ الْأَذَانَ بِأُذُنَيْهِ). متفق عليه.[١٥٧]

ئیبنو عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەژیانی دا، بەشەو كەشەونوێژی دەكرد دوو ڕكات دووڕكات دەیكرد، لەدوا كاتی شەویشدا یەك ڕكات نوێژی وەتری دەكرد، دووڕكات سوننەتیشی لەپێش نوێژی فەرزی بەیانی دا دەكرد، ئەوەندە خێرا ئەم دوو ڕكاتەی دەكرد دەتگوت گوێی لەقامەتی نوێژی بەیانی یەو پەلەی ئەوەیەتی كەلەسەرەتای كاتدا فریای بكەوێ (ش).

---

[١٥٦] بوخاری (٦١٨)و موسلیم (٧٢٣).

[١٥٧] بوخاری (٩٩٥)و موسلیم (٧٤٩).

٤/١١٠٧-١٥٨/ عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ فِي الْأُولَى مِنْهُمَا قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا الْآيَةَ الَّتِي فِي الْبَقَرَةِ وَفِي الْآخِرَةِ مِنْهُمَا: (آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ). [١٥٨]

ئیبنو عەبباس - ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی - فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دا لەڕکاتی یەکەما ئایەتی (قولوا آمنا بالله وما أنزل إلينا) هەتا (ونحن له مسلمون) ەی دەخوێند کەوا لەسوورەتی بەقەرەدا، لەڕکاتی دوەمدا ئایەتی (فلمَّا أحس عيسى منهم الكفر قال: من أنصاري الى الله ؟ قال الحواريون نحن أنصار الله آمنا بالله واشهد بأنا مسلمون) (٣/٥٢)ەی دەخوێند. لەگێڕانەوەیەکی تردا: لەڕکاتی دوەمدا ئایەتەکەی سوورەتی ئالی عیمرانی دەخوێند، کە دەفەرموێ: (قل يا أهل الكتاب تعالوا الى كلمة سواء بيننا وبينكم) (٣/٦٤) (م).

٥/١١٠٨-١٥٩/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَرَأَ فِي رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) و(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)). رواه مسلم. [١٥٩]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دا، لەڕکاتی یەکەما سوورەتی (قل يا أيها الكافرون) ەو لەڕکاتی دوەمدا سوورەتی (قل هو الله أحد) ی دەخوێند (م).

٦/١١٠٩-١٦٠/عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَمَقْتُ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَهْرًا فَكَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ بِـ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) وَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) ). رواه الترمذي، وقال حديث حسن. [١٦٠]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یەك مانگی ڕەبەق سەرنجی حەزرەتم دا، لەدوو ڕکاتە سوونەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دا، لەڕکاتی یەکەمیانا سوورەتی (قل يا أيها الكافرون) ەو لەڕکاتی دووەمیاندا سوورەتی (قل هو الله أحد) ی دەخوێند (ت: ح/ح).

---

[١٥٨] موسلیم (٧٢٧) و (١٠٠).

[١٥٩] موسلیم (٧٢٦).

[١٦٠] تیرمیذی (٤١٧).

**(١٩٨) راكشان لەسەر لای ڕاست، لەپاش دوو ڕکاتە سوننەتەکەی شەبەق سوننەتە، ئیتر بەشەو شەونوێژی کردبێ یانا - باب استحباب الاظطجاع بعد ركعتي الفجر على جنبه الايمن والحث عليه سواء كان تهجد بالليل أم لا**

١/١١١٠-١٦١/ فەرموودەی (... إذا صلى ركعتى الفجر ...).[١٦١]

٢/١١١١-١٦٢/ عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي فِيمَا بَيْنَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلَاةِ الْعِشَاءِ وَهِيَ الَّتِي يَدْعُو النَّاسُ الْعَتَمَةَ إِلَى الْفَجْرِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُسَلِّمُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ وَيُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ فَإِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَتَبَيَّنَ لَهُ الْفَجْرُ وَجَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ لِلْإِقَامَةِ).رواه مسلم.[١٦٢]

**عائیشە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەدوا کردنی نوێژی خەوتنان هەتا شەبەق، لەو ماوەیەدا یازدە ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد، دوو ڕکاتی دەکردو سلاوی دەدایەوە، یەك ڕکاتیشی بەتەنیا، لەدوا هەمووانەوە بەوەتر دەکرد، کاتێکیش بانگدەر لەپاش بانگدانی بانگی بەیانی بێدەنگ دەبوو، وەشەبەقی دەدا ئەوجا بانگدەر دەهات بۆلای حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **ئاگاداری دەکردەوە کەوا نوێژی بەیانی بووە ئەوجا حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **هەڵدەستا، ئەگەر پێویست بوایە خۆی دەشۆرد، دەنا دەسنوێژی دەگرتو ئەوجا خێرا دوو ڕکات نوێژی سووکەڵەی پێش فەرزی بەیانی دەکردو ئەوسا هەتا بانگدەر دەهاتەوە بەدوایا بێ ئەوەی عەرزی بکا کەوا نوێژکەرەکان کۆبوونەتەوەو چاوەڕوانی ئەون کەبێ نوێژەکەیان بۆ بکا، ئەوسا لەو ماوەیەدا لە سەرلای ڕاستی تۆزێ رادەکێشا، بەیادی ڕاکشانی ئێجگاری ناوگۆڕەوە! (موسلیم پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنووربێ).**

**جارێ لەمزگەوتی گەورە حاجییەکی نوورانیم دی، داوای لەدوو کەس دەکرد کەکەمێ تەکە تەکە بکەن، بەڵکوو جێگەی ئەویش لەڕیزەکەدا ببێتەوە، وادیار بوو یەکێکیان ناڕازی بوو، دەیگوت: جێمان نابێتەوە، حاجی یە نوورانی یەکەیش بەدەستی بستێکی گرتو بەئامازە (ئیشارەت) تێ ی گەیاند کەسبەینێ لەناو گۆڕدا چۆن لەبستێ زەویدا جێگەی دەبێتەوە!!**

---

[١٦١] بڕوانە (٨١٦/٢ ز - ١٢٧ ب - ٢ ل - ٢٩٧).

[١٦٢] موسلیم (٧٣٦) رقم: (١٢٢).

ئەویش یەکسەر ماتەمینی دایگرتو بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە جێی کردەوە. ئەم جۆرە کتێبە مەجلیسی ڕەسولوڵلایە، خۆراکی دڵی ئادەمیزادی زاناو داناى تیادایە، خۆشی لەوموسوڵمانەی کەبۆنو بەرامەی ئەم باخچە گەلەی بەهەشتەدێ بەسەریدا، یا چڵێ ڕێحانەی لەم باخە بەردەکەوێ جابەئومێدی بەشداربوونی دڵو چاوو دەروونمان لەبۆنو بەرامەو ڕەحمەتو پیتو بەرەکەتی ئەم ریاض صالحینە کەدەڵێی باخی ڕەنگینی بەهەشتی بەرینە، ئەمەتان عەرز دەکەم.

خێزانم دایکی صەلاح، زەکێ ی مەلا کەریم عەلی زۆر لەگۆڕ دەترسێ، دەڵێ: حاجی مام مەولوود هەبوو، شوانی ی رانی زۆر کردبوو، گەشتی سەرچیاو هاموشۆی مێرگو مێرغوزارو دەشتو دەری زۆر کردبوو، لەبەرئەوە لەشی زۆر سووك بوو، حەزی لەگەڕان بوو، حەزی لەدانیشتن نەبوو، ئەم مام مەولوودە برای حاجی مامە کاکەڕەش بوو، خەڵکی دێ ی شۆراوی چەمچەماڵ بوو، پیاوێکی زۆر ساویلکەو نوێژو ڕۆژوو قایمو خواناس بوو، هەموو جارێ دەیگوت: بەخوا زۆر ستەمە پیاو بەڕۆژگاری بەهار لەناو گۆڕدا ستار بکا!!

خودایە! پەنا هەر پەنای تۆیە، بەڕاستی پلانی سەختو ڕێگەی پڕ مەتریسمان لەبەرە، ئەوە مانەوەی ناوگۆڕە، ئەوە ژیانی بەرزەخە، ئەوە سارای مەحشەرە، ئەوە پردی صیراطە، حەشرە، نەشرە، صیراطە، میزانە نەکیرو مونکەرە، مەحکەمەیە، دادگایە، نامەی کردارە، ئەم مرۆڤە بێ هێزە، چنگەچلۆچێوە ـ ئەگەر یاریدەی تۆ نەبێ ـ لەکوێ بەرگەی ئەم هەموو بەردەڵبەردو بگرەو بەردەیە دەگرێ، پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) بەخۆڕایی نییە کە دەفەرموێ: (لوددت كنت شجرة تعضد) خۆزگەم درەختێ بووم، یەکێ دایدەهێنامو دەیبڕیمو ئیتر بۆخۆم دەبڕامەوەو دەچوومەوە ئەودیو پەردەی نەبوونو رزگارم دەبوو لەچەندو چوونو کێشەو بەرەی هەردوو ژیانی هەردوو جیهان!

خودایە ! هاوار! بەڕەحمەتی خۆت، بەبەرەکەتی ئەم کتێبە پیرۆزە، لەبەرخاتری دانەرەکەی حەزرەت ئیمامی نەوەوی - ڕەزای خودای لێ بێ - لەبەرخاتری ئەو راویو موحەددیثانەی کەناوی پیرۆزیان وا لەناو ڕشتەو سەنەدی ئەم حەدیثە پیرۆزانەدا، لەبەرخاتری هەموو خاوەن جاهو خاترداری لەلای تۆ، لەپەنای خۆتا پەنامان بدەو منو هەموو موسوڵمانو خوێنەرو گوێگرێ، کەبەهەر

جۆرێ سوودو بەهرە لەم کتێبە پیرۆزە وەردەگرێ سەرفرازو رزگاری هەردوو جیهانمان بفەرموو، لەم شوێنانەدا فریامان بکەوە، پردی صیراطمان بۆ بکە بەشەقامە رێی بەهەشت، حەشرو نەشرمان لەژێر سای سێبەری ئالآی موحەممەددا (دروودی خوای لەسەر بێ) بفەرموو، خودایە! ترسی کەنیزی خۆت زەکیێ ی کچی مەلا کەریم عەلی، بەکەرەمی خۆت برەوێنەرەوەو سەربەرزوو روسورو سەرفرازی هەردوو جیهانی بفەرموو، لەمردوو زیندووی خۆش بەو بیکە بەکەنیزێکی لەخودا نزیكو نزاگیراو عاقیبەتخێرو طاعەت جوان!

خودایە! بەبەخشندەیی خۆت گۆڕی هەمووومان گوشاد بفەرموو، شەوگاری پاییزی لەرۆژگاری بەهاری خۆشترو فێنك تربێ! هەموو بەدەمو بەدڵ بابڵێین: ئامین. (وەرگێڕ).

٣/١١١٢-١٦٣/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى يَمِينِهِ). رواه أبو داود والترمذي بأسانيد صحيحه، قال الترمذي: حديث حسن صحيح.[١٦٣]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کە دووڕکاتە سونەتەکەی پێش نوێژی بەیانیتان کرد، لەسەر لای راست بەرەو رووگە کەمێ رابکێشن! (د/ت: ح/ح/ص).

## (١٩٩) باسی سوننەتی نیوەڕۆ - باب سنة الظهر

١/١١١٣-١٦٤/ حەدیثی (صليت مع رسول الله ركعتين . ..).[١٦٤]

٢/١١١٤-١٦٥/ حەدیثی (كان لايدع أربعاً . ..).[١٦٥]

٣/١١١٥-١٦٦/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) فَقَالَتْ: (كَانَ النبى ﷺ يُصَلِّي فِي بَيْتِي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا ثُمَّ يَخْرُجُ فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ

---

[١٦٣] ئەبو داوود (١٢٦١) تیرمیذی (٤٢٠).

[١٦٤] بڕوانە (١٠٩٨/٢ ز ـ ١٩٥ ب ـ ٣ ل ـ . ..).

[١٦٥] بڕوانە (١١٠٠/١از ـ ١٩٦ ب ـ ٣ ل .. .).

الْمَغْرِبَ ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَيُصَلِّي بِالنَّاسِ الْعِشَاءَ وَيَدْخُلُ بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ). رواه مسلم.[166]

عائيشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەرلە کردنی نوێژی نیوەڕۆ، لەماڵەکەی مندا چوار ڕکات نوێژی سونەتی پێش نوێژی نیوەڕۆی کرد، ئەوجا دەچوو بەرنوێژی ی نوێژی نیوەڕۆی بۆ مەردوکومەکە دەکرد دەهاتەوە بۆماڵەوە دووڕکات نوێژی سونەتی دەخوێند، کەنوێژی خەوتنانیشی لەمزگەوتەکە بۆ مەردومەکە دەکرد، لەپاشا دەهاتەوە، لەماڵەوە دوو رکات نوێژی سوونەتی دەخوێند، کەنوێژی خەوتنانیشی لەمزگەوت بۆ مەردومەکە دەکرد دەهاتەوە بۆماڵەکەی من دوور رکاتی نوێژی سوونەتی پاش خەوتنانی لەماڵەوە دەکرد (م).

١١١٦/٤-١٦٧/ عَنْ أُمَّ حَبِيبَةَ زَوْجَ (النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ). رواه أبو داود والترمذى وقال: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.[167]

ئوممو حەبیبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ چوار رکات نوێژی سوننەت لەپێش فەرزی نیوەڕۆو چوار ڕکات لەپاشیەوە هەمیشە بەرێك و پێکی بکا، خودا قەدەغەی دەکا لەئاگری دۆزەخ (د/ت: ح/ح/ص).

١١١٧/٥-١٦٨/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ يُصَلِّي أَرْبَعًا بَعْدَ أَنْ تَزُولَ الشَّمْسُ قَبْلَ الظُّهْرِ وَقَالَ إِنَّهَا سَاعَةٌ تُفْتَحُ فِيهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَأُحِبُّ أَنْ يَصْعَدَ لِي فِيهَا عَمَلٌ صَالِحٌ). رواه الترمذى وقال: حديث حسن.[168]

عەبدوڵلای کوڕی سائیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەخۆر لای دەدا لەناوەڕاستی ئاسمان، لەپێش کردنی فەرزی نیوەڕۆدا چوار رکات نوێژی دەخوێند، دەیفەرموو: لەم حەلەدا هەموو دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە،

[166] موسلیم (٧٣٠).

[167] ئەبو داوود (١٢٦٩) تیرمیذی (٤٢٧).

[168] تیرمیذی (٤٧٨).

لەبۆ بەرزەوە بوونی کردەوەکانی خەڵکی زەوی، جا لەبەرئەوە حەزدەکەم کەکردەوەیەکی باشی منیان لێوە سەرکەوێ؟ (ت:ح/حەزرەت)

٦/١١١٨-١٦٩/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) (أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا لَمْ يُصَلِّ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ صَلَّاهُنَّ بَعْدَهَا).رواه الترمذي وقال: حديث حسن.[١٦٩]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو: ئەگەر چوار ڕکاتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆی بچوایە، لەپاش دووڕکاتە سونەتەکەی پاش نیوەڕۆ دەیکردنەوە (ت:ح/ح)

## (٢٠٠) باسی سوننەتی عەصر - باب سنة العصر

١/١١١٩-١٧٠/ عَنْ عَلِيّ ﷺ قَالَ: (كَانَ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ يَفْصِلُ بَيْنَهُنَّ بِالتَّسْلِيمِ عَلَى الْمَلَائِكَةِ الْمُقَرَّبِينَ وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُؤْمِنِينَ).رواه الترمذي وقال: حديث حسن.[١٧٠]

عەلی کوڕی ئەبی طالیب ﷺ فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەپێش نوێژی فەرزی عەسرەوە چوار ڕکات نوێژی سوننەتی بەدووسلاودانەوە دەکرد، دووڕکاتی دەکردو سلاوی دەدایەوەو سلاوی لەفریشتە نزیکەکانی بارەگا دەکردو هەروا لەگشت موسوڵمانو باوەڕدارێ کەپەیڕەوی ئەوان دەکا. (ت:ح/ح)

٢/١١٢٠-١٧١/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا). رواه أبو داود والترمذي وقال: حديث حسن.[١٧١]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ڕەحمەتی خودا لەو موسوڵمانەبێ کەلەپێش فەرزی عەسردا چوار ڕکات نوێژی سوننەتی پێشینە دەکا. (د/ت: ح/ح)

٣/١١٢١-١٧٢/ عَلِيّ بنْ عبدالمطلب ﷺ أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الْعَصْرِ رَكْعَتَيْنِ). رواه أبو داود باسناد صحيح.[١٧٢]

---

[١٦٩] تیرمیذی (٤٢٦).

[١٧٠] تیرمیذی (٤٢٩).

[١٧١] ئەبو داوود (١٢٧١)و تیرمیذی (٤٣٠).

عەلی کوڕی ئەبوطالیب ﷺ فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) گەلێ جار لەپێش نوێژی عەسردا دوو ڕکات سوننەتی پێشینەی دەکرد (د ـ س/ص).

## (٢٠١) باسی سوننەتی پاشینەو پێشینەی شێوان - سنة المغرب بعدها وقبلها

تقدم في هذه الأبواب حديث ابن عمر وحديث عائيشة وهما صحيحان (أن النَبِـيّ ﷺ كان يصلي بعد المغرب ركعتين) بڕوانە (٢/١٠٩٨) و (٣/١١١٥ ب ـ ٣)

١/١١٢٢-١٧٣/ عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ بنْ مغفل ﷺ عَنْ النَبِـيّ(صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ) قَالَ: (صَلُّوا قَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: لِمَنْ شَاءَ).رواه البخاري.[١٧٣]

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست ـ بەشەوو بەڕۆژ درووددو سڵاوو ڕەحمەتو نوورو صەلاتو پیتو فەڕو بەرەکات پەیتا پەیتا، بەبێ بوارە لەخەوگەی پیرۆزی وەك بەهارە باران بباریێ ـ فەرمووی: دوو ڕکات سوننەت لەپێش فەرزی شێوانەوە بکەن، دووجار ئەم وشە پیرۆزەی دووپات کردەوە، وەڵێ لەسەری جاری سێهەما، تا گومان نەکرێ کەئەمە فەرزە فەرمووی: بەڵام بۆکەسێ مەیلی هەبێ (بوخاری ڕەحمەت لەگۆڕی نازدار).

٢/١١٢٣-١٧٤/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: (لَقَدْ رَأَيْتُ كِبَارَ أَصْحَابِ النَبِـيّ(صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ) يَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ عِنْدَ الْمَغْرِبِ).رواه البخاري.[١٧٤]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گەورەپیاوانی یارانی پێغەمبەرم (دروودی خوای لەسەر بێ) بەچاوی خۆم دەدی لەپاش نوێژی شێوان بەپەلەپەل پەلاماری کن کۆڵەکەکانی مزگەوتەکەی پێغەمبەریان دەدا، دووڕکات سوننەتی بەرینەی شێوانیان دەکرد (ب).

٣/١١٢٤-١٧٥/ عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: (كُنَّا نُصَلِّي عَلَى عَهْدِ النَبِـيّ(صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ) رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ قَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ، فَقيلَ: أَكَانَ رَسُولُ اللّٰـهِ (صَـلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ) صَلَّاهُا؟ قَالَ: كَانَ يَرَانَا نُصَلِّيهِمَا فَلَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا). رواه مسلم.[١٧٥]

---

[١٧٢] ئەبو داوود (١٢٧٢).

[١٧٣] بوخاری (١١٨٣).

[١٧٤] بوخاری (٦٢٥).

[١٧٥] موسلیم (٨٣٦).

دیسان فەرمووی: بەسەرینی ی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی لەپاش خۆراوا بوون، لەپێش فەرزی شێوانەوە دووڕکات سوننەتی بەرینەمان دەکرد؟ فەرمووی: چاوی لێ بوو کەئێمە دەیانکەین، وەلێ نەیدەفەرموو بیکەن وە نەیدەفەرموو مەیکەن، واتە: ڕەزای لەسەریان بوو (م).

١١٢٥/٤-١٧٦/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: (كُنَّا بِالْمَدِينَةِ فَإِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ لِصَلَاةِ الْمَغْرِبِ ابْتَدَرُوا السَّوَارِيَ فَيَرْكَعُونَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ الْغَرِيبَ لَيَدْخُلُ الْمَسْجِدَ فَيَحْسِبُ أَنَّ الصَّلَاةَ قَدْ صُلِّيَتْ مِنْ كَثْرَةِ مَنْ يُصَلِّيهِمَا). رواه البخاری.[١٧٦]

دیسان فەرمووی: جاران لەمەدینە بووین، کاتێ بانگدەر بانگی شێوانی تەواو دەکرد، پەلاماری کۆڵەکەکانیان دەدا، لەوێدا سەرو دووڕکات سوننەتیان بۆخۆیان دەکرد، ئەگەر پیاوێکی نابەڵەد لەو گەرمەی سوننەت کردنەدا بچوایێ بەسەریاندا، وایدەزانی کەنوێژی شێوان دەکرێ، بۆیە ئەو خەڵکە بەزۆری وان بەپێوەو نوێژ دەکەن. (موسلیم. پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنوورو بەرەکەتی خودابێ).

## (٢٠٢) باسی سوننەتی پاشینەو پێشینەی خەوتنان - باب سنة العشاء بعدها وقبلها

فيه حديث إبن عمر السابق (صليت مع النبيّ ﷺ ركعتين بعد العشاء) وحديث عبدالله بن مغفل: (بين كل أذانين صلاة) بڕوانە (١٠٩٨) و (١٠٩٩).

## (٢٠٣) باسی سوننەتی هەینی - باب سنة الجمعة

فيه حديث إبن عمر السابق أنه صلى مع النبيﷺ ركتين بعد الجمعة. متفق عليه.

١١٢٦/١-١٧٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا). رواه مسلم.[١٧٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کەنوێژی جومعەتان تەواو کرد لەدوایەوە چوار ڕکات نوێژی سوننەت بکەن (م).

---

[١٧٦] موسليم (٨٣٧).

(١٧٧) موسليم (٨٨١).

٢/١١٢٧-١٧٨/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (كَانَ لَا يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ حَتَّى يَنْصَرِفَ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ) رواه مسلم.[١٧٨]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عادەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو لەمزگەوت نوێژی جومعەی دەکرد هەتا دەهاتەوە بۆ ماڵەوەی، لەوێ دوو ڕکات سوننەتی پاش نوێژی هەینی دەکرد (م).

**(٢٠٤) سوننەتە نوێژە سوننەتەکان، دامەزراوو دانەمەزراویان، لەماڵەوە بکرێن، بەمەرجێ ترسی چوونیانی تیادا نەبێ. ـ بۆ کردنی نوێژی سوننەت ـ لەجێ نوێژی فەرزەکەوە بکوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر، یا قسەیێ لەنێوانیادا بکا**

**باب استحباب جعل النوافل في البيت سواء الراتبة وغيرها والامر بالتحول للنافلة من موضع الفريضة أو الفصل بينهما بكلام**

١/١١٢٨-١٧٩/ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (صَلَاةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاتِهِ فِي مَسْجِدِي هَذَا إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ). متفق عليه.[١٧٩]

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! بیکەن بەپیشە شەو نوێژو نوێژی سوننەت لەماڵەوەتان بکەن، چونکە نوێژی فەرزی لێ دەرچێ خێرترین نوێژی موسوڵمان ئەو نوێژەیەتی کەلەماڵی خۆیدا دەیکا، چونکە لەوێ بێڕیا ترەو ماڵەکەش پیرۆز دەکا (ش).

٢/١١٢٩-١٨٠/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنْ النَبِيِّ(صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلَاتِكُمْ وَلَا تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا). متفق عليه.[١٨٠]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەشێ لەنوێژەکانتان لەماڵەوەتان بکەن، هەموویان هەر لەمزگەوت مەکەن، دەنا ماڵەکانتان دەبێ بەگۆڕخانە، کەکاری خێری تیا ناکرێ (ش).

---

[١٧٨] موسلیم (٨٨٢).

[١٧٩] بوخاری (٧٣١)و موسلیم (٧٨١).

[١٨٠] بوخاری (٤٣٢)و موسلیم (٧٧٧).

٣/١١٣٠-١٨١/عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ الصَّلَاةَ فِي مَسْجِدِهِ فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ نَصِيبًا مِنْ صَلَاتِهِ فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ فِي بَيْتِهِ مِنْ صَلَاتِهِ خَيْرًا).رواه مسلم.[١٨١]

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کاتێ لەمزگەوت نوێژە فەرزەکان دەکەن، بەشیماڵەوەش دابنێن، چونکە خودا ئەو نوێژەی ماڵەوەتان دەکا بەمایەی خێرو خۆشی یەکی زۆر (م).**

٤/١١٣١-١٨٢/عَنْ عُمَرُ بْنُ عَطَاءٍ ﷺ (أَنَّ نَافِعَ بْنَ جُبَيْرٍ أَرْسَلَهُ إِلَى السَّائِبِ ابْنِ أُخْتِ نَمِرٍ يَسْأَلُهُ عَنْ شَيْءٍ رَآهُ مِنْهُ مُعَاوِيَةُ فِي الصَّلَاةِ فَقَالَ نَعَمْ صَلَّيْتُ مَعَهُ الْجُمُعَةَ فِي الْمَقْصُورَةِ فَلَمَّا سَلَّمَ الْإِمَامُ قُمْتُ فِي مَقَامِي فَصَلَّيْتُ فَلَمَّا دَخَلَ أَرْسَلَ إِلَيَّ فَقَالَ لَا تَعُدْ لِمَا فَعَلْتَ إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلَا تَصِلْهَا بِصَلَاةٍ حَتَّى تَكَلَّمَ أَوْ تَخْرُجَ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَنَا بِذَلِكَ أَنْ لَا تُوصَلَ صَلَاةٌ بِصَلَاةٍ حَتَّى نَتَكَلَّمَ أَوْ نَخْرُجَ). رواه مسلم.[١٨٢]

**عومەری کوڕی عەطاء** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: نافیعی کوڕی جوبەیر ناردمی بۆلای سائیبی خوشکەزای نەمیری صەحابی** (ڕەزای خوای لێ بێ) **کەلەجیاتی نافیع من لەسائیب بپرسم، کەلەبارەی شتێکەوە پرسیاری لێ بکەم کەموعاوییە لەسائیبی دیبوو، وەبەدڵی نەبوو بوو، هەتا سائیب مەسەلەکەمان بۆ روون بکاتەوە، سائیب فەرمووی: بەڵێ ئەمە مەسەلەیەکە، منو موعاوییە لەناو کولییت (مەقصوورەکەی موعاوییەدا، کەلەناو مزگەوتەکەدا بوو) نوێژی هەینیمان کرد، جا کاتێ موعاوییە رۆیشتەوە بۆماڵەوە ناردی بەشوێنما، کەچووم فەرمووی: جارێکی تر شتی وامەکە، کەنوێژی هەینیت کرد مەیلکێنە بەنوێژێکی ترەوە، یا قسەیە لەبەینیان دا بکە، یا لەدوا دەرچوون نوێژی تر بکە، چونکە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **ئەم فەرمانەی پێ کردووین کەنوێژ نەلکێنین بەنوێژەوە، تاقسەیێ لەنێوانیاندا دەکەین یا دەردەچینو دەچین بۆ ماڵەوە! (م).**

[١٨١] موسليم (٧٧٨).

[١٨٢] موسليم (٨٨٣).

**(٢٠٥) هاندان لەسەر نوێژی وەتر باسی لای کەمی و زۆری و ناوەندی و کاتەکەی و باسی ئەوەیش کەسوننەتێکی دامەزراوە**
**باب الحث على صلاة الوتر وبيان أنه سنة مؤكدة وبيان وقته**

١/١١٣٢-١٨٣/ عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: (الْوِتْرُ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَصَلَاتِكُمْ الْمَكْتُوبَةِ وَلَكِنْ سَنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ فَأَوْتِرُوا يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ). رواه أبو داود والترمذي وقال: حديث حسن.[١٨٣]

**عەلی** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: نوێژی وەتر فەرز نییە وەك پێنج نوێژە فەرزەکە، بەڵام سوننەتێکە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دایناوە، دەیفەرموو: ئەی قورئان خواکان! ئەی پەیڕەوانی قورئان! واتە: ئەی گەلی ئیسلام! نوێژی وەتربکەن، کەنوێژێکە ڕکاتەکانی تاکە، لەپاش نوێژی خەوتنانەوە دەکرێ، چونکە خودا خۆی تاکەو، تاکی خۆش دەوێ (د/ت: ح/ح)**

٢/١١٣٣-١٨٤/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: (مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ وَأَوْسَطِهِ وَآخِرِهِ فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ). متفق عليه.[١٨٤]

**عائیشە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەهەموو کاتێکی شەودا وەتری دەکرد: هەندێ جار لەسەرەتای شەوەوە دەیکرد، هەندێ جار لەناوەڕاستی شەودا دەیکرد، هەندێ جاریش لەدوادوایی شەوەوە دەیکرد، بەڵام لەپێش مردنیا هەر بەرەبەیان وەتری دەکرد (ش).**

٣/١١٣٤-١٨٥/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا). متفق عليه.[١٨٥]

**ئیبنوعومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: وەتر بکەن بەدواترین نوێژی شەوتان (ش).**

٤/١١٣٥-١٨٦/عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَوْتِرُوا قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا). رواه مسلم.[١٨٦]

---

[١٨٣] ئەبو داوود (١٤١٦) و تیرمیذی (٤٥٣).

[١٨٤] بوخاری (٩٩٦) و موسلیم (٧٤٩) و (١٣٧).

[١٨٥] بوخاری (٩٩٨) و موسلیم (٧٥١).

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەتا بەیان دەدا لەپاش نوێژی خەوتنان کاتی نوێژی وەتر دەمێنێ (م).

١١٣٦/٥-١٨٧/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّي صَلَاتَهُ بِاللَّيْلِ وَهِيَ مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَ يَدَيْهِ فَإِذَا بَقِيَ الْوِتْرُ أَيْقَظَهَا فَأَوْتَرَتْ). رواه مسلم. وفي رواية له: فاذا بقى الوتر قال: قومي فأوتري يا عائيشة.[١٨٧]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی دەکرد بەشەونوێژ کردن، منیش لەبەردەمیەوە ڕاکشابووم، کەشەونوێژەکەیی تەواو دەکردو بەس وەتری دەما، ئەوسا منیشی لەخەو هەڵدەستاندو دەسنوێژم دەگرتو نوێژی وەترم دەکرد (م) لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیم دا: کەهەر وەتری دەما دەیفەرموو: عائیشە! هەڵسە لەخەو، نوێژی وەتر بکە.

١١٣٧/٦-١٨٨/عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بَادِرُوا الصُّبْحَ بِالْوِتْرِ). رواه أبو داود واترميذى، وقال: حديث حسن صحيح.[١٨٨]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: ئەگەر دەتوانن خێرا لەپیش شەبەقا نوێژی وەتر بکەن (د/ت: ح/ح/ص).

١١٣٨/٧-١٨٩/ عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ خَافَ أَنْ لَا يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ فَإِنَّ صَلَاةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ وَذَلِكَ أَفْضَلُ). رواه مسلم.[١٨٩]

جابیر – فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر کەسێ دەترسێ لەکۆتایی شەوەوە هەڵنەسێ بالەسەرەتای شەوەوە، لەپاش نوێژی خەوتنان، وەتر بکا، بەڵام ئەوەیکەبەتەمایە کەلەدوایی شەوەوە هەڵ بستێ بۆشەونوێژ، با لەکۆتایی شەوەوە وەتر بکا، چونکە نوێژی ئاخیری شەو فریشتەی ڕەحمەت دێنەدیاریو تەماشای دەکەن، ئاشکرایە کەئەمە زۆر باشترە! (م).

---

[١٨٦] موسلیم (٧٥٤).

[١٨٧] موسلیم (٧٤٤) (١٣٤) و (١٣٥).

[١٨٨] ئەبو داوود (١٤٣٦) و تیرمیذی (٤٦٧).

[١٨٩] موسلیم (٧٥٥).

## (٢٠٦) باسی خێری نوێژی چێشتەنگاو، لای کەمی و زۆری‌و ناوەندیی چەندە؟ هەڵنان لەسەر ئاگاداریکردنی
## باب فضل صلاة الضحى وبيان أقلها وأكثرها وأوسطها والحث على المحافظة عليها

١١٣٩/١-١٩٠/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: (أَوْصَانِي خَلِيلِي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِثَلَاثٍ بِصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ وَرَكْعَتَيْ الضُّحَى وَأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَرْقُدَ). متفق عليه.[١٩٠]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دۆستی گیانی بەگیانیم، پێغەمبەری نازدارو خۆشەویستم (درودی خوای لەسەر بێ) ئامۆژگاری کردووم‌و وەسێتی بۆ کردووم کەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بم، وەهەموو ڕۆژێ بەلایەنی کەمەوە دوورکات نوێژی چێشتەنگاو بکەم، بۆ ئیحتیاتیش، نەوەکوو لەدوایی شەودا خەبەرم نەبێتەوە لەپێش نووستندا نوێژی وەتر بکەم (ش).

١١٤٠/٢-١٩١/ حەدیثی: (يصبح على كل سلامي أحدكم صدقة).[١٩١]

١١٤١/٣-١٩٢/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي صَلَاةَ الضُّحَى قَالَتْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَيَزِيدُ مَا شَاءَ) رواه مسلم.[١٩٢]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) وابوو: هەموو چێشتەنگاوێ چوار رکات نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد گەلێ جارانیش چەندەی خودا لەچارەی نووسیبوو زیاتری دەکرد. (موسلیم. پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنوور بێ).

١١٤٢/٤-١٩٣/ عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنها) تَقُولُ: (ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْفَتْحِ فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ قَامَ فَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ). متفق عليه.[١٩٣]

ئوممو هانیئی کچی ئەبو طالیب ﷺ کەناوی فاتیحە بوو، کەهەق ئامۆزای حەزرەت بوو (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککە چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) سڵاوم لێ کرد، ڕوانیم کەوا خەریکە خۆی دەشۆرێ، فاتیمەی کچی بەجلکێ پەردەی بۆگرتبۆوە، جا کەلەخۆشۆردنەکەی بۆوە

---

[١٩٠] بوخاری (١١٧٨) و موسلیم (٧٢١).

[١٩١] بڕوانە (١١٨/٢ ز - ١٣ ب - ١ ل - ١٢٢).

[١٩٢] موسلیم (٧١٩).

[١٩٣] بوخاری (١١٧٦) و موسلیم (٤٩٧/١ رقم: ٨٢).

هەشت ڕکات نوێـژی سـوننەتی، بـەدوو رکـات دووڕکـات کـرد، ئەوحەلـەش ڕێـك چێشتەنگاو بوو (ش).

**(٢٠٧) کاتیێ نوێژی چێشتەنگاو دەست پێ دەکا لەکاتی بەرزەوەبوونی خۆرەوە بەقەد رمێ، تا کاتی لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان کەلار دەبێتەوە بەلای خۆرئاوادا، باشترین کاتیشی ئەوکاتەیە کەخۆر تەواو گەرم دەبێ و دەبێ بەچێشتەنگاو**

**باب تجوز الصلاة الضحى من ارتفاع الشمس الى زوالها والافضل أن تصلي عند اشتداد الحر وارتفاع الضحى**

١/١١٤٣- ١٩٤/ عَنْ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ ﷺ (أَنهُ رَأَى قَوْمًا يُصَلُّونَ مِنْ الضُّحَى فَقَـالَ أَمَـا لَقَـدْ عَلِمُوا أَنَّ الصَّلَاةَ فِي غَيْرِ هَذِهِ السَّاعَةِ أَفْضَلُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ صَلَاةُ الْأَوَّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ الْفِصَالُ). رواه مسلم. [١٩٤]

زەيـدی کـوڕی ئەرقـەم (ڕەزای خوای لێ بێ) کۆمــەڵێکی دی، لــەکاتی خۆرکــەوتن دا چێشتەنوێژ (صلاة الضحى) یان دەکرد، فەرمووی: ئەی ئەمانە خۆشیان بـاش بـاش دەزانن کەئەم نوێژە لەکاتێکی تردا بکرێ باشترە، چونکە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: نوێـژی تەوبـەکاران، کەلەخراپـە گەڕاونەتـەوەو بایـان داوەتـەوە بـەلای خودادا، کەپێی دەگوترێ نوێژی چێشتەنوێژ، ئەوکاتە گەرمەیەتیو بەباشـی دەبـێ، کەخۆر واگەرم دەبێ، چەوولم تاو دەسەنێو سمو قاچی پارێنە وشتر داخ دەبـێ! (م - پڕ گۆڕی پیرۆزی لەڕەحمەتی خودابێ).

**(٢٠٨) هەڵنان و هاندانی موسوڵمانان لەسەر کردنی دووڕکات نوێژی سوننەتی دیاری مزگەوت، دانیشتن لەپێش کردنیاندا ناپەسەندە، ئەم نوێژە لەهەموو کاتێکدا دەکرێ وەبەهەموو نوێژێکی تریش - فەرز بێ یاسوننەت - جێ بەجێ دەبێ بەڵام باش وایە، کەخۆی بەتەنیا بکرێ، یا لەگەڵ فەرز، یا سوننەتی تردا نییەتی دیاری مزگەوتیشی هەبێ**

**باب الحث على صلاة تحية المسجد ركعتين وكراهية الجلوس قبل أن يصلي ركعتين بنية التحية أو صلاة فريضة أو سنة راتبة أو غيرها**

١/١١٤٤-١٩٥/عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنَ رِبْعِيّ الْأَنْصَارِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَبِـيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِـسْ حَتَّـى يُصَـلِّيَ رَكْعَتَـيْنِ). متفـق عليه. [١٩٥]

---

([١٩٤]) موسليم (٧٤٨).

**ئەبو قەتادە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کاتێ دەچنە ناو مزگەوتەوە دامەنیشن هەتا دوو ڕکات نوێژی دیاری مزگەوت دەکەن (ش).**

١١٤٥/٢-١٩٦/ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (أَتَيْتُ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: صَلِّ رَكْعَتَيْنِ). متفق عليه.[١٩٦]

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەناو مزگەوتدا بوو، چووم بۆخزمەتی، فەرمووی: پێش ئەوەی کەدابنیشیت دوو ڕکات نوێژی دیاری مزگەوت بخوێنە (ش).**

## (٢٠٩) دووڕکات نوێژی دیاری دەستنوێژ لەپاش دەستنوێژ سوننەتە
## باب استحباب ركعتين بعد الوضوء

١١٤٦/١-١٩٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِبَلَالٍ عِنْدَ صَلَاةِ الْفَجْرِ، يَا بِلَالُ: حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الْإِسْلَامِ فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ قَالَ مَا عَمِلْتُ عَمَلًا أَرْجَى عِنْدِي أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طَهُورًا فِي سَاعَةِ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ). متفق عليه. وهذا لفظ البخاري.[١٩٧]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەبیلالی فەرموو: ئەی بیلال! پێم بڵێ: کام کارێ دەکەی کەبەلای خۆتەوە زیاتر جێگەی ئومێد بێ لەلای خودا، کەلەم سەردەمی ئیسلامەدا دەیکەی؟ چونکە ئەم شەو لەبەهەشتا لەبەردەم خۆمەوە گوێم لەچرپەی سۆڵەکانت بوو، بیلال فەرمووی: ئەوکارەی کەلەکاتی ئیسلامەتی دا دەیکەمو لەلام پتر جێگەی ئومێد بێ ئەوەیە: هەرکاتێ بەشەو یا بەڕۆژ کەدەسنوێژ دەگرم دەسنوێژێکی پاکی تەواو دەگرمو چەندە خودا لەچارەی نووسیبم نوێژ دەکەم (ش).**

---

[١٩٥] بوخاری (٤٤٤)و موسلیم (٧١٤).

[١٩٦] بوخاری (٤٤٣)و موسلیم (٧١٥).

[١٩٧] بوخاری (١١٤٩)و موسلیم (٢٤٥٨).

**(٢١٠) باسی گەورەیی رۆژی هەینی، نوێژەکەی فەرزە، خۆشۆردن بۆی سوننەتە، هەروا خۆ بۆنخۆش کردن و بەزوویی چوون بۆ نوێژەکەی و نزاکردن لە رۆژی هەینی داو صەڵاواتدانی زۆر لەسەر پێغەمبەر ﷺ و روون کردنەوەی کاتی نزاگیرابوون و ذیکرو یادی خوداکردن بەزۆری لەپاش نوێژی هەینی**

**باب فضل يوم الجمعة ووجوبها والاغتسال لها والتطيب والتبكير لها والدعاء يوم الجمعة والصلاة على النبيﷺ فيه وبيان ساعة الاجابة واستحباب اكثار ذكر الله تعالى بعد الجمعة**

قال تعالى: (فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض وابتغوا من فضل الله واذكروا الله كثيرا لعلكم تفلحون) (٦٢/١٠) لەزنجیرەی (٥٩) دا تەفسیری ئەم ئایەتە رابوورد.

١١٤٧/١-١٩٨/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا). رواه مسلم.[١٩٨]

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: باشترین رۆژ کەخۆری لێ هەڵ دێ رۆژی هەینی یە، ئادەم لەم رۆژەدا خودا دروستی کردووە، هەر لەم رۆژەدا رۆیشتە ناو بەهەشتەوە وەهەر لەم رۆژەدا لەبەهەشت دەرکرا (م).**

١١٤٨/٢-١٩٩/ ← (ب/١ ز/١٣ ل/١٥٩ ف/١٣) فەرموودەی:(من توضأ فأحسن الوضوء).[١٩٩]

١١٤٩/٣-٢٠٠/ حەدیثی (الصلواة الخمس).[٢٠٠]

١١٥٠/٤-٢٠١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ وعَنْ ابنْ عمر حَدَّثَاهُ (أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمْ الْجُمُعَاتِ أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنْ الْغَافِلِينَ). رواه مسلم.[٢٠١]

١١٥١/٥-٢٠٢/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ). متفق عليه.[٢٠٢]

---

[١٩٨] موسلیم (٨٥٤).

[١٩٩] موسلیم (٨٥٧) رقم: (٢٧).

[٢٠٠] بڕوانە (١٤/١٣٠ ز- ١٣ ب - ١ ل - ١٢٨).

[٢٠١] موسلیم (٨٦٥).

[٢٠٢] بوخاری (٨٧٧)و موسلیم (٨٤٤).

ئیبنوعومـەر (رەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: کـاتێ دەچـن بـۆ نوێـژی هـەینی خۆتـان بشۆرن (ش).

٢٠٣-١١٥٢/٦/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ). متفق عليه. المراد بالمحتلم: البالغ، والمراد بالوجوب وجوب اختيار، كقول الرجل لصاحبه: حقك واجب علي، والله أعلم.[٢٠٣]

ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: خۆشۆردنی رۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو پیاوێکی رەسیدە (ش) ئیمامی نەوەوی - رەزای خودای لێ بێ - دەفەرموێ: مەبەست لەرەسیدە: باڵقـە، کـە لـە منـاڵی دەرچـووبێو بـووبێ بـەزەلام، مەبەسـت لـەوجوبو پێویسـت بـوونی خۆشۆردنی هەینی فەرز بوون نییـە، کەبەنـەکردنی مـرۆڤ تاوانبـار دەبـێ، بـەڵکوو مەبەسـت ئەوەیـە کـە موسـوڵمان سـوورو حـەریس بـێ لەسـەرکردنی وەك چـۆن سـوورومجێزە لەسـەر کردنـی نوێـژی فـەرز، وەك چـۆن گـەلێ جـار وا دەبـێ پیـاو بەبرادەری خۆی دەڵێ: مافی تۆ لەسەر من پێویستە. خودا بۆخـۆی زۆر باشـتری لـێ دەزانێ.

٢٠٤-١١٥٣/٧/عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ وَمَنْ اغْتَسَلَ فَالْغُسْلُ أَفْضَلُ). رواه أبو داود والترمذي.[٢٠٤]

سـەموورە (رەزای خـوای لـێ بـێ) لەخۆشەویسـتەوە (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: ئـەوەی لەرۆژی هەینی دا، بۆچوون بۆ نوێژی هەینی، تەنیا دەسنوێژ دەگرێ، ئـەوە بـەپێی سوننەتی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێ) رەفتـار دەکـا، ئەمـەیش دیـارە کەئیشـێکی گـەلێ جوانو شیرینە. ئەوەیشی خۆی دەشوا، زیاد لەدەسنوێژ، دیارە کەخۆشـۆردن لەگـەڵ دەسنوێژدا خێرترە (د/ت).

٢٠٥-١١٥٤/٨/ حەدیثی (لایغتسل رجل یوم الجمعة..).[٢٠٥]

---

[٢٠٣] بوخاری (٨٧٩)و موسلیم (٨٤٦).

[٢٠٤] ئەبو داوود (٣٥٤)و تیرمذی (٤٩٧).

٩/١١٥٥-٢٠٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ حَضَرَتْ الْمَلَائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ). متفق عليه.[٢٠٦]

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **لەپێغەمبەرەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: رۆژی هەینی ئەو موسوڵمانەی خۆی بشۆرێ ـ لەچەشنی خۆشۆردنی لەشپیسی ـ ئینجا لەکاتژمێری یەکەما بڕوا بۆ نوێژی هەینیو لەمزگەوت چاوەڕوانی نوێژی هەینی بکا، یاخود خۆی خەریك بکا بەطاعەتو ذیکرو یادی خوداوە تا کاتی نوێژەکە، ئەوەی ئەمە بکا وەك وشترێ بکا بەخێر وایە، وەئەوەی لەکاتژمێری دوەما بچێ وەك ڕەشەوڵاخێ بکا بەخێر وایە، وەئەوەی لەکاتژمێری سێیەما بچێ وەك بەرانێکی شاخدار بکات بەخێر وایە، ئەوەی لەکاتژمێری چوارەم دا بچێ وەك مریشکێ بکات بەخێر وایە، ئەوەی لە کاتژمێری پێنجەم دا بچێ وەك هێلکەیەك بکا بەخێر وایە کە بەرنوێژ (ئیمام) دەرچوو بۆ سەر مینبەر بۆ خوتبە خوێندنەوە ئیتر فریشتەکانیش دەچن گوێ لەوتارو خوطبەکە دەگرنو ئەوەی لەوەدوا بچێ ناوی لەدەفتەری ڕێزلێنانی ئەواندا نانووسرێ (ش).**

١٠/١١٥٦-٢٠٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (ذَكَرَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَالَ فِيهِ سَاعَةٌ لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ تَعَالَى شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا). متفق عليه.[٢٠٧]

**دیسان فەرمووی: جارێ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **باسی وەسپی رۆژی هەینی ی دەکرد، فەرمووی: تاوێکی تیادایە، هەر بەندەیەکی موسوڵمان بۆی ڕێ بکەوێ لەوکاتەدا راوەستابێ نوێژ بکا، یاخود بەکوڵو بەدڵ لەخودا بپاڕێتەوە، ئیتر داوای هەرشتێ لەخێری دینو دنیا لەخودا بکا خودا بێ دڵی ناکاو دەیداتێ! فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بەدەستی پیشانی دا کەئەو ماوەی نزاگیرابوونە تاوێکی گەلێ کەمە (ش).**

---

[٢٠٥] بوخاری (٨٨٣)و موسلیم (٩١٠).

[٢٠٦] بوخاری (٨٨١)و موسلیم (٨٥٠).

[٢٠٧] بوخاری (٩٣٥)و موسلیم (٨٥٢).

١١٥٧/١١-١٠٨/ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ: (لِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رضي الله عنهما) أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَأْنِ سَاعَةِ الْجُمُعَةِ قَالَ قُلْتُ نَعَمْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الْإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلَاةُ). رواه مسلم.[٢٠٨]

ئای بۆ بوردەی کوڕی ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوا لەهەردووکیان) پێی فەرمووم: ئایا لەبارەی تاوەکەی ڕۆژی هەینی یەوە کەنزای تیادا گیرا دەبێ، هیچت لەبارەی دیاری کردنیەوە لەباوکت نەبیستووە، کەئەویش لە پێغەمبەری بیستبێ (دروودی خوای لەسەر بێ)؟ منیش عەرزیم کرد: با، لەباوکمم ژنەوت دەیفەرموو: لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئەو تاوە لەو حەلەوەیە کەپێشنوێژ لەسەر مینبەر دادەنیشێ هەتا نوێژ تەواو دەبێ (م).

١١٥٨/١٢-٢٠٩/ عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ وَفِيهِ قُبِضَ وَفِيهِ النَّفْخَةُ وَفِيهِ الصَّعْقَةُ فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنْ الصَّلَاةِ فِيهِ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ). رواه أبو داود بإسناد صحيح.[٢٠٩]

ئەوسی کوڕی ئەوس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ڕۆژی هەینی یەکێکە لەڕۆژە هەرە باشەکانتان، دەی کەواتە لەم ڕۆژەدا زۆر سەڵاوات لەسەرمن بدەن، چونکە کاری باش لەکاتو شوێنی باش دا خێری زۆرترە، بۆیە صەڵاوەتەکەتان پێم دەگاتەوە (د ـ س/ص).

**(٢١١) کوڕنووشی سوپاس (سجدة شوکر) لەم دووکاتەدا سوننەتە: لەکاتی ڕوودانی بەهرەیەکا، یالەکاتی قووتاربوون لەدەردو بەڵایێ**
**باب استحباب سجود الشكر عند حصول نعمة ظاهرة أو إندفاع بليه ظاهرة**

١١٥٩/١-٢١٠/ عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: (خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ مَكَّةَ نُرِيدُ الْمَدِينَةَ فَلَمَّا كُنَّا قَرِيبًا مِنْ عَزْوَرَا نَزَلَ ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَدَعَا اللَّهَ سَاعَةً ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا فَمَكَثَ طَوِيلًا ثُمَّ قَامَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَدَعَا اللَّهَ سَاعَةً ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا

---

[٢٠٨] موسليم (٨٥٣).

[٢٠٩] ئەبو داوود (١٠٤٧).

فَمَكَثَ طَوِيلًا ثُمَّ قَامَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ سَاعَةً ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا ذَكَرَهُ أَحْمَدُ ثَلَاثًا قَالَ إِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي وَشَفَعْتُ لِأُمَّتِي فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي فَخَرَرْتُ سَاجِدًا شُكْرًا لِرَبِّي ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي فَسَأَلْتُ رَبِّي لِأُمَّتِي فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي شُكْرًا ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي فَسَأَلْتُ رَبِّي لِأُمَّتِي فَأَعْطَانِي الثُّلُثَ الْآخِرَ فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي). رواه أبو داود.[٢١٠]

**سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا بووین** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەمەککەوە دەچووین بۆ مەدینە، کەنزیکی عەزوەراء بووینەوە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەوڵاخەکەی دابەزیو هەردوو دەستی بەرزکردەوەو، تاوێ باش لەخودا پاڕایەوە، ئینجا کوورنوشێکی بردو تاوێکی چاك لەکوڕنووشەکەدا مایەوە، ئینجا هەڵسایەوەو دەستەکانی دیسان بەرز کردەوەو، تاوێکی تریش پاڕایەوەو، دیسانەوە لەپەوڕوو کوڕنوشێکی تری دوورودرێژی بردەوە، جا بۆجاری سێیەم هەڵسایەوە سەرپێ‌و، تاوێکی تریش بەڕاوەستانەوە دەستەکانی بەرزکردەوە لەپاشا خرپ کەوتەوە بەسەر ڕوداو سەجدەیەکی تری بردەوە، ئینجا فەرمووی: لەخودا پاڕامەوەو تکام بۆ ئومەتم کرد ئەویش تکاکەی‌گیرا کردم‌و سێیەکی ئومەتەکەمی پێ بەخشیم، ئەوە بوو منیش بۆ سوپاس کردنی خودا کەوتم بەسەر ڕوداو کوڕنووشێکم بۆ یبرد، هەمدیسان سەرم بەرز کردەوەو جارێکی تریش لە پەروەردگارم پاڕامەوەو تکام کردەوە بۆ ئومەتم، ئەویش سێیەکێکی تری ئۆمەتەکەمی بەخشی پێم، ئەوە بوو منیش بۆ سوپاسکردنی خودا کوڕنوشێکی ترم بۆیبردەوە، هەمدیسانەوە سەرم بەرزکردەوە بۆ ئۆمەتم، ئەویش ئەو تاقە سێیەکەی کەمابوو لەئۆمەتم ئەویشی بەخشی پێم، ئەوەبوو منیش بۆ سوپاس کردنی خودا کەوتم بەڕووداو سەجدەیەکی شوکری ترم بۆیبردەوە (د).**

## (٢١٢) باسی خێری شەونوێژ - باب فضل قيام الليل

**قال الله تعالى: (ومن الليل فتهجد به نافلة لك عسى أن يبعثك ربك مقاما محموداً) (٧٩/١٧)**

**واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: سەرەڕای نوێژە فەرزەکان بەشەو واز لەخەو بێنەو، هەندێ شەونوێژ بکەو قورئانی تیا بخوێنە، هیوا هەیە لەنوورو بەرەکەتی**

---

[٢١٠] ئەبو داوود (٢٧٧٥).

ئەم طاعەتە جوانەوە خودا لەڕۆژی قیامەتا بتباتە پایەو مەقامە پەسندەکە، کەپایەی تکاو شەفاعەتی گەورەیە لەدواڕۆژدا.

وقال تعالى: (تتجافى جنوبهم عن المضاجع) (سەجدە/ ٣٢ ـ ١٦)، وقال تعالى: (كانوا قليلا من الليل ما يهجعون) (ذاريات/ ١٧/٥١) واتە: ئەو خودا پێداوانە بەشەو خەو لەچاویان ناکەوێ، مەگەر کەمێ سەرخەو بشکێنن، هەر خەریکی خوداپەرستیو شەونوێژن.

١١٦٠/١-٢١١/ حەدیثی (عن عائشة (رضي الله عنها) كان النَبِـيّ ﷺ يقوم من الليل حتى..) وعن مغيرة نحوه. متفق عليه.[٢١١]

١١٦١/٢-٢١٢/ وَعَنْ عليٍّ ﷺ أن النَبِيّ ﷺ طرقه وفاطمة ليلا فقال: (ألا تصليان). متفق عليه.[٢١٢]

عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هێنا بۆلای منو فاطیمە، سەیری کرد کەنوستووین، فەرمووی/: ئەرێ بۆ شەنوێژ ناکەن (ش).

١١٦٢/٣-٢١٣/ عَنْ سَالِمِ بنْ عَبْدالله بـن عُمَر عَنْ أبيه (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: أن النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: (نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ فَكَانَ بَعْدُ لَا يَنَامُ مِنْ اللَّيْلِ إِلَّا قَلِيلًا). متفق عليه.[٢١٣]

سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ فەرمووی: عەبدوڵڵا پیاوی چاکە، بریا بەشەو شەونوێژی دەکرد! سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: ئیتر عەبدوڵڵا بەشەو نەختێك نەبێ، نەدەنووست (ش).

١١٦٤/٥-٢١٥/ عَنْ عَبْدِ اللّهِ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ النَبِـيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (رَجُلٌ فَقِيلَ مَا زَالَ نَائِمًا حَتَّى أَصْبَحَ مَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ فَقَالَ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنِهِ). متفق عليه.[٢١٤]

---

[٢١١] بڕوانە (٩٨/٤ز ـ ١١ ب ـ ١ ل ـ ١٠٧).

[٢١٢] بوخاری (١١٢٧) موسلیم (٧٧٥).

[٢١٣] بوخاری (٣٧٣٩) و موسلیم (٢٤٧٩).

[٢١٤] بوخاری (١١٤٤)و موسلیم (٧٧٤).

**ئیبنومەسعوود** (ڕەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **باسی کابرایەك کرا، گوترا: هەتا بەیانەکی هەر نوستبوو. وەنەچوو بوو بەلای شەونوێژەوە! پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوە شەیتان گمێزی کردۆتە ناو گوێچکەیەوە (ش).**

٦/١١٦٥-٢١٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ فَإِنْ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ). متفق عليه.[٢١٥]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کاتێ دەخەون شەیتان سێ گرێ دەدا لەپشتی سەرتان و یەکە یەکە دەست دەماڵێ بەگرێکاناو دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوورودرێژ لەسەرت بێ، جا ئەگەر خەوتوو خەبەری بۆوەو یادی خودای کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە، وەئەگەر دەسنوێژیشی گرت ئەوا گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە، وەئەگەر نوێژیشی کرد ئیتر هەموو گرێکان بەتەواوی دەکرێنەوە، وەخۆشی گورج و گۆڵ و دڵخۆش دەبێتەوە، ئەگینا بەپەستی و دلگرانی و تەمبەڵی دەمێنێتەوە (ش).**

٧/١١٦٦-٢١٧/ فەرموودەی (أيها الناس أفشوا السلام ..) بڕوانە: (٥/٨٤٩ ز ـ ١٣١ ب ـ ٢ ل ـ ٣١٤).

٨/١١٦٧-٢١٨/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ). رواه مسلم.[٢١٦]

**لەئەبوهورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ** (دروودی خوای لەسەر بێ)**: لەپاش ڕۆژووی ڕەمەزان خێرترین ڕۆژوو ڕۆژوی موحەڕەمە کەمانگی خودایە، لەپاش نوێژی فەڕزیش گەورەترین نوێژ نوێژی شەونوێژە (م-ڕەزای خودای لێ بێ).**

---

[٢١٥] بوخاری (١١٤٢) و موسلیم (٧٧٦).

[٢١٦] موسلیم (١١٦٣).

٩/١١٦٨-٢١٩/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: (صَلَاةِ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى) بڕوانه (٣/١١٠٦ز - ١٩٧ ب - ٣ ل .. ..).

١٠/١١٦٩-٢٢٠/ وعنه قال النبى ﷺ (يصلي من الليل مثنى مثنى ويوتر بركعة). متفق عليه. بڕوانه: (٣/١١٠٦ز - ١٩٧ ب - ٣ ل - ..)

١١/١١٧٠-٢٢١/عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) يَقُولُ: (كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُفْطِرُ مِنْ الشَّهْرِ حَتَّى نَظُنَّ أَنْ لَا يَصُومَ مِنْهُ وَيَصُومُ حَتَّى نَظُنَّ أَنْ لَا يُفْطِرَ مِنْهُ شَيْئًا وَكَانَ لَا تَشَاءُ أَنْ تَرَاهُ مِنْ اللَّيْلِ مُصَلِّيًا إِلَّا رَأَيْتَهُ وَلَا نَائِمًا إِلَّا رَأَيْتَهُ). رواه البخارى.[٢١٧]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مانگی وادەبوو، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڕۆژوو نەدەبوو، لەدڵی خۆمانا دەمانگوت: وا دیارە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەم مانگە ڕۆژوو ناگرێ، مانگی وایش دەبوو، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) هەر بەڕۆژوو دەبوو، لەدڵی خۆمانا دەمانگووت: وادیارە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم مانگە هەموو بەڕۆژوو دەبێ، بەشەویش کاتی تایبەتی دانەدەنا بۆ شەونوێژ، یا بۆ خەوتن، لەبەرئەوە بەپێی حاڵ هەرکاتێ لەشەودا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئارەزووی بکردایە تەماشات دەکرد خەریکە شەونوێژ دەکا، یا تەماشات دەکرد نوستووە (ب).

١٢/١١٧١-٢٢٢/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) (أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً كَانَتْ تِلْكَ صَلَاتَهُ تَعْنِي بِاللَّيْلِ فَيَسْجُدُ السَّجْدَةَ مِنْ ذَلِكَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْفَجْرِ ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ لِلصَّلَاةِ). رواه البخارى.[٢١٨]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەشەو یازدە ڕکات نوێژی شەونوێژی دەکرد، لەناو سەجدەدا گەلێ دەمایەوە یەکێ لەئێوە لەوماوەدا بەقەد پەنجا ئایەت قورئانی دەخوێند، ئەو هێشتا سەری هەڵنەدەبڕی، کەشەبەقی دەدا لەپێش نوێژی بەیانییەوە دووڕکات نوێژی سوننەتی بەیانی دەکرد، ئەوجا

---

[٢١٧] بوخاری (١٤٤١).

[٢١٨] بوخاری (١١٢٣).

تۆزێ بەرەو قیبلە لەسەر لای ڕاست ڕادەکشا، هەتا بانگدەر دەهاتەوە بۆلای کەتەشریفی بچێ بۆ مزگەوت نوێژەکەیان بۆبکا (ب).

١١٧٢/١٣-٢٢٣/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) (مَا كَانَ رَسُول اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثًا فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ قَالَ يَا عَائِشَةُ إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي). متفق عليه. [٢١٩]

دیسان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەلەڕەمەزان‌و نەلەغەیری ڕەمەزاندا، لەیازدە ڕکات نوێژی وەتری پتر نەدەکرد، لەپێشا چوار ڕکاتی دەکرد، مەپرسە لەجوانی‌و درێژییان، ئینجا چوار ڕکاتی تریشی دەکرد، ئەوانیش هەروا، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرلەوە کەوەتر بکەی دەتبینم جار جارە دەخەوی، ئەوە حیکمەتەکەی چییە؟ فەرمووی: ئەی عائیشە! چاوەکانم دەخەون بەلام دڵم ناخەوێ (ش).

١١٧٣/١٤-٢٢٤/ عَنْ عَائِشَةُ (رضي الله عنها) أَنَّ النَبِيّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ يَنَامُ أَوَّلَ اللَّيْلِ ويَقومُ آخره فيصلي). متفق عليه. [٢٢٠]

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو لەسەرەتای شەوەوە لەپاش نوێژی خەوتنان دەنووست، بەلام لەنیوەی شەوبەدواوە هەڵدەستایەوەو شەونوێژی دەکرد (ش).

١١٧٤/١٥-٢٢٥/ فەرموودەی (.. . حتى هممت بأمر سوء ..) بڕوانە (١٠٣/٩ز ـ ١١ ب ـ ١ ل ـ ١١٠).

١١٧٥/١٦-٢٢٦/ فەرموودەی (فافتح البقرة ..) بڕوانە (١٠٢/٨ز ـ ١١ ب ـ ١ ل ـ ١٠٩).

١١٧٦/١٧-٢٢٧/ عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سئل رسول الله ﷺ أي الصلاة أفضل؟ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفْضَلُ الصَّلَاةِ طُولُ الْقُنُوتِ).المراد بالقنوت القيام. رواه مسلم. [٢٢١]

---

[٢١٩] بوخاری (١١٤٧)و موسلیم (٧٢٨).

[٢٢٠] بوخاری (١١٤٦)و موسلیم (٧٣٩).

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ)**: کامەی نوێژ خێری زۆرترە؟ فەرمووی: بەپێوە ڕاوەستانی دوورو درێژ، کەلەوکاتەدا نوێژکەر قورئان دەخوێنێ. (ئیمامی موسلیم ـ پڕگۆڕی پیرۆزی لەنوورو ڕەحمەتو عەطر بێ ـ ئەم حەدیثەی لەکتێبی صەحیحی موسلیم دا ڕوایەت کردووە).** [٢٢٢]

**١٨/١١٧٧ـ٢٢٨/ فەرموودەی (أحب الصلاة إلى الله ..).** [٢٢٣]

**١٩/١١٧٨ـ٢٢٩/ عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ) رواه مسلم.** [٢٢٤]

**حەزرەت ـ درودوو سلاوو ڕەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێو، سەرو ماڵو منالّ بەقوربانی گەردی، سەرگۆڕی بێ ـ دەفەرموێ: هەموو شەوێ ماوەیەکی تایبەتی تیادا هەیە، هەر پیاوێکی موسوڵمان، یا هەرژنێکی موسوڵمان بۆی ڕێ بکەوێ لەوحەلەدا، لەخودا، داوای هەرچی بکا لەخێرو بێری هەردوو جیهان بێ گومان خودا بێ دڵی ناکاو ئەوشتەی دەداتێ، کەدڵخوازیەتی.(م).**

**٢٠/١١٨٠ـ٢٣١/ عَنْ أبي هريرة ﷺ قَال: أنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا قَامَ أحدكم مِنْ اللَّيْلِ فليفتَحَ صَلَاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ). رواه مسلم.** [٢٢٥]

**ئەبوهورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کەبەشەو هەڵسان بۆشەونوێژ، لەپێشا بەدوورکاتی سووکەڵە دەست پێ بکەن (م).**

---

[٢٢١] موسلیم (٧٥٦) (١٦٥).

[٢٢٢] سەرچاوەی ئەم شیعرە ئەم دوو حەدیثەیە: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: گۆڕ یاباخی بەهەشتە یا ئاگردانی دۆزەخە. لەحەدیثێکی تردا دەفەرموێ: (الصبر ضياء) (وەرگێڕ).

حەشرت بۆ نەشری عەتری قەبرت

نووری قەبرەکەت بەری صەبرت بێ (وەرگێڕ)

[٢٢٣] بڕوانە (٩/١٥٠ز ـ ١٤ ب ـ ١ ل ـ ١٣٨).

[٢٢٤] موسلیم (٧٥٧).

[٢٢٥] موسلیم (٧٦٨).

٢١/١١٨٠-٢٣١/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: (كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ افْتَتَحَ صَلَاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ). رواه مسلم.(٢٢٦)

**عائیشه** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **شەو کەهەڵ دەسا لەخەو بۆشەونوێژ، لەپێشا بەدوو ڕکاتی سووکەڵە سەردەقی شەونوێژی دەشکاند(م).**

٢٢/١١٨١-٢٣٢/ فەرموودەی (.. إذا فاتته الصلاة من الليل ..) (٢٢٧)

٢٣/١١٨٢-٢٣٣/ فەرموودەی (من نام عن حزبه ..) (٢٢٨)

٢٤/١١٨٣-٢٣٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (رَحِمَ اللّٰهُ رَجُلًا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ رَحِمَ اللّٰهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّتْ وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ). رواه أبو داود باسناد صحيح.(٢٢٩)

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: رەحمەتی خودا لەوپیاوە بێ، کەبەشەو هەڵدەستێ شەونوێژ دەکاو ژنەکەشی هەڵدەسێنێ، خۆ ئەگەر مێردەکەی بەگوێی نەکردو هەڵ نەسا لەخەو بائاو بپرژێنێ لەدەم و چاوی (د ـ س/ص).**

٢٥/١١٨٤-٢٣٥/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنهما) قَالَا: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا أَيْقَظَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّيَا أَوْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ جَمِيعًا كُتِبَا فِي الذَّاكِرِينَ وَالذَّاكِرَاتِ) رواه أبو داود باسناد صحيح.(٢٣٠)

**ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعید** (رەزای خوایان لێ بێ) **دەفەرموون: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر پیاو لەشەودا خێزانەکەی خۆی خەبەربکاتەوەو پێکەوە شەونوێژ بەجەماعەت بکەن، یا هەرکەسەیان دووڕکات نوێژی سوننەت بەتەنیا بۆخۆی بکا،**

---

(٢٢٦) موسليم (٧٦٧).

(٢٢٧) بڕوانە (١٥٥/٣ز ـ ١٥ ب ـ ١ ل ـ ١٤٥).

(٢٢٨) بڕوانە (١٥٣/١ ز ـ ١٥ ب ـ ١ل ـ ١٤٥).

(٢٢٩) ئەبو داوود (١٣٠٨).

(٢٣٠) بوخاری (٢١٢)و موسليم (٧٨٦).

ناویان لەناو پیاوو ژنە ذیکرکەرەکاندا دەنووسریٚو بەر ئەم ئایەتە دەکەون کە دەفەرمویٚ: (والذاکرين والذاكرات أعد الله هم مغفرة وأجراً عظيما) (٣٥/٣٣) واتە: ئەو پیاوو ژنانەی کەبەزمانو دلّ هەمیشە ذیکرو یادی خودا دەکەنو، ناوو یادی خودا بەئاشکراو بەنهێنی بووە بەشەکری سەرزارو ویردی سەر زوبانیان، ئەوانە خودای گەورە لێخۆشبوونی خۆیو پاداشی گەورەی بۆ ئامادەکردوون. (د ـ س/ص) دەلیلولفالیحین ـ کەشەرحی ئەم ریاضولصالیحینەیە ـ دەفەرمویٚ: وشەی ئەهل (واتە: خێزانو کەسوکار) ژنو منالّو کەسوکار هەمووی دەگرێتەوە. کەواتە: کەسێ دایکی. یاخوشکی، یا کچی، یا باوکی، یا برای، یاخزمو منالّی خۆی هەلّ بسێنیٚ بۆ ئەم مەبەستە بەرئەم فەرموودەیە دەکەویٚ (وەرگێڕ).

٢٣٦-١١٨٥/٢٦/ فەرموودەی (.. إذا نعس أحدكم في الصلاة..) بڕوانە (١٤٧/٦ ز ـ ١٤ ب ـ ١ ل ـ ١٣٦).

٢٣٧-١١٨٦/٢٧/ عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنْ اللَّيْلِ فَاسْتَعْجَمَ الْقُرْآنُ عَلَى لِسَانِهِ فَلَمْ يَدْرِ مَا يَقُولُ فَلْيَضْطَجِعْ) رواه مسلم.[٢٣١]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر بەشەو هەلّسا بۆ شەونوێژو لەشەونوێژەکەدا خەودایگرتن، بەڕەنگێکی وا قورئانیان بەڕەوانی بۆ نەدەخوێنراو زمانتان تەتەلّەی دەکردو نەتان دەزانی کەدەلّێن چی، ئیتر دانیشتنو راکشێن تا ماندووتان دەردەچیٚ (م).

## (٢١٣) تەراویحی رەمەزان سوننەتێکی گەورەیە
## باب استحباب قيام رمضان وهو التراويح

٢٣٨-١١٨٧/١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ). متفق عليه.[٢٣٢]

[٢٣١] موسلیم (٧٨٧).

[٢٣٢] بوخاری (٢٠٠٨)و موسلیم (٧٥٩).

**ئەبوهورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کەسێ شەونوێژی رەمەزان بکاو باوەڕی پێی هەبێو باوەڕی بەپاداشی باشی هەبێو ساغ لەبەر رەزای خودابێ، خودا لەگوناهەکانی لەوەوپێشی خۆی خۆش دەبێ (ش).**

**٢/١١٨٨-٢٣٩/** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ فِيهِ بِعَزِيمَةٍ فَيَقُولُ مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) رواه مسلم.[٢٣٣]

**دیسان فەرمووی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هانی یارانی دەدا، لەسەر کردنی شەونوێژی رەمەزان، بەڵام جەختی لێ نەدەکردن، دەیفەرموو: کەسێ شەونوێژی رەمەزان بکا، بەباوەڕو ئیمانەوە، ساغ لەبەر رەزای خودا، خودا لەگوناهەکانی لەوەوپێشی خۆش دەبێ (ش).**

## (٢١٤) گەورەیی شەونوێژی لەیلەتولقەدرو روونکردنەوەی، بەئومێدترین شەوەکانی رەمەزان بۆ لەیلەتولقەدر - باب فضل ليلة القدر

**قال تعالى: (إنا أنزلناه في ليلة القدر) (قەدر - ١/٩٧).**

**خودای گەورە دەفەرموێ: بەڕاستی ئێمە کەخودای ئەم بوونەوەرە بەرینو خاوەنی هەردوو جیهانین ئەم قورئانە پیرۆزەمان ناردووە بۆ محمدی بەندەو پێغەمبەری خۆمان، لەشەوێکی زۆر بەڕێزو نازداردا ناردوومانە بۆی، کەلەبەر گەورەییو نازداریی خۆی مەشهوورە بەشەوی لەیلەتولقەدر، تاکۆتایی سورەت.**

**وقال تعالى: (إنا أنزلناه في ليلة مباركة) الآيات (دخان - ٤٤/٢-٧)**

**واتە: خودای مەزن، لەسوورەتی دوخاندا، کەسوورەتی ژمارە چلو چوارە، لەسەدو چواردە سوورەتەکەی قورئان، لەئایەتی ژمارە دووی ئەم سوورەتەوە تا ئایەتی ژمارە حەوتی دەفەرموێ: لەڕاستی دا من کە خوداو خاوەنی ئاسمانەکانو زەویمو هەرچی لەماندا هەیە، لەسەرو لەخوار هەمووی هی منەو لەقەبضەی قودرەتی مندایە، من ئەم قورئانەپیرۆزەم لەشەوی لەیلەتولقەدردا، کە شەوێکی پیرۆزو فەرڕدارە، کەحاڵی ئەو شەوە وایە هەموو کارو باروئیشو کارێکی گرنگو پڕ حیکمەت لەوشەوەدا یەکالا دەکرێتەوەویەك لایی دەبێتەوە، من ئەم قورئانەم لەم شەوەدا ناردۆتە خوارەوە بۆ موحەممەد، چونکە بڕیاری من لەسەر ئەوەیە کەنامە**

---

[٢٣٣] موسلیم (٧٥٩) (٧٤).

بنێرم بۆ پێغەمبەرانی خۆم، ئەمەیش ڕەحمەتێکە لەخودای تۆوە ئەی موحەممەد بۆ هەموو جیهانیان.

١/١١٨٩-٢٤٠/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ). متفق عليه.[٢٣٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ، بەئیمانو باوەڕەوە ساغ لەبەر ڕەزای خودا شەونوێژی شەوی لەیلەتولقەدر بکا خودا لەگوناهەکانی لەومو پێشی خۆش دەبێ (ش).

٢/١١٩٠-٢٤١/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ رِجَالًا مِنْ أَصْحَابِ النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْمَنَامِ فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ). متفق عليه.[٢٣٥]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: چەند پیاوێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەخەونا، لەحەوت شەوەکانی دوایی ڕەمەزاندا لەیلەتولقەدریان پێ نیشان درابوو، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: وادەزانم کەخەونەکەتان پێکاویەتی ڕێك دەکەوێ لەگەڵ ڕاستی دا، جا کەوابوو ئەوەی کەمشووری بۆ دەخوات بالەحەوت شەوەکانی دوایی دا مشووری بۆ بخوات (ش - ڕەزای خودایان لێ بێ).

٣/١١٩١-٢٤٢/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ) رواه البخاری.[٢٣٦]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو، لەدەی دوایی ڕەمەزاندا خەڵوەی لەمزگەوتا دەکێشا، وەدەیفەرموو: لەدە شەوی دوایی ڕەمەزاندا، بۆ لەیلەتولقەدر بگەڕێن (ش).

٤/١١٩٢-٢٤٣/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنْ الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ).[٢٣٧]

---

[٢٣٤] بوخاری (٢٠١٤)و موسلیم (٧٦٠).

[٢٣٥] بوخاری (٢٠١٥)و موسلیم (١١٦٥).

[٢٣٦] بوخاری (٢٠٢٠)و موسلیم (١١٦٩).

[٢٣٧] بوخاری (٢٠١٧).

دیسان فەرمووی: بگەڕێن بۆ شەوی لەیلەتولقەدر، لەشەوە تاکەکانی دوایی ڕەمەزاندا (ب).

٥/١١٩٣-٢٤٤/ فەرموودەی (.. أحيا الليل ..).[٢٣٨]

٦/١١٩٤-٢٤٥/ عَنْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَجْتَهِدُ فِي رَمَضَانْ، وفِي عشر الأواخر مَا لَا يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهِ) رواه مسلم.[٢٣٩]

دیسان فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەو کۆشش‌و تێکۆشانەی کەلەمانگی ڕەمەزاندا دەیکرد، لەمانگەکانی تردا نەیدەکرد، وە ئەو کۆشش‌و تێکۆشانەی کەلەدەی دوایی ڕەمەزانیشدا دەیکرد لە هیچ کاتێکی تردا ئەوەی نەدەکرد (م).

٧/١١٩٥-٢٤٦/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيُّ لَيْلَةٍ لَيْلَةُ الْقَدْرِ مَا أَقُولُ فِيهَا؟ قَالَ: قُولِي (اللَّهُمَّ إِنَّكَ عُفُوٌّ كَرِيمٌ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي) رواه الترمذي هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.[٢٤٠]

دیسان فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەگەر زانیم شەوی لەیلەتولقەدر کام شەوە چی گوتەیێ بڵێم باشە؟ فەرمووی بڵێ: (اللَّهُمَّ إِنَّكَ عُفُوٌّ كَرِيمٌ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي) خودایە! بەڕاستی تۆ تاوانبەخش‌و گوناهپۆشی‌و حەز دەکەی کەگوناهو نەنگی بەندەی خۆت بپۆشی، کەوایە تاوانم بپۆشەو لەگوناهم خۆش بە! (ت:ح/ح/ص).

## ٢١٥) باسی خێرو گەورەیی سیواك و ئەو ڕەوشە جوانانەی کەدادەنرێن بەخوویەکی زگماکی و سروشتی - باب فضل السواك وخصال الفطرة

١/١١٦١-٢٤٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي أَوْ عَلَى النَّاسِ لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلَاةٍ) متفق عليه.[٢٤١]

---

[٢٣٨] بڕوانە (٩٩/٥ ز - ١١ ب - ل - ١٠٧).

[٢٣٩] موسلیم (١١٧٥).

[٢٤٠] تیرمیذی (٣٥٠٨).

[٢٤١] بوخاری (٨٨٧)و موسلیم (٢٥٢).

ئەبوهورەيرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ نەبادا ئازارو زەحمەتی ئۆمەتم بدەم یا فەرمووی: زەحمەتی ئەو خەڵکە بدەم ئەگینا فەرمانم پێیان دەکرد کەبۆ هەموو نوێژێ سیواك بکەن (ش ـ خا).

١١٩٧/٢-٢٤٨/ وَعَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قالَ: (كانَ النبِيّ ﷺ إذا قامن من النومِ يشوص فاه بالسواك). متفق عليه.[٢٤٢]

حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە شەو هەڵدەسا لەخەو بۆ شەونوێژ، یا بۆ هەرشتێ، سیواکی لەدەمی رادەدا (ش).

١١٩٨/٣-٢٤٩/ وعَنْ عائيشة (رضي الله عنها) قالت: (كنا نعد لرسول الله ﷺ سواكه وطهوره فيبعثه الله ماشاء أن يبعثه من الليل فيتسوك ويتوضأ وصلي) رواه مسلم.[٢٤٣]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران بەشەو سیواكو ئاوی دەسنوێژمان بۆ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئامادە دەکرد، چەندەی حەزی خودای لەسەر بوایە، وەکەی مەیلی ببوایە لەخەو هەڵی دەساندو سیواکی دەکردو دەسنوێژی دەگرتو دەستی دەکرد بەشەونوێژ (م).

١١٩٩/٤-٢٥٠/ عَنْ أَنَسٌ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَكْثَرْتُ عَلَيْكُمْ فِي السِّوَاكِ) رواه البخارى.[٢٤٤]

ئەنەس خۆشنوودی لەسەر فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەبارەی سیواکەوە زۆرم لەگەڵ گوتن! (ب. رەحمەت لەگۆڕی نازداری).

١٢٠٠/٥-٢٥١/ عَنْ شُرَيْحِ بنْ هانئ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ قُلْتُ: (بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يَبْدَأُ النَبِيّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ قَالَتْ: بِالسِّوَاكِ). واه مسلم.[٢٤٥]

شورەیحی کوڕی هانئ (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەعائیشەم گوت: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەدەهاتەوە بۆماڵەوە، لەپێشدا دەستی بەچی دەکرد، فەرمووی: دەستی بەسیواك کردن دەکرد (م).

---

[٢٤٢] بوخاری (٨٨٩)و موسلیم (٢٥٥).

[٢٤٣] موسلیم (٧٤٦) (١٣٩).

[٢٤٤] بوخاری (٨٨٨).

[٢٤٥] موسلیم (٢٥٣).

٦/١٢٠١-٢٥٢/ عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَطَرَفُ السِّوَاكِ عَلَى لِسَانِهِ). رواه مسلم.[٢٤٦]

**ئەبو مووسا** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: چوومە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەودەمەدا سەری سیواکەکە بەسەر زمانیەوە بوو (ش).**

٧/١٢٠٢-٢٥٣/ عَنْ عَائِشَةَ عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ). رواه النسائى وابن خزيمه فى صحيحه بأسانيد صحيحه، وذكر البخارى - رحمه الل - في صحيحه.[٢٤٧]

**عائیشە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: سیواك هەم دەمو ددان پاك كەرەوەیەو هەم هۆو مایەی ڕەزامەندیو خۆشنوودی خودایە (ن/ئیبنوخوزەیمە/ب).**

٨/١٢٠٣-٢٥٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ (الْفِطْرَةُ خَمْسٌ أَوْ خَمْسٌ مِنْ الْفِطْرَةِ: الْخِتَانُ وَالِاسْتِحْدَادُ وَنَتْفُ الْإِبْطِ وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ وَقَصُّ الشَّارِبِ). متفق عليه.[٢٤٨]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەم پێنج شتە لەفیترەتن: واتە: یاساو دەستوورو ڕەوشێکی گەلێ کۆنن و لەبەرکۆنیو لەمێژی دەڵێی خوویەکی زکماكو سروشتین، یەکەم: کوڕو کچ سوننەت کردن، دووەم: بەر تاشین، سێیەم: نینۆك کردن، چوارەم: هەڵکێشانی مووی بنباڵ، پێنجەم: بەرسمێڵ کردنو قرتاندنی مووی سمێڵ (ش).**

٩/١٢٠٤-١٥٥/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَشْرٌ مِنْ الْفِطْرَةِ قَصُّ الشَّارِبِ وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ وَالسِّوَاكُ وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ وَقَصُّ الْأَظْفَارِ وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ وَنَتْفُ الْإِبِطِ وَحَلْقُ الْعَانَةِ وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ قَالَ زَكَرِيَّاءُ قَالَ مُصْعَبٌ وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلَّا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ زَادَ قُتَيْبَةُ قَالَ وَكِيعٌ انْتِقَاصُ الْمَاءِ يَعْنِي الِاسْتِنْجَاءَ). رواه مسلم.[٢٤٩]

---

[٢٤٦] بوخاری (٢٤٤)و موسلیم (٢٥٤).

[٢٤٧] النسائى ١/١٠ وإبن خزيمه (١٣٥).

[٢٤٨] بوخاری (٥٨٨٩)و موسلیم (٢٥٧).

[٢٤٩] موسلیم (٢٦١).

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم دە شتە ڕەوشتێکی سروشتین‌و لەبەرکۆنی‌و لەمێژیی خۆیان دەڵێی خوویەکی زکماکین: یەکەم: بەرسمێڵ کردن‌و قرتاندنی مووی سمێڵ، دووەم: ڕیش هێشتنەوە، سێیەم: نینۆك کردن فرچە کردنی دەم‌و ددان، چوارەم: ئاو لەلووت رادان، پێنجەم: نینۆك کرتاندن، شەشەم: شۆردنی لۆچی سەر جمگەو گرێ پەنجەکان‌و جێ ی لۆچاوی لەش، وەك دەوروبەری گوێ‌و چاڵی ناوك، حەوتەم: هەڵکێشانی مووی بنباڵ، هەشتەم: تاشینی مووی بەر، نۆیەم: تاراتکرتن بەئاو، واتە: خۆشۆردن بەئاو لەپاش سەرئاوکردن، موصعەب کەیەکێکە لەگێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە ـ گوتی: دەهەمیانم لەیاد نەماوە، مەگەر ئاولەدەم وەردان بێ (م).

١٢٠٥/١٠-٢٥٦/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَحْفُوا الشَّوَارِبَ وَأَعْفُوا اللِّحَى). متفق عليه.[٢٥٠]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سمێڵ کورت بکەنەوەو بەرسمێڵ بکەن، بەڵام ڕیش پەروەردە بکەن (ش).

### (٢١٦) باسی دووپات کردنەوەی پێویستی زەکات و ڕوونکردنەوەی خێرو گەورەیی زەکات و ئەوشتانەی پەیوەندی یان هەیە بەزەکاتەوە
### باب تأكيد وجوب الزكاة وبيان فضلها وما يتعلق بها

قال تعالى: (وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة) (بەقەرە ـ ٤٣/٢)

واتە: یەزدانی مەزن فەرموویەتی: نوێژێکی ڕێك‌و پێك، بەبنیات‌و مەرجەکانیەوە بکەن‌و زەکات بدەن.

وقال تعالى: (وما أمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين حنفاء، ويقيموا الصلاة ويؤتوا الزكاة، وذلك دين القيّمة) (بەیینە ـ ٥/٩٨).

تەفسیری ئەم ئایەتە لەپێشەوە رابورد:← (ب ـ ١ ز ـ ١).

١٢٠٧/٢-١٥٨/ عَنْ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺقال: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ ثَائِرَ الرَّأْسِ يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ وَلَا يُفْقَهُ مَا يَقُولُ حَتَّى دَنَا فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنْ الْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ

---

[٢٥٠] بوخاری (٥٨٩٣)و موسلیم (٢٥٩).

فَقَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا قَالَ لَا إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصِيَامُ رَمَضَانَ قَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ قَالَ لَا إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ قَالَ وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الزَّكَاةَ قَالَ هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا قَالَ لَا إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ قَالَ فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ وَاللَّهِ لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلَا أَنْقُصُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ) متفق عليه. [٢٥١]

طەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی قژئاڵۆزکاوی خەڵکی نەجد دەهات بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدوورەوە گرمەی دەنگی دەهات بەڵام نەمان دەزانی دەڵێ چی، جا کە هاتەپێشەوە بۆمان دەرکەوت کەلەبارەی ئیسلامەوە پرسیاری هەیە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەشەوو ڕۆژێکا دەبێ پێنج نوێژ بکەی، پیاوەکە گوتی: باشە نوێژی ترم لەسەرە یانا؟ فەرمووی: نەء، مەگەر بەئارەزووی خۆت نوێژی سوننەت بکەی، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژووی ڕەمەزانیش دەبێ بگری، پیاوەکە گوتی: باشە ڕۆژووی ترم لەسەرە یانا؟ فەرمووی: نەخێر مەگەر بە ئارەزووی خۆت ڕۆژووی تر بگری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) باسی زەکاتیشی بۆ کرد، پیاوەکەیش گوتی: باشە لەمەزیاتر زەکاتی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: نەء، مەگەر بەئارەزووی خۆت خێری تربکەی، لەپاشا کابرا کەڕۆیشتو گوتی: بەخودا نەلەمەزیاتر دەکەمو نەلەمە کەمتر دەکەم، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکا ڕزگاری دەبێ! (ش).

٣/١٢٠٨-٢٥٩/ فەرموودەی: (.. إنك تأتي قوماً من أهل الكتاب ..) بڕوانە (٦/٢٠٨ز - ٢٦ ب - ١ ل - ١٩٥).

٤/١٢٠٩-٢٦٠/ فەرموودەی: (أمرت أن أقاتل الناس..). [٢٥٢]

٥/١٢١٠-٢٦١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنْ الْعَرَبِ فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ

---

[٢٥١] بوخاری (٤٦)و موسلیم (١١).

[٢٥٢] بڕوانە (١/٣٩٠ ز- ٤٩ ب - ١ ل - ٣٠٤).

حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَمَنْ قَالَهَا فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ فَقَالَ وَاللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا قَالَ: عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ قَدْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ). متفق عليه.[٢٥٣]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کەکۆچی دوایی کرد، وەلەپاش ئەو ئەبوبەکر کرا بەجێنشین (خەلیفە) وەئەو عارەبانەی کەلەدین هەڵگەڕابوونەوە پەیدابوون، وە ئەبو بەکر ویستی بچێ بەگژیانا، بەم بۆنەیەوە عومەری کوڕی خەطاب** (ڕەزای خوای لێ بێ) **پێی فەرموو: تۆ چۆن جەنگ دەکەی لەگەڵ ئەم خەڵکەداو بەڵگەت چیە؟ ئەوەی چی دەکەی لەوە کە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: فەرمانم پێ کراوە کەشەڕبکەم لەگەڵ ئەم خەڵکەدا تاشایەتمان دێنن‌و بەزمان دەڵێن: (لا إله الا الله) واتە: هەر خودا خودایەو بەس، ئیتر ئەوکەسەی کەئەمە بڵێ: ئەوا سەروماڵی خۆی لەمن قەدەغەدەکاو خوێن‌و نامووس‌و سەروماڵی لەمن حەرام دەبێ، مەگەر لەسەر حەقی شەرعی، ئیتر لەوەدوا حیساب‌و لێپرسینەوەی نیازی دڵی لەو دنیا لەسەر خودایە ئەبو بەکریش فەرمووی: بەخودا زۆرباش دەچم بەگژ ئەوانەدا کەفەرقی نوێژو زەکات دەکەن‌و دەڵێن نوێژ دەکەین‌و زەکات فەرز نییەو نایدەن، چونکە زەکاتیش مزی ماڵە، سوێند بەخودا ئەگەر گێسکێکتان دابێ بە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **و ئێستە نەیدەن بەمن لەسەرنەدانی ئەو گیسکەیە دەچم بەگژیاندا عومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **دەیفەرموو: بەخودا دیاربوو کەکردنی ئەو جەنگە شتێ بوو خوا نابوویە دڵی ئەبو بەکرەوە، وەمنیش بۆم دەرکەوت کەفەرمایشتەکەی ئەبوبەکر ڕاست بوو (ش).**

٦/١٢١١-٢٦٢/ فەرموودەی: (.. أخبرني بعمل يدخلني الجنة..) بڕوانە (٢٠/٣٣١ز ـ ٤٠ ب ـ ١ ل ـ ٢٦٦).

٧/١٢١٢-٢٦٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) (أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ قَالَ تَعْبُدُ اللَّهَ لَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمُ

---

[٢٥٣] بوخاری (١٣٩٩)و موسلیم (٢٠).

الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ وَتُؤَدِّي الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ وَتَصُومُ رَمَضَانَ قَالَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا فَلَمَّا وَلَّى قَالَ النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا). متفق عليه. [٢٥٤]

ئـەبو هـورەيرە (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: عـارەبێكی دەشـتەكی هاتـە خزمـەتی حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) گـوتی: كـارێكی وام پـێ نیشـان بـدە ئەگـەر كـردم بـبم بەبەهەشـتی؟ فـەرمووی: خـودا بپەرسـتەو بەنـدەیی‌و پەرستشـی بـۆ بكـەو هـیچ هاوبەشـی بـۆ بڕیـار مـەدەو نوێـژە فـەرزەكان بكـەو زەكـاتی فەرزبـدەو، ڕۆژووی ڕەمـەزان بگـرە، پیاوەكـەیش گـوتی: بەوكەسـە كـەگیانی منـی بەدەسـە، كەیـەزدانی پاكـە، لەمانـە زیـاتر ناكـەم، جـا كـە كابراكـە ڕۆیشـت خۆشەویسـت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئـەوەی حـەز دەكـا كەلـەم جیهانـەدا بەچـاوی خـۆی پیـاوێكی بەهەشـتی ببینێ باتەماشای ئەم پیاوە بكا. (ش ـ خا).

٢٦٨ـ١٢١٣/٨/ عَنْ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ (بَايَعْتُ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ). متفق عليه. [٢٥٥]

جـەریری كـوڕی عەبـدوڵلا (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: بـەڵێن‌و پـەیمانم دا بـە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەسەر ئـەوە كەنوێـژێكی ڕێكوپێـك بكـەم‌و، زەكـات بـدەم‌و ئامۆژگاری خێری هەموو موسوڵمانێكیش بكەم (ش). بڕوانە (١٨٢/٢ز ـ ٢٢ ب ـ ١ ل ـ ١٦٩)

٢٦٩ـ١٢١٤/٩/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلَا فِضَّةٍ لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحُ مِنْ نَارٍ فَأُحْمِيَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ كُلَّمَا بَرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْإِبِلُ قَالَ وَلَا صَاحِبُ إِبِلٍ لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا وَمِنْ حَقِّهَا حَلَبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ أَوْفَرَ مَا كَانَتْ لَا يَفْقِدُ مِنْهَا فَصِيلًا وَاحِدًا تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا وَتَعَضُّهُ بِأَفْوَاهِهَا كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولَاهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ

---

[٢٥٤] بوخاری (١٣٩٧)و موسلیم (١٤).

[٢٥٥] بوخاری (١٤٠١)و موسلیم (٥٦).

كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ قَالَ وَلَا صَاحِبُ بَقَرٍ وَلَا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ لَا يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ وَلَا جَلْحَاءُ وَلَا عَضْبَاءُ تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولَاهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْخَيْلُ قَالَ الْخَيْلُ ثَلَاثَةٌ هِيَ لِرَجُلٍ وِزْرٌ وَهِيَ لِرَجُلٍ سِتْرٌ وَهِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ فَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ وِزْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا رِيَاءً وَفَخْرًا وَنِوَاءً عَلَى أَهْلِ الْإِسْلَامِ فَهِيَ لَهُ وِزْرٌ وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ سِتْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِي ظُهُورِهَا وَلَا رِقَابِهَا فَهِيَ لَهُ سِتْرٌ وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ فِي مَرْجٍ وَرَوْضَةٍ فَمَا أَكَلَتْ مِنْ ذَلِكَ الْمَرْجِ أَوْ الرَّوْضَةِ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا كُتِبَ لَهُ عَدَدَ مَا أَكَلَتْ حَسَنَاتٌ وَكُتِبَ لَهُ عَدَدَ أَرْوَاثِهَا وَأَبْوَالِهَا حَسَنَاتٌ وَلَا تَقْطَعُ طِوَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ آثَارِهَا وَأَرْوَاثِهَا حَسَنَاتٍ وَلَا مَرَّ بِهَا صَاحِبُهَا عَلَى نَهْرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَا يُرِيدُ أَنْ يَسْقِيَهَا إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ مَا شَرِبَتْ حَسَنَاتٍ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْحُمُرُ قَالَ مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ فِي الْحُمُرِ شَيْءٌ إِلَّا هَذِهِ الْآيَةَ الْفَاذَّةُ الْجَامِعَةُ (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ * وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ)). **متفق عليه** [٢٥٦]

**ئـەبو هـورەيرە** (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (درووودی خـوای لەسـەر بـێ) **دەفـەرموێ: ئەوكەسەی خاوەنی زێڕو زیـوبێو زەكـاتی لێ دەرنـەكا، لـەڕۆژی قیامـەتا ئـەو زێـڕو زیووە سووردەكرێتەوە لەناو ئاگری دۆزەخـا، تـادەبێ بەیـەك پارچـە ئـاگری سـوور، ئـەوجا تەنیشـتیو ناوچـەوانیو پشـتیو هـەموو لەشـی تـری پێـی داخ دەكـرێ، هەمووجارێ كەسارد دەبێتەوە، سـەرلەنوێ سـوور سـووری دەكەنـەوە بـۆیو دیسـان وای لێ دەكەنەوە، ئیتر لەوڕۆژەدا كـە پـەنجا هـەزار سـاڵ درێـژە ئـەو كابرایـە ئەمـە حاڵیەتی، هەتا موحاكەمەی بەندەگان لـەناو خۆیانـدا تـەواو دەبـێ، ئـەوجا ڕێگـەی خۆی نیشان دەدرێ، جایا بـۆ بەهەشـت، جایـا بـۆ دۆزەخ، گـوترا: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەی وشـتر؟ فـەرمووی: وەئـەوەی خـاوەنی وشـتربێو مـافی مافـداران و هـەقی هەقـدارانی لێ نـەدا، وەیـەكێ لەومافانـەی كەلەوشـتردا هەیـە ئەوەیـە: ئـەوڕۆژەی**

---

[٢٥٦] بوخاری (١٤٠٢)و موسلیم (٩٨٧).

كەوشترەكە دەبرێ بۆسەرئاوو ئاودەدرێو دەدۆشرێ، ئەو شیرە مافی هەژارانی پێوەیە، وەك خەرمانلۆغەی خەرمان، ئەو خاوەن وشترەی مافی مافدارانی لێ نەدا، لەڕۆژی قیامەتدا لەدەشتێكی كاكی بەكاكی دا لەسەردەم رای دەخەن بۆئەو وشترانە، وەتا بلێیت زل زلو فیلەتەنن‌و یەك پارێنەشیان كەم نییە، ئیتر ئەوانیش بەپا دەیشێلن‌و بەدەم دەیگەزن‌و قەپی لێ دەگرن، گشت جارێ كەدوایی یەكەیان بەسەریا تێ دەپەڕێ دیسانەوە بەرایی یەكەیان دەگێڕنەوە بۆسەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەوڕۆژەدا كەپەنجا هەزارساڵ درێژە هەتا مەحكەمەو دادپرسی ناو بەندگان تەواودەبێ، ئەوجار ڕێگەی خۆی پیشان دەدرێ، یا بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ! گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ڕەشەوڵاخ‌و مەڕو بزن؟ فەرمووی: وەئەوەی خاوەنی ڕەشەوڵاخ‌و مەڕو بزن بێ‌و مافی هەژارانیان لێ نەداو زەكاتی شەرعی یان لێ دەرنەكا، لەڕۆژی ژینەوەدا، لەقیامەتدا، لەدەشتێكی كاكی بەكاكی دا لەسەردەم بۆیان ڕادەخرێ، ئەو ئاژەڵە لەوكاتەدا نە تاقەیەكێكیان كەمە، نەشاخبادڕاوێكیان تێدایە، نەكوڵێ، نەشاخشكاوێ، هەموو زرت‌و بزوو ئامادەن بۆ شەڕە قۆچ‌و شۆق وەشاندن، ئیتر بەشاخ دەیدەنە بەر شۆق‌و بەسم گێرەی دەكەن، گشت جارێ كەدوایی یەكەیان بەسەریا تێ دەپەڕن دیسانەوە بەرایی یەكەیان دەگێڕنەوە بۆسەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو ڕۆژەدا كە پەنجا هەزار ساڵ درێژە هەتا مەحكەمەی ناوەندی بەندەگان تەواودەبێ، ئەوجا ڕێگەی خۆی نیشان دەدرێ: سا یا بۆ بەهەشت، سا یا بۆ دۆزەخ، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوا حوكی زێڕو زیوو ڕەشەوڵاخمان‌و بزن‌و مەڕمان زانی ئەی حوكی وڵاخی بەرزە چییەو چۆنە؟ فەرمووی: وڵاخی بەرزە سێ جۆرە:بۆ هەندێ پیاو مایەی شەڕە، بۆ هەندێ پیاو پەردەو داپۆشەرە، بۆ هەندێ پیاو مایەی پاداش‌و خێرە، مایەی تاوان‌و شەڕە بۆئەو پیاوەی كەڕایدەگرێ بۆ چاوەو رووپامایی‌و خۆنواندن‌و شانازی كردن‌و بۆ دوژمنایەتی‌و دژایەتی گەلی ئیسلام‌و، لەدژی موسوڵمانان! پەردەوتارایەكی داپۆشەریشە بۆئەو پیاوەی كەلەڕێگەی خودادا ڕایدەگرێ‌و بۆ روسووری هەردووجیهان كاروكەسابەتی پێوە دەكاو ئەو مافەی كەخودا لەسەر ئەو وڵاخەی داناوە كەبرێتی یە لەخەباتگێڕان لەسەر پشتی، فەرامۆش ناكا، هەروەها مافی وڵاخەكە خۆشی فەرامۆش ناكا، مایەی پاداشی باش‌و خێری گەورەیشە بۆ ئەو

پیاوەی کەڕایدەگرێ بۆ غەزاکردنو تێکۆشان لەبەر ڕەزای خودا، بۆ بەرژەوەندیی گەلی ئیسلام، لەمێرگێکا لەمێرغوزارێکا دەیبەستێتەوە، ئیتر ئەو ولاخە هەرچی بخوا لەو مێرگو مێرغوزارەو چەندە لەو لەوەڕە بلەوەڕێ بەژمارەی ئەوە چاکە بۆخاوەنەکەی دەنووسرێ، وەبەژمارەی تەرسو مێزەکەیشی چاکەو خێرات بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ، تەنانەت ئەگەر مەڕبەندەکەی بپسێنێ، یا گوریسەکەی بپچڕێنێ، وەسەرێ دووسەر غاربکاو بای باڵی خۆی بداو یاری بکاو بەبێ سوارەکەی تەراتین بکا، تەنانەت لەحاڵەتی وادا خودایش بەژمارەی شوێن سمو تەرسو میزەکەی چاکەو خێری بۆ دەنووسێ، گریمان خاوەنەکەی بەسەرئاوێکا بردی، نیازی ئەوەیشی نەبوو کەئاوی بدا، بەلام ولاخەکە لەخۆیەوە دەمی نایە ئاوەکەو لێی خواردەوە ئەوە بەقەد ژمارەی ئەو ئاوەی کەدەیخواتەوە چاکەی بۆ دەنووسرێ، گوترا: قوربان! ئەی گوێدرێژ؟ فەرمووی: لەبارەی گوێدرێژەوە هیچ سروشێکم بەتایبەتی بۆ نەهاتووە، تەنیا ئەم ئایەتە دانسقەو کەم هاوتەیە نەبێ کەتێکڕا هەموو جۆرە خێری، کەمو زۆر، دگرێتەوە: کە دەفەرموێ: (فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره * ومن يعمل مثقال ذرة شر ايره) (زەلزەلە - ٩٩/٨) هەرکەسێ بەقەی سەنگی مێرووچە بچکۆلەیێ چاکەی کردبێ پاداشەکەی دەبینێتەوە، وەهەرکەسێ بەقەی سەنگی مێرووله بچکۆلەیێ خراپەی کردبێ، پاداشەکەی دەبینێتەوە (ش).

**(٢١٧) باسی فەڕزی ڕۆژووی ڕەمەزان و خێرو گەورەیی ڕۆژوو نەوشتانەی پەیوەندییان بەڕۆژووەوە هەیە - باب وجوب صوم رمضان وبيان فضل الصيام وما يتعلق به**

قال تعالى: (يا أيها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قبلكم - الى قوله تعالى - شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان * فمن شهد منكم الشهر فليصمه ومن كان مرضا أو على سفر فعدة من أيام أخر) ألآية (بەقەرە - ٢/١٨٣- ١٨٥).

واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: ئەی کەسانێ کەخاوەنی ئیمانو باوەڕن! ڕۆژوو فەڕز کراوەو دانراوە لەسەرتان، هەروەك دانراوە لەسەر ئەو گەلانەی کەلەپێش ئێوەدا بوون، بەهیوای ئەوە کەلەخودا بترسنو خۆتان بپارێزن لەسزای پەروەردگار، ئەو ڕۆژووەیش وا لەچەند ڕۆژێکی هەڵژمێراودا، کەمانگی ڕەمەزانە، دەی کەسێ

نەخۆش بێ، یا لەسەر سەفەربێ، ئەگەر بەرۆژوو نەبێ درووستە، بەڵام دەشێ کەعوذرەکەی نەماو بیانوەکەی بڕا چەند رۆژی خواردووە ئەوەندە قەزابکاتەوە، پێویستو فەرزە لەسەر ئەوکەسانە کەساغنو لەشوێنی خۆیاندان، بەڵام لەبەر پیریو ناتەوانایی بەخەرج کردنی هەموو تەوانایان نەبێ ناتوانن رۆژوو بگرن، پێویستە لەسەریان کەتۆڵەی ئەو رۆژەیان بدەن، بۆ هەر رۆژەی بەئەندازەی ژەمێ خواردەمەنی گەدایەك، وەلێ ئەگەر کەسێ بەئارەزووی خۆی لەم ئەندازە پتر بدا بەگەدا، ئەوە خێرەو بۆخۆی دەیکا، هەروەها ئەگەر ئەم پیرو بێ تاقەتانە دەیانزانی کەخێری رۆژوو چەندە گەورەیە نەیاندەشکاندو بەرۆژوو دەبوون، مانگی رەمەزان ئەو مانگە پیرۆزەیە کەقورئانی پیرۆزی تیادا نێردراوەتە خوارەوە، بۆ سەر حەزرەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەو قورئانەی کەبووەو دەبێ بەرێنومایی هۆشمەندان، بۆ بیرو باوەڕی باشو بۆ کردەوەی چاك، هەروەك بووەو دەبێ بەشایەتو بەلگەو نیشانەی درەخشان لەسەر پێغەمبەرێتی ی موحەممەد، وە بووەو دەبێ بەهۆی شارەزایی هۆشیاران، وە بەهۆی جیاکردنەوەی راست لەناڕاستو حەق لەناحەق، دەی هەرکەسێ لەئێوە لەو مانگەدا لەجێی خۆی بوو، واتە: لەشی ساغ بوو، وەلەسەفەردا نەبوو، وەبەهانەی رەوای پێ نەبوونی نەبوو، ئەوە با بەرۆژوو بێ، بەڵام نەخۆشو رێبوار بەرۆژوو نەبن، وەلێ کاتێ بەهانە رەهاکەیان نەما چەند رۆژیان لەرەمەزان خواردووە بەئەندازەی ئەوە قەزا بکەنەوە، خودای گەورە هەمیشە خۆشی ئێوەی دەوێو کارتان بۆ ئاسان دەکاو نایەوێ کەبەخۆڕاییو بەبێ حیکمەت تووشی زەحمەتو کاری گرانتان بکا، کەرۆژووی لەسەرتان داناوە، کەزەحمەتو ئەرکی تیادایە، دیارە بەبەلاش نییەو خێری ئێوەی تیادایە، کەرێگەی نەخۆشو رێبوارو بیانووداریش دەدا کەبەرۆژوە نەبن دیارە بارسووکی یەکە بۆئێوەی بەندەگان، کەواتە مانگەکە بەتەواوی بەرۆژوو بنو لێی کەل مەکەن، لەدوا رەمەزانیش لەشەوی جەژنەوە دەست بکەن بە ئەڵلاهوئەکبەر کردن، وەك ئەوە بڵێن: (الله أكبر الله أكبر، لا إلـه إلا الله والله أكبر ولله الحمد)، دەی ئەم عیبادەتی رۆژووە بەنیعمەت بزاننو بەئەركو زەحمەتی دامەنێن، چونکە بەندەیی خودا هۆی شاد بوونە بەبەهرەو نازو نیعمەتەکانی بەهەشت، نازو نیعمەتیش دەبێ شوکری لەسەر بکرێ.

**لەباسی پێش ئەم باسەدا، لەزنجیرەی دووسەدو شازدەدا چەند فەرموودەیێ رابوورد، کەبۆ ئەم باسەیش دەست دەدەن وەك: ژمارە (١٠٧٥/٢+ ١٢٠٧+ ٢٠٨/٦)**

١٢١٥/١-٢٧٠/عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (قَالَ اللَّهُ كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصِّيَامَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ وَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلَا يَرْفُثْ وَلَا يَصْخَبْ فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ). **متفق عليه. وهذا لفظ رواية البخاري.**

**وفي رواية له:** (يَتْرُكُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي الصِّيَامُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا).

**وفى رواية مسلم:** (كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ الْحَسَنَةُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَّا الصَّوْمَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَطَعَامَهُ مِنْ أَجْلِي، لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقَاءِ رَبِّهِ وَلَخُلُوفُ فِيهِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ).[٢٥٧]

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خوای گەورەو سەروەر لەحەدیثێکی قودسی دا دەفەرموێ: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بۆخۆیەتی‌و بەشی دنیایی خۆی پێوەیە بێجگە لەڕۆژوو، بەلام رۆژوو ساخ هەر بۆمنە، لەبەرئەوە من خۆم پاداشی دەدەمەوەو بەس، پاداشێکی وا کەبەکەسی تر نەدرێ، رۆژوو قەلغانەو مەردوم لەخراپە دەگێڕێتەوەو چەکی دەستی رۆژووەوانەو دەبێ بەحەسارو شورە بەدەوری ئاگری دۆزەخا! جا هەر رۆژێ بە بەڕۆژوو بوون قسەی پووچ‌و شاتەشات مەکەن، ئەگەر کەسێکیش جنێوی پێدان، یا شەڕێ پێ فرۆشتن بلێن: من بابایەکی بەڕۆژووم، شەڕە جمێن‌و شەڕکردن بۆمن نەهاتووە، بەزمانی بەڕۆژووەوە دەمی خۆم چەپەڵ ناکەم. بەو کەسە کەگیانی موحەممەدی بەدەسە، کە خودای فریاڕەسە، بۆنی بەلخی رۆژووەوان ـ لەلای خودا ـ لەبۆنی میسك خۆشترە. رۆووەوان لەدوو کاتا شادو کەیف خۆش دەبێ: لەکاتی**

---

[٢٥٧] بوخاری (١٨٩٤)و موسلیم (١١٥١).

بەربانگا شادمانو کامەران دەبێ، وە لەوکاتەیش دا کەدەچێتەوە خزمەتی خودا بەهۆی رۆژووەکەیەوە کەدەبێ بەهۆی پاداشی باش، تەواو کەیفخۆش دەبێ (ش).

لەگێڕانەوەیەکی بوخاریدا: دەفەرموێ: رۆژووەوان لەبەرخاتری من واز لە خۆراكو خواردنەوەو ئارەزووی دەروونی خۆی دێنێو لەئیشی شەرعی لەگەڵ ژنی خۆیدا پارێز دەکا، رۆژوو ساخ هەر بۆمنە، من خۆم دەزانم چۆن پاداشی باشی دەدەمەوە، چاکەش یەك بەدەیە. لەگێڕانەوەیەکی موسلیم دا: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد چەند قات پاداشی دەدرێتەوە، چاکەیش یەك بەدەیە هەتا یەك بەحەوت سەدیش هەیە، بەڵکوو زیاتریش، خودای گەورەو سەروەیش دەفەرموێ: رۆژوو نەبێ، چوونکە رۆژوو ساخ هەر بۆخۆمە، وەپاداشی رۆژوو هەر بەخۆم دەدرێتەوە، رۆژووەوان لەبەرخاتری من واز لەهەوەسو ئارەزووی خۆی دێنێو نانو ئاو لەخۆی قەدەغە دەکا.

٢/١٢١٦-٢٧١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ نُودِيَ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عَلَى مَنْ دُعِيَ مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ كُلِّهَا قَالَ نَعَمْ وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ). متفق عليه.[٢٥٨]

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ جووتێ شت لەڕێگەی خودادا ببەخشێ، وەك ئەوە دوو درەم، یا دوو دینار، یا دوو ماین، یا دوو گا، یا وەك ئەوە مەڕو بزنێ، یا کەواو کراسێ، یا هەنێ شەکرو چا، ببەخشێ کاتێ کەدەچێتە بەهەشت دەرگاوانەکان بانگی دەکەن: ئەی بەندەی خودا! ئەی فیسارە کەس! ئەم دەرگایە باشە لەباوەڕی منا، فەرموو وەرە لێرەوە بچۆرە ژوورەوە! جا ئەوەی خاوەنی نوێژە لەدەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ، وەئەوەی خاوەنی خەباتو غەزابێو لەجیهاندا بەناوی غەزاوە ناوی جوانی دەرکردبێ، لەدەرگای خەباتو

---

[٢٥٨] بوخاری (١٨٩٧)و موسلیم (١٠٢٧).

غەزاوە بانگ دەکرێ، وەئەوەی خێرەوومەند بێ لەدەرگای خێرەوومەندانەوە بانگ دەکرێ، ئیتر هەروا هەموو کردەوەیەکی باش دەرگای تایبەتی خۆی هەیە. ئەبوبەکری صەدیقیش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەباوك و دایکمەوە بەقوربانت بم، خۆ قەیدی نییە یەکێ لەهەموو دەرگاکانەوە گاز بکرێ؟ وە ئایا کەسی وا هەیە کەلەهەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ بکرێ؟ خۆشەویست دایك و باوکم بەقوربانی بێ - فەرمووی: بەڵێ هەیە لەهەموو دەرگاکانەوە بانگ دەکرێ، وە ئومێد دەکەم کەتۆ یەکێك بیت لەوان (ش).

٣/١٢١٧-٢٧٢/ عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ يُقَالُ أَيْنَ الصَّائِمُونَ فَيَقُومُونَ لَا يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ). متفق عليه.[٢٥٩]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دەرگایەك لەبەهەشتا ناوی دەرگای تێراوە، لەڕۆژی قیامەت دا تەنها ڕۆژووەوانەکان لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوەو بەس. بانگەواز دەکەن: ڕۆژووەوانەکان کوان لەکوێن؟ جا ئەوانیش دەڕۆن لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە، کەدوا کەسیان دەچێتە ژوورەوە ئیتر ئەو دەرگایە دادەخرێ و کەسی تری لێوە ناچێتە ژوورەوە (ش).

٤/١٢١٨-٢٧٣/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ وَجْهَهُ عَنْ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا). متفق عليه.[٢٦٠]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەربەندەیێ ڕۆژێ بۆ ڕەزای خودا بەڕۆژوو بێ خودای گەورە بەهۆی ئەو ڕۆژە ڕۆژووەوە حەفتا ساڵە ڕێ دووری دەخاتەوە لەدۆزەخ! (ش ـ خا).

---

[٢٥٩] بوخاری (١٨٩٦)و موسلیم (١١٥٢).

[٢٦٠] بوخاری (٢٨٤٠)و موسلیم (١١٥٣).

٥/١٢١٩-٢٧٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ). متفق عليه.[٢٦١]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لەخۆشەویستەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کەسێ مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێو باوەڕی پێی هەبێو ئیمانی بەو پاداشە باشە هەبێ کەخودا بۆی داناوەو ساخ لەبەر ڕەزای خودا بیگرێ، خودا لەگوناهی لەوەبەری خۆش دەبێ (ش).**

٦/١٢٢٠-٢٧٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ وَصُفِّدَتْ الشَّيَاطِينُ). متفق عليه.[٢٦٢]

**دیسان فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کاتێ کەڕەمەزان دێ دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو ڕەحمەت دەبارێ، دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن، وەشەیتانەکان کۆتو زنجیرو کەلەپچە دەکرێن. (ش ـ خا ـ بوخاریو موسلیم، ڕەزای خودایان لێ بێ).**

٧/١٢٢١-٢٧٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ: النَّبِيّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ فَإِنْ غُبِّيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلَاثِينَ). متفق عليه. وهذا لفظ البخاری وفي رواية مسلم: (فان غم عليكم فصوموا ثلاثين يوما).[٢٦٣]

**دیسان فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: تا مانگی نوێ نەبینن نەبیکەن بە ڕەمەزانو نەبیکەن بەجەژن، ئەگەر هەورو هەلاش بەری مانگی گرتبوو ژمارەی کولەمانگ (شەعبان) بکەن بەسیی ڕۆژی تەواو (ش) لەگێڕانەوەیەکی موسلیم دا: ئەگەر هەورو هەلای لێکردن سیی ڕۆژی تەواو بەڕۆژوو بن.**

---

[٢٦١] بوخاری (١٩٠١)و موسلیم (٧٦٠).

[٢٦٢] بوخاری (١٨٩٨)و موسلیم (١٠٧٩).

[٢٦٣] بوخاری (١٩٠٠)و موسلیم (١٠٨١).

**(٢١٨) باسی بەخشندەیی و چاکە کردن و زۆر خێرا کردن لەمانگی رەمەزاندا، بەتایبەتی لەدەی دوایی دا**

**باب الجود وفعل المعروف والاكثار من الخير في شهر رمضان والزيادة من ذلك في العشر الاواخر**

١/١٢٢٢-٢٧٧/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَجْوَدَ النَّاسِ وَكَانَ أَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ وَكَانَ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ فَيُدَارِسُهُ الْقُرْآنَ فَلَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنْ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ). متفق عليه.[٢٦٤]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودا لەخۆی و بابی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ بەخشندەیی و پیاوەتی و چاکەکردن لەوێنەی خۆی نەبوو، لەرەمەزانیشا - کە جوبرائیل (دروودی خوای لەسەر بێ) لەهەموو کاتێکی تر زیاتر خێری دەکردو شتی دەبەخشی و بەخشندەتر بوو، جوبرائیل عادەتی وابوو لەمانگی رەمەزاندا هەتا مانگ تەواو دەبوو هەموو شەوێ دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەو ماوەیەدا دەوری قورئانی بۆ دەکردەوە هەتا بەباشی ڕەوانی بکاو لەبیری نەچێتەوە، جا لەم کاتەدا کە جوبرەئیل (دروودی خوای لەسەر بێ) هاموشۆی حەزرەتی دەکرد پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ بەخشندەیی و خێر خوایی سەری پێوە نەبوو، وەلەم مانگەدا، بۆ خێر کردن ئەوەندە خێرا بوو، بەهەر چوارلادا خێری دەکردو شتی دەبەخشی، دەتگوت: بای شەماڵی هەڵکراوە، سۆزەی بەهەموو لایەکا دەگات (ش).

٢/١٢٢٣-١٧٨/ فەرموودەی:(.إذا دخل العشر أحيي الليل)بڕوانە:(٥/٩٩ ز-١١ ب-١ ل-١٠٧).

**(٢١٩) لەپاش دووکوتبوونی مانگی کولەمانگ (شەعبان) رۆژووی سوننەت باش نییە هەتا رەمەزان دێ، مەگەر بۆکەسێ لەپێش نیوەی شەعبانەوە هێنابێتی، یاڕێکەوتی عادەتی لەوەو پێشی بکا، وەك گرتنی رۆژی دووشەممەو پێنج شەممەو رۆژنارۆژێ**

**باب النهي عن تقدم رمضان بصوم بعد نصف شعبان الا لمن وصله بما قبله أو وافق عادة له بأن كان عادته صوم الاثنين والخميس فوافقه**

١/١٢٢٤-٢٧٩/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَا يَتَقَدَّمَنَّ أَحَدُكُمْ رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ إِلَّا أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمَهُ فَلْيَصُمْ ذَلِكَ الْيَوْمَ). متفق عليه.[٢٦٥]

---

[٢٦٤] بوخاری (٦)و موسلیم (٢٣٠٧).

[٢٦٥] بوخاری (١٩١٤)و موسلیم (١٠٨٢).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەڕۆژوو دوو رۆژ لەپێش ڕەمەزانا بەڕۆژوو مەبن، مەگەر بۆکەسێ رۆژووی خۆی بگرێ، وەك ئەوە دەستووری وا بێ دوو شەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو بێ، یا رۆژنارۆژێ بەڕۆژوو بێ، یا رۆژووی نەذر بێ، یا قەزابێ، ئەوە قەیناکا با بیگرێ (بوخاری‌و موسلیم، رەحمەتی خودایان لێ بێ).

٢/١٢٢٥-٢٨٠/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لَا تَصُومُوا قَبْلَ رَمَضَانَ صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ فَإِنْ حَالَتْ دُونَهُ غَيَايَةٌ فَأَكْمِلُوا ثَلَاثِينَ يَوْمًا). رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.[٢٦٦]

عەبدوللای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپێش هاتنی رەمەزاندا، لەنیوەی دوەمی مانگی کولەمانگدا بەڕۆژوو مەبن، تا مانگی نوێش نەبینن نەبیکەن بەڕەمەزان‌و نەبیکەن بەجەژن، ئەگەر هەورو هەلاش بەری مانگی گرتبوو سیی رۆژەکە تەواو بکەن (ت: ح/ح/ص).

٣/١٢٢٦-٢٨١/عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا بَقِيَ نِصْفٌ مِنْ شَعْبَانَ فَلَا تَصُومُوا). رواه الترمذی وقال حديث حسن صحيح.[٢٦٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەکولەمانگ دوو کوت بوو ئیتر هەتا رەمەزان دادێ رۆژوو مەگرن (ت:ح/ح/ص).

٤/١٢٢٧-٢٨٢/ عَنْ أَبِي يقظان عمار بن ياسر ﷺ (مَنْ صَامَ الْيَوْمَ الَّذِي يَشُكُّ فِيهِ النَّاسُ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه أبو داود والترمذی وقال: حديث حسن صحيح.[٢٦٨]

ئەبو یەقظان عەمماری کوڕی یاسر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەرکەسێ رۆژووی ئەو رۆژە بگرێ کەخەڵك گومانی لێ دەکەن‌و لێیان روون نییە کەلە ڕەمەزانە یا لەکولەمانگە، ئەوە لەفەرمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەرچووە، کە کەسناوی پیرۆزی ئەبولقاسمە (دروودی خوای لەسەر بێ) (د/ت:ح/ح/ص).

---

[٢٦٦] تیرمیذی (٦٨٨).

[٢٦٧] تیرمیذی (٧٣٨).

[٢٦٨] ئەبو داوود (٢٣٣٤)و تیرمیذی (٦٨٦).

## (٢٢٠) گوتەی كاتی دیتنی مانگی یەكشەوە - باب ما يقال عند رؤية الهلال

١/١٢٢٨-٢٨٣/ عن طلحة بن عبيدالله ﷺ أن النَبِـيّﷺ كان إذا رأى الهلال قال: اللـهم أهله علينا بالأمن والإيمان، والسلامة والسلام، ربي وربك الله، هلال رشـد وخـير، رواه الترمذي وقال: حديث حسن.[٢٦٩]

**طەلحەی كوڕی عوبەیدوڵلا** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **كە مانگی نوێی دەدی دەیفەرموو:** (أللهُمَّ أهله علينا بالأمن والإيمان، والسـلامة والسـلام، ربـي وربـك الله، هـلال رشـد وخـير) **خودایـە! بـەخێرو خۆشـیو لەسـەر ئیمـانو ئیسلامەتیو بەبێ وەیو بەئیمان، هەمیشە ئەم مـانگی نوێیـە لـەم سـەری مانگـەدا هەڵبهێنە بۆمـان، ئـەی مـانگ! مـنو تـۆ هـەردوو پـەروەردەی یـەك پـەروەردگارین، خـودای مـنو خـودای تـۆ یەكـە، كـە یـەزدانی پاكـە، خـودا حـەزكا مـانگی نـوێی سەرفرازیو خێرو خۆشییە. (ت: ح/ح).**

## (٢٢١) باسی خێری پارشێو كردن و دواخستنی بەمەرجێ مەترسی شەبەقدانە نەبێ باب فضل السحور وتأخيره ما لم يخش طلوع الفجر

١/١٢٢٩-٢٨٤/ عَنْ أَنَسْ ﷺ قـالَ: قـالَ: رسـول الله ﷺ (تسـحروا فـإن في السـحور بركة). متفق عليه.[٢٧٠]

**ئەنەس** (رەزای خوای لێ بێ) **لەخۆشەویستەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفـەرموێ: پارشێو بكـەن، چونكە بەرەكەتو پیتو فەڕ لەپارشێودایە (ش).**

٢/١٢٣٠-٢٨٥/عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: كَمْ كَانَ قَدْرُ مَا بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: خَمْسِينَ آيـةً) متفق عليه.[٢٧١]

**زەیدی كوڕی ثابیت** (رەزای خوای لێ بێ) **فـەرمووی: لەگـەڵ پێغەمبـەردا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پارشـێومان كـرد، ئینجـا لەخزمـەتی پێغەمبـەردا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **هەڵسـاین چـووین**

---

[٢٦٩] تیرمیذی (٣٤٤٧).

[٢٧٠] بوخاری (١٩٢٣)و موسلیم (١٠٩٥).

[٢٧١] بوخاری (١٩٢١)و موسلیم (١٠٩٧).

بەلای نوێژەوە، بەزەید گوترا: نێوانی بانگی بەیانیو پارشێوەکە چەند دەبوو؟ فەرمووی: بەقەد ئەوە دەبوو کەیەکێ بە خوێندنی ئاسایی، نەخێرا نەسست، پەنجا ئایەتی مامناوەندی، نەکورت نەدرێژ، بخوێنێ (ش ـ خا).

٢٨٦-١٢٣١/٣/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُؤَذِّنَانِ بِلَالٌ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ قَالَ وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلَّا أَنْ يَنْزِلَ هَذَا وَيَرْقَى هَذَا). متفق عليه.[٢٧٢]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دوو بانگدەری هەبوو، یەکێکیان بیلال بوو، ئەویتریشیان ئیبنوئوممی مەکتوم بوو، کەپیاوێکی کوێر بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: بیلال هێشتا شەوی دەمێنێ کە بانگ دەدا، جا لەبەرئەوە بخۆنو بخۆنەوە هەتا ئیبنو ئوممی مەکتووم بانگ دەدا، ئیبنو عومەر دەیفەرموو: ئەم دوو بانگدەرە هەر ئەوەندەشیان بەین بوو کە یەکەمیان دادەبەزیو ئەوی تریان سەردەکەوت (ش).

٢٨٧-١٢٣٢/٤/ عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحَرِ). واه مسلم.[٢٧٣]

عەمری کوڕی عاص (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جیاوازی رۆژووی ئێمە لەگەڵ رۆژووی خاوەن نامەکان ـ واتە: لەگەڵ رۆژووی گاورو جوولەکەکان ـ بەخواردنەکەی پارشێوە (م).

## (٢٢٢) خێری زوو بەربانگ کردنەوە، وەبەچی بەربانگ بکرێتەوە باشە، وەگوتەی پاش بەربانگ

## باب فضل تعجيل الفطر وما يفطر عليه وما يقوله بعد افطاره

٢٨٨-١٢٣٣/١/ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ). متفق عليه.[٢٧٤]

---

[٢٧٢] بوخاری (٢٦١٧)و موسليم (١٠٩٢) (٣٨).

[٢٧٣] موسليم (١٠٩٦).

[٢٧٤] بوخاری (١٩٥٧)و موسليم (١٠٩٨).

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەردوم هەتا پەلە لەبەربانگ بکەن و بەربانگ بەفتگا نەخەن و لەکاتی خۆیدا ڕۆژوو بشکێنن نیشانەی ئەوەیە کەهێشتا هەر باشن و لەڕێی ڕاست لایان نەداوە (ش).

٢٨٩-١٢٣٤/٢/ عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ ﷺ قَالَ: (دَخَلْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقَالَ لَهَا مَسْرُوقٌ رَجُلَانِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كِلَاهُمَا لَا يَأْلُو عَنْ الْخَيْرِ أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الْمَغْرِبَ وَالْإِفْطَارَ وَالْآخَرُ يُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ وَالْإِفْطَارَ فَقَالَتْ مَنْ يُعَجِّلُ الْمَغْرِبَ وَالْإِفْطَارَ؟ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ يعني ابن مسعود، فَقَالَتْ هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ). رواه مسلم.[٢٧٥]

ئەبوعەطییە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من و مەسروق (ڕەزای خوای لێ بێ) چووین بۆلای عائیشە پێمان گوت: ئەی دایکی موسوڵمانان! دوو پیاو هەن هەردوکیان بۆ خێرو چاکەکردن درێغی ناکەن وەهەردووکیشیان لەیارانی موحەممەدن (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڵام یەکێکیان زوو بەربانگ دەکاتەوەو زوویش نوێژی شێوان دەکا، وەئەوەی تریان درەنگ بەربانگ دەکاتەوەو درەنگیش نوێژی شێوان دەکا، ئایا کاری کامەیان زۆر تەواوە؟ عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کامیان بەزوویی بەربانگ دەکاتەوەو بەزوویی نوێژی شێوان دەکا؟ گوتمان: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود. فەرمووی: جاران حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆیشی ئاوای دەکرد (م).

٢٩٠-١٢٣٥/٣/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَحَبُّ عِبَادِي إِلَيَّ أَعْجَلُهُمْ فِطْرًا). رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.[٢٧٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر، لەفەرمایشتێکی پیرۆز (حەدیثێکی قودسی) دا دەفەرموێ: خۆشەویسترینی بەندەگانم لەلام ئەوانەیانە کەزووتر بەربانگ دەکەنەوە (ت:ح/ح).

---

[٢٧٥] موسلیم (١٠٩٩).

[٢٧٦] تیرمیذی (٧٠٠).

٢٩١-١٢٣٦/٤/ وعن عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ مِنْ هَا هُنَا وَأَدْبَرَ النَّهَارُ مِنْ هَا هُنَا وَغَرَبَتْ الشَّمْسُ فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ). متفق عليه.[٢٧٧]

عومەری كوڕی خەتاب (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: كەشەو ئالێرەوە، لای خۆرهەڵاتەوە، داهاتو ڕۆژ ئالێرەوە لای خۆرنشینەوە نەماو خۆر ئاوابوو، ئیتر كاتی بەربانگی ڕۆژووەوانە (ش).

٢٩٢-١٢٣٧/٥/ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ صَائِمٌ فَلَمَّا غَرَبَتْ الشَّمْسُ قَالَ انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ أَمْسَيْتَ قَالَ انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عَلَيْكَ نَهَارًا قَالَ انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا فَنَزَلَ فَجَدَحَ ثُمَّ قَالَ إِذَا رَأَيْتُمْ اللَّيْلَ أَقْبَلَ مِنْ هَا هُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ قِبَلَ الْمَشْرِقِ). متفق عليه.[٢٧٨]

ئەبو ئیبراهیم عەبدوڵلای كوڕی ئەبو ئەوفا (رەزای خوای لێ بێ) فەرموی: لەسەفەرێكا لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) دەڕۆیشتین بەڕێ دا، حەزرەت خۆی (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڕۆژوو بوو، كەخۆرئاوا بوو بەپیاوێكی فەرموو: ئەی فیسار! دابەزە قاوتو ئاومان بۆ بكەو بەكەوگیرەكە تێی رادە ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا زووە، بابەتەواوی ببێ بەئێوارە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دابەزەو قاوتو ئاوەكەمان بۆ بگرەوە، گوتی: هێشتا هەر ڕۆژە، فەرمووی: دابەزەو قاوتو ئاومان بۆ بگرەوە پیاوەكەیش دابەزیو قاوتو ئاوی بۆ كردنو شەڵەقاندیو دای پێیان جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خواردیەوە، لەپاشا فەرمووی: كەتەماشاتان دەكرد واشەو لێرەوە داهات ئیتر كاتی بەربانگی ڕۆژووەوانە عەبدوڵلای كوڕی ئەبو ئەوفا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاماژەی بۆخۆرهەڵات كرد (ش).

٢٩٣-١٢٣٨/٦/ عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ يَبْلُغُ بِهِ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ، فَإِنَّهُ بَرَكَةٌ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ تَمْرًا فَالْمَاءُ فَإِنَّهُ طَهُورٌ). رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.[٢٧٩]

---

[٢٧٧] بوخاری (١٩٥٤)و موسلیم (١١٠٠).

[٢٧٨] بوخاری (١٩٥٥)و موسلیم (١١٠١).

[٢٧٩] ئەبو داوود (٢٣٥٥)و تیرمیذی (٦٥٨) بڕوانە (٣٣٢/٢١ز - ٤٠ ب - ١ ل - ٢٦٦).

سەلمانی کوڕی عامیری ئەل - ضوببی، کەهاوڕێی حەزرەت بوو، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەخورما بەربانگ بکەنەوە، چونکە شتێکی پیرۆزو موفەڕکە، ئەگەر خورما نەبوو بەئاو ڕۆژووەکانتان بشکێنن، چونکە ئاو پاکەوەکەرە، خودا حەزکا دەبێ بەپاکەوەکەری دەروون‌و دەرەوەتان (د - ت: ح/ ح/). بڕوانە: (ب/١ ز/٤٠ ل/٢٦٦ ژ/٢١/٣٣٢).

١٢٣٩/٧-٢٩٤/عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَبِـيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُفْطِرُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَى رُطَبَاتٍ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَتُمَيْرَاتٌ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تُمَيْرَاتٌ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ). رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث حسن.[٢٨٠]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەپێش کردنی نوێژی شێواندا، بەچەند دەنکێ فەریکە خورما ڕۆژووەکەی دەشکاند، بەڵام ئەگەر فەریکە خورما نەبوایە بەچەند دەنکۆڵەیێ خورما دەیشکاند، جا ئەگەر خورمایش دەست نەکەوتایە ئەوسا بەچەن قومێ ئاو ڕۆژووەکەی دەشکاندو ئەوجا نوێژی شێوانی دەکردو لەپاش نوێژەکە شێوی دەکرد (د/ت: ح/ح).

وەك لەدەلیلولفالیحین دا دەفەرموێ: دانەر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) حەدیثی گوتەی پاش بەربانگی لەبیرچووە لەبەرئەوە ئەم دوو حەدیثە لەم بارەیەوە دەنووسین: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەبەربانگی دەکردەوە دەیفەرموو: (ذهب الظمأ وابتلت العروق وثبت الاجر إن شاء الله) تونێتی ڕۆیشت‌و ڕەگ‌و دەمارەکان تەڕبوونەوەو خودا حەزکا پاداشی باشیش جێگەی خۆی گرت (د - سند صالح - ن/تاج).

جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەڕۆژووی دەشکاند دەیفەرموو: اللهم لك صمت وعلى رزقك أفطرت: خودایە! بۆ ڕەزای تۆ بەڕۆژوو بووم‌و بەڕزق‌و ڕۆژیی تۆ بەربانگ دەکەمەوە (د - سەنەد صالح - طەبەرانی/تاج) گفتەی طەبەرانی ئاوایە: بسم الله اللهم لك صمت وعلى رزقك أفطرت: بەناوی خودا، ئەی خودایە! لەبەر ڕەزای تۆ بەڕۆژوو دەبم‌و بەرزق‌و ڕۆژیی تۆ بەربانگ دەکەمەوە! (وەرگێڕ).

---

[٢٨٠] ئەبو داوود (٢٣٥٦)و تیرمیذی (٦٩٤).

## (٢٢٣) فەرمان بەڕۆژووەوان كراوە كەزمانی پاك بێ و لەبێ شەرعی بپارێزێ، ئاگای لەدەم و زمانی خۆی بێ و لەشەڕە جنێوو ئەمانە لابدا
## باب أمر الصائم بحفظ لسانه وجوارحه عن المخالفات والمشاتمة ونحوها

١٢٤٠/١-٢٩٥/ فەرموودەی: (إذا كان صوم احدكم..).[٢٨١]

١٢٤١/٢-٢٩٦/ وعنه (أي عن أبي هريرة) ﷺ قال: قال النبيﷺ: من لم يدع قول الزور والعمل به، فليس لله حاجة في أن يدع طعامه وشرابه) رواه البخاری.[٢٨٢]

لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو ڕۆژووە وانەی كەلەقسەی ناڕەواو كاری ناڕەوا وازنەیەنێ، خودا كاری بەوەی ئەو نییە كەدەمی خۆی ببەستێو ناںو ئاو نەخوا، گوایە بەڕۆژووە (ب).

## (٢٢٤) باسی چەند بابەتێكی ڕۆژوو - باب في مسائل من الصوم

١٢٤٢/١-٢٩٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا نَسِيَ فَأَكَلَ وَشَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ). متفق عليه.[٢٨٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەر بێ): كەسێكتان ئەگەر لەیادی نەبوو كەبەڕۆژووە، لەبەرئەوە چ شتێكی خوارد، یا چشتێكی خواردەوە، ئەوە با ڕۆژووەكەی نەشكێنێو، ئەو نانو ئاوەیش كەخواردوویەتی رزقو ڕۆژیی یەك بووە خودا بۆی ڕەخساندووە (ش).

١٢٤٣/٢-٢٩٨/ عَنْ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: (يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي عَنْ الْوُضُوءِ قَالَ أَسْبِغْ الْوُضُوءَ وَخَلِّلْ بَيْنَ الْأَصَابِعِ وَبَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا). رواه أبو داود والترمذی، وقال: حديث حسن صحيح.[٢٨٤]

لەقیطی كوڕی صەبرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! دەستنوێژم پێ بڵێ؟ فەرمووی: دەسنوێژێكی تێرو تەسەل بگرەو دەست بخەرە بەینی پەنجەكانتو نێوانەكانتان بەپەنجە بئاژنەوەو زۆرباش ئاو لەدەمو لووتت

---

[٢٨١] بڕوانە: (١٢١٥ ز ـ ٢٧١ ب ـ ٣ ل ..).

[٢٨٢] بوخاری (١٩٠٣).

[٢٨٣] بوخاری (١٩٣٣)و موسلیم (١١٥٥).

[٢٨٤] ئەبو داوود (٢٣٦٦)والترمذي(٧٨٨).

ومردەو هنگ بكە، ئەگەر بەڕۆژوو نەبووی، بەڵام ئەگەر بەڕۆژوو بووی لەئاو لەدەم‌و لووتڕادان زۆر پێی هەڵمەبڕە (د/ت:ح/ ح/ ص).

٣/١٢٤٤-٢٩٩/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قالت: كَانَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ أَهْلِهِ ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ). متفق عليه.[٢٨٥]

عائیشە - خۆشنوودی خودای لەسەربێ - فەرمووی: جاری وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەڕەمەزاندا، بەشەو لەگەڵ ژنەكانیا دروست دەبوو، بەلەشی پیسەوە بەیانی لێ دەدا، ئەوسا خۆی دەشۆرد، لەهەمان كاتا ئەو رۆژە بەڕۆژوو دەبوو (ش - پڕ گۆڕی پیرۆزیان پڕ لەڕەحمەتی خودابێ).

٤/١٢٤٥-٣٠٠/ عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قالتا: (كَانَ النَّبِيّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ غَيْرِ حُلُمٍ ثُمَّ يَصُومُ). متفق عليه.[٢٨٦]

عائیشەو ئوممو سەلەمە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: جاری وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەلەشی پیسەوە بەیانی لێ دەدا، لەش پیسی ی جووتبوونیش لەگەڵ حەڵاڵەكانیا، نەك لەشپیسی ی شەیتانی بوون، لەگەڵ ئەوەیشا ئەو رۆژە بەڕۆژوو دەبوو، كەواتە بەلەشی پیسەوە رۆژوو دروستە (ش).

**(٢٢٥) باسی گەورەیی گرتنی رۆژووی موحەڕەم و كوڵەمانگ (شەعبان) و چوار مانگە حەرامە (ئەشهورولحوروم) ەكان كەڕەجەب و ناوجەژنان (زیلقەعدە) و قوربان و موحەڕەمن - باب بيان فضل صوم المحرم وشعبان والاشهر الحرم**

١/١٢٤٦-٣٠١/ فەرموودەی: (.. أفضل الصيام بعد رمضان..).[٢٨٧]

٢/١٢٤٧-٣٠٢/عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (لَمْ يَكُنْ النَّبِيّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ شَهْرًا أَكْثَرَ مِنْ شَعْبَانَ فَإِنَّهُ كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ). متفق عليه.[٢٨٨]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: نەم دیوە كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مانگێكی تەواو بەڕۆژوو بێ، جگە لەمانگی رەمەزان، نەیشم دیوە كەلەهیچمانگێكا بەقەی

---

[٢٨٥] بوخاری (١٩٣٠)و موسليم (١١٠٩) (٧٥).

[٢٨٦] بوخاری (١٩٣١)و موسليم (١١٠٩) (٨٠).

[٢٨٧] بڕوانە (١١٦٧/٨از - ٢١٢ ب - ٣ ل - ..).

[٢٨٨] بوخاری (١٩٦٩)و موسليم ٧١١/٢ رقم: (١٧٦) (١٧٧).

مانگی کوڵەمانگ بەڕۆژووبێ، کوڵەمانگ هەمووی دەگرت کەمێکی نەبێ، بگرە ساڵی وابوو گشتی دەگرت. (ش/ تاج رەحمەتی خودا لەهەموویان).

١٢٤٨/٣-٣٠٣/ عَنْ مُجِيبَةَ الْبَاهِلِيَّةِ ﷺ (أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ انْطَلَقَ فَأَتَاهُ بَعْدَ سَنَةٍ وَقَدْ تَغَيَّرَتْ حَالُهُ وَهَيْئَتُهُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمَا تَعْرِفُنِي قَالَ وَمَنْ أَنْتَ قَالَ أَنَا الْبَاهِلِيُّ الَّذِي جِئْتُكَ عَامَ الْأَوَّلِ قَالَ فَمَا غَيَّرَكَ وَقَدْ كُنْتَ حَسَنَ الْهَيْئَةِ قَالَ مَا أَكَلْتُ طَعَامًا إِلَّا بِلَيْلٍ مُنْذُ فَارَقْتُكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمَ عَذَّبْتَ نَفْسَكَ ثُمَّ قَالَ صُمْ شَهْرَ الصَّبْرِ وَيَوْمًا مِنْ كُلِّ شَهْرٍ قَالَ زِدْنِي فَإِنَّ بِي قُوَّةً قَالَ صُمْ يَوْمَيْنِ قَالَ زِدْنِي قَالَ صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ قَالَ زِدْنِي قَالَ صُمْ مِنْ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ صُمْ مِنْ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ صُمْ مِنْ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ وَقَالَ بِأَصَابِعِهِ الثَّلَاثَةِ فَضَمَّهَا ثُمَّ أَرْسَلَهَا). رواه أبو داود. وشهر الصبر رمضان.[289]

موجیبەی باهیلییە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: باوکم - یا فەرمووی: مامەم - دەچێ بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەپاشا دەڕواتەوەو پاش ساڵێ لەوەدوا دەچێتەوە بۆ خزمەتی، بەڵام لەجارێ دووهەما رەنگو رووی تەواو دەگۆڕێو شێوەی وەك خۆی نامێنێ، لەبەرئەوە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) نایناسێتەوە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە نامناسیتەوە؟ دەفەرموێ: بۆ تۆ کێیت؟ دەڵێ: من ئەو پیاوە باهیلی یەم کەپار هاتم بۆلات، دەفەرموێ: خۆتۆ پیاوێکی قۆز بووی! بۆچی وا گۆڕاوی؟ دەڵێ: ئەوەتی لەتۆ جیابوومەتەوە بەشەو نەبێ رۆژووم نەشکاندووە. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بۆچی ئازاری خۆتت داوە؟ ئنجا فەرمووی: رۆژووی مانگی رەمەزان بگرە کەمانگی صەبرە، وە لەهەموو مانگێکیش یەك رۆژ بەڕۆژوو بە، دەڵێ: بۆم زیاتر کە، توانای پترم هەیە، دەفەرموێ: دەلەگشت مانگێ دوو رۆژ بەڕۆژوو بە، دەڵێ: بۆم پترکە، دەفەرموێ: دە لەهەموو مانگێ سێ رۆژ بەڕۆژوو بەو دیسان وازبێنە هەروەها ناوبەناو سێ رۆژ بەڕۆژوو بەو ماوەیێ بەڕۆژوو مەبە. حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) هەمووجارێ بەسێ پەنجەی خۆی دەلکان بەیەکەوەو ئینجا بەری دەدانەوە (ئەبو داوود، پڕ گۆڕی لەنوورو رەحمەتی خودا بێ).

---

[289] ئەبو داوود (٢٤٢٨).

**(٢٢٦) باسی گەورەیی ڕۆژوو گرتن و خێرکردن و هەموو جۆرە بەندەیی کردنێ لەدەی یەکەمی مانگی قوربان دا - باب فضل الصوم وغيره في العشر الاول من ذي الحجة**

١٢٤٩/١-٣٠٤/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الْأَيَّامِ الْعَشْرِ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ) رواه البخاري.[٢٩٠]

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هیچ ڕۆژانێ نییە کەوەك ئەم دەرۆژەی یەکەمی مانگی قوربانە کردەوەی باشیان تیا خۆشەویستو پەسەند بێ لەلای خودای گەورە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هەتا خەباتو تێکۆشانیش لەڕێگەی خودا دا هاوتای کردەوەی باشی ئەم ڕۆژانە ناکا؟ فەرمووی: بەڵێ، هەتا خەباتو غەزاش لەڕێگەی خودادا خێرو پاداشی وەك ئەوە گەورە نییە، مەگەر کەسێ کەبەسەرو ماڵەوە بڕوات بۆ غەزاو هیچیان نەهێنێتەدواوە! (ب ـ ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).**

**(٢٢٧) خێری ڕۆژووی نۆمینەی حاجیان و دەهەم و نۆهەمی مانگی موحەڕەم**
**باب فضل صوم يوم عرفة وعاشوراء وتاسوعاء**

١٢٥٠/١-٣٠٥/ عَنْ أَبِي قتادة ﷺ قَالَ: (سئل رسول الله ﷺ عن صوم يوم عرفة؟ قال: يكفر السنة الماضية والباقية). رواه المسلم.[٢٩١]

**ئەبو قەتادە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: بۆ گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی نۆمینەی حاجیان لە پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **پرسیارکرا، فەرمووی: ئومێدم هەیە بەکەرەمی کەڕۆژووی ڕۆژی نۆی مانگی قوربان، کەناوداره بەڕۆژی عەرەفە، برێتی ی گوناهی ساڵێ پێش خۆیو ساڵێ پاش خۆی بکەوێ (م/ تاج ـ ڕەحمەتی خودایان لێ بێ).**

١٢٥١/٢-٣٠٦/ عَن ابن عباس ﷺ (أن رسول الله ﷺ صام يوم عاشوراء وأمر بصيامه). **متفق عليه.**[٢٩٢]

---

[٢٩٠] بوخاری (٩٦٩).

[٢٩١] موسلیم (١١٦٢).

[٢٩٢] بوخاری (٢٠٠٤)و موسلیم (١١٣٠) (١٢٨).

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕۆژی دەی موحەڕەم کەناوداره بەعاشورا، بەڕۆژوو بوو، وەفەرمانی دا بە موسوڵمانانیش کەئەو ڕۆژە بەڕۆژووبن و هەموو ساڵێ دەی موحەڕەم بگرن. (ش - ڕەزای خوای لێ بێ).

٣/١٢٥٢-٣٠٧/ عَنْ أبي قتادة ﷺ (أن رسول الله ﷺ سئل عن صيام يوم عاشوراء؟ فقال: يكفر السنة الماضية). راوه مسلم.[٢٩٣]

ئەبو قەتادە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆ گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی دەی موحەڕەم لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) پرسیارکرا؟ فەرمووی: بڕێتی گوناهی ساڵی ڕابردوو دەکەوێ (م).

٤/١٢٥٣-٣٠٨/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لَئِنْ بَقِيتُ إِلَى قَابِلٍ لَأَصُومَنَّ التَّاسِعَ). رواه مسلم.[٢٩٤]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر مام و نەمردم، لەساڵی ئاییندەدا ڕۆژی نۆی موحەڕەمیش بەڕۆژوو دەبم (م).

## (٢٢٨) گرتنی شەش ڕۆژ لەمانگی شەشەڵان سوننەتە
## باب استحباب صوم ستة أيام من شوال

١/١٢٥٤-٣٠٩/عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ). رواه مسلم.[٢٩٥]

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ لەپێش دا ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ، وەلەپاش ئەو شەش ڕۆژیش لەشەشەڵان بگرێ، ئەوە وەکوو بەدرێژایی ساڵ هەر بەڕۆژووبێ وایە (م: ڕەزای خودای لێ بێ).

---

[٢٩٣] موسلیم (١١٦٢).

[٢٩٤] موسلیم (١١٣٤) (١٣٤).

([٢٩٥]) موسلیم (١١٦٤).

## (٢٢٩) گرتنی دوو شەممەو پێنج شەممە سوننەتە
## باب استحباب صوم الاثنين والخميس

١٢٥٥/١-٣١٠/ عَنْ أبي قتادة ﷺ (سئل يوم عن صوم يوم الاثنين؟ فقال: ذلك يوم ولدت فيه، أو أنزل علي فيه). رواه مسلم.[٢٩٦]

ئەبو قەتادە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆ گرتنی ڕۆژووی دوو شەممە لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پرسیارکرا: حیکمەتەکەی چییە؟ فەرمووی: من لەڕۆژی دوو شەممەدا لەدایکبوومو هەر لەم ڕۆژەیشا قورئانم بۆهات، کەواتە: ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی پیرۆزەو شایانی ئەوەیە کە موسوڵمان تیا بەڕۆژووبێ (م).

١٢٥٦/٢-٣١١/عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ( تُعْرَضُ الْأَعْمَالُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ). رواه الترمذي، وقال حديث حسن، ورواه المسلم بغير ذكر صوم.[٢٩٧]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کردەوەکانی هەموو بەندەیێ لەڕۆژی دووشەممەو پێنج شەممەدا دەوردەکرێنەوەو لەحوزوری خودادا رادەنوێنرێن، لەبەرئەوە حەز دەکەم لەم دوو ڕۆژەدا کە کردەوەم رادەنوێنرێو لە حوزوری خودادا دەور دەکرێتەوە خۆم بەڕۆژوو بم (ت: ح/ح)

١٢٥٧/٣-٣١٢/ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: (كَانَ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَحَرَّى صَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ). رواه الترمذي وقال: حديث حسن.[٢٩٨]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مشووری ڕۆژووی دووشەممەو پێنج شەممەی دەخوارد (ت: ح/ح).

---

[٢٩٦] موسلیم (١١٦٢) (١٩٧).

[٢٩٧] تیرمیذی (٧٤٧) و موسلیم (٢٥٦٥).

[٢٩٨] تیرمیذی (٧٤٥).

## (٢٣٠) گرتنی سێ رۆژ لەهەموو مانگێ سوننەتە
## باب استحباب صوم ثلاثة أيام من كل شهر

والافضل صومها في أيام البيض، وهي الثالث عشر والرابع عشر والخامس العشر، وقيل: الثاني عشر والثالث عشر والرابع عشر، والصحيح المشهور هو الأول.

**باشتر وایە ئەو سێ رۆژە بکەوێتە ئەییامولبەییضەوە واتە: رۆژە شەو روناکەکان کەبرێتین لەرۆژی سیازدەو چاردەو پازدە، هەندێ دەڵێن: برێتین لەدوازدەو سیازدەو چاردە، بەڵام فەرمایشتی ساغ فەرمایشتی یەکەمە.**

١٢٥٨/١-٣١٣/ فەرموودەی (.. أوصاني خليلي ﷺ بثلاث..) بڕوانە: (١١٣٩/١از - ٢٠٦ ب - ٣ ل ...)

٢/١٢٥٦-٣١٤/ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: (أَوْصَانِي حَبِيبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِثَلَاثٍ لَنْ أَدَعَهُنَّ مَا عِشْتُ بِصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ وَصَلَاةِ الضُّحَى وَبِأَنْ لَا أَنَامَ حَتَّى أُوتِرَ) رواه مسلم.[٢٩٩]

**ئەبو دەرداء** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: دۆستی خۆشەویستم پێغەمبەری خۆشەویستو نازدارم -** (دروودی خوای لەسەر بێ) **- ئامۆژگاری کردووم، کەهەتا ماوم ئەم سێ شتە تەرك نەکەم: لەهەموو مانگێ سێ رۆژ رۆژوو بگرم، وەنوێژی چێشتەنگاو هەموو رۆژێ بکەم، وەهەتا نوێژی وەتریش نەکەم نەنووم (م).**

٣/١٢٦٠-٣١٥/ وعن عبدالله بن عمرو بن عاص ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ (صوم ثلاثة أيام من كل شهر صوم الدهر كله). متفق عليه.[٣٠٠]

**عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرکەسێ ڕەمەزانەو ڕەمەزان بەڕۆژووبێو لەگشت مانگێکیش سێ رۆژ بەڕۆژووبێ ئەوە وەك بەدرێژایی رۆژگار ساڵ دوانزە مانگە بۆ رەزای خودا بەڕۆژووبێ وایە (ش/ تاج).**

٤/١٢٦١-٣١٦/عَنْ مُعَاذَةُ الْعَدَوِيَّةُ ﷺ (أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ؟ قَالَتْ:

---

[٢٩٩] موسليم (٧٢٢).

[٣٠٠] بوخاری (١٩٧٩)و موسليم (١١٥٩).

نَعَمْ. فَقُلْتُ: لَهَا مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ كَانَ يَصُومُ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِي مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ يَصُومُ). رواه مسلم.[٣٠١]

**موعاذەی عەدەوییە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: بەعائیشەم گوت: ئایا کوو پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کردبووی بەیاسا کەلەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژووبێ؟ فەرمووی: ئا، گوتی: پێم گوت: لەکوێی مانگەوە بەڕۆژوو دەبوو؟ فەرمووی: دەربەستی ئەوەنەبوو کەچ ڕۆژێ لەمانگ بەڕۆژووبێ (م).**

٥/١٢٦٢-٣١٧/ عَنْ أَبِى ذَرّ ﷺ قال: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا أَبَا ذَرّ: (إِذَا صُمْتَ مِنْ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَصُمْ ثَلَاثَ عَشْرَةَ وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ وَخَمْسَ عَشْرَةَ). رواه الترمذى وقال حديث حسن.[٣٠٢]

**ئەبو ذەڕ** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرمووم: ئەگەر لەمانگ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بووی، ئەوا سیازدەو چوارەو پازدە بەڕۆژوو بە. (ت:ح/ح).**

٦/١٢٦٣-٣١٨/ وعَن قتادة بن ملحان ﷺ قال: كان رسول الله ﷺ (يأمرنا بصِيَامِ أَيَّامِ الْبِيضِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ وَخَمْسَ عَشْرَةَ) رواه أبو داود.[٣٠٣]

**قەتادەی کوڕی میلحان** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: جاران حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمانی پێ دەکردین کە ڕۆژە شەو ڕووناکەکان (ئەییامولبیضەکان) بەڕۆژووبین، کەڕۆژانی سیازدەو چاردەو پازدەن. (ئەبو داوود ـ ڕەحمەتی خودای لێ بێ).**

٣/١٢٦٤-٣١٩/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَا يُفْطِرُ أَيَّامَ الْبِيضِ فِي حَضَرٍ وَلَا سَفَرٍ). رواه النسائى باسناد حسن.[٣٠٤]

**ئیبنوعەبباس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: جاران حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەلەماڵەوەو نەلەسەفەردا لەڕۆژە شەو ڕووناکەکان دا ڕۆژووی نەدەشکاند (ن - س/حەزرەت).**

---

[٣٠١] موسلیم (١١٦٠).

[٣٠٢] تیرمذی (٧٦١).

[٣٠٣] ئەبو داوود (٢٤٤٩).

[٣٠٤] نەسائی ٤/١٩٨-١٩٩.

### (٢٣١) خێری کەسێ بەربانگ بدا بەڕۆژووەوان و خێری ئەو ڕۆژووەوانەی شتی لەلادا دەخورێ و شت خۆرەکە چ نزایێ بۆ ڕۆژووەوانەکە بکا کە شتی لەلا دەخوات
### باب فضل من فطر صائما وفضل الصائم الذي يؤكل عنده ودعاء الآكل للمأكول عنده

١٢٩٥/١-٣٢٠/ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا) رواه الترمذی، وقال: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.[٣٠٥]

لەزەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی یەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ بەربانگ بدا بەڕۆژووەوانێ، ئەویش بەقەد ڕۆژووە وانەکە پاداشی باشی بۆ دەنووسرێ، وەڵێ لەپاداشی ڕۆژووەوانەکە یەك تۆز کەم نابێتەوە (ت: ح/ح/ص).

١٢٦٦/٢-٣٢١/ وعَنْ أُمِّ عُمَارَةَ بِنْتِ كَعْبٍ الْأَنْصَارِيَّةِ ﷺ أَنَّ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ عَلَيْهَا فَقَدَّمَتْ إِلَيْهِ طَعَامًا فَقَالَ كُلِي فَقَالَتْ إِنِّي صَائِمَةٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ الصَّائِمَ تُصَلِّي عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ إِذَا أُكِلَ عِنْدَهُ حَتَّى يَفْرُغُوا وَرُبَّمَا قَالَ حَتَّى يَشْبَعُوا). رواه الترمذی، وقال: حديث حسن.[٣٠٦]

ئوموعیمارەی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆ دێنیم بۆ ماڵەوە، منیش نانم بۆ دروست کردو بۆیم دانا، فەرمووی: دە خۆیشت بخۆ ئەی دایکی عومارە! عەرزیم کرد: ئاخر من بەڕۆژووم، فەرمووی: هەر ڕۆژووەوانێ شتی لەلابخۆن، هەتا ئەوان لەو خواردنە لێ دەبنەوە، فریشتەی ڕەحمەت بۆئەو ڕۆژووەوانە دەپاڕێنەوەو دوعای بەخێری بۆدەکەن (ت:ح/ح).

١٢٦٧/٣-٣٢٢/ عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (جَاءَ إِلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فَجَاءَ بِخُبْزٍ وَزَيْتٍ فَأَكَلَ ثُمَّ قَالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفْطَرَ عِنْدَكُمْ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعَامَكُمْ الْأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمْ الْمَلَائِكَةُ). رواه أبو داوود باسناد صحيح.[٣٠٧]

---

[٣٠٥] تیرمیذی (٨٠٧).

[٣٠٦] تیرمیذی (٧٨٥).

[٣٠٧] ئەبو داوود (٣٨٥٤).

**ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **چوو بۆلای سەعدی کوڕی عوبادەی سەرگەورەی هۆزی خەزرەج سەعد نان و ڕۆن زەیتوونی بۆدانا، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نانی خواردوو لەپاشا فەرمووی: (أَفْطَرَ عِنْدَكُمْ الصَّائِمُونَ وَأَكَلَ طَعَامَكُمْ الْأَبْرَارُ وَصَلَّتْ عَلَيْكُمْ الْمَلَائِكَةُ) هەمیشە وەك ئێستا ڕۆژووەوانان بەربانگتان لەلا بکاتەوەو ئەم بەهرە گەورەیەتان بەنصیب بێ و پیاوچاکان نانتان بخۆن و فریشتەکان دروودو ڕەحمەتتان بۆ بنێرن (د ـ س/ص).**

## (٢٣٢) نامەی خەڵوەکێشان - باب الاعتكاف

١٢٦٨/١-٣٢٣/ عَنْ ابنْ عمر ﷺ قال: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ). متفق عليه.[٣٠٨]

**ئیبنوعومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **یاسای وابوو، لەدەی دوایی ڕەمەزانا، لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا.**

١٢٩٦/٢-٣٢٤/عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ) متفق عليه.[٣٠٩]

**عائیشە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کردبووی بەدەستوور لەدەی دوایی ڕەمەزانا، لەمزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، هەتا ئەوکاتەی خودا بردیەوە بۆلای خۆی ئەمەی تەرك نەکرد، بۆیە لەپاش خۆی ژنەکانیشی لەمزگەوتا خەڵوە دەکێشن (ش).**

١٢٧٠/٣-٣٢٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعْتَكِفُ فِي كُلِّ رَمَضَانٍ عَشْرَةَ أَيَّامٍ فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا). رواه البخاري.[٣١٠]

---

[٣٠٨] بوخاری (٢٠٢٥)و موسلیم (١١٧١).

[٣٠٩] بوخاری (٢٠٢٦)و موسلیم (١١٧٢) (٥).

[٣١٠] بوخاری (٢٠٤٤).

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **وابوو لەهەموو ڕەمەزانێکا دەڕۆژ لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا بەڵام لەوساڵەدا کەتێیدا وەفاتی کرد بیست ڕۆژ خەڵوەی کێشا. (ب ـ ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).**

## (٢٣٣) نامەی حەج: كتاب الحج

**قال الله تعالى: (ولله على حج البيت من استطاع إليه سبيلا * ومن كفر فإن الله غني عن العالمين) (ئالی عیمران/ ٣-٩٧) واتە:**

**خـودای گـەورەو سـەروەر لـەقورئانی پـیرۆزدا، لەسـوورەتی ئـالی عیمـران دا کەسوورەتی ژمارە سێ یە لەسـوورەتەکانی قورئـان، لەئایـەتی نـەوەدو حـەوتی ئـەم سوورەتەدا دەفـەرموێ: خـودا کردوویـەتی بەفـەرزو پێویسـت لەسـەر گشت کەسـێ کەحـەجی خانـەی خـودا بکـا، بەمـەرجی ئـەوە کەتـەوانای چـوونۆ هاتنـەوەی ئـەو ڕێگەیەی هەبێ، وەهەرکەسێ باوەڕی بەحەج نەبێ ئەوە خودا بێ نیـازە لەوکەسـە، چونکە خودا بێ باکەو نیازی بەهیچ چشتێ نییە.**

**١/١٢٧١-٣٢٦/ فەرموودەی: (.. بني الاسلام على خمس..)[٣٢٦].**

**٢/١٢٧٢-٣٢٧/ [٣١١] عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ الْحَجَّ فَحُجُّوا فَقَالَ: رَجُلٌ أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَسَكَتَ حَتَّى قَالَهَا ثَلَاثًا فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ ثُمَّ قَالَ: ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ).. الحديث.**

**ئـەبو هـورەیرە** (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) **فـەرمووی: حـەزرەت** (درودی خـوای لەسـەر بـێ) **وتـارێکی دا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! خودا حەجی دانـاوە لەسـەرتان دەی حـەج بکـەن، پیـاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا هـەموو سـاڵێ؟ پێغەمبـەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەنگـی نەکرد، تا سێ جار پیاوەکە ئەم پرسیارەی کردەوە، ئەوجا پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر بڵێم بەڵێ: ئەوا هەموو ساڵێ حەج فەرز دەبێ لەسەرتانو بۆشتان ناکرێ، ئینجا فەرمووی: کاتێ من وازم لەئێوە هێنـا.. تـا دوایـی فەرموودەکە کەلـە ژمارە (١٥٦/١) دا رابوورد.**

---

[٣٢٦] بڕوانە (١٠٧٥/٢ز ـ ١٩٣ ب ـ ٣ ل ـ٨٤).

[٣١١] بڕوانە (١٥٦/١ز ـ ١٦ ب ـ ١ ل ـ ١٤٧).

٣/١٢٧٣-٣٢٨/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (سُئِلَ أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ فَقَالَ إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ قِيلَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قِيلَ ثُمَّ مَاذَا قَالَ حَجٌّ مَبْرُورٌ). متفق عليه. [٣١٢] **مبرور: هو الذى لايرتكب فيه معصية.**

**دیسان لەوەوە فەرمووی: لە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **پرسیارکرا: قوربان! چی کردەوەیێ خێرترە؟ فەرمووی: ئیمانو باوەڕ بەخوداو بە پێغەمبەری خودا گوترا: ئەوجا چی تر؟! ئەی لەدوا ئەو چی تر؟ فەرمووی: ئەوجا حەجی دروستو باش (ش) دانەر - پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنووری خودا بێ - دەفەرموێ: حەجی دروست ئەوەیە کە حاجی گوناهی تیادا نەکا.**

٤/١٢٧٤-٣٢٩/ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ حَجَّ لِلَّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ). متفق عليه. [٣١٣]

**دیسان فەرمووی: ژنەوتم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرکەسێ بۆ ڕەزای خودا حەجێ بکاو لەکاتی کردنی حەجەکەدا پارێز لەکەیف کردن لەگەڵ ژندا بکاو گورێز لەهەرزەگۆیی‌و قسەی پڕوپوچ بکاو، گوناه نەکا، ئەوە وەك ئەو ڕۆژە کەلەدایك دەبێ ئاوا لەگوناه پاك دەبێتەوە (ش).**

٥/١٢٧٥-٣٣٠/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ). متفق عليه. [٣١٤]

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەم عەمرە هەتا ئەو عەمرە برێتی ی گوناهی نێوانی هەر دووکیان دەکەوێ، حەجی دروستیش هەر بەهەشتە پاداشیو بەس! (ش).**

٦/١٢٧٦-٣٣١/ عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّهَا قَالَتْ: (يَا رَسُولَ اللَّهِ نَرَى الْجِهَادَ أَفْضَلَ الْعَمَلِ أَفَلَا نُجَاهِدُ قَالَ لَا لَكِنَّ أَفْضَلَ الْجِهَادِ حَجٌّ مَبْرُورٌ). رواه البخاري. [٣١٥]

---

[٣١٢] بوخاری (١٥١٩)و موسلیم (٨٣).

[٣١٣] بوخاری (١٥٢١)و موسلیم (١٣٥٠).

[٣١٤] بوخاری (١٧٧٣)و موسلیم (١٣٤٩).

[٣١٥] بوخاری (١٥٢٠).

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە خەباتو غەزا کردن بەباشترین کردەوە دەزانین، جا ئایا نەچین بۆ غەزاو خەباتکردن؟ فەرمووی: نەء، بەڵام بۆ ئێوەی ژنان حەجی باش گەورەترین غەزاو خەباتە (ب).

٧/١٢٧٧-٣٣٢/ قَالَتْ عَائِشَةُ (رضي الله عنها) إنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللّٰهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ). رواه مسلم.[٣١٦]

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەهیچ ڕۆژێکا خودا بەقەد ڕۆژی عارفەی جەژنی قوربان بەندەی خۆی ئاوا بەزۆری لەئاگری دۆزەخ ئازاد ناکا(م).

٨/١٢٧٨-٣٣٣/ وعن ابن عباس (رضي الله عنهما) (عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً أَوْ حَجَّةً مَعِي). متفق عليه.[٣١٧]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: عەمرەیێ لەڕەمەزاندا هاوتای حەجێ دەکا یا فەرمووی: هاوتای حەجێ لەگەڵ مندا بکرێ دەکا (ش).

٩/١٢٧٩-٣٣٤/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) أن إمرأة قالت: يا رسول الله ﷺ (إنَّ فَرِيضَةَ اللّٰهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لَا يَثْبُتُ عَلَى الرَّاحِلَةِ أَفَأَحُجُّ عَنْهُ قَالَ: نَعَمْ). متفق عليه.[٣١٨]

دیسان فەرمووی: ئافرەتێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج کە فەرزی خودایە لەسەر بەندەکانی، کەوتۆتە سەر باوکم، لەم حاڵی پیریو ئیختیاری یەدا، کەوای لێ هاتووە لەبەرپیری خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، جا ئایا من لە باتی ئەو دەتوانم کەحەجی بۆبکەم؟ فەرمووی: ئا، دەتوانی کە حەجی بۆ بکەی. (ش - ڕەزای خودایان لێ بێ).

١٠/١٢٨٠-٣٣٥/ وعَنْ لقيط بن عامر ﷺ أنه أتى النبيّ ﷺ فقال: (أن أبي شيخ كبير لايستطيع الحج ولا العمرة ولا الظعن قال: حج عن أبيك واعتمره). رواه أبو داود والترمذي وقال حديث حسن صحيح.[٣١٩]

---

[٣١٦] موسلیم (١٣٤٨).

[٣١٧] بوخاری (١٧٨٢)و موسلیم (١٢٥٦) (٢٢٢).

[٣١٨] بوخاری (١٥١٣)و موسلیم (١٣٣٤).

لەقیطی كوڕی عەمیر (ڕەزای خوای لێ بێ) كەناسراوە لە ئەبو ڕەزینی عوقەیلی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: گوتم: ئەی ڕەوانەكراوی خودا! باوكم پیرێكی ئیختیاری وایە تەوانای حەج و عەمرەو هاموشۆی نەماوە؟ فەرمووی: خۆت حەج و عەمرەی بۆبكە (د/ت: ح/ح/ص).

١١/١٢٨١-٣٣٦/ عَنْ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: (حُجَّ بِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ). رواه البخاری. [٣٢٠]

سائیبی كوڕی یەزید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منداڵ بووم حەوت ساڵان بووم، لەحەجی ماڵ ئاوایی دا، لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) باوكم حەجی پێ كردم (ب).

١٢/١٢٨٢-٣٣٧/ فەرموودەی ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) (ان رسول الله لقي ركبا بالروحاء). [٣٢١]

١٣/١٢٨٣-٣٣٨/عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَجَّ عَلَى رَحْلٍ وَكَانَتْ زَامِلَتَهُ). رواه البخاری. [٣٢٢]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەساڵی حەجی ماڵ ئاوایی دا، بەسواری وشترێ حەجی كرد، لەسەر كۆپانە ڕووتەكەوە سوار بوو بوو، سەرجل و دۆشەكەڵەی بەسەرەوە نەبوو، ئەو وشترە هەم ووشتری سواری ی بوو هەم مینەك و بارە بەری بوو (ب).

١٤/١٢٨٤-٣٣٩/عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (كَانَتْ عُكَاظُ وَمَجَنَّةُ وَذُو الْمَجَازِ أَسْوَاقًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَتَأَثَّمُوا أَنْ يَتَّجِرُوا فِي الْمَوَاسِمِ فَنَزَلَتْ: (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُم) فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ). رواه البخاری. [٣٢٣]

---

[٣١٩] ئەبو داوود (١٨١٠)و تیرمیذی (٩٣٠).

[٣٢٠] بوخاری (١٨٥٨).

[٣٢١] بڕوانە: (١٧٩/٣ ب ـ ١ ز ـ ٢١).

[٣٢٢] بوخاری (١٥١٧).

[٣٢٣] بوخاری (١٧٧٠).

**ئیبنوعەبباس** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی:** لەسەرەتای حەجەوە کەئایینی ئیسلام هات، خەڵك وەك سەردەمی پێش ئیسلام لەميناو لەعەرەفاتو بازارەکانی عوکازو مەجیینەو زیلمەجازرو مەڵبەندەکانی حەجدا، شتومەکیان دەکڕیو دەفرۆشتو مامەڵەو ئاڵو وێڵیان دەکرد، بەڵام لەپاشا کاتێ کەئایینی ئیسلام دامەزراو خۆی گرت، موسوڵمانەکان لەکاتی حەج کردندا پێیان ناخۆش بوو کەبەبەرگی ئیحرامەوە خەریکی سەوداو ئاڵو وێڵ بن، دەترسان کەشتی وا گوناه بێ، لەبەرئەوە لەمەڵبەندەکانی حەجدا خەریکی بازرگانی نەدەبوون، هەتا خودای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: (ليس عليكم جناح أن تبغوا فضلا من ربكم ) في مواسم الحج (بەقەرە- ٢/١٩٨) گەرچی بەوە گوناهبار نابن، کەلەمەڵبەندەکانی حەجدا، لەکاتی حەجکردندا، مامەڵەو ئاڵو وێڵ بکەنو بگەڕێن بەشوێن رزقو رۆزی پاكو ماڵی حەڵاڵدا، کەبەشێکن لەبەخششو کەرەمی خودای خۆتان، بەڵام خۆتان تەرخان بکەن بۆ کاروباری حەجەکەتان زۆرباشترە! (ب).

## (٢٣٤) نامەی خەبات و تێکۆشان (جیهاد) - كتاب الجهاد

**قال الله تعالى:** (وقاتلوا المشركين كافة كما يقاتلونكم كافة * واعلموا أن الله مع المتقين) (تەوبە ـ ٩/٣٦).

**وقال تعالى:** (كتب عليكم القتال وهو كره لكم وعسى أن تكرهوا شيئا وهو خير لكم وعسى أن تحبوا شيئا وهو شر لكم والله يعلم وأنتم لاتعلمون) (بەقەرە ـ ٢/٣١٦)

**وقال تعالى:** (ان الله أشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة يقاتلون في سبيل الله فيقتلون ويقتلون وعدا عليه حقا في التوراة والإنجيل والقرآن ومن أوفى بعهده من الله فاستبشروا ببيعكم الذي بايعتم به وذلك هو الفوز العظيم) (تەوبە ـ ٩/٢١١).

**وقال تعالى:** (لايستوي القاعدون من المؤمنين غير اولي الضرر والمجاهدون في سبيل الله بأموالهم وأنفسهم، فضل الله المجاهدين بأموالهم وأنفسهم على قاعدين أجرا عظيما، درجات منه ومغفرة ورحمة وكان الله غفورا رحيما) (نيساو ـ ٤ ـ ٩٥/٩٦).

**وقال تعالى:** (يا أيها الذين آمنوا هل أدلكم على تجارة تنجيكم من عذاب أليم تؤمنون بالله ورسوله، وتجاهدون في سبيل الله بأموالكم وأنفسكم، ذلكم خير لكم إن كنتم تعلمون، يغفر لكم ذنوبكم ويدخلكم جنات تجري من تحتها الأنهار ومساكن طيبة

في جنات عدن ذلك الفوز العظيم، وأخرى تحبونها نصر من الله وفتح قريب، وبشر المؤمنين) (صەفف ـ ٦١/١٠ـ ١٣).

مەبەست لەتەفسیری ئایەتە پیرۆزەکان ئەوەیە کەخوێنەری ئازیز مەبەستەکەی بزانێ، تا کاری تێ بکاو کاری پێ بکا، دەنا مەبەست لەتەفسیرەکە ئەوە نییە کەخوێنەر فێری تەرجەمەی قورئانەکە ببێو بەس چونکە زانینێ کردەوەی لەگەڵ نەبێ نەبوونی باشترە لەبوونی. کەواتە: واتە:

ئەی موسوڵمانینە! بزانن ئێرە جیهانی کاروکردەوەیەو خانەی کێ بەرکێ ی خێرو شەڕەو، مەیدانو گۆڕەپانی شەڕە زۆرانی نێوانی هەقو ناهەقیو دینو بێ دینی یە، لەبەرئەوە ژیان هەروا بەخۆشیوبێ وەییو ڕێكو پێکی ناڕوا بەڕێوە، لەبەرئەوە گومانی تیادا نییە کەحاڵی ئێوەیش وەك حاڵی گەلانی پێش خۆتان دەبێ، جەنگو غەزاو شەڕ لەمێژەوە هەیەو هۆی تایبەتی خۆی هەیەو رەگو ڕیشەی لەدڵو دەروونی نەوەو وەچەو نەتەوەو گەلاندا داکوتاوەو هەروا بەهاسانی ڕیشەکەن نابێ، لەبەرئەوە ناوبەناو لێرەو لەوێ، بەهەقو ناهەق هەر شەڕەو ڕوودەداو هەر جەنگەو دەقەومێ!

بەدەیانو بەسەدانو بەهەزاران بێ تاوان، لەمنداڵ، لە ژن، لەپیر، لەزانای ئایینی، لەدەروێشو صۆفیلکە، دەبن بەژێرپێوەو لەژێر ڕەوڕەوەی شەڕدا دەپلیشێنەوەو دەبن بەقۆچی قوربانی! ئەمە ڕاستەو دیاردەیەکی رەقو زەقەوبووە بەهۆی ئەوە کەلە کۆنو نۆدا رۆشنبیرانو روناکبیران بیرلەوە بکەنەوە کەچارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوەو لەئێشو ئازاری جەنگ کەم بکەنەوە، بەڵام خودا بۆخۆی ئەمانە لەهەمووکەس باشتر دەزانێ، کەواتە ئێوە پەیڕەوی فەرمانەکانی خودا بکەنو هەقتان بەسەر کەسی ترەوە نەبێ.

بزانن کەخودا بۆ بەرگری لەسەروماڵو ناموسو خانەو لانەو نیشتمانو ئایینی خۆتان جەنگی لەسەر نووسیونو کردوویەتی بەئەرکی سەرشانتان، گەرچی ئێوە ـ وەکوو هەموو ئادەمیزادێکی تر بەسروشت ـ حەزتان لەئاشتیو ئاسوودەیی یەو حەزتان لەشەڕو شۆڕ نیەو جەنگتان لەبەرشان گرانە، گەرچی ئەمە وایە بەڵام خودا لەبەرژەوەندی ئێوە باشتر دەزانێ، گەلێ شت هەیە ئێوە خۆشتان دەوێ کەچی ئەو شتە بۆئێوە زۆر خراپە.

بزانن هەموو شت بەخۆزگەو ئارەزووی ئێوە نابێ، کەواتە خۆتان بۆ ڕووداوەکانی ژیان‌و کارەساتەکانی ئامادەکەن‌و دوای خەیاڵ پلاو مەکەون‌و سەیری ئەملاو لای خۆتان بکەن‌و پەندو عیبرەت لەمێژوو و داستانەکانی گەلانی پێش خۆتان وەرگرن‌و بەرهەمیان بێنن، فەرمانەکانی خودا جێ بەجێ بکەن‌و بەرەخنەو خراپەگرتن لەکاری خوداو دەستوورەکانی دین خۆتان دەستخەڕۆو دەستەشکێن مەکەن، بزانن ئیشی خودا بێ حیکمەت نییە، هەمووی پڕ لەدانایی‌و زانست‌و خێرو بەهرەیە، دەی مل کەچی کەن بۆ بڕیاری خودا، گوێ بەلاژگەلاژگی نەفامانی دەستەی شەیتان مەدەن، کە دەڵێن: ئێمە ئاشتی خوازین‌و دژی جەنگ‌و براکوژین، چونکە ئێوە کەگەلی ئیسلامن دەبێ هەمیشە وەك میللەتێکی ووریا لەسەرپێ بن‌و لەژێر سێبەری شیرو تیری خۆتاندا بژین‌و بەدرك بەزەبرو زەنگ بن‌و چقڵی چاوی دوژمن بن، دەشێ بەپێ ی حاڵ‌و بەپێ ی ڕۆژوکات، بەپیرو لاوتانەوە بەسەرو بەماڵ ئامادەبن بۆ شەڕو جەنگ، بەچەك‌و تفاق‌و کەرەستەی پێویستەوە، وەلێ جیاوازیی شەڕی ئێوە لەگەڵ شەڕی ئەو خەڵکەی تردا یەك شتی جەوهەرییە: ئێوە شەڕدەکەن بۆ ڕەزای خودا، تا ئایینی ڕاست‌و دروستی خودا لەسەر ڕووی زەوی دابمەزرێ، وەلێ ئەو خەڵکەی تربۆمەبەستی پیسی گلاوی دنیایی جەنگ بەرپا دەکەن!

بزانن جەنگ‌و غەزاو خەبات لەپێناوی پاراستنی نامووس‌و خاوو خێزان‌و دامەزراندنی دینی هەق‌و لەسەر ئاوو خاك‌و نیشتمان ولاتی خۆتان، کەخاکی پاکی پیرۆزی گەلی ئیسلامە، ئەرکی سەرشانتانە بزانن جەنگی وا کارێکی زۆر بەرزوبەڕێزەو خۆشی‌و خۆشبەختی لەو خوداپێداوە مەردە نەبەردەی کەلەجەنگی ئاوادا سەربەرزیی شەهید بوونی بەنسیب دەبێ‌و بەڵێنی دەکەوێتە سەرخوداو ڕۆحی ڕەوانی خۆی دەفرۆشێ بە خودا بە بەهای بەهەشت، بەڵێ مەرد ئەو مەردەیە لەڕۆژی ئاوادا تادەتوانێ لەدوژمن بکوژێ‌و بەبارو بەتەغار خوێنی دوژمن بڕێژێ، وەبەهیچ جۆر ۆ لالوێچێ خوێن سەری خۆی شۆڕ نەکاو لەهەڵێکا گوڵێ لەباخی ئیسلام بەخوێنی خۆی ئاوبدا. بزانن هەر موسوڵمانێکی مەرد بەم گیانەوە بجەنگێ بەڵێنی دەکەوێتە سەرخودا، کەبەخەڵاتی بەهەشتی پێ خەڵات بفەرموێ،

ئەم بەڵێن‌و پەیمانەی لەنامە پیرۆزەکانی خۆیدا نووسیوە، لە تەوراتا، لەئینجیل دا، لەقورئاندا، دیارە وەعدو بەڵێنی خودا هەقەو راستەو هەڵەی نییە.

بزانن موسوڵمان هەمووی هەرباشە، خوا زانابێ، خوا دانابێ، خوا کاسب بێ، خوا دەوڵەمەندبێ، خوا هەزاری ماڵی خۆی بێ، بەڵام لەناو هەموانا پاڵەوانی هەرە گەورەو سەربەرزی هەردوو جیهان‌و رووسووری هەردووژیان تێکۆشەرانی ڕێگەی خودان!

بزانن خودای مەزنی ئێوە، لەبەرئەوەی کەڕەوشی مەردانەی تێکۆشەرانی ڕێگەی هەقی گەلێ پێ خۆشە باوو فەضلی داون بەسەر موسوڵمانانی تردا بەتایبەت ئەو زاتانەیان کە بەسەرو ماڵ لێ بڕاون‌و لەڕێگەی خودادا تێ دەکۆشن‌و بەدەست‌و بەزمان‌و بەسەرو ماڵ‌و بەخوێن‌و بەقەڵەم‌و بەدڵ‌و بەهەموو جۆرێ‌و لەسەر هەموو حاڵێ سەربازی دڵسۆزی ئازاو دلێری ئیسلامن هەمیشە کردوویانە بەپیشە خەباتگێڕان‌و تێکۆشان لەپێناوی بەرزەوە بوونی شەریعەتی خوداو فەرمایشتی قورئانی پیرۆزدا، لەم مەیدانی مەردایەتی یە هەرگیز دواناکەون، مەگەر بەهانەیەکی رەوایان هەبێ، دیارە ئەوەیشی کەمەهانەی هەقی هەبێ خودا عوزری لێ قەبووڵ دەکاو لەپلەو پایەی بڵندی کەم ناکاتەوە، وەڵێ ئەوانەی کە هەر بەناو موسوڵمانن‌و خۆیان لەپشتیوانی دین‌و خەباتگێڕان دەدزنەوە ئەوانە بەپاداشی بەدی خۆیان دەگەن‌و لەهەردوو جیهاندا لەبەری تاڵی خۆیان دەخۆن‌و، سەرشۆڕی ئەمرۆکەن‌و شەرمەزاری سبەینێ!

بزانن ئیمان‌و باوەڕ بەخوداو بە پێغەمبەری خودا کلیلی دەرگای رەحمەت‌و مەغفیرەت‌و لێخۆشبوونی خودایە، ئیمان گەورەترین دەسمایەی دەستی موسوڵمانە، هەتا ئیمان نەبێ هیچ کارێ، هیچ خێرێ، هیچ چاکەیێ دانامەزرێ، ئەی گەلی ئیسلام! خودا بانگەوازتان لێ دەکا، دەفەرموێ: وەرن بۆسەر ڕێگەی ڕزگاری، زووکەن بەهەشت لەسەر خۆتان تاپۆکەن، وەرن لەگەڵ خودادا بازرگانی بکەن، وەرن مەردانەوشێرانە تێکۆشن بەسەرو بەماڵ بۆ رەزای خودا، خودا لێتان خۆش دەبێ، تاوانتان دەپۆشێ، دەتانباتە ناو بەهەشتی بەرین. کەپڕە لەماڵ‌و حاڵی پاک‌و تەمیز، لەدنیاش دا سەرکەوتن‌و سەربەرزی دەکا بەنصیبتان‌و زووبەزوو فەتحی

**گەورە گەورەتان بۆدەکا. ئەی موحەممەد! دڵی موسوڵمانان بەمژدەی خۆش، خۆش کەو بەهەرەشەو گورەشەی زۆر ساردیان مەکەرەوە!**
**لەسۆنگەی (قورئان خۆی خۆی راڤەو تەفسیر دەکا) ئەم ئایەتە پیرۆزانەیش تێکەڵاوی تەفسیرەکە بوون، لەگەڵ هەندێ شتی تریش دا، کەلەخوێنەری بەئاگا پەنهان نییە:**

**(وەرگێڕ)**

١- (لقد خلقنا الإنسان في كبد) (٤/٩٠).
٢- (يا أيها الإنسان إنك كادح إلى ربك كدحا فملاقيه) (٦/٨٤).
٣- (أم حسبتم أن تدخلوا الجنة ولما يأتكم بمثل الذين خلوا من قبلكم، مستهم البأساء والضراء وزلزلوا) (٢/٢١٤).
٤- (وتلك الايام نداولها بين الناس) (٣/١٤٠).
٥- (فإذا لقيتم الذين كفروا فضرب الرقاب حتى إذا أثخنتموهم فشدوا الوثاق، فاما منا بعد واما فداء، حتى تضع الحرب أوزارها) (٤/٤٧) الاوزار: الآثام.
٦- (ليس بأمانيكم ولا أماني أهل الكتاب من يعمل سوءا يجز به) (٤/١٢٣).
٧- (وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة) (٨/٦٠).
٨- (وان جنحوا للسلم فاجنح لها) (٨/٦١).
٩- (محمد رسول الله، والذين معه أشداء على الكفار رحماء بينهم) (٤٨/٢٩).
١٠- (الذين آمنوا يقاتلون في سبيل الله والذين كفروا يقاتلون في سبيل الطاغوت) (٤/٧٥).
١١- (وما لكم لا تقاتلون في سبيل الله والمستضعفين من الرجال والنساء والولدان) (٤/٧٥).
١٢- (الذين أخرجوا من ديارهم بغير حق الا أن يقولوا: ربنا الله، ولولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لهدمت صوامع وبيع وصلوات ومساجد يذكر فيها اسم الله كثيراً) (٢٢/٤٠).
١٣- (وكلمة الله هى العليا والله عزيز حكيم) (٩/٤٠).
١٤- (قد خلت من قبلكم سنن، فسيروا في الأرض فانظروا كيف كان عاقبة المكذبين) (٣/١٣٧).

والآيات في هذا الباب كثيرة مشهورة، وأما الاحاديث في فضل الجهاد فأكثروا من أن تحصر، فمن ذلك: واته: ئايەتو حەدیث زۆرن لەم بابەتە، وەك ئەم حەدیثانە كە دەفەرموون:

١٢٨٥/١-٣٤٠/ فەرموودەی: (.. أي الأعمال أفضل..). [٣٢٤]

١٢٨٦/٢-٣٤١/ فەرموودەی: (.. أي العمل أحب ..). [٣٢٥]

١٢٨٧/٣-٣٤٢/ عَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ). متفق عليه. [٣٢٦]

ئەبوذەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! كام كردەوە لەكردەوە باشەكان خێرترەو پاداشی باشی پترە؟ فەرمووی: لەپاش باوەڕ بەخوداو پێغەمبەری خودا باشترین كردەوەی بەندەی موسوڵمانان تێكۆشانو غەزاكردنو خەباتگێڕانە لەبەر ڕەزای خودا (ش).

١٢٨٨/٤-٣٤٣/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَغَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا). متفق عليه. [٣٢٧]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: تاقی كۆششو تێكۆشان لەڕێگەی خودادا ـ چی تاقی بەیانیو چی تاقی ئێوارە ـ لەهەموو سامانو موڵكی جیهان چاكترە! (ش).

١٢٨٩/٥-٣٤٤/ فەرموودەی:(.. أى الناس أفضل..)بڕوانە:(٥٩٨/٢ ب/٢ ز/٦٩ ل/١٥٠). [٣٢٨]

١٢٩٠/٦-٣٤٥/ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا وَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ مِنْ الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا وَالرَّوْحَةُ يَرُوحُهَا الْعَبْدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ الْغَدْوَةُ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا). متفق عليه. [٣٢٩]

---

[٣٢٤] بڕوانە: (١٢٧٣/٣ ب ـ ٣ز ـ ٢٣٣ل ...) .

[٣٢٥] بڕوانە: (٣١٢/١ ب ـ ١ ز ـ ٤٠ ل ـ ٢٥٧).

[٣٢٦] بوخاری (٢٥١٨)و موسلیم (٨٤).

[٣٢٧] بوخاری (٢٧٩٢)و موسلیم (١٨٨٠).

[٣٢٨] بڕوانە (٥٩٨/٢).

[٣٢٩] بوخاری (٢٨٩٢)و موسلیم (١٨٨١).

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: ئێشك گرتنی یەك ڕۆژ لەسەر سنووری ئیسلام لەبەر ڕەزای خودا، لەهەموو سامانو موڵکی جیهان باشترە! هەروەها تاقێ کۆششو تێکۆشان لەڕێگەی خودادا ـ چی تاقی ئێوارەو چی تاقی بەیانی ـ لەهەموو سامانو دارایی‌و سەڵتەنەتی جیهان چاکترە! (ش).

٧/١٢٩١-٣٤٦/ عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ وَإِنْ مَاتَ جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُهُ وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ وَأَمِنَ الْفَتَّانَ). رواه مسلم.[٣٣٠]

سەلمان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئێشك گرتنی ڕۆژو شەوێ، لەسەر سنووری ئیسلام لەبۆ ڕەزای خودا، چاکترە لەڕۆژوو شەونوێژی یەك مانگ، وەئەوەی لەم دێ پیرۆزەدا بمرێ، ئەم کردەوە جوانەی‌و هەموو کردەوە باشەکانی تریشی کەلەم حاڵەدا دەیکردن هەتا ڕۆژی قیامەت هەربەردەوام دەبێ‌و هەر پاداشی ئەوەی بۆ دەنووسرێ، بەوێنەی شەهیدانیش رزق‌و ڕۆزیی بەهەشتی پێ دەدرێ‌و مووچەی بۆ دەبڕدرێتەوە، گرفتاری تاقی کرنەوەی ناو گۆڕیشی نابێ‌و ترسی نەکیرو مونکەری نامێنێ (م).

٨/١٢٩٢-٣٤٧/ عَنْ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: (كُلُّ مَيِّتٍ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ إِلَّا الَّذِي مَاتَ مُرَابِطًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَإِنَّهُ يُنْمَى لَهُ عَمَلُهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَيَأْمَنُ مِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ). رواه أبوداود والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.[٣٣١]

فەضالەی کوڕی عوبەید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو کەسێ کاتێ دەمرێ ئیتر کردەوەکەی مۆر دەکرێ‌و زیادو کەم ناکا، تەنیا پاسەوانی سەر سنوور نەبێ، چونکە کردەوەی ئەو هەر لەزیاد بوونەو هەتا ڕۆژی زینەوە هەر نەش‌و نوما دەکا بۆی، وەلەتاقیکردنەوەی نەکیرو مونکەریش لەقەبردا هێمن دەبێ‌و ترسی نابێ (د/ت: ح/ح/ص).

---

[٣٣٠] موسلیم (١٩١٣).

[٣٣١] ئەبو داوود (٢٥٠٠)و تیرمیذی (١٦٢١).

٩/١٢٩٣-٣٤٨/ عَنْ عُثْمَانَ ﷺ قال: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول: (رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ يَوْمٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنْ الْمَنَازِلِ). رواة التميذى، وقال: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.(٣٣٢)

**عوثمان** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم ژنەوت:** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: تاقە یەك ڕۆژئێشك گرتنی سەر سنووری وڵاتی ئیسلام، کەلەبەرخاتری خودای گەورە بێ، خێرترە لەهەزار ڕۆژ خێرکردنی مەڵبەندەکانی تر. (ت:ح/ح/ص).**

١٠/١٢٩٤-٣٤٩/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (تَضَمَّنَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَإِيمَانًا بِي وَتَصْدِيقًا بِرُسُلِي فَهُوَ عَلَيَّ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ أَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ نَائِلًا مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا مِنْ كَلْمٍ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهِ حِينَ كُلِمَ لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ وَرِيحُهُ مِسْكٌ وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْلَا أَنْ يَشُقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خِلَافَ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَبَدًا وَلَكِنْ لَا أَجِدُ سَعَةً فَأَحْمِلَهُمْ وَلَا يَجِدُونَ سَعَةً وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي أَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأُقْتَلُ ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ). رواه مسلم. وروى البخارى بعضه.(٣٣٣)

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوەی دەڕوا بۆ خەباتو غەزا لەڕێگەی خودادا، خودا بۆخۆی دەبێ بەدەستەبەرو زامنیو دەفەرموێ: خۆم دەبم بەکەفیلو دستەبەری، کەیەکێ لەم دوو خەڵاتە گەورەیەی پێ ببەخشم: یا بیبەمەناو بەهەشت، ئەگەر کوژرا، یان بیبەمەوە بۆشوێنو جێگەی خۆی، لەگەڵ کۆڵێ پاداشی باشو تالانی زۆردا، بەمەرجێ ئەو تێکۆشەرە کەدەچێ بۆ ئەو غەزایە مەبەستی تەنیا ڕەزامەندیی خودا بێو ئیمانی بەمنو پێغەمبەرانی من هەبێ. بەو کەسە کەگیانی منی بەدەسە، هەرکەسێ لەڕێی خودادا زاماربکرێ، لە ڕۆژی ژینەوەدا کەدێ زامەکەی تازەو نوێ یە. وەکوو تازە زامار کرابێ ئاوا،**

---

(٣٣٢) تیرمیذي (١٦٦٨).

(٣٣٣) موسلیم (١٨٧٦)و بوخاری (٢٨٠٣).

لەسەرشێوەی زاماربوونی کاتی ناو شەڕگەکە، ڕەنگەکەی سووری تلیقی یە وەکوو خوێن، بەڵام بۆنەکەی بۆنی میسکە. بەوکەسە کەگیانی موحەممەدی بەدەسە، کەخودای کەسی هەموو کەسە، دەترسم کەموسوڵمانان تووشی ڕەنجو سەخڵەتی ببن، ئەگینا ئەگەر لەبەرئەوە نەبێ، لەگەڵ هەموو تاقمە موسوڵمانێکا کەدەچن بۆ غەزاو خەبات، خۆشم دەچووم! وەڵێ ئەمە ناکرێو لەتوانادا نی یە، چونکە نەخۆم ئەو توانایەم هەیە کەوڵاخی سواری بۆهەموویان پەیدا بکەم، نەخۆشیان ئەو دەستەیان دەڕوا کەتفاقی خۆیان بێنن، لەهەمان کاتا زۆریش بەزەحمەتی دەزانن‌و لەشانیان گرانە، کەمن بچم بۆغەزاو ئەوان لەگەڵم نەیەن! بەو خودایە کەڕەوانی موحەممەدی لەدەستایە، بەحەزی دڵ، پڕ بەدڵ حەز دەکەم کەلەبەر ڕەزای خودا بچم بۆغەزاو لەوغەزایەدا بکوژرێم، جا خودا زیندووم بکاتەوەو دیسان بچمەوە بۆغەزاو هەمدیسان بکوژرێمەوە، دیسانەوە خودا زیندووم بکاتەوەو هەمدیسانەوە بچمەوە بۆ غەزاو هەمدیسان بکوژرێمەوە (م).

١١/١٢٩٥-٣٥٠/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَا مِنْ مَكْلُومٍ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَكَلْمُهُ يَدْمَى اللَّوْنُ لَوْنُ دَمٍ وَالرِّيحُ رِيحُ مِسْكٍ). متفق عليه.[٣٣٤]

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی لەجیهاندا، لەغەزادا زامار بکرێ، بەدەستی دوژمن یا بەهەر شتێکی تر، لە ڕۆژی ڕەستا خێزداکەدێ زامەکەی کفارەی دێ: ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە، سوورێکی ئاڵە، کەچی بۆنەکەی بۆنی میسکە (ش).

١٢/١٢٩٦-٣٥١/ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فُوَاقَ نَاقَةٍ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ وَمَنْ جُرِحَ جُرْحًا فِي سَبِيلِ اللّٰهِ أَوْ نُكِبَ نَكْبَةً فَإِنَّهَا تَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَغْزَرِ مَا كَانَتْ لَوْنُهَا الزَّعْفَرَانُ وَرِيحُهَا كَالْمِسْكِ) رواه أبو دود والترمذى وقال:حَدِيثٌ حسن صَحِيحٌ.[٣٣٥]

---

[٣٣٤] بوخاری (٥٥٣٣)و موسلیم (١٨٧٦).

[٣٣٥] ئەبو داوود (٢٥٤١)و تیرمیذی (١٦٥٧).

**موعاذ** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرپیاوێکی موسوڵمان ئەوەندەی دۆشینی وشترێ لەڕێگەی خودادا، لەگەڵ دوژمن دا جەنگ بکا، بەهەشت مسۆگەر دەکا بۆخۆی، وەهەرکەسێ لەغەزادا زاماربێ، یان تووشی لێقەمانێ ببێ، رۆژی قیامەت ئەو برینداره یا ئەو لێقەوماوە کەدێتە ڕوو، گەرمەی خوێن لێهاتنی برینەکەیەتی‌و هەرگیز لەووپێش ئاوا بەزۆری خوێنی لەبەرنەڕۆیشتووە، رەنگەکەی وەك زەعفەران زەردە بەلام بۆنەکەی وەك بۆنی مسك وایە (د/ت:ح/ح).**

**١٣/١٢٩٧-٣٥٢/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: (مَرَّ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشِعْبٍ فِيهِ عُيَيْنَةٌ مِنْ مَاءٍ عَذْبَةٌ فَأَعْجَبَتْهُ لِطِيبِهَا فَقَالَ لَوْ اعْتَزَلْتُ النَّاسَ فَأَقَمْتُ فِي هَذَا الشِّعْبِ وَلَنْ أَفْعَلَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَا تَفْعَلْ فَإِنَّ مُقَامَ أَحَدِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ سَبْعِينَ عَامًا أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ الْجَنَّةَ اغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَوَاقَ نَاقَةٍ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ). رواه الترمذي وقال: حديث حسن.**[٣٣٦]

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ، لەیارانی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەدۆڵێکەوە دەڕوا، کانیاوێکی گچکەی شیرینی تیادا دەبێ، زۆر بەدڵی دەبێ، دەڵێ: خۆزگە لەم دۆڵەدا بۆ خۆم جێ نشین دەبووم‌و لەو خەڵکە دوورە پارێزم دەگرت، وەڵێ هەتا ڕێگەدان (روخصەت: ئیجازە: ئیزن) لە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەخوازم، لەخۆمەوە شتی واناکەم.**

**جا ئەمە عەرزی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەکا، دەفەرموێ: شتی وا مەکە، نەکەی شتی وابکەی، چونکە تاقە پێهەڵسانێکی ئێوە لەبەر رەزای خودا لەحەفتا ساڵ نوێژی سوننەتی ماڵەوەتان خێری پترە. ئەدی ئێوە حەزناکەن کەخودا لێتان خۆش بێ‌و بتانباتە بەهەشتێ؟! دەی کە حەز لەمەدەکەن زووکەن لەڕێی خودادا غەزابکەن، دڵنیابن ئەوەی بەقەی دۆشینی وشترە مێنگەیێ لە ڕێی خودادا جەنگ بکاو بچێ بەگژ دوژمندا بەهەشت دەبێ بەماڵی‌و لەخۆی تاپۆ دەکا!**

---

[٣٣٦] تیرمیذی (١٦٥٦).

(ت:ح/حەزرەت). دانەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: والفواق ما بين الحلبتين: واتە: نێوانی دوو دۆشین. لەتاجدا دەفەرموێ: فواق ناقة: قدر حلبها: واتە: بەقەی دۆشینی وشترێ. هەندێکی تر دەفەرموون: فواق ناقة: وهو مابين رفع يدك من ضرعها وقت الحلب وضمها: واتە: بەقەد خوشێ شیر، مەبەست دەمێکی کەمە. (وەرگێڕ)

١٤/١٢٩٨-٣٥٣/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قِيلَ: لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا يعادِلُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَ: (لَا تَسْتَطِيعُونَهُ قَالَ: فَأَعَادُوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: لَا تَسْتَطِيعُونَهُ وَقَالَ: فِي الثَّالِثَةِ: (مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِتِ بِآيَاتِ اللَّهِ لَا يَفْتُرُ مِنْ صِيَامٍ وَلَا صَلَاةٍ حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ) متفق علية. وهذا لفظ مسلم. وفي رواية البخاری: أن رجلا قال: يا رسول الله دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَعْدِلُ الْجِهَادَ؟ قَالَ: (لَا أَجِدُهُ) قَالَ: هَلْ تَسْتَطِيعُ إِذَا خَرَجَ الْمُجَاهِدُ أَنْ تَدْخُلَ مَسْجِدَكَ فَتَقُومَ وَلَا تَفْتُرَ وَتَصُومَ وَلَا تُفْطِرَ قَالَ وَمَنْ يَسْتَطِيعُ ذَلِكَ). [٣٣٧]

دیسان فەرمووی: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! چی هاوتای خەباتو تێکۆشان لەرێگەی خودای گەورەدا دەکا؟ ئەگەر هەیە کارێکی ئاوەهامان پێ نیشان بدە؟

فەرمووی: بۆتان ناکرێ، تا دووجار یا سێ جار ئەم پرسیارەیان لێ دووبارە کردەوە، گشت جارێ هەر دەیفەرموو: لەتواناتاندا نییەو بۆتان ناکرێ هەتا لەسەری جاری سێیەمدا فەرمووی: وێنەی کەسێ لەرێگەی خودادا غەزا بکاو خەبات بگێڕێ، وەك وێنەی ئەو خوداپەرستە وایە کەهەتا غەزاکەرەکە دەگەڕێتەوە لەغەزاکەی، ئەو سەرو مڕ بەڕۆژوو بێو هەمیشە دەوری ئایەتەکانی قورئان بکاتەوەو ڕەفتیان پێ بکاو یەك دەم چییە لەنوێژوو ڕۆژوو سارد نەبێتەوە! (م) لەگێڕانەوەی بوخاریدا: [٣٣٨] ئاوایە: پیاوێ لەیاران فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! کارێکی وام پێ نیشان بدە کەهاوتای خەباتو غەزابکا؟ فەرمووی: کاری وا شك نابەم لەدوایی دا فەرمووی: ئەدیی پێم بڵێ: ئایا دەتوانیت ـ کەخەباتگێڕ ڕۆیشت بۆ غەزا ـ تۆیش

---

[٣٣٧] بوخاری (٢٧٨٥)و موسلیم (١٨٧٨).

[٣٣٨] حەزم لەسورمەی گەردی گۆڕتانە

دەرمانی چاوەو لابەری تانە ! (وەرگێڕ)

بچیته ناو ژووری مزگەوتو سەرگەرمی نوێژکردن بیو لێ ی سارد نەبیتەوەو هەر بەرۆژووش بیو قەت نەیشکێنی؟ پیاوەکە گوتی: جا کێ ئەوە دەتوانێ؟

١٥/١٢٩٩-٣٥٤/ فەرموودەی:(..من خير معاش الناس..)بڕوانە:(٦٠١/٥ ب/٢ ز/٦٩ ل/١٥١).

١٦/١٣٠٠-٣٥٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ كُلُّ دَرَجَتَيْنِ مَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ). رواه البخاري.[٣٣٩]

دیسان هاوڕی نازدارەکەی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) حەزرەتی ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەبەهەشتا سەد پایەی بەرزو بەڕێز هەیە، خودا ئامادەیانی کردووە بۆ ئەو خەباتگێڕانە کەهەوڵو تەقەڵلا دەدەنو کۆشش دەکەن لەڕێگەی خودادا، نێوانی دوو پایەیێ لەم سەد پایەیە، بەقەد نێوانی ئاسمانو عەرد لەیەك دوورن! (بوخاری، ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).

١٧/١٣٠١-٣٥٩/عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ فَقَالَ أَعِدْهَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَفَعَلَ ثُمَّ قَالَ وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ قَالَ وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ). رواه مسلم.[٣٤٠]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی خودا بەخودای خۆی بزانێو ئیسلام بەئایینی خۆی قەبووڵ بکاو موحەممەد بە پێغەمبەری خۆی بزانێو ئیسلام لبەئایینی خۆی قەبووڵ بکاو موحەممەد بە پێغەمبەری خۆی دابنێ ئیتر بەهەشت لەسەرخۆی تاپۆ دەکا! ئەبو سەعید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەڕاستی منیش ئەم فەرمایشتەم گەلێ لەلا خۆشو دلگیر بوو، بۆیە عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەگەر بفەرمووی دووبارەی بکەیتەوە بۆم گەشەی پێ دەکەم، ئەویش بۆی دووبارە کردمەوە، لەپاشا فەرمووی:

---

[٣٣٩] بوخاری (٢٧٩٠).

[٣٤٠] موسلیم (١٨٨٤).

بەڵام پایەیەکی تریش هەیە، بەندە لەبەهەشتا سەدپلە پێی بەرز دەبێتەوە، کەنێوانی هەموو دووپلەیەکی بەقەد نێوانی ئاسمانو زەوی دەبێ! منیش عەرزیم کرد: قوربان! دەشێ ئەوە چی بێ؟ فەرمووی: ئەوە غەزا کردنە لەرێگەی خودادا، ئەوە خەباتگێڕانو هەوڵو کۆششو تەقەلادا لەرێگەی خودادا.

١٨/١٣٠٢-٣٥٧/ عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي وَهُوَ بِحَضْرَةِ الْعَدُوِّ يَقُول: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إنَّ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ فَقَامَ رَجُلٌ رَثُّ الْهَيْئَةِ فَقَالَ: يَا أَبَا مُوسَى آنْتَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: هَذَا قَالَ نَعَمْ قَالَ فَرَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَقْرَأُ عَلَيْكُمْ السَّلَامَ ثُمَّ كَسَرَ جَفْنَ سَيْفِهِ فَأَلْقَاهُ ثُمَّ مَشَى بِسَيْفِهِ إِلَى الْعَدُوِّ فَضَرَبَ بِهِ حَتَّى قُتِلَ). رواه مسلم. [٣٤١]

ئەبو بەکرەی کوڕی مووسا (خودا لێیان خۆش بێ) فەرمووی: ڕووبەڕوی دوژمن وەستابووین، لەوکاتەدا لەباوکم بیست دەیفەرموو: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دڵنیابن کەوا دەرگاکانی بەهەشت وان لەژێر سێبەری شمشێردا، کابرایەکی رووتەڵەی شڕۆڵە هەڵسایەوە گوتی: ئەی ئەبوموسا! ئایا تۆ بۆخۆت بەگوێی خۆت ئەمەت لەزاری پیرۆزی خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) ژنەوتووە، یا کەسێکی تر بۆی گێڕاویتەوە؟ فەرمووی: ئا بەگوێچکەی خۆم لەوم بیستووە ئیتر ئەو برادەرە گەڕایەوە بۆلای برادەرەکانی خۆیو گوتی: بۆدواجار لەلایەنی منەوە سلاوتان لێ بێ، من دەڕۆم بۆ کوشتار، تا نەکوژرێم ناگەڕێمەوە! ئەوجا دەستی دایە مشتووی شمشێرەکەیو لەکێلان دەری هێناو کێلانەکەی شکانو فڕێ داو جارێکی تر بەتەمای نەما، ئینجا بەشمشێری ڕووتەوە رووی کردە دوشمنو دەستی کرد بە شەڕەشیرو هەر شمشێری وەشاند هەتا شەهیدکرا (م).

١٩/١٣٠٣-٣٥٨/ عَنْ أبِي عَبْسٍ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جَبْرٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا اغْبَرَّتْ قَدَمَا عَبْدٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ). رواه البخارى. [٣٤٢]

---

[٣٤١] موسلیم (١٩٠٢).

[٣٤٢] بوخاری (٢٨١١).

ئەبو عەبسی کوڕی ئەوڕەحمانی کوڕی جەبر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەربەندەیێ بۆ ڕەزای خودا قاچەکانی گەرداوی ببن‌و خۆڵ‌و گەردی ڕێگەوبانیان لێ بنیشێ ئاگری دۆزەخ چەشکەیان ناکا (ب).

٢٠/١٣٠٤-٣٥٩/ فەرموودەی:(.. لايلج النار رجل ..) بڕوانە: (٤٤٨/٣ /ب/٢ ز/٥٤ ل/٣٣).

٢٢/١٣٠٥-٣٦٠/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (عَيْنَانِ لَا تَمَسُّهُمَا النَّارُ عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن.[٣٤٣]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: ئاگری دۆزەخ بەر ئەم دوو جۆرە چاوانە ناکەوێ: یەکەم: چاوێ کەلەترسی سام‌و شکۆمەندی خودا بگری، دوەم: چاوێ کەبۆ ڕەزای خودا ببێ بەپاسەوان‌و پاسی وڵاتی ئیسلام بکا (ت:ح/ح).

٢٢/١٣٠٦-٣٦١/ فەرموودەی (.. من جهز غازيا ..) بڕوانە: (١٧٧/١ ب - ١ ز - ١٦٧).

٢٣/١٣٠٧-٣٦٢/ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَفْضَلُ الصَّدَقَاتِ ظِلُّ فُسْطَاطٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَنِيحَةُ خَادِمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ طَرُوقَةُ فَحْلٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ). رواه الترمذي.[٣٤٤]

ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: گەورەترین خێرو خێرات خێری سێبەری ئەو دەوارەیە کەخاوەنەکەی ساخ لەبەر ڕەزای خودا دەیدا بەتێکۆشەرانی ڕێگەی خودا لەبنی دا گوزەران بکەن، یا خێری ئەو نۆکەرەیە کەبۆ ڕەزای خودا بدرێ بەتێکۆشەرانی ڕێگەی خودا، کەبەردەستی یان بکاو خزمەتیان بکا، یا خێری ئەو وڵاخی سواری یەیە کەدەدرێ بەتێکۆشەرانی ڕای خودا، کەهەڕەتی بڕشتیەتی‌و هاوەڵی دەمیەتی، گریمان پارێنە وشتر بێ بەرکەڵ بووبێ (ت:ح/ح/ص).

٢٤/١٣٠٨-٣٦٣/ فەرموودەی:(.ائت فلاناً فإنه قد كان) بڕوانە:(١٧٦/٤ ب/١ ز/٢٠ ل/١٦٦).

٢٥/١٣٠٩-٣٦٤/ فەرموودەی:(.. بعث إلى بني لحيان .) بڕوانە: (١٧٨/٢ ب/١ ز/٢١ ل/١٦٨).

---

[٣٤٣] تیرمیذی (١٦٣٩).

[٣٤٤] تیرمیذی (١٦٢٧).

لێرەدا ئەم پترییەی هەیە: لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا: فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): دەی بالەهەردوو پیاوێ پیاوێکیان بڕوا بۆ غەزا ئەوجا فەرمووی: بەوەیان کەلەماڵەوە دەمێنێتەوە: هەرکامتان بەباشە لەجیاتی ئەوەی دەرچووە بۆ غەزا، لەپاش دەرچوونی خۆی سەرەوکاری ماڵو منالەکەی بکا نیوەی ئەو خێرو پاداشی باشی بۆهەیە.

٢٦/١٣١٠-٣٦٥/ عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قالَ: (أَتَى النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ مُقَنَّعٌ بِالْحَدِيدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُقَاتِلُ أَوْ أُسْلِمُ؟ قَالَ: أَسْلِمْ ثُمَّ قَاتِلْ. فَأَسْلَمَ ثُمَّ قَاتَلَ فَقُتِلَ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَمِلَ قَلِيلًا وَأُجِرَ كَثِيرًا). متفق عليه.[٣٤٥]

بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەبەر چەكو شیروتیرو تفاقی شەڕ هەر دوو کونی چاوی بەدەرەوە بوو، سەرتاپای لەشی لەئاسندا نووقم بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! یەکسەر بڕۆم بۆشەڕ، یا لەپێشدا موسوڵمان ببمو شایەتمان بێنم؟ فەرمووی: لەپێش دا موسوڵمان ببە، ئەوسا بچۆ بۆ جەنگ ئیتر پیاوەکە باوەڕی هێناو یەکسەر لەپاش ئەوە چووە پێشەوەبۆ بەرەی شەڕو خۆی کرد بەکۆڕی شەڕداو جەنگی کرد هەتا کوژرا!

ئەوجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم پیاوە کارێکی زۆرکەمی کردو پاداشێکی زۆر گەورەو چاکی بۆ خۆی برد! (ش).

٢٧/١٣١١-٣٦٦/عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا أَحَدٌ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا وَلَهُ مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا الشَّهِيدُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ لِمَا يَرَى مِنْ الْكَرَامَةِ) وفي رواية: لما يرى من فضل الشهادة. متفق عليه.[٣٤٦]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی دەمرێ، ئەگەر بەهەشتی بێ، ئیتر ئەگەر ئەم جیهانەو هەرچی لەم جیهانەدایە بیدەن پێی حەز ناکا بگەڕێتەوە بۆئێرە، بێجگە لەشەهید، بەڵام شەهید ـ لەبەر

---

[٣٤٥] بوخاری (٢٨٠٨)و موسلیم (١٩٠٠).

[٣٤٦] بوخاری (٢٨١٧)و موسلیم (١٨٧٧) (١٠٩).

گەورەیی‌و نازداریی پایەو پلەی شەهیدیی ـ حەزدەکا دە جاری تریش بگەڕێتەوە بۆ جیهان‌و گشت جارێ خۆی لەڕێگەی خودادا بداتەوە بەکوشت! لەگێڕانەوەیەکدا: حەزدەکا دە جاری تریش بگەڕێتەوە بۆ جیهان‌و هەموو جارێ خۆی بداتەوە بەکوشت، چونکە بەچاوی خۆی دەبینێ کە شەهید چەندە بەقەدرو بەڕێزو گرانە!

٢٨/١٣١٢-٣٦٧/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلَّا الدَّيْنَ) رواه مسلم وفي رواية له: القتل في سبيل الله يكفر كل شيء الا الدين.[٣٤٧]

لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: تەنیا تەنیا قەرد نەبێ خودا لەهەموو گوناهێکی تری شەهید خۆش دەبێ (م) لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیم دا: کوژران لەڕای خودادا هەموو خراپەو گوناهێکی شەهید دادەپۆشێ بێجگە لەگوناهی قەرزاری!

٢٩/١٣١٣-٣٦٨/ فەرموودەی: (.. قام فيهم فذكر ..) [٣٤٨]

٣٠/١٣١٤-٣٦٨/ عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: أَيْنَ أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ قُتِلْتُ: قَالَ: فِي الْجَنَّةِ. فَأَلْقَى تَمَرَاتٍ كُنَّ فِي يَدِهِ ثُمَّ قَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ).رواه مسلم.[٣٤٩]

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر لەپێناوی ئەم ئایینەی تۆدا بکوژرێم لەو دنیا شوێنم کوێ یە؟ فەرمووی: جێگەت بەهەشتە! ئیتر پیاوەکە چەند دەنکێ خورما لەناو دەستی دا بوو، تووڕی دان‌و دەستی کرد بەجەنگین‌و جەنگی کرد هەتا کوژرا (م).

٣١/١٣١٥-٣٦٩/عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ حَتَّى سَبَقُوا الْمُشْرِكِينَ إِلَى بَدْرٍ وَجَاءَ الْمُشْرِكُونَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يُقَدِّمَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلَى شَيْءٍ حَتَّى أَكُونَ أَنَا دُونَهُ فَدَنَا الْمُشْرِكُونَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ قَالَ يَقُولُ عُمَيْرُ بْنُ الْحُمَامِ الْأَنْصَارِيُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ جَنَّةٌ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ قَالَ نَعَمْ قَالَ بَخٍ

---

[٣٤٧] موسليم (١٨٨٦) (١١٩) و (١٢٠).

[٣٤٨] بڕوانە (٢١٧/١٥ب ـ از ـ ٢٦ ل ـ ٢٠٢).

[٣٤٩] موسليم (١٨٩٩).

بَخٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا يَحْمِلُكَ عَلَى قَوْلِكَ بَخٍ بَخٍ قَالَ لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلَّا رَجَاءَةَ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِهَا قَالَ فَإِنَّكَ مِنْ أَهْلِهَا فَأَخْرَجَ تَمَرَاتٍ مِنْ قَرَنِهِ فَجَعَلَ يَأْكُلُ مِنْهُنَّ ثُمَّ قَالَ لَئِنْ أَنَا حَيِيتُ حَتَّى آكُلَ تَمَرَاتِي هَذِهِ إِنَّهَا لَحَيَاةٌ طَوِيلَةٌ قَالَ فَرَمَى بِمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ التَّمْرِ ثُمَّ قَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ) رواه مسلم.[٣٥٠]

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای بەدری گەورەدا پێغەمبەرو سوپاکەی کەبریتی بوون لەیارانی بەرەو شەڕگەی بەدر کەوتنەڕێ، بەر لە سوپای هاوبەش پەیداکەران خۆیان گەیاندە سەر کانیەکەی بەدر، کاتێ هاوبەشپەیداکەرە کانیش لەولاوە هاتن‌و گەیشتنە شەڕگە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەستان دەست لەهیچ مەدەن هەتا خۆم نەڵێم! کاتێ بتپەرستەکان نزیك بوونەوەو بووبەشەڕ، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئادەی هەستن خۆتان بگەیەننە ئەو بەهەشتەی کەخودا لەپەسنی دا دەفەرموێ: (وسارعوا إلى مغفرة من ربكم وجنة عرضها السموات والأرض) وەبچن بەلای ئەو بانگەوازەی خوداوە کە دەفەرموێ: ( إن الله اشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة ، يقاتلون في سبيل الله فيقتلون ويقتلون وعدا عليه حقا) [٣٥١]

فەرمووی: عومەیری کوڕی حومامی ئەنصاری (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا! بەهەشتێ کەپانایی یەکەی بەقەد هەموو ئاسمانەکان‌و ئەم زەوی یەیە!؟ فەرمووی: بەڵێ عومەیر فەرمووی: بەه بەه ! حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خێرە دەڵێی بەه بەه، قسەکەت بەدڵە، یا مەبەستت شتێکی ترە؟ عومەیر فەرمووی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خودا! خوانەخواست بەدەغەزەوە ناڵێم، تەنیا مەبەستم ئەوەیە کەلەدانیشتوانی ئەو بەهەشتە بەرینەبم حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دە دڵنیابە تۆ خەڵکی ئەوێ ی! جا چەند قلێ خورمای لەهەکبەی تیرتیردانەکەی دەرهێناو لەخۆشیدا دەستی کرد بەلێخواردنیان، لەپاش تۆزێ فەرمووی: بەخوا تا لەخواردنی ئەم قلە خورمایانە دەبمەوە درەنگم

---

[٣٥٠] موسلیم (١٩٠١).

[٣٥١] ئایەتی یەکەم لەم زنجیرە دەدا رابورد، ئایەتی دوەم لەسەرەتای ئەم باسەدا رابورد. حەدیثەکە تەلمیحی بۆ ئەم دوەتیادایە. (وەرگێڕ)

بەسەردێو ئەوە ژیانێکی دوورو درێژی دەوێ، ئیتر ئەو خورمایەی پێی بوو گشتی توڕدا وەدەستی کرد بەجەنگین هەتا کوژرا (م).

٣٢/١٣١٦/٣٧٠/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: (جَاءَ نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا أَنْ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالًا يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَّةَ فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلًا مِنْ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُمْ الْقُرَّاءُ فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ وَيَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ وَكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالْمَاءِ فَيَضَعُونَهُ فِي الْمَسْجِدِ وَيَحْتَطِبُونَ فَيَبِيعُونَهُ وَيَشْتَرُونَ بِهِ الطَّعَامَ لِأَهْلِ الصُّفَّةِ وَلِلْفُقَرَاءِ فَبَعَثَهُمْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ فَعَرَضُوا لَهُمْ فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا الْمَكَانَ فَقَالُوا اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا قَالَ وَأَتَى رَجُلٌ حَرَامًا خَالَ أَنَسٍ مِنْ خَلْفِهِ فَطَعَنَهُ بِرُمْحٍ حَتَّى أَنْفَذَهُ فَقَالَ حَرَامٌ فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَصْحَابِهِ إِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ قُتِلُوا وَإِنَّهُمْ قَالُوا اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا). متفق علية وهذا لفظ مسلم.[٣٥٢]

دیسان فەرمووی: وەفدێ هاتنە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! دەستەیێ زانامان لەگەڵدا بنێرە، هەتا قورئانو رەوشتی تۆمان فێربکەن، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) حەفتا پیاوی لەئەنصارەکان بۆیان نارد، پێیان دەگوتن: قورئان زانەکان، خاڵێکی منیان تیادا بوو ناوی حەرام بوو، ئەمانە ئیشیان ئەوەبوو بەشەو قورئانیان دەخوێندو دەوریان دەکردەوەو رەوانیان دەکرد تا بەتەواوی فێری دەبوون، بەڕۆژیش دەچوون ئاویان دەهێناو لەمزگەوت دایان دەنا بۆ پێویستی خەڵکی مزگەوت، دوا ئەوە دەچون داریان دەبڕیو چیلکەو چەواڵو داریان کۆ دەکردەوەو دەیانبرد لەبازاڕ دەیانفرۆشتو نانو خۆراکیان بۆ خەڵکی صوففەو هەژارانی تر پێ دەکرێ. کاتێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەم نیازە پیرۆزە ناردنی، لەرێ عامیری کوڕی طوفەیل، ئەو دوژمنی خودایە، پەلاماری دانو هەموویانیان کوشت، پێش ئەوەی بگەنە ئەو شوێنەی بۆی دەچوون، کەگەمارۆیان دان فەرموویان: خودایە! ئێمەوا واین لەخزمەتی تۆدا بەچارەنووسی تۆ قاییلینو هەرچیت لەچارەمان نووسیوە لەسەر سەرمانە، لەتۆبەزیاد بێ لەئێمە رازیت، ئەوەتا رێگەی بەهەشتت، بەنصیب کردووین، دەی بەرەحمەتی خۆت حاڵمان بە

[٣٥٢] بوخاری (٢٨٠١)و موسلیم (٣/١٥١١ رقم/١٤٧).

پێغەمبەری خۆمان رابگەیەنە کەئێمە ئەمە حاڵمانە واین لە خزمەتی تۆدا، هەم ئێمە لەتۆ رازین‌و هەم تۆ لەئێمە رازیت. پیاوێ بەنامەردی لەپشتەوە فرسەت لەحەرامی خاڵی ئەنەس دەبینێ، رمێکی لێ دەدا، دییواودەری دەکا. حەرام مستێ لەخوێنەکەی خۆی دەگرێ‌و دەیپرژێنێ لەسەرو دەموچاوی خۆی‌و لەخۆشی دا دەفەرموێ: ئۆخەی بەئاواتی خۆم گەیشتم، بەخودای کابە کەهەر خۆی تاقە خودای راست‌و دروستە ئاواتی بوونم هاتەدی!

جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: برادەرەکانی ئێوە، ئەو حەفتا پێشمەرگە قارەمانانەتان هەموو شەهیدکران، عەرزی خودایان کردبوو: خودایە! لەباتی ئێمە هەواڵمان بدە بە پێغەمبەرەکەمان: کەوا ئێمە واین لەخزمەتی تۆدا ئێمە لەتۆ رازین‌و تۆیش لەئێمە رازیت، بەهەرەیش لەمەگەورەتر دەبێ چی بێ؟! (ش).

٣٣/١٣١٧-٣٧١/ فەرموودەی ئەنەس (..غاب عمي أنس بن النضر عن قتال بدر).[٣٥٣]

٣٤/١٣١٨-٣٧٢/ عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: النَبِـيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي فَصَعِدَا بِي الشَّجَرَةَ فَأَدْخَلَانِي دَارًا هِيَ أَحْسَنُ وَأَفْضَلُ لَمْ أَرَ قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهَا قَالَا أَمَّا هَذِهِ الدَّارُ فَدَارُ الشُّهَدَاءِ). رواه البخارى وهو بعض من حديث طويل فيه أنواع من العلم، سيأتي في باب تحريم الكذب إن شاء الله تعالى.

سەموورە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم شەو لەخەوما .. تادوایی فەرموودەکە، خوایاربێ بەتەواوی فەرموودەکە لەدواوە لەباسی (تحريم الكذب) دا، دێ.

٣٥/١٣١٩-٣٧٣/عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ أُمَّ الرُّبَيِّعِ بِنْتَ الْبَرَاءِ وَهِيَ أُمُّ حَارِثَةَ بْنِ سُرَاقَةَ أَتَتْ النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَلَا تُحَدِّثُنِي عَنْ حَارِثَةَ وَكَانَ قُتِلَ يَوْمَ بَدْرٍ أَصَابَهُ سَهْمٌ غَرْبٌ فَإِنْ كَانَ فِي الْجَنَّةِ صَبَرْتُ وَإِنْ كَانَ غَيْرَ ذَلِكَ اجْتَهَدْتُ عَلَيْهِ فِي الْبُكَاءِ قَالَ يَا أُمَّ حَارِثَةَ إِنَّهَا جِنَانٌ فِي الْجَنَّةِ وَإِنَّ ابْنَكِ أَصَابَ الْفِرْدَوْسَ الْأَعْلَى). رواه لبخارى.[٣٥٤]

---

[٣٥٣] بوخاری (١٣٨٦). بڕوانە (١٥٤٦/٥ز ـ ٢٦٠ ب ـ ٤ل ـ ).

[٣٥٤] بوخاری (٢٨٠٩).

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئوممو رەبیعی کچی بەراو، کەدایکی حاریثی کوڕی سوراقەبوو، کە حاریثی کوڕی لەغەزای بەدردا شەهید بوو بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزیا باسی حاڵی حاریثی کوڕمت بۆ دەکردم: ئەگەر جێگەی باش بێ‌و لەبەهەشتابێ ئەوا سەبووریم دێ‌و ددان بەخۆما دەگرم، خۆ خوانەخواستە ئەگەر حاڵی باش نەبێ‌و جێگەی خراپ بێ، ئەوا هەتا وزەم لێ دەبڕێ هەربۆی دەگریم!

حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی دایکی حاریثە! خۆی وایە: بەهەشتگەلێکی زۆرن‌و وان لەناو بەهەشتی بەرین دا، لەسایەی رەحمەتی خوداوەو بەهۆی شەهید بوونەوە کوڕەکەی تۆ بەهەشتی هەرەباش‌و هەرەبالای بەرکەوتووە کەناسراوە بەفیردەوس! (ب).

٣٦/١٣٢٠-٣٧٤/ عَنْ جَابِرٍ ﷺ قالَ: (جِيءَ بِأَبِي إِلَى النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ مُثِّلَ بِهِ وَوُضِعَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَذَهَبْتُ أَكْشِفُ عَنْ وَجْهِهِ فَنَهَانِي قَوْمِي فَسَمِعَ صَوْتَ صَائِحَةٍ فَقِيلَ ابْنَةُ عَمْرٍو أَوْ أُخْتُ عَمْرٍو فَقَالَ لِمَ تَبْكِي أَوْ لَا تَبْكِي مَا زَالَتْ الْمَلَائِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا). متفق عليه.[٣٥٥]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەلاشەکەی باوکمیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە لە ڕۆژی ئوحودا کوژرابوو، لەپاش شەهید بوونی، لچولێو یان کردبوو، کەلەبەردەمی حەزرەتدا دایان نا، چووم کەسەری هەڵ بدەمەوە تا دڵم پێی بسوتێ، وەلێ هەندێ کەس رێگەیان نەدام کەوا بکەم. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: تاهەنووکەیش فریشتەکان بەباڵی رەحمەتیان سێبەریان بۆ تەرمەکەی کردبوو (ش).

٣٧/١٣٢١-٣٧٥/ فەرموودەی:(من سأل الله تعالى الشهادة) بڕوانە:(٥٧/٤ ب/١ ز/٤ ل/٧١).

٣٨/١٣٢٢-٣٧٦/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ طَلَبَ الشَّهَادَةَ صَادِقًا أُعْطِيَهَا وَلَوْ لَمْ تُصِبْهُ). رواه مسلم.[٣٥٦]

---

[٣٥٥] بوخاری (٢٨١٦)و موسلیم (٢٤٧١).

[٣٥٦] موسلیم (١٩٠٨).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بەڕاستی، پڕ بەدڵ لەکانگای دڵیەوە خۆزگە بۆ شەهیدبوون بخوازێ، خودا لەسەر ئەونیازە باشەی پاداشی پایەی شەهید بوونی دەداتێ: با شەهیدبوونیشی بەنصیب نەبێ (م).

٣٩/١٣٢٣-٣٧٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مِنْ مَسِّ الْقَتْلِ إِلَّا كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ مِنْ مَسِّ الْقَرْصَةِ) رواه الترمذی حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.[٣٥٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی:/ شەهید بەشەهید بوون لەکاتی کوشتنەکەیدا ئەوەندە ئازاری دەگا، بەقەد یەکێ لەئێوە کەمێشوولەیێ، یا مێرووولەیێ پێوەی بدا، یا گازی لێ بگرێ (ت: ح/ح/ص).

٤٠/ ١٣٢٤-٣٧٨/ فەرموودەی (أن رسول الله ﷺ في بعض أيامه التي لقي فيها العدو). بڕوانە (٢٩/٥٣ب - از - ٣ ل - ٦٨).

٤١/١٣٢٥-٣٧٩/ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (ثِنْتَانِ لَا تُرَدَّانِ أَوْ قَلَّمَا تُرَدَّانِ الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّدَاءِ وَعِنْدَ الْبَأْسِ حِينَ يُلْحِمُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا) رواه أبو داود بأسناد صحيح.[٣٥٨]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دوو نزا هەن هەمیشە گیرا دەبن‌و ڕەتبوونەوەیان بۆ نییە یا قسە بەر (ڕاوی) گوتی: فەرمووی: دوو دووعا هەن مەگەر چۆنها، دەنا هەمیشە قەبووڵ دەبن: نزای دەمە دەمی بانگ‌و قامەت، هەروەها نزای گەرمەی شەڕو جەنگەی جەنگ، کەدەبێ بەتێك ڕژان‌و تێکبەربوون (د - س/ص).

٤٢/١٣٢٦-٣٨٠/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا غَزَا قَالَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي بِكَ أَحُولُ وَبِكَ أَصُولُ وَبِكَ أُقَاتِلُ).[٣٥٩]

---

[٣٥٧] تیرمیذی (١٦٦٨).

[٣٥٨] ئەبو داوود (٢٥٤٠).

[٣٥٩] ئەبو داوود (٢٦٣٢)و تیرمیذی (٣٥٧٨).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) کەدەچوو بۆ غەزا، دەیفەرموو: اللَّهُمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي بِكَ أَحُولُ وَبِكَ أَصُولُ وَبِكَ أُقَاتِلُ: پەروەردگارا! ئەی خودای من ! هەر خۆت پشتو پەناو کۆمەکی منیتو بەس، هەر بەپشتی تۆ دێمو دەچمو دەرو دەشت دەکەم، هەر بەپشتی یاریدەی تۆش پەلاماری دوژمن دەدەمو هەڵمەت دەبەمە سەری، هەر تۆیش دەکەم بەگژ دوژمنی خۆم دا (د/ت:ح/ح).

٣٨١-١٣٢٧/٤٣/ فەرموودەی (أللهم إنا نجعلك في نحورهم ..). [٣٦٠]

٣٨٢-١٣٢٨/٤٤/ عَنْ ابنْ عمر (رضي الله عنهما) قال: قال: النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ).متفق عليه. [٣٦١]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەکاکۆڵی چارەوا (ماینو ئەسپ) خێرگرێ دراوە هەتا ڕۆژی قیامەت، واتە: ناوچەوانی ماین خێری پێوەیە (ش).

٣٨٣-١٣٢٩/٤٥/ عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيُّ ﷺ أَنَّ النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: (الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ الْأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ). متفق عليه. [٣٦٢]

عوروەی باریقی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەتا ڕۆژی قیامەت واتە: تا ئەو دەمەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دوا چۆڕی دێ، واتە: تانزیکی قیامەت، پیرۆزیو پیتو فەڕ وابەناوچەوانی وڵاخی بەرزەوە: هەم پاداشی باشی لای خودا، هەم ماڵی تالانی حەلاڵ (ش ـ خا).

٣٨٤-١٣٣٠/٤٦/ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قالَ: قَالَ: النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (مَنْ احْتَبَسَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللّهِ إِيمَانًا بِاللّهِ وَتَصْدِيقًا بِوَعْدِهِ فَإِنَّ شِبَعَهُ وَرِيَّهُ وَرَوْثَهُ وَبَوْلَهُ فِي مِيزَانِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). رواه البخارى. [٣٦٣]

---

[٣٦٠] بڕوانە (١/٩٨١ب ـ ٣ز ـ ١٧٣ل ـ ..).

[٣٦١] بوخاری (٢٨٤٩)و موسلیم (١٨٧٣).

[٣٦٢] بوخاری (٢٨٥٢)و موسلیم (١٨٧٣).

[٣٦٣] بوخاری (٢٨٥٣).

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەڕێی خودا وڵاخێکی بەرزە ڕابگرێو تەرخانی بکا بۆغەزا، لەبەر رەزای خودا، وەلەهەمان کاتدا ئەمە بۆیە بکا چونکە باوەڕی هەیە بەخوداو بەڵێنی خودا لەم لایەنەوە بەڕاست دەزانێ، ئەوە لەڕۆژی زیندووەدا تێرە خۆرو پاراوو تەرس‌و گمێزی ئەو وڵاخە دادەنرێ لەتای خێری تەرازووی خاوەنەکەیدا (ب).

٤٧/١٣٣١-١٣٨٥/ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: (جَاءَ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فَقَالَ هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَالَ (رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سَبْعُ مِائَةِ نَاقَةٍ كُلُّهَا مَخْطُومَةٌ).رواه مسلم.[٣٦٤]

ئەبو مەسعوود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ وشترە مێنکەیەکی قەمتەرکراوی بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هێناو گوتی: قوربان! ئەمەم هێناوە دەیدەم لەڕێگەی خودادا، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەڕۆژی زیندووەدا خودا لەباتی ئەمە حەوسەد وشتری مێنگەی قەمتەرکراوت دەداتێ (م).

٤٨/١٣٣٢-٣٨٦/ وعن أبي حماد، ويقال: أبو سعاد، ويقال أبو أسد ويقال: أبو عامر، ويقال: أبو عمرو، ويقال: أبو الأسود، ويقال: أبو عبس، عقبة بن عامر الجهني (رضي الله عنه) سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ). رواه مسلم.[٣٦٥]

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر مینبەر (بەکوردی: دوانگە) دەیفەرموو: (واعدوا ماستطعتم من قوة) (٨/٦٠). ئینجا فەرمووی: بزانن کە مەبەست لە (قوە) لەم ئایەتەدا تیرئەندازیو تیرهاویشتن‌و تەقەکردنە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ گرنگی دان بەبابەتەکە سێ جار ئەم وشە پیرۆزەی دووبارە کردەوە، تاموسوڵمانان بەگرنگی بیگرن (م).

---

[٣٦٤] موسلیم (١٨٩٢).

[٣٦٥] موسلیم (١٩١٧).

٤٩/١٣٣٣-٣٨٧/ وعَنهُ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ أَرَضُونَ وَيَكْفِيكُمُ اللّٰهُ فَلَا يَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ). رواه مسلم.[٣٦٦]

**دیسان فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست، دەیفەرموو** (درودی خوای لەسەر بێ): **بەم زوانە خودا لەسەردەستی ئێوەدا وڵاتێکی زۆر ئازاد دەکا بۆتان‌و بۆتانی دەگرێ‌و فەتحی دەکاو دەیدا بەدەستانەوە، وەخودا بۆخۆی چارەسەری دوژمنتان بۆ دەکاو کاروباری شەڕتان بۆ دەبابەڕێگەوە، وەلێ بەهەرحاڵ ئێوە لەچالاکی خۆتان خاو مەبنەوەو واز لەتیربازی‌و شەڕەشیرو مەشق کردن بەچەك مەهێنن (م)**

**وادەزانم هەتا لەحاڵەتی وایشدا، کەخودا خۆی بەئاشکرا یارمەتیان بدا، ساردبوونەوە لەمەشق کردن زۆر ناشایستەیە، واتە: سوپای ئیسلام هەتا سەرکەوتووتربێ، دەبێ باشتر خۆی ئامادەبکا بۆشەڕو لەهەمووکاتێ پتر چالاکی‌و شەوکەت‌و ڕەشیدی بنوێنێ، دانا پشتی سارد دەبێتەوە (وەرگێڕ).**

٥٠/١٣٣٤-٣٨٨/ وعَنهُ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ عَلِمَ الرَّمْيَ ثُمَّ تَرَكَهُ فَلَيْسَ مِنَّا أَوْ قَدْ عَصَى) رواه مسلم.[٣٦٧]

**دیسان فەرمووی: خۆشەویست دەفەرموێ** (درودی خوای لەسەر بێ): **ئەوەی فێری ڕمبازی‌و تیرئەندازی‌و تەقەکردن ببێ‌و لەبیر خۆی بەرێتەوە ئەوە لەئێمە نییە، یا راوی گوتی: فەرمووی: ئەوە بێفەرمانی خودا دەکا (م).**

٥١/١٣٣٥-٣٨٩/ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّ اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ يُدْخِلُ بِالسَّهْمِ الْوَاحِدِ ثَلَاثَةَ نَفَرٍ الْجَنَّةَ صَانِعَهُ يَحْتَسِبُ فِي صَنْعَتِهِ الْخَيْرَ وَالرَّامِيَ بِهِ وَمُنْبِلَهُ وَارْمُوا وَارْكَبُوا وَأَنْ تَرْمُوا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ تَرْكَبُوا لَيْسَ مِنْ اللَّهْوِ إِلَّا ثَلَاثٌ تَأْدِيبُ الرَّجُلِ فَرَسَهُ وَمُلَاعَبَتُهُ أَهْلَهُ وَرَمْيُهُ بِقَوْسِهِ وَنَبْلِهِ وَمَنْ تَرَكَ الرَّمْيَ بَعْدَ مَا عَلِمَهُ رَغْبَةً عَنْهُ فَإِنَّهَا نِعْمَةٌ تَرَكَهَا أَوْ قَالَ: كَفَرَهَا). رواه أبو داوود.[٣٦٨]

---

[٣٦٦] موسليم (١٩١٨).

[٣٦٧] موسليم (١٩١٩).

[٣٦٨] ئەبو داوود (٢٥١٣).

**دیسان فەرمووی: لە حەزرەتم بیست دەیفەرموو** (درودی خوای لەسەر بێ): **بەهۆی تاقە تیرێکەوە خودای مەزن سێ کەس دەخاتە بەهەشتەوە: یەکەم تیرسازەکە: ئەوەی لەبەر رەزای خودا دروستی دەکاو ساخ مەبەستی لەدروستکردنەکەی خێرو قازانجی ئیسلامە، دووەم: تەقێنەرەکەی کەدەیتەقێنێ، سێیەم: بەردەستەکەی، کەتیرەکە دەداتە دەستی. فەرمووی: دەی هەم مەشقی تیربازیی‌و هەم مەشقی سواریی بکەن، بەڵام لەباری دڵی مندا مەشقی تێگرتن‌و تیرتەقاندن‌و نیشانەنانەوە لەمەشقی سواریی زۆرتر بکەن باشترە، کەسێ ـ لەپاش فێربوون ـ تەقەکردن‌و مەشقی چەك تەقاندن تەرك بکاو تاقەتی لێ ی بچێ‌و حەزی لێ ی نەمێنێ ئەوە دەست بەخێری خۆیەوە دەنێ. یا فەرمووی: ئەوە لەقە لەنازو نیعمەت دەدا (ئەبو داوود ـ رەزای خودای لێ بێ).**

**٣٩٠-١٣٣٦/٥٢/ عَنْ سَلَمَةَ بْنَ الْأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (مَرَّ النَبِيّ(صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَسْلَمَ يَنْتَضِلُونَ فَقَالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ارْمُوا بَنِي إِسْمَاعِيلَ فَإِنَّ أَبَاكُمْ كَانَ رَامِيًا) رواه البخاري.** [٣٦٩]

**سەلەمەی کوڕی ئەکوەع** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **چووبوڵای دەستەیێ، نیشانەیان نابۆوەو بوڕ بوڕێنیان دەکرد تابزانن کێ دەستی راستەو کێ تیری پتر دەڕوا، فەرمووی: ئەی نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەر** (سەلامی خوای لێ بێ) **دەی هەمیشە ئاوا تیر بتەقێنن‌و مەشقی تەقاندن بکەن، ئەم رەوشە بەرزە بەمیراتی لەبابە گەورەتانەوە بۆتان جێماوە، چونکە لەکاتی خۆیدا ئیسماعیلی بابەگەورەشتان کەباپیرەی عەرەبانە، تیرئەنداز بوو! (ب ـ خ).**

**٣٩١-١٣٣٧/٥٣/ وعَنْ عَمرو بنْ عبسة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ لَهُ عَدْلُ مُحَرَّرٍ). رواه أبو داود والترمذي وقال: حديث حسن صحيح.** [٣٧٠]

---

[٣٦٩] **بوخاری (٣٣٧٣).**

[٣٧٠] **ئەبو داوود (٣٩٦٥)و تیرمیذی (١٦٣٨).**

**عەمری کوڕی عەبسە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: ئەوەی لەبەر ڕەزای خودای گەورە تیرێ بتەقێنێ پاداش و خێری ئازادکردنی بەندەیەکی بۆهەیە (د/ت: ح/ح/ص).**

٥٤/ ١٣٣٨-٣٩٢/ وعَنْ أبي يحيى خُرَيْم بْنِ فَاتِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) (مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ كُتِبَتْ لَهُ بِسَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ). رواه الترمذي وقال: حديث حسن. [٣٧١]

**ئەبو یەحیا: خورەیمی کوڕی فاتیك** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرکەسێ هەر خێری بکا، لەبەر ڕەزای خودا، لەنامەی کرداریا بەحەوت سەدقات بۆی دەنووسرێ (ت:ح/ح).**

٣٩٣-١٣٣٩/٥٥/ فەرموودەی (.. مامن عبد يصوم يوماً..) بڕوانە: (١٢١٨/٤ب - ٣ ز- ٢١٧ ل - ..).

٥٦-١٣٤٠-٣٩٤/ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ عَنْ النبيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ جَعَلَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ خَنْدَقًا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ) رواه الترمذي وقال حَدِيثٌ حسن صحيح. [٣٧٢]

**ئەبو ئومامە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ ساخ بۆ ڕەزای خودا یەك ڕۆژ بەڕۆژووبێ، خودا بەهۆی ئەو ڕۆژووەوە خەندەکێ لەبەینی ئەوو لەبەینی دۆزەخا دروست دەکا، ئەو خەندەکە بەقەی بەینی ئاسمان و زەوی دەبێ (ت: ح/ح/ص).**

٣٩٥-١٣٤١/٥٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النبيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِالْغَزْوِ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ). رواه مسلم. [٣٧٣]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوەی بمرێ و غەزای نەکردبێ و لەدڵیشیەوە بەتەمای غەزا نەبووبێ کەدەمرێ دەمارێکی نیفاق و ناپاکی ی تیادایە (م).**

---

[٣٧١] تیرمیذی (١٦٢٥).

[٣٧٢] تیرمذی (١٦٢٤).

[٣٧٣] موسلیم (١٩١٠).

٥٨/١٣٤٢-٣٩٦/ فەرموودەی: (.. كنا مع النبـيّ ﷺ في غـزاة ..). بڕوانـه: (٤/٤ ب/١ ز/١ ل/١١).

٥٩/١٣٤٣-٣٩٧/ فەرموودەی: (أن أعرابيا أتى النبـيّ ﷺ ..).[٣٧٤]

٦٠/١٣٤٤-٣٩٨/ حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ سَهْلٍ التَّمِيمِيُّ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ أَخْبَرَنَا نَافِعُ بْنُ يَزِيدَ حَدَّثَنِي أَبُو هَانِئٍ حَدَّثَنِي أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيُّ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فَتَغْنَمُ وَتَسْلَمُ إِلَّا كَانُوا قَدْ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أُجُورِهِمْ وَمَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تُخْفِقُ وَتُصَابُ إِلَّا تَمَّ أُجُورُهُمْ). رواه مسلم.[٣٧٥]

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص - ﷺ - فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکۆمەڵە موسوڵمانێ - کەم بن یا زۆر بن - بچن بۆ غەزایێ‌و لەو غەزایەدا تالانیان دەست بکەوێ بەڵام بەبێ زیان بگەڕێنەوەو بێوەی بن‌و سەلامەت بن، خۆئەگەر ئەو کۆمەڵە سەرنەکەوتن‌و لێدران ئەوە پاداشی تەواویان بۆ حلێب دەکرێ (م).

٦١-١٣٤٥/٣٩٩/ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ لِي فِي السِّيَاحَةِ؟ قَالَ: النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِنَّ سِيَاحَةَ أُمَّتِي الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى). رواه أبو داود باسناد جيد.[٣٧٦]

ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ بە حەزرەتی گوت: قوربان! ڕێگەم بدە دەچم بۆ گەشت‌و سەیرانی وڵاتان، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: گەشتوگوزاری گەلی من بریتی یە لەخەباتگێڕان‌و غەزاکردن لەڕێگەی خودای سەروەرو سەرداردا (د - س/ جيد).

٦٢/ ١٣٤٦-٤٠٠/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ هُوَ ابْنُ عَمْرٍو ﷺ عَنْ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (قَفْلَةٌ كَغَزْوَةٍ). رواه أبو داود باسناد جيد.[٣٧٧]

---

[٣٧٤] بڕوانە: (٨/٨ ب - ١ ز - ١ ل - ١٤).

[٣٧٥] موسليم (١٩٠٦) رقم: (١٥٤).

[٣٧٦] ئەبو داوود (٢٤٨٦).

[٣٧٧] ئەبو داوود (٢٤٨٧).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: گەڕانەوەیش لەغەزا وەك چوون بۆغەزا وایە، لەپاش‌و خێردا. (د - س/جید).

٦٣-١٣٤٧-٤٠١/ عَنْ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ قَالَ: (لَمَّا قَدِمَ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ تَلَقَّاهُ النَّاسُ فَلَقِيتُهُ مَعَ الصِّبْيَانِ عَلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ). رواه البخارى قال: ذهبنا تتلقى رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مع الصبيان الى ثنية الوداع.[٣٧٨]

سائیبی کوڕی یەزید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەغەزای تەبووك گەڕایەوە، مەردووم چوون بەپیریەوە، منیش لەگەڵ منداڵاندا چووم بەپیریەوە، لەثەنیەتولوداع بەخزمەتی گەیشتم. (د - س/ص). بوخاریش گێڕاویەتیەوە دەڵێ: فەرمووی: لەناو منداڵانی هاوسێرەی خۆمدا، تا ثەنیەتولوداع لەنزیك مەدینە بە پیر پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ). ثەنیەتولوداع ناوی ملەیەکە لەنزیك مەدینەوە، ڕێبواری ئازیز تا ئەوێ بەڕێ دەکرا (وەرگێر).

٦٤/١٣٤٨-٤٠٢/ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ لَمْ يَغْزُ أَوْ يُجَهِّزْ غَازِيًا أَوْ يَخْلُفْ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ أَصَابَهُ اللَّهُ بِقَارِعَةٍ قَالَ يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ رَبِّهِ فِي حَدِيثِهِ قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ). رواه أبو داود باسناد صحيح.[٣٧٩]

ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ نەخۆی غەزای کردبێ‌و نەتفاقی غەزاکردنی غەزاکەرێکی بۆی ئامادە کردبێ‌و، نەبە چاکە سەرپەرشتی خێزانی غەزاکەرێکی کردبێ، ئەوە خودا لەژیانی جیهاندا، بەرلەقیامەت، تووشی کارەساتێکی دڵتەزێنی دەکات (د - س/ص).

٦٥/١٣٥٠-٤٠٣/ عَنْ أَنَس ﷺ أَنَّ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ). رواه أبو داوود باسناد صحيح.[٣٨٠]

---

[٣٧٨] ئەبو داوود (٢٧٧٩)و بوخاری (٣٠٨٣).

[٣٧٩] ئەبو داوود (٢٥٠٣).

[٣٨٠] ئەبوداوود (٢٥٠٤).

**ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: چ بەسامان، چ بەگیان، چ بەزمان، بەسەرو بەماڵو بەزبان خەبات لەگەڵ هاوبەش پەیداکەران دا بکەنو بچن بەگژیانداو بەرپەرچیان بدەنەوە. (د ـ س/ص).**

٦٦/١٣٥٠-٤٠٤/ وعَنْ أَبي عمروٍ، ويقَالَ النُّعْمَانُ بْنُ مُقَرِّن ﷺ قال: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَانَ إِذَا لَمْ يُقَاتِلْ أَوَّلَ النَّهَارِ انْتَظَرَ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ وَتَهُبَّ الرِّيَاحُ وَيَنْزِلَ النَّصْرُ) رواه أبو داود والترمذي وقال:حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.[٣٨١]

**ئەبو عەمر پێشی دەگوترێ: ئەبو حەکیم نوعمانی کوڕی موقەڕین** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: گەلێ جاران، بۆخۆم لەخزمەتی حەزرەتدا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **بووم، ئەگەر سەرلەبەیانی، بەفێنکی دەستی نەکردایە بەجەنگ کردنو لەسەرەتای ڕۆژەوە شەڕی دانەمەزران دایە، ئیتر دامەزراندنی شەڕی دوا دەخست تاخۆر لای دەدا لەناوەڕاستی ئاسمانو لاردەبۆوە بە لای ئێوارەدا، کە کاتی هەڵکردنو وەزینی بایەو فێنك دەکا، هەلو مەرجی وایش دەبێ بەهۆی دابەزینی نەصرو سەرکەوتنو پیرۆزیی! (د/ت: ح/ح/ص).**

**٦٧/١٣٥١-٤٠٥/ فەرموودەی (.. لاتتمنوا لقاء العدوا..). بڕوانە (٢٩/٥٣ب ـ از ـ ٣ ل ـ ٦٨).**

٦٨/١٣٥٢-٤٠٦/ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الْحَرْبُ خَدْعَةٌ).[٣٨٢]

**ئەبوهورەیرە و جابیر ـ خۆشنوودی خودایان لێ بێ ـ فەرموویان: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: جەنگ فرو فێڵە شەڕ بەفێڵو فەرەج دەبڕێتەوە (ش) واتە: پیاوی شەڕزان ـ پێش بۆڕدانی دوژمن، لەگۆڕەپانی نەبەرددا، کەبەنووکی گوللەو شیرو تیر لەشەڕگەدا بیبەزێنێو سەری پێ دانەوێنێ ـ لەمەیدانی بیروڕادا، هۆشو ئەقڵ دەخاتەکارو، بەدانانی پلانی جەنگو بەنەخشەکێشانی باشو لەبارو تەیارو ساز، بەشوێنە گومکێو جێ گۆڕکێ، بەشێلەو بێلە، بەدرۆو دەلەسە، بەچاوبەستو فێڵو تەڵەکە، وەرەی دەڕوخێنێو بەتەواوی هەڵی دەخەڵەتێنێ، تا لەشەڕی دەماو**

---

[٣٨١] ئەبو داوود (٢٦٥٥)و تیرمیذی (١٦١٣).

[٣٨٢] بوخاری (٣٠٢٩) و (٣٠٣٠)و موسلیم (١٧٣٩).

لەشەڕە قسەدا داشی سوار دەبیٚو هەڵمەت دەباتە سەر دوژمنو دەیکا بەپۆڕی خوراو. وەلیٚ موسوڵمان نابیٚ بەدرۆ پەیمان بدا بەنەیاری خۆی، موسوڵمانو بیٚ پەیمانیو پەیمان شکاندنیان نەگوتووە (وەرگێڕ).

## (٢٣٥) باسی دیاریکردنی کۆمەڵیٚ لەشەهیدانی قیامەت، بەڵام چونکە شەهیدی دنیاش نین و بەپێی باوو یاسای ناوکۆمەڵ لەدنیادا ناویان دەرنەکردووە بەشەهیدی، وەك مردووی ئاسایی هەم دەشۆردرێن و هەم نوێژیان لەسەر دەکریٚ بەپێچەوانەی کوژراوی شەڕی بیٚ بڕوایانەوە

## باب بيان جماعة من الشهداء في ثواب الآخرة، ويغسلون ويصلي عليهم بخلاف القتيل في حرب الكفار

١/١٣٥٣-٤٠٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ الْمَطْعُونُ وَالْمَبْطُونُ وَالْغَرِقُ وَصَاحِبُ الْهَدْمِ وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ). متفق عليه. [٣٨٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بیٚ) دەفەرمویٚ: ئەم پێنج کەسەیە شەهیدن: کەسیٚ بەتاعوون بمریٚ شەهیدە، کەسیٚ بەدەردی ناوسك بمریٚ شەهیدە، کەسیٚ لەئاودا بخنکیٚ شەهیدە، کەسیٚ شت بڕوخیٚ بەسەریاو بمریٚ شەهیدە، کەسیٚ لەخەباتی ڕێگەی خودادا بکوژریٚ شەهیدە (ش).

٢/١٣٥٤-٤٠٨/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَا تَعُدُّونَ الشَّهِيدَ فِيكُمْ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ فَهُوَ شَهِيدٌ قَالَ إِنَّ شُهَدَاءَ أُمَّتِي إِذًا لَقَلِيلٌ قَالُوا فَمَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ مَاتَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ مَاتَ فِي الطَّاعُونِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ مَاتَ فِي الْبَطْنِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَالْغَرِيقُ شَهِيدٌ). رواه مسلم. [٣٨٤]

دیسان لەوەوە فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بیٚ) فەرمووی: ئەی یارانی من! ئێوە لەناو خۆتاندا کیٚ بەشەهید دادەنێن؟ گوتیان: قوربان! دیارە ئەوکەسە بەشەهید دادەنێین کەلەغەزای ڕێگەی خودادا بکوژریٚ، فەرمووی: ئەگەر

(٣٨٣) بوخاری (٢٨٢٩)و موسلیم (١٩١٤).

(٣٨٤) موسلیم (١٩١٥).

وابێ شەهیدانی ئۆمەتی من زۆرکەمن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی کێ شەهیدە؟ فەرمووی: ئەوەی لەخەباتی ڕێگەی خودادا بکوژرێ شەهیدە، وەئەوەی لەڕێگەی خودادا بمرێ شەهیدە، وەئەوەی بەهۆی تاعوونەوە بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی بەدەردی ناوسك بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی لەئاودا بخنکێ شەهیدە! (م - رەزای خودای لێ بێ):

**خوا مرازم بدا بگەم بەئاوات        شەهیدیی عیلمم بەنصیب بکات!**

٣/١٣٥٥-٤٠٩/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ النَبِيَّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ). متفق عليه.[٣٨٥]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ لەسەرماڵی خۆی بکوژرێ شەهیدە. (ش - خودا لێیان رازی بێ).

٤/١٣٥٦-٤١٠/ عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ).رواه أبو داود والترمذي، وقال: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.[٣٨٦]

سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل - کە کەسناو (کونیە) ی ئەبو ئەعوەر بوو، کەیەکێکە لەدە کەسە خودا پێداوەکان، کە خودا لەسەرزمانی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) مژدەی بەهەشتی پێ داون فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری نازدارم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): کەسێ لەسەرماڵی خۆی بەناڕەوا بکوژرێ شەهیدە کەسێ لەسەر کەسوکاری خۆی بەناهەق بکوژرێ شەهیدە (د/ت: ح/ح/ص).

٥/١٣٥٧-٤١١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي؟ قَالَ: فَلَا تُعْطِهِ مَالَكَ قَالَ

---

[٣٨٥] بوخاری (٢٤٨٠)و موسلیم (١٤١).

[٣٨٦] ئەبو داوود (٤٧٧٢)و تیرمیذی (١٤٢١).

أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي قَالَ قَاتِلْهُ قَالَ أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي قَالَ فَأَنْتَ شَهِيدٌ قَالَ أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ قَالَ هُوَ فِي النَّارِ). رواه مسلم. [٣٨٧]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر زەلامێ هات ویستی بەزۆر مالی حەلالی خۆم ببات بۆخۆم چی بکەم؟ فەرمووی: مالی خۆتی مەدەرێ، گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر ئەو کابرایە لەسەر ئەوە چوو بەگژما؟ فەرمووی: تۆش بچۆ بەگژیدا، گوتی: ئەی پێم بفەرموو، ئەگەر لەم حالەدا ئەو منی کوشت جێگەم کوێیەو پایەم چییە؟ فەرمووی: تۆ شەهیدیتو جێگەت بەهەشتە. گوتی: ئەی پێم بفەرموو ئەگەر من ئەوم کوشت من لەهەلو مەرجێکی ئاوادا ئەو جێگەی کوێ یە؟ فەرمووی: ناو کولۆرەی دۆزەخە! (م).

زانای گەورەو سەرومر دانەری کتێبی (دلیل الفالحين لگرق رياج الصالحين) مامۆستا مەلا محمدی کوڕی علان (رەزای خودای لێ بێ) لەم باسەدا لەئاخرەوە دەفەرموێ:

وقد جمع بعض الافاضل شهداء الآخرة ونظمهم في أبيات فقال:

| | |
|---|---|
| من بعد حمد الله والصلاة | على النبي، وآله الهداة |
| خذ عدة الشهداء سردا نظما | واحفظ هديت للعلوم فهما |
| محب آل المصطفى ومن نطق | عند امام جائر بعين حق |
| وذو اشتغال بالعلوم ثم من | على وضوء نومه نال المنن |
| ومن يموت فجائة، حريق | ومائت بفتنة، غريق |
| لديغ أو مسحور أو مسموم | ذو عطش مجموعة مولوم |
| أكيل سبع عاشق، مجنون | والنفسا، ذو الهرم، المبطون |
| ومن بذات الجنب أو ظلما قتل | أو دون مال أو دم، أهل، نقل |
| أو دين أو في الحرب أو مات به | مؤذن محتسب لربه |
| وجالب مبيع سعر يومه | أو مات في الطاعون بين قومه |
| كذا الغريب وبعين، قد قرا | أواخر الحشر بها نال الذرى |
| ومن يلازم وتره وورده | عند الضحا، وصوم حتم سعده |

[٣٨٧] موسليم (١٤٠).

ومن يصل ثالث الاسبوع    عند الزوال عاشر الركوع
ويقرأ الكرسي بعد الفاتحة    وسورة الإخلاص حتما صالحة
ومن يقل في الموت بارك ثم في    مابعده خمسا وعشرين اصطفى
ومن بصدق يسأل الشهادة    نال بذاك غاية السعادة

واته: پایەبەرزێ ژمارەی شەهیدەکانی رۆژی قیامەت لەم چەن شیعرەدا هۆنیوەتەوە، وا بەندەیش بەرێز ئەم خودا پێداوانەی کەدادەنرێن بەشەهیدی قیامەت، بەشیعر دەهۆنمەوە، چونکە شیعر لەبەرکردن لەبارترە:

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی یەزدان: خوای میهرەبان    سوپاسی دەکەم بەدڵ بەزوبان
ناوی چەن خۆشە لەکن موسوڵمان    تۆشەی دڵیەتی و شەکری سەرزمان
الله! یا یەزدان، خودا یا رەحمان    ئەسمائی حوسنان: واتە: ناوی جوان!
خودا چونکە خۆی خودای هەموانە    بەگش زمانێ ناوەکەی جوانە!
وەلێ زاتی خوا کونهی پەنهانە    کوردیش وەک عەرەب تیا دەسەوسانە
باسم الله: واتە: بەناوی یەزدان    یەکەم نایەتە، کاکە! لەقورئان!
والەناویدا سێ ناوی جوان    تۆ بڵێ: ئەڵلاورەحیم و رەحمان
ناوی گەورەی خوا برا! ئەڵلایە    ئەم ناوە عەجەب سرێکی تیایە!
مایەی پیرۆزیی بەندەی خودایە    مەرکەزی قودسیی هەموو دنیایە
رەحیم و رەحمان دوو ناوی خودان    چەتری رەحمەتن لەسەر شەهیدان
پایەی شەهیدی بەهرەی یەزدانە    بە هەرکێ ی دەدا خۆی میهرەبانە
لەپاش بیسمیلاو سوپاسی خودا    رەحمەت لەوکەسەی صەلاوات دەدا
لەسەر موحەممەد، لەگەڵ درووددا    لەگەڵ کۆمەڵ، یاخۆ بەجودا
شەهید شەهیدی رێگەی خودایە    هەرخۆی شەهیدی هەردوو دنیایە
ژمارەی شەهید خۆی دەدا لەچل    وادەیهۆنمەوە وەک گەردانەی مل
بەشیعری ئاسان، ناسک و رەوان    خۆش بێ لەگوێداو سووک لەسەر زوان
خاکمان بەخوێنی شەهید سەرانسەر    گوڵگوون و رەنگین وەک حەوزی کەوسەر
شەهیدی رێگەی خواوەندی صەمەد    شەهیدی ئەشقی ئالی موحەممەد
ئەم دوو دەستەیە لای زانای رەشید    سەرقافڵەن لەبۆ کاروانی شەهید
کەسێ گوستاخ بێ لەرووی زۆرداردا    بەقسەی رەوا رۆحی لە داردا
فەقێ و فێرخوازیش هەرکاتێ مردن!    لەرێی زانیندا شەهیدو مەردن!

هەروا ئەو كەسەی كەلەسەر دەسنوێژ
ئەوەی بەمەرگی كوتوپڕ دەڕوات
زوو ڕزگاری بوو لەمەینەتی ژین
سوتاوو خنكاو هەردوو شەهیدن
شتپێوەداوو بەجادوو مردوو
ئەوەی لەتونیا خنكابێ قوربان
ژنی دووگیان و گەورەكچ هەردوو
دڕندە خواردوو ئەویش شەهیدە
شێت و زەیستان، پیری كەفتەكار
ئەوەی بەدەردی پاڵوو مردو كاكە
لەسەر ماڵی خۆی، لەسەر خینی خۆی
ئەوە لەجەنگا كوژرا یا ئەوەی
بانگدەرێ بانگی ساخ بۆ خودابێ
هەرزانفرۆشێ شت بەنرخی ڕۆژ
شەهیدە ئەوەی دەمرێ بەتاعوون
ئاوارەیانی: غەریبی دێ و شار
لەپەنا بەردێ، یالەناو هەردێ
یا لەوێرانەی كەلاوەی گوندێ
وێڵ و غەریبی دێهات و شارن
زمان و قەڵەم كۆڵن وەكوو من
تیری چاوی پیس زۆر كوشندەیە
بەچی پێت خۆشە بمكوژە ئەی یار
سێ ئایەت هەیە كۆتایی حەشرە
شەهیدە هەركەس بكا ئەم سێیە
كەسێ دووشەممان سوننەتی زەوال
لەپاش فاتیحا ئایەتەلكورسی
لەنەخۆشینی مەرگا سەڵاوات
صل وسلم وزد وبارك
لەپاش (وبارك) بیست و پێنج وشە
رب هذه الدعوة التامة
كەسێ بەڕاستی لەخوا داواكات
دەخەوێ، عەمری كورت بێ یادرێژ
شەهیدە، بۆخۆی گەیی بەئاوات
لەتەپاوتلی سەرنوێن و سەرین !
هەروا كەسانێ بەناشووب مردن
هەروا مردوییێ ژاركار تێ كردوو
شەهیدی لەلای خودای میهرەبان
هەروا ئەو كەسەی لەژێر دارمردوو
كوشتەی عەشقێكی پاكی نەدیدە!
كەسێ بەدەردی سك بێ گرفتار!
مەزڵوومی كوژراو شەهیدی چاكە
لەسەر كەسی خۆی، لەسەر دینی خۆی
بەهۆی جەنگەوە مردبێ بەوەی
كەسێ خۆی وەقفی راهی خودابێ
ساخ بكاتەوە، بەبێ لۆژە لۆژ
هەروا ئەوانەی كەئاوارە بوون
كەلانەواز بوون لەناو كەسووكار!
لەبەینی دوو دێ، یا لەبن گردێ
بێ نیاز دەمرن بەهەموو دەردێ!
پایەراگەنەدەی زۆری زۆردارن
بۆ دەربڕینی داد لەدەس دوشمن
تیغی بڕندەی سەری بەندەیە !
شەهیدم مەكە بەچاوی خومار!
ئەوەی بیخوێنێ شەهیدی قەبرە
وەترو چێشتەنوێژ، لە مانگ سێ پێ یە
دە ركات بكا بۆ خوای زیلجەلال
بخوێنێ لەگەڵ سوورەی ئیخلاسی
لەسەر موحەممەد بەم جۆرە بدات
بەقەد ئەستێرەی ناو شەوی تاریك
باهەڵبژێرێ، ئیتر زۆرباشە
بخوێنە، برا! ئەوە تەمامە !
پایەی شەهیدیی دەگا بە ئاوات

ئەمانە هەموو لەدنیای دووهەم
ئەم ئورجوییەم من بەپێی عەینی
وەلێ سێ شیعری ماقەبلەئەخیر
ئەگەر وانەبوو، راستی کەرەوە
زانستی دینی ئەمڕۆ بێ نازە
دەنا خوا هەقە (نووری) ئەمەی تۆ
دەترسم نەزان بەنەزانی خۆی
سوپاس بۆخودا لەسایەی خواوە
تووتی و بولبول و کەوو کەناری!
نموونەن لە بۆ ناو کوردەواری

لای خوا شەهیدن بەبێ زیادوکەم
شەرح و راڤە کرد، کەلێ بەجوانی
خۆم شەرحم کردوون بانەبێ تەزویر
پاداشی گەورەش بۆخۆت بەرەوە
رۆژی پارەیە بەعیلمی تازە!
دەیکەی، گوڵێکە زۆر بەرەنگ و بۆ
قالۆنچە ئاسا جارِس بێ لەبۆی
دۆستی خێر هێشتا بەشی تۆ ماوە
چەن جوانن لەناو گەنمە قەناری!
کەبۆ ئەهلی دین بۆتە دەواری

(وەرگێڕ)- ١٩٩١/٨/١٠

## (٢٣٦) باسی بەهرە (خێر) ی ئازاد کردنی بەندە (عەبد)
## باب فضل العتق

قال الله تعالى:

بسم الله الرحمن الرحيم

{ لا أُقْسِمُ بِهَذَا الْبَلَدِ (١) وَأَنْتَ حِلٌّ بِهَذَا الْبَلَدِ (٢) وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ (٣) لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي كَبَدٍ (٤) أَيَحْسَبُ أَنْ لَنْ يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ (٥) يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالاً لُبَداً (٦) أَيَحْسَبُ أَنْ لَمْ يَرَهُ أَحَدٌ (٧) أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ (٨) وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ (٩) وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ (١٠) فَلا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ (١١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ (١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ (١٣) أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ (١٤) يَتِيماً ذَا مَقْرَبَةٍ (١٥) أَوْ مِسْكِيناً ذَا مَتْرَبَةٍ (١٦) ثُمَّ كَانَ مِنْ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ (١٧) أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ (١٨) وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ (١٩) عَلَيْهِمْ نَارٌ مُؤْصَدَةٌ (٢٠)} (سورة البلد- ٩٠/١- ٢٠).

قورئانی پیرۆز خۆی زۆر گرنگی بەمۆسیقای ناوخۆی وشەکانی داوە، هەرئەوەیە شیعری عەروضی نییە، دەنا هەموو جوانکاری و ناسکی و نازداری شیعری بەزیادەوە تیادایە، کەم وا دەبێ کەسەری ئایەتەکان، دوان و سیان یەک

سەروایان نەبێ، بگرە ئایەتی وا هەیە کێشی شیعری عەروزی، یا پەنجەی هەیە، گەرچی شتی وا بوونەکەی ڕێکەوتەو قەستی نییە.

بەڵێ قورئان قورئانەو بەس، نەشیعرەو نەنەثرە، نەپەخشانەو نەنەخشانە، ئەمە پتر لەهەزارو چوار سەد ساڵە دابەزیوە، کەچی وەك خۆرو مانگو ئەستێرەکان ئاسمان پیریو بەساڵاچوونی پێوە دیار نییەو تازەییو بەپێزیو بەهێزیو شەوقو رەونەقی خۆی لەدەست نەداوە، دەڵێی گوڵەمەشقەڵانەو تازە پشکوتووە، یا گوڵو ڕێحانەیەو بۆنو بەرامەی خۆشیو دەمار دەمار دەڕوا، جا ئەگەر بێتو شاعیرێکی گەورەی وەك حەزرەتی مەولەوی - رەزای خودای لێ بێ - بەو هەستە ناسکەی خۆی، وەبەو طەبعە مەوزوونەی خۆی، لەگەڵ ئەو هەموو شارەزایی یەی کەلەزانستە ئایینی یەکاندا بوویەتی، سەرەڕای خووی بەرزیو دینداریو دیانەتی جوانی، ئەگەر بێتو زانایەکی بلیمەتی ئاوا، تەفسیرێکی نەکورت نەدرێژ بەشیعر، لەقورئان بکا، بێگومان دەبێ بەشۆڕشێکی ئەدەبیو دیینیو کۆمەڵایەتی گەورە.

مەرجیش نییە تەفسیری وا هەر بەکوردی بێ بەهەموو زمانێ دەبێ، هەتا بەعەرەبی، چونکە راڤەو تەفسیر جیایە لەوەرگێڕانو تەرجەمە، دەنا دەبوو تەفسیر بەزمانی عەرەبی لەقورئان نەکرایە.

لەڕاستی دا جۆری تەفسیر زۆرە، تا ئێستا مامۆستایانی ئایینی کە راڤە دەنووسن، پتر خەریکی لایەنە تەسكو تەنگەبەرەکان بوونو، لەبەر هەندێ هۆی دەروونی بەناو ئایینی زاتی ئەوەیان نەکردووە کەجوزئی یات تەی بکەنو بەرەو ئامانجە بەرزەکانی ئایین هەنگاوی گەورە بنێن، وەڵێ مانگ کە هەڵهات شەرمی لەکەس نییە، وەك خودا لەقورئاندا دەفەرموێ: (فأما الزبد فيذهب جفاء وأما ما ينفع الناس فيمكث في الأرض) (١٧/١٣). شەڕە زۆرانی حەقو باطیلو وێنەی دروستیو نادروستی، وەکوو ئەوە وایە، کەبارانی زۆر لافاو لەناو شیوەکاندا، بەئەندازەی خۆیان هەڵ دەستێنێ، کەفو پووشو پەلاشێکی زۆر لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێو رامالی دەکا، هەروا زێڕو زیوو کانی نا پوخت، کە لەسەر ئاگر یا لەناو کوورەو بۆتەدا پوختو پالفتە دەکرێن، کەفو خلتە سەریان دەکەوێ، یا بنیان دەکەوێ، جا باراناوەکە خێرو بێرێکی چاکە، وڵاتو ئاوەدان دەکاتەوە، زێڕو زیوو کانە پوختە

کراوەکـانیش خشـڵو تفاقیـان لێدروسـت دەکـرێ، کـەفـو خڵتـەو پڵتەکـەیش فـڕە دەدرێنو نامێنن.

کەواتە بڕیاری خودا وایە شتی پـڕو پـووچ، وەك کـەفـو خڵتـە وایـە، سـەرێکەو دەبڕێتـەوە، بـەڵامو حـەقو دروستـی وەك زێـڕو زیـوو ئـاوی حـەیات وایـە، سـوودی ئێجگار زۆرە بۆ ئادەمیزاد، لەبەرئەوە هەر دەمێنێو ڕۆژ بەڕۆژ باشتر ڕەنگو ڕیشە بەناوی زەوی دا دادەکوتێ. خولودو بەقا بۆ ئەصلەحەو فەناو نـەمان بـۆ نالـەبارە. بچینەوە سەر مەبەستی سەرەکی خۆمان، دنیـا هـەروانابێ خـوا یـاربێ ڕۆژێ دەبـێ ڕۆژ بەدڵی خۆمان دەبێ، دین گەشە دەکاتەوە، لافاوی کوفرو بێـدینی دەنیشـێتەوە، دنیاش زۆری بەبەرەوە ماوە بەشی هەموو تاقیکردنەوەو تەجرەبەیـە دەکا، نەیسا هەرچۆنێ بێ بەڕای من ئەم سوورەتە پیرۆزە بـانگی ئـازادی یـە، بـەردی بنچینەی ڕۆژی ئازادی گەلانە، چونکە استبعادی گەل هیچی لە استعبادی فـەرد کـەمتر نییـە، ئەگەر پتر نەبێ، بەڵێ استعبادو کۆیلەیی زەبەدە، دەبێ بڕواو ڕەهەنەی نـاو کتـێبی مێژوو بکرێ، لافاوی خـوێنی ئـازادیخوازان خـەریکـە وەك کـەفـو تلّپـو قنگلاشـکەو پووشو پەڵاش، تەختو تاراجو کورسیو مورسی زۆرداره ملهوڕە موستـەعبیدەکان هـەڵ دەگـرێو لـە سـەلوێنکی مێـژوو مۆزەخانـەکانی فڕەیـان دەدا، ئـازادیو سەربەسـتیو حوڕییـەت بـوون بـە ئـاوو هـەواو نـانو دۆی میللـەتان، دەبـێ بـبن بەچەتری سەری گەلان لەسای سێبەری یەکسانیو برایەتی دا.

دیـن - بەتایبـەت ئـایینی پـیرۆزی ئیسـلام - دژی کۆیلـەییو چەوسـانەوەی بەندەکانی خودایە. لەحەدیثا دەفـەرموێ: (ألانسـان أخـو ألانسـان أحـب أم كـره) ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفـەرموێ: (متى استعبدتم النـاس وقـد ولـدتهم أمهـاتهم أحرارا).

جا لەم ڕوانگەیەوە، بۆ ڕچەشکاندنو هاندانی کەڵەشاعیرەکانمان، ئەم سوورەتە پیرۆزەیـە کەئـەم جـۆرە تەفسـیرە تەفسـیری تـەعلیمی نییـە، بـەڵکوو تەفسـیری تەهدیفی یە، ئەگەر تەعبیری (تەهدیفی) دروست نەبێ:

| | |
|---|---|
| بـەناوی یـەزدان: خـودای میهرەبـان | خـاوەن ڕەحمەتـە لەهـەردوو جیهـان! |
| خـودا دەفـەرموێ بـەزاتی حـەزرەت | کـەخۆی ناردوویـە بـۆ بەخشـی ڕەحمـەت |
| سوێندم بەزێـدت: بەمەککـەی پـیرۆز | کەتیایـە بەنـدەی وەکـوو تـۆ دڵسـۆز |

بەباوە ئادەم، بەدایە حەوا
مرۆڤ بەگشتی وان لەمەینەتا
نۆ مانگ لەناو سک لەتاریکسانن
ئیتر هەر رەنجەو والەناو رەنجا
سەیرە سروشتی مرۆڤی نادان
سوپاسی ناکا بۆنەو خواتانە
گوایە لەو وایە کەس پێی ناوێرێ
دەخورێ بەسامان، دەڵێ بەزمان
گوایە لەو وایە کەس پێی نازانێ
جیهان باخێکی بێ خاوەن نییە
سپلەی پێ نەزان چۆن لەبیری چوو
یا چەنها ئەندام کەداومانن پێی
بەنازو نیعمەت خۆم گۆشی دەکەم
رێی خێرو شەرم نیشانی داوە
کەچی ئەو هێشتا هەڵمەتی نابات!
لەگەڵ سەرکەوێ بەرەو ئازادی
بەندەکانی خوا وەک برا بژین
هەموو لەئادەم، ئادەمیش لەگڵ
هەڵبەت هێشتا کەدەژی لەپەستی
واتە: بگاتە ئەوقە سەری کەل
خاوەن پیاوەتی و جوان و دیوان بێ
چاوی لەحاڵی لێقەوماوان بێ!
مامۆستای صەبرو ئارامی جوان بێ
چاوی لەقاپی خوای میهرەبان بێ
یارانی دەستی راستی یەزدان بێ!
بەرپەرچی نامەی خوای دایەوە
رۆیشتە ناوی و سەری نایەوە
نافەریم نووری! خوێنەر! دەمت خۆش!
پیرۆز بێ خوێنەر! نووسەر دەستت خۆش!
ئەم راقەی منە دوورە لەتەحریف
مەبەست فامینی مەغزی قورئانە

بەوەچەو ئەوەی تادێت و دەروا
خوا خەلقی کردوون لەناو زەحمەتا
هێندەیان خۆشە کەهیچ نازانن!
لاوو پیر وێڵن بەشوێنی گەنجا!!
بەهێزی بازوو پەیدا دەکا نان
بەخۆی دەنازێ ئەو پێ نەزانە
هەڵبەت هەڵەیەو خۆی هەڵدەدێرێ
ئەفرو تونام کرد ماڵی بێ سامان!
تالێی بسەنێ تۆڵەی تاوانێ
خودا پادشایێ بێ پاوەن نییە
دوو چاوو، دوو لێو هەروا زوو بەزوو
وەک دەم و لووت و دان و دەس و پێی!
من فێری دەکەم مەم بگرێ بەدەم!!
بیانووم بریوە لەهەموو لاوە!
کۆسپ و پلەی سەخت لەرێی خۆی لابات
لەمل داماڵێ کۆتی بێ دادی
هەموو بەیەکسان لەسێبەری دین!
چۆن بازێ خاربێ و بازێ تریش گوڵ
ماویە بگاتە قووچکەی سەربەستی
ئازادبێ هەموو کەس و هۆزو گەل
پەنای هەتیوی بێ ئاوو نان بێ
سەرەرای ئەوەش ئەهلی ئیمان بێ
دڵی بۆ رەحمەت سەرچاوەی کان بێ
ئەوەی بەم رەنگە واموسوڵمان بێ
ئەوەشی لەدین هەڵگەرایەوە
ئەوە ئەگبەتە ئاگری نایەوە
وەک گەوهەر بوونە ئەڵقەی گۆشی هۆش
لەبەحری رەحمەت پڕکە کۆش و گۆش!
لەبەحری رەحمەت پڕکەن دڵ و کۆش!
گەر تۆدەزانی بۆ تەحریف تەعریف
ئەوەک فێربوونی وشەو زمانە

لەشیعردا چاولێخشانو موسامەحات زۆرە، هەروا بازدانو ئیلتیفات زۆرە، وەك خوا ئەفەرمووێ: (قل يا عبادي الذين ظلموا لاتقنطوا من رحمة الله) واتە: (قل يا محمد لعبادي على لساني: يا عبادي الذين أسرفوا..).

جا لەسەر ئەم بنیاتە ڕستەی (بەباوە ئادەم) مەعنای ئاوایە: بەوکەسەی کەتۆ پێ ی دەڵێی باوە ئادەم.

١٣٥٨/١-٤١٢/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: (مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً أَعْتَقَ اللّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْ النَّارِ حَتَّى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ). [٢٨٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ بەندەیەکی موسوڵمان ئازادبکا، خودای گەورەیش لەجیاتی هەر ئەندامێکی ئەو بەندەیە ئەندامێکی ئەوکەسە ئازادکەرە لەئاگری دۆزەخ ئازاد دەکا، تەنانەت دامەنو شەرمگای ئازادکەرەکە لەجیاتی دامەنو شەرمگای ئازادکراوەکە ئازاد دەکا (ش).

١٣٥٩/٢-٤١٣/ عَنْ أَبِي ذَرّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: (يَا رَسُولَ اللّهِ أَيُّ الْأَعْمَال أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْإِيمَانُ بِاللّهِ وَالْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ، قَالَ قُلْتُ: أَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: أَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا وَأَكْثَرُهَا ثَمَنًا). متفق عليه. [٢٨٩]

ئەبو ذەڕ (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! کام کاری چاکەیە زۆر بەهرەدارە؟ فەرمووی: ئیمانو باوەڕ بەخوداو غەزاو خەباتو تێکۆشان لەڕێگەی ئەودا گوتم: ئەی کام بەندەیە ئازاد بکرێ پاداشی گەورەترە؟ فەرمووی: ئەوەی کەبەبەها گرانەو لەلای خاوەنەکەی گەلێ چاكو نایابە (ش).

**(٢٣٧) بەهرەی پیاوەتی کردن لەگەڵ بەندەو خوڵاما - باب فضل الاحسان الى المملوك**

قال الله تعالى: (واعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا وبالوالدين إحسانا، وبذي القربى واليتامى والمساكين والجار ذي القربى والجار الجنب والصاحب بالجنب وابن سبيل وما ملكت أيمانكم) (ز ـ ٣٩).

---

[٢٨٨] بوخاری (٦٧١٥)و موسلیم (١٥٠٩) رقم: (٢٢).

[٢٨٩] بوخاری (٢٥١٨)و موسلیم (٨٤).

١/١٣٦٠-٤١٤/ عَنْ الْمَعْرُور بْنِ سُوَيْدٍ ﷺ قَالَ: (لَقِيتُ أَبَا ذَرّ ﷺ بِالرَّبَـذَةِ وَعَلَيْـهِ حُلَّـةٌ وَعَلَى غُلَامِهِ حُلَّةٌ فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلًا فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ فَقَالَ لِي النَّبِـيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أَبَا ذَرّ أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ جَعَلَهُمْ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْـهُ مِمَّـا يَأْكُـلُ وَلْيُلْبِسْـهُ مِمَّـا يَلْـبَسُ وَلَـا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ عليه). متفق عليه.[٣٩٠]

مـەعرووری كـوڕی سـووەيد (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ئـەبو ذەڕم بينـی، دەسـتێ بەرگی لەبەردا بوو، خولامەكەيشی لەهـەمان دەسـتی لەبـەردا بـوو، عـەرزيم كـرد: هـۆی چـييە كەبـەرگی خـۆتو خولامەكـەت وەك يەكـە؟ فـەرمووی: لەسـەردەمی حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەر بێ) جنێـوم بـەبيلال (ڕەزای خوای لێ بێ) دا، تانـەم لـەدايكی داو پێيم گـوت: ئـەی كـوڕی ژنـە ڕەشـكەڵەكە! پێغەمبـەريش (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: ئـەی ئەبوذەڕ! هێشتا بۆنی ڕەگەزپەرستی ی سـەردەمی نـەزانی (جاهليـە)ت لێ دێ، ئـەم بەندانـە ـ گەرچـی خـولامو دەسـتو پـێو بەردەسـتو نۆكـەرێ ئێـوەن ـ بـەڵام لەبنەڕەتدا براتانو ئێوەو ئەوان لەيەك باوكو دايكن، كەباوە ئادەمو دايە حەوان، موسوڵمانەكانيشيان سەرەڕای ئـەوەيش بـرای ئـايينی تـانن، ئەوەنـدە هەيـە خـودا ـ لەبەر حيكمەتێ ـ ئەمانـەی كـردووە بەژێردەستەی ئێـوە، دەی برايـەكی بـاش بـن، ئەگەر يەكێ لەم برايانەی خۆتان كەوتنە لاتانو ژێردەستەی ئێوە بـوون، وەك بـرا ڕەفتاريان لەگەڵ دا بكەنو خۆتان چی دەخۆن ئەوەيش بـدەن بـەوان، خۆتـان چـی لەبەر دەكەن لەهەمان جلو بەرگيش بۆ ئەوان بكەن، قەتيش زەحمەتيان مەدەنو ئەركێكی وا مەدەن بە سەرياندا كە لە وزەو كێشيانا نەبێ، كەئەركێكيش بەسەريانا دەدەن خۆشتان بەپێی حاڵو تەوانا ياريدەيان بدەن! (ش).

٢/١٣٦١-٤١٥/ عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِـيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) (إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُنَاوِلْهُ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ أَوْ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ فَإِنَّهُ وَلِيَ عِلَاجَهُ). رواه البخاری.[٣٩١]

---

[٣٩٠] بوخاری (٢٥٤٥)و موسليم (١٦٦١).

[٣٩١] بوخاری (٢٥٥٧) موسليميش تەخريجی كردووە ژمارەكەی لەموسليم دا (١٦٦٣).

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی كاتێ كەسێكتان نۆكەرەكەی نانی بۆدانا، با لەگەڵ خۆی دایبنێو نانەكەی لەگەڵ بخوا، بەڵام ئەگەر لەگەڵ خۆی دای نەنا با پارووێ، دووپارو یا فەرمووی: باتیكەیێ دوو تیكەی پێ بدات، چونكە ئەو خۆی ئەركو زەحمەتی پێوە كێشاوەو دروستی كردووە (بوخاری ـ رەحمەت لەگۆڕی).**

**(٢٣٨) باسی بەهرەی ئەو زەڕ خریدەیەی كە هەم مافی خوداو هی خاوەنەكانیان بەجوانی بەجێ دەهێنن - باب فضل المملوك الذي يؤدي حق الله تعالى وحق مواليه**

١٣٦٢/١-٤١٦/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْعَبْدُ إِذَا نَصَحَ سَيِّدَهُ وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ). متفق عليه.[٣٩٢]

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەو بەندەیەی لەگەڵ ئاغاكەی دڵسۆزو ساغ بێو لەهەمان كاتدا بەجوانی خودای خۆی بپەرستێ، ئەوە دووقات پاداشی باشی بۆ هەیە (ش).**

١٣٦٣/٢-٤١٧/ وعَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لِلْعَبْدِ الْمَمْلُوكِ الصَّالِحِ أَجْرَانِ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْحَجُّ وَبِرُّ أُمِّي لَأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ). متفق عليه.[٣٩٣]

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بەندەی زەڕ خڕیدەی باش دوو پاداشی بۆهەیە. ئەبو هورەیرە دەڵێ: بەوكەسە كەگیانی منی بەدەسە، لەبەرخاتری غەزاو خەباتو تێكۆشان لەڕێگەی خوداداو لەبەر حەج كردنو خزمەتی دایكم نەبێ، حەز دەكەم بەبەندەیی بمرم (ش).**

١٣٦٤/٣-٤١٨/ عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْمَمْلُوكُ الَّذِي يُحْسِنُ عِبَادَةَ رَبِّهِ وَيُؤَدِّي إِلَى سَيِّدِهِ الَّذِي لَهُ عَلَيْهِ مِنْ الْحَقِّ وَالنَّصِيحَةِ وَالطَّاعَةِ لَهُ أَجْرَانِ). رواه البخاري.[٣٩٤]

---

[٣٩٢] بوخاری (٢٥٤٦)و موسلیم (١٦٦٤).

[٣٩٣] بوخاری (٢٥٤٨)و موسلیم (١٦٦٥).

[٣٩٤] بوخاری (٢٥٥١).

له ئەبو مووساوه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو کۆیلەیەی کەبەجوانی بەندەیی بۆ خودای خۆی دەکا، وە مافی ئاغاکەشی بەجێ دەهێنێو بەگوێی دەکاو بەدڵسۆزی خزمەتی بکاو تەمێی خێری بکا ئەوە دوو پاداشی بۆ هەیە (ب).

١٣٦٥/٤-٤١٩/ وعَنهُ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (ثَلَاثَةٌ لَهُمْ أَجْرَان رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْعَبْدُ الْمَمْلُوكُ إِذَا أَدَّى حَقَّ اللّٰهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَةٌ فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا ثُمَّ أَعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا فَلَهُ أَجْرَانِ). متفق عليه.[٣٩٥]

دیسان لەوەوە فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم سێ کەسە، لەباتی پاداشێ دوو پاداشیان بۆهەیە: پیاوێکی نۆ موسوڵمان، لەخاوەن نامەکان، کەهەم باوەڕی بە پێغەمبەرە پێشووەکەی خۆی هەبێو هەم باوەڕیش بەموحەممەد بکاو ئیمانی پێ بێنێ، ئەو بەندەیەیش کەهەم مافی خودای گەورەو هەم مافی خاوەنەکەی بەجێ دێنێ، ئەو پیاوەیش کەکەنیزەکێکی هەبێ، بەجوانی تەمێ ی بکاو فێری وێڵو ڕەوشتی بەرزی بکا، ئینجا فێری زانینو خوێندنو پێویستی هەر دوو جیهانی خۆیی بکا، ئینجا ئازادی بکاو مارەی بکا بۆخۆی (ش).

## (٢٣٩) بەهرەی خودا پەرستی لەکاتی بشێویی و بگرەو بەردەدا
## باب فضل العبادة في الهرج وهو الاختلاط والفتن

١٣٦٦/١-٤٢٠/ عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: النَّبِيّ(صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الْعِبَادَةُ فِي الْهَرْجِ كَهِجْرَةٍ إِلَيَّ). رواه مسلم.[٣٩٦]

مەعقیلی کوڕی یەسار (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەندەیيو عیبادەت کردن بۆ خودای گەورە لەکاتی پشێویيو فەرتەنەدا خۆی دەدا لەکۆچ کردنو ڕەوکردن لەدەستی دوژمنی ئایین بۆلای من! (م) داخەکەم لەکاتی ڕەوەکەدا ئەم بەهرە گەورەیەمان لەکیس چوو. (وەرگێڕ)

[٣٩٥] بوخاری (٩٧)و موسلیم (١٥٤).

[٣٩٦] موسلیم (٢٩٤٨).

**(٢٤٠) بەهرەی سەر راستی و مامەڵەخۆشی و، دانەوەی قەردوشتی وا لەسەر شێوەیەکی جوان بەخاوەنەکەی و داوا کردنەوەی شت لەخەڵك بەنەزاکەت و سلاو دانەوەی عەیارەو تەرازوو لەکاتی شت پێوان و شت کێشان داو قەدەغەکردنی تەرازووبازیی، هەروەك بەهرەیەکی گەورەیە کەدارا مۆڵەتی قەرزاری نەدارا بدا، یا لەفەرزەکەی سەری دا بشکێنێ بۆی**

**باب فضل السماحة في البيع والشراء والاخذ والعطاء وحسن القضاء والتقاضي وارجاح المكيل والميزان والنهي عن التطفيف**

قال تعالى: (وما تفعلوا من خير فإن الله به عليم) (٢/٢١٥). وقال تعالى: (ويا قوم أوفوا المكيال والميزان بالقسط ولا تبخسوا الناس أشيائهم) (١١/٨٥).

واتە: شوعەیب پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەفەرمانی خودا بەگەلی خۆی فەرموو: ئەی خزمینە! ئەی گەلی خۆم! لە مامەڵەو کڕینو فرۆشتنو سەوداو ئاڵوویڵ دا عەیارەتان تەواوبێو تەرازووتان بێ فڕوفێڵ بێ بەرێكو پێکیو بەعەداڵەت لەنگەری ئەیارەو تەرازوو رابگرنو، کەشتێ دەکێشن یا دەپێون سلاوی بدەنەوە، وە بەهیچ جۆرێ، قاچوو قوچ لەشمەکی خەڵك مەکەنو ناخونەکیان لێ مەدەن.

وقال تعالى: (ويل للمطففين الذين اذا اكتالوا على الناس يستوفون وإذا كالوهم أو وزنوهم يخسرون ألا يظن أنهم مبعوثون ليوم عظيم * يوم يقوم الناس لرب العالمين) (٨٣/١ ـ ٦) واتە:

وای هاوار لەحاڵی تەرازووبازان، وای لەوکاتەی کەدەتەپێنە ناو شیوی وەیلی ناو دۆزەخەوە، کردوویانە بەخوو، کاتێ کەلەماڵی مەردووم شتێ پێوانە، کێشانە، بکەن بۆخۆیان بەزیادەوە پێوانە یا کێشانەی دەکەن، ومبەزۆر دەیبەن، وەکاتێکیش کە لەماڵی خۆیان بۆیان پێوانە یا کێشانە بکەن کەمیان دەدەنێو قاچووقوچی لێ دەکەن، ئایا ئەوانە نازانن کەزیندوو دەکرێنەوە لەرۆژێکی گەورەدا، رۆژێ کە مەردوم سەرجەم لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیان دا دەوەستن.

١/١٣٦٧-٤٢١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَقَاضَاهُ فَأَغْلَظَ فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُهُ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَعُوهُ فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالًا ثُمَّ قَالَ أَعْطُوهُ سِنًّا مِثْلَ سِنِّهِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلَّا أَمْثَلَ مِنْ سِنِّهِ فَقَالَ أَعْطُوهُ فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ قَضَاءً). متفق عليه.[٣٩٧]

---

[٣٩٧] بوخاری (٢٣٠٦)و موسلیم (١٦٠١).

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: کابرایێ، سەرێ ئاژەڵی لەسەر پێغەمبەر بوو** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کە داوای کردەوە قسەی ڕەق بوو لەگەڵ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەبەرئەوە هاوڕێیان قرمیان لێ خۆش کرد کەپەلاماری بدەنو تەمێ ی بکەن، وەلێ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: وازی لەێ بێنن، چونکە خاوەن ماف قسەی ڕەوایەو هەقی قسەی هەیە، ئاژەڵێکی هاوتەمەنی ئاژەڵەکەی خۆیی بۆ بکڕنو بیدەنێ. گوتیان: ئاژەڵی وا نییە، مەگەر لەهینەکەی خۆی باشتری بۆ پەیدا بکەین؟ فەرمووی: دەبیکڕنو بیدەنێ، چونکە پیاوخاسانی ئێوە قەرزو شتی وا زۆر بەجوانی دەدەنەوە (ش).**

٢/١٣٦٨-٤٢٢/ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رَحِمَ اللَّهُ رَجُلًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ وَإِذَا اشْتَرَى وَإِذَا اقْتَضَى) رواه البخاري.[٣٩٨]

**لەجابیرەوە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ڕەحمەتی خودا لەوکەسە بێ، کەلەسەودای کڕینو فرۆشتنو داواکردنی هەقی خۆی دا مامەڵەی خۆشو نەرمونیانە. (ب)**

٣/١٣٦٩-٤٢٣/ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُنْجِيَهُ اللَّهُ مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلْيُنَفِّسْ عَنْ مُعْسِرٍ أَوْ يَضَعْ عَنْهُ).رواه مسلم.[٣٩٩]

**ئەبو قەتادە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: بەگوێی خۆم لە زاری حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: هەرکەسێ حەزی لەوەیە کەخودا لەمەینەتی ڕۆژی قیامەت ڕۆزگاری بکا باپشووی قەرزاری نەدارا بداو بەپێی تەوانا مۆڵەتی بدا، یا شتێ لەقەرزەکەی سەری بۆ دابشکێنێ (م).**

٤/١٣٧٠-٤٢٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (كَانَ الرَّجُلُ يُدَايِنُ النَّاسَ فَكَانَ يَقُولُ لِفَتَاهُ إِذَا أَتَيْتَ مُعْسِرًا فَتَجَاوَزْ عَنْهُ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا قَالَ فَلَقِيَ اللَّهَ فَتَجَاوَزَ عَنْهُ). متفق عليه.[٤٠٠]

---

[٣٩٨] بوخاری (٢٠٧٦).

[٣٩٩] موسلیم (١٥٦٣).

**لەئەبو هورەیرەوە** (رەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: پیاوێ هەبوو قەرزی دەدا بەخەڵك، دەستووری وابوو بەسەرکارەکەیی دەگوت: کەچووی بۆلای قەرزاری نەدارا پێی لێ مەکەرە کەوش‌و مۆڵەتی بدەو چاوپۆشی لێ بکە، ئایا بەڕووی خۆش بێ، یا بەلێداشکان بێ، یا بەلێبووردنی تەواوبێ، سا بەشکوو خودایش بەڕەحمەتی خۆی چاوپۆشی لەئێمە بکا، جا کاتێ کەمردو چووە دیوانی خودا، خودا چاو پۆشی لێ کردو لێی خۆش بوو (ش).**

**٥/١٣٧١-٤٢٥/ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (حُوسِبَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مِنْ الْخَيْرِ شَيْءٌ إِلَّا أَنَّهُ كَانَ يُخَالِطُ النَّاسَ وَكَانَ مُوسِرًا فَكَانَ يَأْمُرُ غِلْمَانَهُ أَنْ يَتَجَاوَزُوا عَنْ الْمُعْسِرِ قَالَ قَالَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ تَجَاوَزُوا عَنْهُ). رواه مسلم.** [٤٠١]

**ئەبو مەسعوودی ئەل ـ بەدری** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: پیاوێ ـ کەلەنەتەوەکانی پێش ئێوە بوو ـ لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرا، ئەوەی پێی بڵێی خێرو چاکە نەیبوو! تەنیا ئەوە نەبێ کەئاڵ‌و وێڵی دەکرد لەگەڵ خەڵکاو بەهۆی مامەڵەو سەوداوە تێکەڵی لەگەڵ خەڵکا دەکرد، وەخۆشی دەوڵەمەندێکی بەرچاو تێر بوو، هەمیشە فەرمانی بەپیاوەکانی دەکرد: کەچاوپۆشی لەقەرزاری نەدارا بکەن، خودای زاڵ‌و شکۆداریش فەرمووی: ئەی فریشتەکانی من! چاوپۆشی کردن‌و لەهەق بووردن لەئێمە باشتر دەوەشێتەوە هەتا لەم بەندەیە، کەوایە ئێوەیش چاوپۆشی لێ بکەن (م).**

**٦/١٣٧٢-٤٢٦/ عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: (أُتِيَ اللّٰهُ بِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِهِ آتَاهُ اللّٰهُ مَالًا فَقَالَ لَهُ: مَاذَا عَمِلْتَ فِي الدُّنْيَا؟ قَالَ: وَلَا يَكْتُمُونَ اللّٰهَ حَدِيثًا، قَالَ: يَا رَبِّ آتَيْتَنِي مَالَكَ فَكُنْتُ أُبَايِعُ النَّاسَ وَكَانَ مِنْ خُلُقِي الْجَوَازُ فَكُنْتُ أَتَيَسَّرُ عَلَى الْمُوسِرِ وَأُنْظِرُ الْمُعْسِرَ فَقَالَ: اللّٰهُ أَنَا أَحَقُّ بِذَا مِنْكَ تَجَاوَزُوا عَنْ عَبْدِي فَقَالَ: عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ الْجُهَنِيُّ وَأَبُو مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيُّ هَكَذَا سَمِعْنَاهُ مِنْ فِي رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ). رواه مسلم.** [٤٠٢]

---

[٤٠٠] **بوخاری (٢٠٧٨)و موسلیم (١٥٦٢).**

[٤٠١] **موسلیم (١٥٦١).**

[٤٠٢] **موسلیم (١٥٦١).**

حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوی دەبرێ بۆ خزمەتی خودا، یەکێ دەبێ لەو بەندانەی خودا، کەخودا کردوونی بەخاوەن دارایی‌و ماڵ‌و سامان، خودا پێ ی دەفەرموێ: لەجیهاندا چیت کردووە!؟ حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وەك خودا لەقورئاندا لەسورەتی نیسائدا دەفەرموێ: (ولا یکتمون الله حدیثاً) (٤٢/٤) لەڕۆژی ژینەوەدا کەس ناتوانێ هیچ شتێ، نە ووتار، نە کردار، لەخودای گەورە حەشار بداو بیشارێتەوە. جا بۆیە بەندەکە راستەو ڕاست بەبێ پێچ‌و پەنا دەڵێ: خودایە! تۆ خۆت ئاگات لێیەتی، ئەو ماڵەی کەدابووت پێم لەگەڵ دارادا بەخۆشی ڕەفتارم دەکردوو کامەی ئاسان بوایە ئەوەم دەکرد، مۆڵەتی نەداراشم دەداو پێم لێ نەدەکردە کەوش، خودای گەورەیش فەرمووی: چاوپۆشی کردن‌و خۆش ڕەفتاری لەمن باشتر دەوەشێتەوە تا لەتۆ، ئەی فریشتەکانی من، وازی لێ بێنن‌و چاوپۆشی لێ بکەن. عوقبەی کوڕی عامیرو ئەبومەسعوودی ئەنصاریش (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: ئێمەیش ئەم فەرموودەیەمان هەروا لەزاری حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ژنەوتووە، بەبێ زیادو کەم. (م - ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

٧/١٣٧٣-٤٢٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا أَوْ وَضَعَ لَهُ أَظَلَّهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَحْتَ ظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ).رواه الترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.[٤٠٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ مۆڵەتی قەرزارێکی نەدارا بدا - یا چەردەیێ لەقەرەدەکەی دابشکێنێ بۆی - ئەوە ئەوکەسە لەڕۆژی قیامەتا خودا دایدەنێ لەژێر سایەی تەخت‌و بارەگای خۆی دا، ئەوڕۆژە رۆژێکی وایە کەجگە لەسێبەری خودا هیچ سێبەرێکی تر نییە. (ت: ح/ح/ ص).

٨/١٣٧٤-٤٢٨/ وعَنْ جابر ﷺ أن النَبِيّ ﷺ (اشترى منه بعيرا فوزن له فأرجح). متفق عليه.[٤٠٤]

---

[٤٠٣] تیرمیذی (١٣٠٦).

[٤٠٤] بوخاری (٢٠٩٧)و موسلیم (٧١٥) ژمارە (١١٥).

جابير (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) وشترێکی لێ کڕیم، کەبەهاکەیی بۆم کێشا سڵاوی دایەوە، یەك قیراتی پتر دامێ (ش).

٩/١٣٧٥-٤٢٩/ حَدَّثَنِي سُوَيْدُ بْنُ قَيْسٍ ﷺ قَالَ: (جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَفَةُ الْعَبْدِيُّ بَزًّا مِنْ هَجَرَ فَأَتَيْنَا بِهِ مَكَّةَ فَجَاءَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمْشِي فَسَاوَمَنَا بِسَرَاوِيلَ فَبِعْنَاهُ وَثَمَّ رَجُلٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ، فَقَالَ: لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زِنْ وَأَرْجِحْ).

رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.[٤٠٥]

ئەبو صەفوان: سووەیدی کوڕی قەیس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منو مەخرەمەی ئەل ـ عەبدی لەهەجەرەوە کووتاڵمان هێنا، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلامان، سەودای شەرواڵێکی لێ کردین، تەرازوو بە دەستێکم لەلابوو، بە کرێ شتی بۆم دەکێشا، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی کێشانی بەهای شەرواڵەکەی دا پێی فەرموو: بیکێشەو سڵاوی بدەرەوە! (د/ت: ح/ح/ص).

## (٢٤١) نامەی زانین : كتاب العلم

قال تعالى: (وقل رب زدني علما) (١١٤/٢٠) واتە: ئەی خۆشەویست! بفەرموو: خودایە! ئەی ئەو کەسەی کەتۆ خۆت منت پەروەردە کردووەو خۆت پەروەردگاری منیت پتر زانستو عیلمم پێ ببەخشە.

وقال تعالى: (قل هل يستوي الذين يعملون والذين لايعلمون) واتە: ئایا چۆن دەبێ زاناو نەزان چون یەك بنو یەکسان بن؟

وقال تعالى: (يرفع الله الذين آمنوا منكم والذين اوتوا العلم درجات) (١١/٥٨) واتە: ئەو موسوڵمانانەی کە فەرمانی خودا بەجێ دەهێننو لەفەرمانی پێغەمبەری ئەو کە موحەممەدە دەرناچن، خودا سەربەرزی هەردوو جیهانیان دەکا، زانای کارای موسوڵمانیش، کەخودا خەڵاتی زانستو عیلمی پێ بەخشیووە، خودا ـ لەهەردوو جیهانا ـ چەند پلەی بەرز بەرزی دەداتێ، سەربەرزی جیهان بەماڵو جاهی جیهانی نییە، بەڵکوو بەقەدرو ڕێزو هێژایی لای دۆستانی ئایینە، خۆڵڕێژی موسوڵمانی ساغی وا هەیە لەناو دۆستانی ئاییندا ڕێزو کێشی پادشایەکی هەیە، پادشای درۆزنی

[٤٠٥] ئەبو داوود (٣٣٣٦)و تیرمیذی (١٣٠٥).

زۆرداری بێ دین‌و بێ پەیمانی واش هەیە، لای دۆستانی خودا سەنگی سەگێکی پاسی نییە!

وقال تعالى: (انما يخشى الله من عباده العلماء) (٢٨/٣٥) واتە: بەڕاستی لەناو بەندەکانی خودادا هەرزاناکان بەباشی سام‌و شەرم‌و شکۆ لەخودا دەکەن، چونکە بەندەی خودا پێداوی خودا هەتا زاناتربێ‌و داناتربێ باشتر سام‌و شەرم‌و شکۆ لەخودای گەورە دەکا.

١/١٣٧٦-٤٣٠/ عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قال: قالَ: النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ).متفق عليه. [٤٠٦]

موعاوییە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ خودا ویستی تووشی خێرو خۆشی بکا شارەزای ئایینی دەکاو دەیکا بەمەلاو زانای دین! (ش).

دینی پیرۆزی ئیسلامی نازدار بەمەلا بەندە، وەک بان‌و دیوار

٢/١٣٧٧-٤٣١/ حەدیثی: (لا حسد إلا في اثنتين..). [٤٠٧]

٣/١٣٧٨-٤٣٢/ حەدیثی (إن مثل مابعثني الله به من الهدى..تاد). [٤٠٨]

٤/١٣٧٩-٤٣٣/ حەدیثی (لاعطين هذه الراية) تاکۆتای فەرموودەکە. [٤٠٩]

٥/١٣٨٠-٤٣٤/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ أَنَّ النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا حَرَجَ وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ). رواه البخاري.

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر تەنیا یەك ئایەتیشیان لەلایەنی منەوە ڕاگەیاندووە بە موسوڵمانان بیکەن‌و ڕای بگەیەنن پێیان، هەرچۆنێ بۆتان دەلوێ زانستی ئایینی پەخش بکەنەوە، هەتا ئەگەر قسەوباس‌و خواسی نەوەی ئیسرائیل (بەنی

[٤٠٦] بوخاری (٧١)و موسلیم (١٠٣٧).

[٤٠٧] بڕوانە: (٥٤٤/١ب - ٢ ز - ٦٠ ل - ١٠٨).

[٤٠٨] بڕوانە: (١٦٢/٧ب - ٢ز - ١٦ ل - ١٥٠).

[٤٠٩] بڕوانە: (١٧٥/٣ب - ١ز - ٢٠ ل - ١٦٥).

ئیســـرائیل) یـــش بگێڕنـــەوە قـــەیناکا، بەمـــەرجێ درۆی رووت نـــەبێ، دەی هەرکەسێکیش بەئارەزوو بەدەم منەوە درۆبکا باجێگەی خۆی لەدۆزەخا خۆش بکا (ب ـ رەحمەت لەگۆڕی نازداری).

١٣٨١/٦-٤٣٥/ فەرموودەی: (ومَن سلك طريقا..). [٤١٠]

١٣٨٢/٧-٤٣٦/ فەرموودەی: (من دعى إلى هدى..). [٤١١]

١٣٨٣/٨-٤٣٧/ فەرموودەی: (.. إذا مات ابن آدم..). [٤١٢]

١٣٨٤/٩-٤٣٨/ فەرموودەی: (ألا أن الدنيا ملعونة..). [٤١٣]

١٣٨٥/١٠-٤٣٩/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) (مَنْ خَرَجَ فِي طَلَبِ الْعِلْمِ كَانَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ حَتَّى يَرْجِـعَ) رواه الترمـذي، وقـال حـَدِيثٌ حَسَنٌ. [٤١٤]

ئەنـەس (ڕەزای خوای لـێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (درروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: هەرکەسـێ وێڵ بێ بە شوێن زانین داو ملی ڕێگەی زانین بگرێ، ئەوە وەك ئەوە وایـە بچـێ بـۆ غەزا، ئیتر هەتا ئەوە حاڵی بێ وەك لەغەزادا بێ وایە (ت:ح/ح).

١٣٨٦/١١-٤٤٠/عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنْ رَسُول اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَنْ يَشْبَعَ الْمُؤْمِنُ مِنْ خَيْرٍ يَسْمَعُهُ حَتَّى يَكُونَ مُنْتَهَاهُ الْجَنَّةُ) رواه الترمذي وقال: حـَدِيثٌ حَسَنٌ. [٤١٥]

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (درروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: موسـوڵمان لەبیسـتن‌و لـەفێربوونی خێـرو چاکە قـەت تێـر نـابێ، هـەتا نەمرێ‌و لەبەهەشتا هەوار هەڵ نەدا، هەتا لە دنیادا بێ هەر خەریکی چاکەکردنە (ت: ح/ح).

---

[٤١٠] بروانە (٢/٢٤٥ب ـ ٱز ـ ٢٩ل ـ ٢١٦).

[٤١١] بروانە (٢/١٧٤ب ـ ١ز ـ ٢٠ ل ـ ١٦٥).

[٤١٢] بروانە (٢/٩٤٩ب ـ ٣ز ـ ١٦٢ ل ..).

[٤١٣] بروانە (٢١/٤٧٧ب ـ ٢ز ـ ٥٥ ل ـ ٥٦).

[٤١٤] تیرمیذي (٢٦٤٩).

[٤١٥] تیرمیذی (٢٦٨٧).

١٢/١٣٨٧-٤٤١/ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرَضِينَ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الْحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الْخَيْرَ). رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.[٤١٦]

**ئەبو ئومامە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ڕێزو گەورەیی زانا لەچاو سۆفی‌و سۆفیلکەدا وەك ڕێزو گەورەیی من وایە لەچاو کەمترین کەستانا لەپاشا فەرمووشی: خودا خۆی‌و فریشتەکانی‌و خەڵکی ئاسمانەکان‌و خەڵکی زەوی هەموویان سەڵاواتیان لەسەر دەدەن‌و درودیان بۆدەنێرن‌و دوعاو نزای خێریان بۆدەکەن (ت: ح/ح).**

١٣/١٣٨٨-٤٤٢/ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَبْتَغِي فِيهِ عِلْمًا سَلَكَ اللَّهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضَاءً لِطَالِبِ الْعِلْمِ وَإِنَّ الْعَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ حَتَّى الْحِيتَانُ فِي الْمَاءِ وَفَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ إِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا إِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَذَ بِهِ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ). رواه أبو داود والترمذي.[٤١٧]

**ئەبو دەرداء ﷺ فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو** (درودی خوای لەسەر بێ)**: کەسێ ڕێگەیێ بگرێ کەبەشوێن فێربوون‌و زانستا بگەڕێ، خودا ڕێگەی بەهەشتی بۆئاسان دەکاو دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێگەی چاکە، کەباشترین ڕێگەی چوونە ناو بەهەشتە، فریشتەکانیش کاتێ قوتابییەك، یا فێرخوازێ، یا فەقێ یەك دەبینن، لەخۆشی ئەو قوتابییە دەنیشنەوەو دەورەی لێ دەدەن‌و گوێ دەگرن لەدەورو دەرسەکەی، چونکە دەورو دەرسی فەقێ باشترین یادو ذیکری خودایە! بۆیە وا پەرۆشن بۆی، سەرەڕای ئەم بەهرە گەورەیەیش دانیشتوانی ئاسمانەکان‌و زەوی دەپارێنەوە!**

---

[٤١٦] تیرمیذی (٢٦٨٦).

[٤١٧] ئەبو داوود (٣٦٤١) و (٣٦٤٨)و تیرمیذی (٢٦٨٣).

باوو قەدرو پایەی زانا لەچاو سۆفیلکەی خودا پەرستدا وەك باوو قەدرو پایەو پلەی مانگ وایە لەچاو ئەستێرەکانی تردا، بێ گومان کە زاناکان میراتبەرو کەلەپوور گری پێغەمبەرەکانن، میراتو کەلەپووری پێغەمبەرەکان بۆزاناکان بەجێماوە، دیارە کە پێغەمبەرەکانیش دینارو درەمو زێرو زیویان بەکەلەپوور لەپاش خۆیان بەجێ نەهێشتووە، بەڵکوو عیلمو زانست کەلەپووری ئەوانە، دەی بەڕاستی ئەوکەسەی لەم کەلەپوورەی بەربکەوێ بەشی فرەگەورەیەو بەختەوەری چاکە (د/ت).

١٣٨٩/١٤-٤٤٣/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا شَيْئًا فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَ فَرُبَّ مُبَلِّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.[٤١٨]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): خودا گەشیو خۆشی بخاتە ڕوو و دڵو دەروونی ئەوکەسەوە کەشتێ لەئێمە دەبیسێو ڕەوانی دەکا، وەچۆنی دەبیسێ ئاوا بەڕەوانی ڕای دەگەیەنێ بەموسوڵمانان، چونکە زۆر کەس لەوانەی کەئەو فەرمایشتەیان پێ دەگاتەوە لەکەسێکی ترەوە، گەلێ باشتر تێ ی دەگەن لەزۆر لەوکەسانەی کەبەگوێی خۆیان لەمنی دەبیستن. (د/ت: ح/ح).

١٣٩٠/١٥-٤٤٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أَلْجَمَهُ اللَّهُ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ) رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث حسن.[٤١٩]

ئەبو هورەیرە ـ خۆشنوودی خوای لێ بێ ـ فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەزانستێکی ئایینی پرسیاری لێ بکرێو بیزانێو حەشاری بداو وەڵامی پرسیارەکە نەداتەوە، بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خودا لغاوی ئاگرینی لەدەم دەکا! (د/ت: ح/حەزرەت).

---

[٤١٨] تیرمیذی (٢٦٥٩).

[٤١٩] ئەبو داوود (٣٦٥٨)و تیرميذي (٢٦٥١).

١٦/١٣٩١-٤٤٥/ وعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ تَعَلَّمَ عِلْمًا مِمَّا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَتَعَلَّمُهُ إِلَّا لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضًا مِنْ الدُّنْيَا لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَعْنِي رِيحَهَا). رواه أبو داود باسناد صحيح. [٤٢٠]

**ئەبو هورەيرە** (رەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەرکەسێ زانستێ فێربێ - لەوشتانە کە بەزانستی ئایینی دادەنرێن و کەدەبێ مەبەست لەفێربوونیان رەزامەندی خودا بێ - بەڵام ئەو بۆئەوەی بێ کەپڕو پیتی ئەم جیهانەی پێکۆبکاتەوە، ئەوە ئەو کەسە لەرۆژی قیامەتدا بۆن و بەرامەی بەهەشت ناکا (د - س/ص).**

١٧/١٣٩٢-٤٤٦/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضي الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنْ الْعِبَادِ وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا). متفق عليه. [٤٢١]

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص - رەزای خوایان لێ بێ - فەرمووی: ژنەوتم لەخۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: ئەوە نەبێ کەخودا زانین کوتوپڕ وەربگرێتەوەو بەچاوترووکانێ لەسینگی ئەو مەردومە دایبڕێنێ، بەڵام لەئاخر زەمانا، بەرەدوا زاناکان دەمرن و خودا دەیانباتەوە بۆلای خۆی، جا کەزانای نەهێشت، ئەوسا مەردومیش لەناو خۆیانا سەرۆکی زۆری نادان و نەزان دادەنێن و پرسیاریان لێ دەکەن و سەرلێشێواوو گومڕا دەبن و هەم خەڵکی تریش سەر لێشێواوو گومڕا دەکەن (ش).**

## (٢٤٢) نامەی ستایش و سوپاسی خودا - كتاب حكم الله تعالى وشكره

**قال الله تعالى: (فاذكروني أذكركم واشكروا لي ولا تكفرون) (٢/١٥٢) واتە: دەی یادی من بکەن، تامنیش یادی ئێوە بکەم، وە سوپاسی بەهرەو نازو نیعمەتەکانی من بکەن کەپێتانم داوەو پێنەزان مەبن.**

---

[٤٢٠] ئەبو داوود (٣٦٦٤).

[٤٢١] ئەبو داوود (٣٦٦٤).

قال الله تعالى: (لئن شكرتم لازيدنكم) (٧/١٤) واتە: خودای پەروەردگاری ئێوە لە ئەزەلدا بڕیاری داوەو ئەو بڕیارەشی روون کردۆتەوە بۆ ئێوە ئەی نەوەی ئیسرائیل! هەرکاتێ کەئێوە سوپاسی چاکەکانی من بکەن، بەم رەنگە لەفەرمانم دەرنەچن منیش ئەوەندەی تر نازو نیعمەتتان بەسەردا بڕێژم.

وقال تعالى: (وقل الحمد لله) (١١١/١٧) واتە: بفەرموو: سوپاس و ستایش بۆ خودا، کەخودایەکی هەرە مەزنی بێ نیازی وایە: هەوەجێ ی بەهیچ کەسێ نییە.

وقال تعالى: (وآخر دعواهم ان الحمدلله رب العالمين) (١٠/١٠) واتە: بەهەشتی یەکان دوعاو نزای خۆیان لەبەهەشت بەم وشە پیرۆزە کۆتایی دەهێنن، دەفەرمووون: الحمدلله رب العالمين: سوپاس بۆ خودای خاوەنی هەردووجیهان.

١/١٣٩٣-٤٤٧/عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قالَ: إنَّ النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (أُتِيَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا فَأَخَذَ اللّبَنَ، فَقَالَ: لَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام، الْحَمْدُ لِلّهِ الّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ). رواه مسلم.[٤٢٢]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەو شەوەی کەدەبرێ بۆشەوڕەوی (کە لەناو کوردەواریدا ناودارە بەشەوی میعراج) حەزرەتی جوبریل - دروودی خوای لەسەربێ - دوو پیاڵەی بۆ دێنێ، پیاڵەیەکیان پڕدەبێ لەمەیی‌و ئەوی تریان پڕ دەبێ لەشیر، کەفەرمووی لێ دەکا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) سەرنجێکیان دەداو شیرەکە وەردەگرێ، جا جوبرائیل - خودا سڵاوو دروودو رەحمەت بڕێژێ بەسەریدا - پێی دەفەرموێ: سوپاس و ستایش بۆ خودا کەتۆی خستە سەر رێگەی خۆی، کەئایینی ئیسلامی پیرۆزی خودا کردە، خۆئەگەر پیاڵە مەیەکەت وەربگرتایە ئۆمەتت سەریان لێ دەشێواو گومڕا دەبوون (م).

٢/١٣٩٤-٤٤٨/ وعَنهُ عَنْ رسول الله ﷺ قالَ: (كل امريء ذي بال لا يبدأ فيه بالحمد لله فهو أقطع).[٤٢٣]

---

[٤٢٢] موسلیم (١٦٨).

[٤٢٣] ئەبو داوود (٤٨٤٠).

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە (درووودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەموو کارێکی گرنگ، کەبەسوپاسی خودا دەستی پێ نەکرێ کارێکی نیوەچڵ دەبێو بێ پیت دەبێ (د - ح/حەزرەت).

٣/١٣٩٥-٤٤٩/ حەدیثی (إذا مات ولد العبد..). [٤٢٤]

٤/١٣٩٦-٤٥٠/ حەدیثی (ان الله لیرضی عن عبد..). [٤٢٥]

## (٢٤٣) نامەی سەلاواتدان لەدیداری پێغەمبەر ﷺ - كتاب الصلاة على رسول الله ﷺ

قال الله تعالى: (ان الله وملائكته يصلون على النَبِيّ يا أيها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما) (٥٦/٣٣). واتە: دڵنیا بن کەخوداو فریشتەکانی خودا صەلاوات لەسەر پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) دەدەنو درووودو رەحمەتی بۆدەنێرن، ئەی موسوڵمانەکان! ئەی کەسانێ کەباوەڕتان بەخوداو پێغەمبەر هەیە، دەی ئێوەیش وەك ئەوان صەلاواتی لەسەربدەنو سلاوی لێ بکەنو درووود بدەن لەدیداری.

١/١٣٩٧-٤٥١/ عَنْ عبدالله بنْ عمرو بن عاص ﷺ أنهُ سمع رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقولْ: (مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ بها عَشْرًا). رواه مسلم. [٤٢٦]

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص - رەزای خوایان لێ بێ - فەرمووی: لە حەزرەت (درووودی خوای لەسەر بێ) خۆیم بیست دەیفەرموو: هەرکەسێ یەك صەلاوات لەسەر من بدا، خودا بەهۆی ئەوەوە دە صەلاوات لەسەر ئەو دەدا (م) بۆ نموونە: ئەگەر کەسێ یەکجار بڵێ: الصلاة والسلام على سيدنا محمد، یا بڵێ: درووودو ڕەحمەتی خودا لەسەر پێغەمبەری خودا یا بڵێ: (أللهم صل على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم) یا بەهەر جۆرێ سلاواتی لە دیداری خۆشەویست بدا، ئەوە خودا بەهۆی ئەم تاقە جارەوە دە صەلاوات لەسەر ئەوکەسە دەدا، ئەو صەلاواتە چۆنەو چییە؟ ئەوە خودای گەورە خۆی باشی دەزانێ، وە خۆی دەزانێ کەشانی ئەو بەندەیەی چی هەڵدەگرێ (وەرگێڕ).

---

[٤٢٤] تیرمیذی (١٠٢١) بڕوانە (٣/٩٢٢ب - ٢ز - ١٥٢ ل - ٣٥٤).

[٤٢٥] بڕوانە (٢٤/١٤٠ب - ١ ز - ١٣ ل - ١٣٣).

[٤٢٦] موسلیم (٣٨٤).

٢/١٣٩٨-٤٥٢/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَوْلَى النَّاسِ بِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَكْثَرُهُمْ عَلَيَّ صَلَاةً) رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.[٤٢٧]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ـ کەناوداره بەئیبنو مەسعود ـ خۆش نوودیی خودای لێ بێ ـ لەخۆشەویستەوە ـ صەلاتو سەلامو درووده رەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێ ـ دەفەرموێ: لەرۆژی قیامەتا لەهەموو مەڵبەندەکانا، لەپێشترین کەس بەمن ئەو کەسانەن کە صەلاوات زۆرتر لەسەر من دەدەن، هەرکەسێ لەجیهانا سەلاوات زۆر لەسەر من بدا لەقیامەتدا لەمنەوە زۆر نزیکە (ت: ح/ح).

٣/١٣٩٩-٤٥٣/ عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ وَفِيهِ قُبِضَ وَفِيهِ النَّفْخَةُ وَفِيهِ الصَّعْقَةُ فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنْ الصَّلَاةِ فِيهِ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ قَالَ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلَاتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ قال: يقول: بَلِيتَ فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ). رواه أبو داود باسناد صحيح.[٤٢٨]

ئەوسی کوڕی ئەوس (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: رۆژی هەینی یەکێکە لەرۆژە هەرە باشەکانتان، لەودا ئادەم (سەلامی خوای لێ بێ) دروست کراوە، وەهەر لەویشدا مردووەو گیانی سپاردووە، وەهەر لەویشدا نەفخی سوور رودەداو فوو دەکرێ بە کەرەنا (صور) دا، وەهەر لەویش دا نەعرەتە گەورەکە دەبێ، کەمەشهوورە بە ئەل ـ صاعقە، کەهەرچی زیندەوەرو گیانلەبەرە لەوەی لەئاسمانو زەویدایە، هەموو لەسامی زەندەقیان دەچێو بێهۆش دەکەونو دەمرن، دەی کەوایە لەم رۆژەدا زۆر صەلاوات لەسەرمن بدەن، چونکە صەلاواتەکەتان دەگاتەوە پێمو رادەنوێنێ بۆم، یارانیش (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ کەلەگۆڕدا جەستەت پۆرتکاو لەشت رزی چۆن چۆنی صەلاواتو دروودی

---

[٤٢٧] تیرمیذي (٤٨٤).

[٤٢٨] ئەبو داوود (٢٠٤٢).

ئێمەت پێ دەگاتەوە؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): خودای گەورەو سەروەر جەستەی پێغەمبەرانی لەزەوی حەرام کردووەو لەشیان لەخاکا نارزێ! (د ـ س/ص/ تاج).

٤/١٤٠٠-٤٥٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (رَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ). رواه الترمذي وقال: حديث حسن.[٤٢٩]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەر بێ): لووتی ئەو پیاوە، یا ئەو ژنە بەقورداچێو بتەوسێتەوە کەمن لەکنی باس دەکرێمو سەڵاواتم لەسەرنادا (ت:ح/ح).

٥/١٤٠١-٤٥٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا وَلَا تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا وَصَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ). رواه أبو داود باسناد صحيح.[٤٣٠]

دیسان ئەو لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەر بێ): وەك چۆن بۆ جەژن کۆدەبنەوە ئاوا بەکۆمەڵ بۆ دینی ی گۆڕی من کۆمەبنەوەو لەسەر گۆڕەکەم مەیکەن بەبەزمو ڕەزمو شایی لۆغان، بەلام سەلاواتم لەسەر بدەن، دڵنیابن لەهەرکوێ بن نزیك بن یادوور صەڵاواتەکەتان پێم دەگاتەوە (د ـ س/ص).

٦/١٤٠٢-٤٥٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلَّا رَدَّ اللَّهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ). رواه أبو داود باسناد صحيح.[٤٣١]

دیسان لە ئەوەوە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ لەگۆڕەکەما سڵاوم لێ بکا خودا گیانم دەکاتەوە بەبەردا هەتا وەڵامی سڵاوەکەی دەدەمەوە (د ـ س/ص).

٧/١٤٠٣-٤٥٧/ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْبَخِيلُ الَّذِي مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ). رواه الترمذي، وقال: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ.[٤٣٢]

---

[٤٢٩] تیرمیذی (٣٥٣٩).

[٤٣٠] ئەبو داوود (٢٠٤٢).

[٤٣١] ئەبو داوود (٢٠٤١).

عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕەزیلو ڕژدو چرووك ئەوەیە کەناوی من دەبرێ لەلای کەچی درووودم بۆنانێرێو صەڵاواتم لە سەر نادا (ت: ح/ح/ص).

٨/١٤٠٤-٤٥٨/ عَنْ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ ﷺ يَقُولُ: (سَمِعَ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلًا يَدْعُو فِي صَلَاتِهِ فَلَمْ يُصلِّ عَلَى النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَجِلَ هَذَا ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ: لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَحْمِيدِ اللَّهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ ثُمَّ لْيُصَلِّ عَلَى النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ لْيَدْعُ بَعْدُ بِمَا شَاءَ).رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث صحيح.[٤٣٣]

فوضالەی کوڕی عوبەید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوێی لێ بوو کەپیاوێ لەناو نوێژەکەیدا نزای دەکردو دەپاڕایەوە، کەچی نەسوپاسی خودای کردو نەدرودی نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەمە پەلەی کرد لەپاشا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گازی کرد، یا بەو یابەیەکێکی تری فەرموو: کاتێ نوێژ دەکەن بەسوپاسو ستایشێکی جوانی پەروەردگارتان دەست پێ بکەن ـ کەخودایەکی پاكو پیرۆزو بێ گەردە ـ لەدوا ئەوە درووودو ڕەحمەت بنێرن بۆ پێغەمبەر ـ خوا درووودو ڕەحمەتو پیتو فەڕ بڕێژێ بەسەریدا ـ جا لەدوا ئەوە بەئارەزووی خۆی بۆچی دەیەوێ بابپاڕێتەوە (د/ت:ح/ص).

٩/١٤٠٥-٤٥٩/ عَنْ محمد كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ ﷺ فَقَالَ: (خَرَجَ عَلَيْنَا النَبِيّ ﷺ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكَ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ قَالَ: فَقُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ). متفق عليه.[٤٣٤]

---

[٤٣٢] تیرمیذی (٣٥٤٠).

[٤٣٣] ئەبو داوود (١٤٨١)و تیرمیذي (٣٤٧٥).

[٤٣٤] بوخاری (٤٧٩٢)و موسلیم (٤٠٦).

کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) هات بۆ ناومان، گوتمان: قوربان! ئەوا فێربووین کەچۆن سڵاوت لێ بدەین، بەم ڕەنگە لەتەحیاتا دەڵێین: السلام عليك أيها النبيّ ورحمة الله وبركاته: دروود لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خودا! لەگەڵ ڕەحمەتو میهرەبانیو پیتو بەرەکەتی زۆری خودا، ئەی چۆن چۆنی صەلاواتت لەدیار بدەین؟ فەرمووی بڵێن: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ: ئەی خودایە! بڕژێنە میهرەبانیو ڕەحمەت بۆسەر موحەممەدو کەسو کاری موحەممەد، وەك ئەو میهرەبانیو ڕەحمەتەی کەڕژاندوتە بەسەر ئیبراهیمو کەسوکاری ئیبراهیما، وەپیتو فەڕو بەرەکەت بڕژێنە بەسەر موحەممەدو بنەماڵەی موحەممەددا. وەك ئەو پیتو فەڕو بەرەکەتەی کە ڕژانووتە بەسەر ئیبراهیمو بنەماڵەی ئیبراهیما، بەڕاستی تۆ ئەی خودایە! شایستەی هەموو ستایشو سوپاسێکیت، وە خودایەکی گەلێ گەورەو پیرۆزیت! (ش).

١٠/ ١٤٠٦-٤٦٠/ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ البدري ﷺ قَالَ: (أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فَقَالَ: لَهُ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ أَمَرَنَا اللَّهُ تَعَالَى أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ وَالسَّلَامُ كَمَا قَدْ عَلِمْتُمْ). رواه مسلم.[٤٣٥]

ئەبو مەسعوودی بەدری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەدیوەخانەکەی سەعدی کوڕی عوبادە لەلای دانیشتبووین، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) هات بۆلامان، بەشیری کوڕی سەعد پێی فەرموو: قوربان! خودا فەرمانی پێمان کردووە کەصەلاوات لەسەر تۆبدەینو پێمان دەفەرموێ: يا أيها الذين آمنوا صلوا وسلموا تسليما: باشە چۆن چۆنی سەلاواتت لەسەر بدەین؟ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) تاوێ مات بوو، بێ

[٤٣٥] موسلیم (٤٠٥).

دەنگییەکەی وا درێژەی کێشا تەنانەت گوتمان خۆزگە ئەم پرسیارەی لێ نەدەکرد، لەپاشی بەینێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بڵێن: (اللهم صل على محمد) هەتا (انك حميد مجيد) ئەوجا فەرمووی: ئەمە شێوەی صەلاواتدانە لەسەرمن، شێوەی سلاوکردنیش لەمن وەك لەتەحیاتا فێرکراون ئاوایە: دەڵێن: السلام عليك أيها النبيُّ ورحمة الله وبركاته (موسلیم. رەحمەت لەگۆڕی نازداری لەهی خۆیو کەسوکاری).

١١/١٤٠٧-٤٦١/ عَنْ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (قالوا: يارَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعلى أَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ). [٤٣٦]

ئەبو حەمیدی ساعیدی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتیان کرد: چۆن چۆنی درووودت لەدیدار بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعلى أَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ: خودایە! رەحمەتو میهرەبانی بڕژێنە بەسەر موحەممەد خۆیداو بەسەر هاوسەرە پاکیزەکانی داو بەسەر وەچەو نەوەی پیرۆزی دا، وەك چۆن رەحمەتو میهرەبانیت رژاندووە بەسەر ئیبراهیم پێغەمبەردا، وەپیتو فەڕو پیرۆزی بڕژێنە بەسەر موحەممەد خۆیو بەسەر هاوسەرەکانو نەوەیدا، وەك چۆن پیتو فەڕو پیرۆزیت رژاندووە بەسەر ئیبراهیم پێغەمبەردا، بەڕاستی تۆ ئەی خودایە! شایستەی هەموو ستایشو سوپاسێکیت، وەخودایەکی گەلێ گەورەو پرۆزیت (ش).

بڕژێنە خودا بارانی رەحمەت
پەیا پەی لەسەر ئارامگای حەزرەت
لەگەڵ دروودو صەلاتو سلاو
ئامێتەی نوورو تێکەڵی گوڵاو!
وەک سێلاوی نووح، لافاوی رەحمەت

[٤٣٦] بوخاری (٣٣٦٩)و موسلیم (٤٠٧).

دنيــــا داپۆشــــىَو رامــــاڵى رەحمـــــەت
گـــۆڕى هاوســـــەرو نـــــەوەو يـــــارانى
هـەڵقوڵێ لێيـان ڕەحمـەت وەك كـانى!

(وەرگێڕ) ١٩٩١/٨/٢٠

## (٢٤٤) نامەى ذيكرو يادى خوداى گەورە باسى بەهرەى ذيكرو يادى خوداكردن
## كتاب الاذكار ـ باب فضل الذكر والحث عليه

قال الله تعالى: (ولـذكر الله أكـبر) (٢٩/٤٥). وقال تعالى: (فـاذكروني أذكـركم) (٢/١٥٢) وقال تعالى: (واذكر ربك في نفسك تضرعا وخفية ودون الجهر من القول بالغدو والآصال ولا تكن من الغافلين) (٧/٢٠٥) وقال تعالى: (واذكروا الله كثيرا لعلكم تفلحون) (٦٢/١٠) وقال تعالى: (ان المسلمين والمسلمات * والمؤمنين والمؤمنات والقانتين والقانتات * والصادقين والصادقات * والصابرين والصابرات * والخاشعين والخاشعات والمتصدقين والصائمين والصائمات والحافظين فروجهم والحافظات والـذاكرين الله كـثيرا والذاكرات أعد الله لهم مغفرة وأجرا عظيما) (٣٣/٣٥). وقال تعالى (يا أيها الـذين آمنـوا اذكروا الله ذكرا وسبحوه بكرة وأصيلا) (٣٣/٤١) الاية. والآيات في الباب كثيرة معلومة:

مەبەست لەئايەتەكان بەتێكڕايى: يادو ذيكرى خـودا لـە هـەموو تاعـەتێكى تـر گەورەترە، گەورەترين ذيكـرى خـوداش نوێـژە، كەبـەزۆرى بريێتييـە لـەيادى خـودا، كەواتە: بەنوێژى زۆرى دروستو بەتاعەتى جوان يـادى خودابكـەن، هـەتا خـوداش بەپاداشى بـاش يـادى ئێـوە بكـا، خـودا خـۆى دەفـەرموێ: بيكـەن بەپيشە هەميشە بەگفتارو بەكردار سوپاسى بەهرەى خودا بكەنو، بەنـدە دەبێ بەنمەكو بەئـەمـەك بێ، بەدنمەكو بێ ئەمەكو سپڵەو پێنەزان نەبێ.

هەروەها يەزدان ئامۆژگارى شيرينى بەنـدەى خۆىِ دەكاو لەڕووى رەهنومايييەوە پێـى دەفــەرموێ: لەبــەر خۆتــەوە، بــەنهێنى لەســەرەخۆو بەشـێنەيى، بــەبێ هەڵشەيىو دەنگە دەنگو زڵەزڵ هەموو جۆرە يادو ذيكرێكى خودا بكە، وەك نزاو پاڕانەوە، وەك قورئان خوێندنى ناو نوێژ، لەهەمان كاتدا بەدڵگەرمىو بەملكەچى بيكەو سامو ترسى خودا لەدڵتابێ، هەميشە يادو ذيكرى خوا بەم شێوەيە پەسەندە، مەگـەر هۆيـەكى رەوا هـەبێ بـۆ دەنـگ بـەرزەوە كـردن، وەك بانگـەوازو نوێـژى

جەماعـەتو سـلاكردنی رەمـەزان، بەتايبـەت سـەر لەبـەيانيانو سـەرلەئێواران، کەپێيان دەگوترێ: زەردە کەوتنو زەردەپەڕ، دەوام لەسەر يادی خودا، دڵو دەروون روون دەکاتـەوە، دڵ زينـدوو دەکاتـەوە، دەی کەوايـە هـەتا دەتـوانن يـادێکی جـوانی خودابکەن، يادێکی زۆری بێ شومار، بزانن کە يادی خودا کاتو جێگەی تايبەتی بۆ نييە، وەختو ناوەختی بۆ نييە، هەمووکاتێ کاتی يادی خودايـە، هـەموو جێگـەیێ جێگـەی يـادی خودايـە، مەگـەر چـۆنەها بەدەگمـەن کـاتو جێگـەی واهـەبێ يـادی خودای تيا نەکرێ، لەهەموو بارودۆخێکا بەندە دەتوانێ يـادی خـودا بکـا، لەحـەجا لەنوێژا، لەماڵا، لەمزگەوتا، لەبازاڕا، لەدەشت، لەدەر، بە دانيشتنەوە، بەپێوە، بەدەم رۆيشـتنەوە، بەڕاکشـانەوە، تەنانـەت سـەرجێ یو سـەراوکردنو پـژمينو باوێشكو نووستنو ياريکردنی رەواو خۆشۆردنو حەمام کردنو جل لەبەرکردنو نەخۆشیو بێ تاقەتیو سەرەمەرگو دەردو مەينەتيش دوعاو نزاو يادو ذيکری تايبەتی خۆی هەيە!

خودای مەزن مژدەی پيرۆزیو سەربەرزیو سەرفرازی هەر دووژيان، لەهەردوو جيهانـدا دەدا بەوکەسانە کەخوويان گرتووە بـەيادو ذيکـری خـوداوە، بـەڵێ ذيکـری خودا بەزۆری دەبێ بەمايەی پيرۆزیو رزگاری!

دەی ئەی مەردی خودا! ئەی پياوی خودا پێداو، ئەی ژنی لەخودا نزيك، هەلـە فرسـەتە، تـا مـەودا مـاوەو مـەرگ يەخـەی پـێ نـەگرتوون، دەسـتان بـەيادو ذيکـری خوداوەبێ، دڵ بدەنە ذيکرەکەتان، تەقديسی خـودا بکـەن، بـەپاكو پـيرۆزی بـزانن، تەحميدی بکەن، تەليلەو لائيلاهەئيللەڵلا بکەن، سلاوو تەمجيدی خودا بکەن!!

خوای گەورە مژدەيەکی خۆشی پيرۆز دەدا بە هەموو ژنو بەهەموو پياوێ کـە دەفەرموێ: دڵنيابن ئەو موسوڵمانەی کەبڕوايـەکی سـاخی بـەخودای خـۆی هـەبێو بـەجوانی خوداپەرستـی بکـاو بـەردەوام بـێ لەسـەریو راسـتگۆو کـار دروسـت بـێو بەئارامو خۆگربێو بەدڵگەرمييەوە سەرگەرمی تاعەتی خودا بـێو بـەدەمو بـەدڵو بەهەموو ئەندامـەکانی ملکەچـی تـەواوی فـەرمانی خـودابێو بـێ هـەواو بـێ فيـزو دەعيە بێو زەکاتی سەری بداو بـەپێی تـەوانا درێغـیو کۆتـايی لـەخێرکردن نـەکاو خێرکەرو خێرەومەنـدبێو سەرەڕای ئـەم رەوشـە جـوان جوانانـە زمانيشـی بـەيادی خودا پاراوبێو هەميشە يادو ناوو ذيکری زۆری جۆر بـەجۆری خـودای گـەورە وەك

نوقڵو نەباتو شەکرو شەربەت لەسەر زاری بن، دڵنیابن ئەو موسوڵمانەی کەئەمە رەوشی بەرزی بێو رەفتاری شیرینی بێ، چ پیاوبێ، وە چ ژن بێ، خودای گەورە بەمیهرەبانیو بەبەخششی خۆی گوناهی دەپۆشێو لێی خۆش دەبێو پاداشێکی گەورەی باشیشی لەسەر ئەم کارە جوانانە دەداتەوە ئەمە پاڵفتەی ناوەڕۆکی ئەم ئایەتە پیرۆزانە بوو، لەقورئان دا ئایەتی تری لەم بابەتە هەر زۆر زۆرە، وە لەلای کەسی خۆی زانراوو ئاشکران.

١٤٠٨/١-٤٦٢/ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ). متفق عليه. [٤٣٧]

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم دوو وشەیە: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم: خودا بەپاكو پیرۆز دەزانمو سوپاسو ستایشی دەکەم، دیسان خودای خۆم، یەزدانی مەزن بەپاكو پیرۆز دەزانمو لەمەدا هیچ گومانو سوویەکم نییە. ئەم دوو وشە پیرۆزەیە سووكو خۆشو ئاسانن لەسەر زمان، قورسو گرانن لەناو شایەن لەکاتی کێشان، خۆشەویستن لەلای خودای میهرەبان (ش ـ موسلیمو بوخاری).

١٤٠٩/٢-٤٦٣/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لَأَنْ أَقُولَ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ). رواه مسلم. [٤٣٨]

دیسان لەوەوە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سوێندم بەخودا یەکجار بڵێم: سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ: پاکیو پیرۆزی بۆ خودایە، هەروا سوپاسو ستایش، تەنیا یەزدانی پاك خودای بەهەقەو بەس، خودا لەهەموو کەسێ گەورەترە. فەرمووی: یەکجار ئەم وشە پیرۆزەیە بڵێم، لەکنم لەهەموو موڵكو سامانی جیهان باشترە (موسلیم. رەحمەت لەگۆڕی نازداری لەهی خۆیو کەسوکاری).

---

[٤٣٧] بوخاری (٦٦٨٢)و موسلیم (٢٦٩٤).

[٤٣٨] موسلیم (٢٦٩٥).

٣/١٤١٠-٤٦٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنْ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، وَمَنْ قَالَ سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ). متفق عليه.[439]

دیسان لەوەوە حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ ـ بەڕۆژ ـ سەد جار بڵێ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: هەر خودا خودای بەهەقەو بەس، خودایەکی تاکو تەنیایە، هیچ هاوبەشێکی نییە، موڵکو سامانو دارایيو پاشایەتيو سەلطەنەتو سوپاسو ستایش هەمووی بۆ ئەوە، وەخۆی خودایەکی وایە کەدەستی دەڕوا بەسەرگشت شتێکاو تەوانای هەموو شتێکی هەیە. فەرمووی: هەرکەس لەڕۆژێکا سەدجار ئەم ذیکرە بڵێ: هاوتای خێری ئازادکردنی دە بەندە دەکا، سەرەڕای ئەوەش سەد چاکەی لەنامەی کرداردا بۆ دەنووسرێ، وە سەد خراپەیش لەدەفتەری کرداری دەکوژێتەوە، سەرباری ئەمانەیش دەبێ بەقسنو پەرزینو دژو قەڵا لەدژی شەیتانو، ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارێ شەیتان پێی ناوێرێ، وەهیچ کەسێ ـ لەیادکارانی خودای گەورە ـ بەقەد ئەو خێری ناگا، مەگەر کەسێ کەلەم یادو ذیکرە، لەو پتربکات. فەرمووشی (درودی خوای لەسەر بێ): وەهەرکەسێ ـ لە ڕۆژدا ـ سەدجار بڵێ: سبحان الله وبحمده: بەفەرمانی خودا هەموو گوناهەکانی هەڵ دەوەرن، ئەگەرچی لەبەر زۆری وەك کەفی دەریا ئاوا زۆربن! (ش ـ خا)

٤/١٤١١-٤٦٥/ عَنْ اَبي أيوب الانصاري ﷺ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ عَشْرَ مِرَارٍ كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أَرْبَعَةَ أَنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَعِيلَ). متفق عليه.[440]

---

[439] بوخاری (٦٤٠٣) و موسلیم (٢٦٩٣).

[440] بوخاری (٦٤٠٤) و موسلیم (٢٦٩٣).

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ دە جار ئەم ذیکرە بەزمان بڵێو بەدڵ باوەڕی پێی هەبێ، وەك ئەوە وایە کەبۆ ڕەزای خودا چوار کەس لەنەوەی ئیسماعیلی باپیرە گەورەی پێغەمبەر ئازاد بکا، واتە: ئەم ذیکرە بخوێنێ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (ش).

٥/١٤١٢-٤٦٦/ عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلَا أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِأَحَبِّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ فَقَالَ إِنَّ أَحَبَّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ). رواه مسلم.[٤٤١]

ئەبو ذەڕ (خۆشنودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هۆشیاربە! باپێت بڵێم کەخۆشەویست ترین گوتار لەلای یەزدانی پاك چییە؟ دڵنیابە کەخۆشەویسترین گوتار لەلای یەزدانی پاك ئەم گوتە پیرۆزەیە: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ (م).

٦/١٤١٣-٤٦٦/ فەرموودەی: (الطهور شطر من الإيمان..).[٤٤٢]

٧/١٤١٤-٤٦٧/ عَنْ سَعَد بنْ أبي وقاص ﷺ قَالَ: (جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ عَلِّمْنِي كَلَامًا أَقُولُهُ قَالَ قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ قَالَ فَهَؤُلَاءِ لِرَبِّي فَمَا لِي قَالَ قُلْ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي). ـ رضوان الله تعالى عليه ـ

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عارەبێکی چۆڵ نشین هاتە خزمەتی خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: قوربان! وتارێکم فێربکە کەبۆ خۆم بیڵێم، فەرمووی: بڵێ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ: گوتی: ئەم وشانە سوپاسو ستایشنو بۆ پەروەردگارمن، بفەرموو گوتەیەکی وایشم پێ بفەرموو کە بۆخۆم بێ؟ فەرمووی: بڵێ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي:

---

[٤٤١] موسليم (٢٧٣١) رقم: (٨٥).

[٤٤٢] بڕوانە (٢٦/١ب ـ ١ ز ـ ٣ ل ـ ٤٦).

خودایه! لێم خۆش بەو رەحمم پێ بکەو رێگەی هەقم پێ نیشان بدەو رۆژیم بده(م).

٨/١٤١٥-٤٦٨/ وَعَنْ ثوبان ﷺ قالَ: (كان رسول الله ﷺ إذا انصرف من صلاته استغفر ثلاثا، وقال: اللهم أنت السلام ومَنك السلام تباركت يا ذاالجلال والإكرام، قيل للأوزاعي ـ وهو أحد رواة الحديث: كيف الاستغفار؟ قال: استغفر الله، استغفر الله). رواه مسلم.

ثەوبان (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) کە سلاوی نوێژی دەدایەوە، سێ جار داوای لێخۆشبوونی لەخودا دەکرد، وە دەشی فەرموو: اللهم أنت السلام ومنك السلام تباركت يا ذاالجلال والإكرام: خودایە! ئەی خوداوەند! سەلام ناوێکە لەناوە جوانەکانی تۆو تۆ سەرچاوەی سەلامو سەلامەتیو ئامانو پەناو هانای، بەڕاستی تۆ فرە بەفەڕو پیرۆزو گەورەیت، ئەی خاوەن شکۆی بەقەدرو نازدار! بە ئەوزاعییان گوت ـ کە ئەویش یەکێکە لەقسەبەرانی ئەم فەرموودەیە ـ ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوون چۆن چۆنی بکاو بڵێ چی؟ فەرمووی: استغفر الله، استغفر الله، استغفر الله: لەخودا داوای لێبووردن دەکەم (م ـ رەحمەت لەگۆڕی نازداری).

٩/١٤١٦-٤٦٩/ عَنْ مُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ ﷺ قالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ الصَّلَاةِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ). متفق عليه.[٤٤٣]

موغیرەی کوڕی شوعبە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کەلەنوێژ دەبۆوەو سلاوی دەدایەوەو دەیفەرموو: اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ: خودای راستو دروست تەنیا یەزدانی پاکە، خودایەکی تاكو تەنیایە، هیچ هاوبەشێکی نییە، موڵكو دارایيو پادشاییو سوپاسو ستایش هەمووی هەر بۆئەوە، وە ئەو خودایەکی ئەوتۆیە دەستی دەڕوا بەسەر هەموو شتێکاو تەواناى هەموو شتێکی هەیە، پەروەردگارا! خوداوەندا!

---

[٤٤٣] بوخاری (٨٤٤) و موسلیم (٥٩٣).

هەرچی تۆ بیدەیت بەکەسی تر نابڕێت، هەرچیش تۆ نەیدەیت بەکەسی تر نادرێت، دارایی‌و داراو دەستداری دەستدار هیچ دادێکیان نادا لەلای تۆ، ئەوەی بەدادیان دەخوا چاودێری تۆیەو کاری باشی خۆیان (ش).

١٠/١٤١٧-٤٧٠/ عَنْ ابْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ (أنه كان يَقُولُ: فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ حِينَ يُسَلِّمُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَلَا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ وَقَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُهَلِّلُ بِهِنَّ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ).رواه مسلم.

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر - خۆشنوودی خودایان لێ بێ - دەستووری وابوو کەسلاوی نوێژی دەدایەوە، لەپاش هەموو نوێژێ ئەم نزایەی دەخوێند: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَلَا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ: خودای راست‌و دروست تەنیا یەزدانی پاکە، تاك‌و تەنیایە، هیچ هاوبەشێکی بۆنییە، موڵك‌و دارایی‌و پادشایی سوپاس‌و ستایش هەمووی هەر بۆئەوە، دەستی دەڕوا بەسەر گشت شتێکا، هێزو تەوانایی هەر بەدەستی خودا خۆیەتی‌و بەس، خودای راست‌و دروست تەنیا یەزدانی پاکە، خۆی نەبێ کەسی تر ناپەرستین، بەهرە بەهرەی ئەوە، چاکەو تەواویی هەربۆ ئەوە، وەسپ‌و پەسنی جوان ئەوەیە کە بۆ تاریف‌و پیاهەڵدانی ئەوبێ، دیسان وەك گشت جارێ هەر دەڵێم‌و دەڵێمەوە: خودای بەهەق بەس خودایە، لەحاڵێك دا ئەم گوتە پیرۆزەیە دەڵێم کەلەگەڵ تێکڕای موسوڵمانان دا بەنیازێکی پاك ئایندارییی بۆ خودای خۆمان دەکەین، بەکوێرایی چاوی بێ بڕواکانەوە! عەبدوڵڵای کوڕی (رەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەر بێ) لەپاش هەموو نوێژە فەرزەکانەوە تەلیلەی بەم وشانە دەکرد (م).

١١/١٤١٨-٤٧١/ فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە: (ذهب أهل الدثور بالدرجات..). [٤٤٤]

---

[٤٤٤] بڕوانە: (٣/٥٧٣ب - ٢ ز - ٦٤ ل - ١٢٦).

١٢/١٤١٩-٤٧٢/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُول اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (مَنْ سَبَّحَ اللّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَحَمِدَ اللّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَكَبَّرَ اللّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ وَقَالَ تَمَامَ الْمِائَةِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ) رواه مسلم.[٤٤٥]

**دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەرکەسێ لەپاش هەموو نوێژێ ـ سیی‌و سێ جار بڵێ (سبحان الله) سی‌و سێ جار بڵێ (الحمدلله)و سیی‌و سێ جار بڵێ: (الله أكبر) کە ئەمە هەمووی دەکاتە نەوەت‌و نۆجار، وەلەسەری جاری سەدهەما بڵێ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: هەرکەسێ لەپاش هەموو نوێژێ ئەمە بکا خودا لەهەموو تاوانەکانی خۆش دەبێ، هەرچەند تاوانەکانیشی وەك کەفی دەریا زۆربن (م).**

١٣/١٤٢٠-٤٧٣/ عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُول اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: (مُعَقِّبَاتٌ لَا يَخِيبُ قَائِلُهُنَّ أَوْ فَاعِلُهُنَّ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ ثَلَاثٌ وَثَلَاثُونَ تَسْبِيحَةً وَثَلَاثٌ وَثَلَاثُونَ تَحْمِيدَةً وَأَرْبَعٌ وَثَلَاثُونَ تَكْبِيرَةً). رواه مسلم[٤٤٦]

**کەعبی کوڕی عوجرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: چەن وشەو، چەن تەسبیحاتێ هەن لەپاش نوێژە فەرزەکانەوە دەگوترێن، دەبن بەپاشکۆیان، هەرکەسێ لەپاش هەموو نوێژێ بیانڵێ، یا بیانکات قەت ناهومێد نابێ، ئەویش ئەمەیە سیی‌و سێ جار (سبحان الله)و سیی‌و سێ جار (الحمد لله)و سیی‌و سێ جار (الله أكبر) (م).**

١٤/١٤٢١-٤٧٤/ وَعَنْ سَعْد بن أبي وقاص ﷺ (أن رسول الله ﷺ كان يتعوذ دبر الصلوات بهؤلاء الكلمات: اللهم إني أعوذبك من الجبن والبخل، وأعوذ من أن أرد الى أرذل العمر، وأعوذ بك من فتنة الدنيا، وأعوذ بك من فتنة القبر). رواه البخارى.[٤٤٧]

**لەسەعدی کوڕی ئەبو وەققاصەوە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **بۆ فێرکردنی موسوڵمانان لەپاش نوێژەکان پەنای دەگرت بەخودا، بەگوتنی**

---

[٤٤٥] موسلیم (٥٩٧).

[٤٤٦] موسلیم (٥٩٦).

[٤٤٧] بوخاری (٦٣٧٠).

ئەم وشانە دەیفەرموو: اللهم إني أعوذبك من الجبن والبخل، وأعوذ من أن أرد الى أرذل العمر، وأعوذ بك من فتنة الدنيا، وأعوذ بك من فتنة القبر: خوداوەندا! پەنا دەگرم بەتۆ لەترسنۆکیو لەرەزیلیو چرووکی، پەنا دەگرم بەتۆ لەتەمەنی ئیفتادەییو کەفتەکاری، پەنا دەگرم بەتۆ لەلاسدانو فریودانی جیهان، کە بەئاڵو والای خۆی تەفرەم بدا، پەنا دەگرم بەتۆ لەئاشووبی گۆڕ، هی ئەوکاتە کەنەکیرو مونکەر مردوو تاقی دەکەنەوە (بوخاری. رەحمەت لەگۆری نازداری).

١٥/ ١٤٢٢-٤٧٥/ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخَذَ بِيَدِهِ وَقَالَ يَا مُعَاذُ وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ فَقَالَ أُوصِيكَ يَا مُعَاذُ لَا تَدَعَنَّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ تَقُولُ اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ) رواه أبو داود بإسناد صحيح.[٤٤٨]

موعاذی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی گرتمو فەرمووی: ئەی موعاذ! بەخودا من زۆر تۆم خۆش دەوێ، ئەی موعاذ! کەواتە با ئامۆژگاری یەکت بکەم: لەپاش هەموو نوێژێکی فەرزەوە ئەم وشانە بڵێو هەرگیز تەرکیان مەکە، بڵێ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ: خوداوەندا! لەسەر ذیکرو یادی خۆت یاریدەم بدە، هەروەها لە سەر سوپاسو ستایشی خۆت، هەروەها لەسەر بەندەییو عیبادەتو پەرستنی خۆت، لەسەر شێوەیەکی شیرینو جوان (د ـ س/ص).

١٦/ ١٤٢٣-٤٧٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ). رواه مسلم.[٤٤٩]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ کەسێکتان تەحیات دەخوێنێ، بالەکۆتاییەکەیدا پەنا بگرێ بەخودا لەم چوارشتە: با بڵێ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ: خوداوەندا! پەنا دەگرم بەتۆ لەسزاو ئەشکەنجەی

---

[٤٤٨] ئەبو داوود (١٥٢٢).

[٤٤٩] موسلیم (٧٧١).

دۆزەخ و، لەسزای ناوگۆڕو، لەفەرتەنەو ئاژاوەی ژیان و مردن و لەئاژاوەو ئاشووبی جەجاڵ کوێرەی جادووگەری هەلاتباز (م).

١٧/ ١٤٢٤-٤٧٧/ وعن علي ﷺ قال: كان رسول الله ﷺ (إذا قام إلى الصلاة يكون من آخر مايقول بين التشهد والتسليم: اللهم اغفر لي ماقدمت وما أخرت وما أسررت وما أعلنت وما أسرفت، وما أنت أعلم به مني، أنت المقدم وأنت المؤخر لا إله إلا أنت) رواه مسلم.[٤٥٠]

**عەلی** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: یاسای پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **وابوو، کەنوێژی دەکرد، لەدوا دواوە، لەتەحیاتا لەناوەندیشایەتمانهێنان و سلاوەدانەوەدا دەیفەرموو: اللهم اغفر لي ماقدمت وما أخرت وما أسررت وما أعلنت وما أسرفت، وما أنت أعلم به مني، أنت المقدم وأنت المؤخر لا إله إلا أنت: ئەی خودایە! لێم خۆش بە، لەگوناهی بەرودوام و لەگوناهی ئاشکراو نهێنیم و لەو تاوانە زۆرانەی کەلەخۆمم کردووە، لەو گوناهانەیش کەتۆ لەمن باشتر دەیانزانی، پەروەردگارا! هەر خۆت پێشخەرو پاشخەری، پێش خستن و پاش خستن هەر بەدەستی تۆیە، خودایەکی تر نیە تۆ نەبی (موسلیم. ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری لەهی خۆی و کەسوکاری).**

١٨/١٤٢٥-٤٧٨/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: (كَانَ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يكثر أَنْ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي). متفق عليه.[٤٥١]

**عائیشە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: جاران پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەزۆری لەچەمینەوەو کورنووش (روکوع و سوجود) دا دەیفەرموو: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي: خودایە! تۆ خودایەکی پاك و بێ نەنگیت، ئەی پەروەردگارم! لەسایەی خۆتەوەیە کەمن تەسبیح و سوپاس و ستایشی تۆ دەکەم، بەئازایی خۆم نییە خوداوەندا! لێم خۆش بە (ش).**

١٩/١٤٢٦-٤٧٩/ وعَنْها (رَضيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ).[٤٥٢]

---

[٤٥٠] موسلیم (٧٧١).

[٤٥١] بوخاری (٨١٧)و موسلیم (٤٨٤).

دیسان فەرمووی: زۆرجار حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەچەمینەوەو کوڕنووش دا دەیفەرموو: سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ: خودایەکی پیرۆزو بێ نەنگو پاكو خاوێنەو پەروەردگاری فریشتەکانو جوبرائیلە (م).

٢٠/١٤٢٧-٤٨٠/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَنَّ رَسول الله ﷺ قالَ: (فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ عَزَّ وَجَلَّ وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ فيه). رواه مسلم.[٤٥٣]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەناو روکووعا باسی گەورەیی خودا بکەن، وەك ئەوە بڵێن: (سبحان ربي العظيم وبحمده): خودای گەورەی خۆم بەپاكو پیرۆز دەزانم، وەڵێ لەناو کوڕنووش دا لەدوعاو نزا کردندا بەدڵو بەکوڵ تێ بکۆشن، دوعای هەڵبژاردەی باشی تیا بخوێنن، وەك ئەوە بڵێن: سبحان ربي الأعلى وبحمده: پاكو پیرۆزو بێ گەردە پەروەردگاری بڵندم. یا وەك ئەوە بڵێن: اللهم اغفر لي ذنبي كله دقه وجله وأوله وآخره وعلانيته وسره: ئەگەر وابکەن جێگەی خۆیەتی کەنزاو پاڕانەوەکەتان گیرا ببێ (م).

٢١/١٤٢٨-٤٨١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ). رواه مسلم.[٤٥٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هیچ کاتێ بەندە وەك کاتی ناو سەجدە لەخوداوە نزیك نابێتەوە، کەواتە لەوکاتەدا دوعاو نزا زۆر بکەن (م).

٢٢/١٤٢٩-٤٨٢/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: فِي سُجُودِهِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ دِقَّهُ وَجِلَّهُ وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ وَعَلَانِيَتَهُ وَسِرَّهُ). رواه مسلم.[٤٥٥]

---

([٤٥٢]) موسليم (٤٨٧).

[٤٥٣] موسليم (٤٧٩).

[٤٥٤] موسليم (٤٨٢).

[٤٥٥] موسليم (٤٨٣).

دیسان لەوەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەناو کوڕنووشا دەیفەرموو: اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ دِقَّهُ وَجِلَّهُ وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ وَعَلَانِيَتَهُ وَسِرَّهُ: پەروەردگارا! ئەی خودایە! لەهەموو گوناهەکانم خۆش ببە: لەوردیو لەدرشتی، لەپێشینیو لەپاشێنی، لەئاشکرایو لەپەنهانی (م).

٢٣/١٤٣٠-٤٨٣/ وعن عائشة (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قالت: افتقدت النَبِيﷺ ذات ليلة فتحسست فاذا هو راكع أو ساجد يقول: سبحانك وبحمدك لا إله إلا أنت. وفي رواية: فوقعت يدي على بطن قدميه وهو في المسجد، وهما منصوبتان وهو يقول: اللهم اني أعوذ برضاك من سخطك، وبمعافاتك من عقبوتك، وأعوذ بك منك. لا أحصي ثناءا عليك أنت كما أثنيت على نفسك). رواه مسلم.[٤٥٦]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەسەرنوێن پێغەمبەرم لێ ون بوو، کەلەپم کوتا بۆی هەستم پێ کرد کەوا لەچەمینەوەدا، یا فەرمووی: کەوا لە کوڕنووشدا، دەیفەرموو: سبحانك وبحمدك لا إله إلا أنت: لەگێڕانەوەیەکدا: فەرمووی: کە لەپم کوتا بۆی دەستم کەوت لەبەری پێکانی، لەکوڕنووشا بوو، هەردوو پێی هەڵنابوون، دەیفەرموو: اللهم إني أعوذ برضاك من سخطك، وبمعافاتك من عقوبتك، وأعوذ بك منك، لا أحصي ثناءا عليك أنت كما أثنيت على نفسك: خودایە! پەنا دەگرم بەرەزامەندیی تۆ لەخەشمو قاری تۆ، وە پەنا دەگرم بەچاوپۆشینی تۆ لەتۆڵە سەندنی تۆ، وەپەنا دەگرم بەخۆت لەخۆت، وەسپو ثەناخوانیی تۆ لەکێشی منا نیەو سوپاسو ستایشی تۆ بەکەس نابژێردرێ، ئەوە مەگەر هەر بەخۆت بکرێ (م).

٢٤/١٤٣١-٤٨٤/ عَنْ سَعْدَ بنْ أَبي وَقاص ﷺ قَالَ: (كُنَّا عِنْدَ رَسُول اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ قَالَ: يُسَبِّحُ مِائَةً تَسْبِيحَةٍ فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ). رواه مسلم.[٤٥٧]

---

[٤٥٦] موسليم (٤٨٦).

[٤٥٧] موسليم (٢٦٩٨)

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەتی خۆشەویستا (دروودی خوای لەسەر بێ) دانیشتبووین، فەرمووی: کامتان دەتوانن کە هەموو ڕۆژێ هەزار چاکە پەیدا بکەن؟ یەکێ لەهاونشینەکانی فەرمووی: قوربان؟ چۆن چۆنی هەزار چاکەتان بۆ دەنووسرێ یا هەزار گوناهتان لێ هەڵدەوەرێ، تەسبیحات کردن وەك ئەوە بڵێ: سبحان الله (م).

٢٥/١٤٣٢-٤٨٥/ فەرموودەی (يصبح على كل سلامي من..) [٤٥٨]

٢٦/١٤٣٣-٤٦٨/ عَنْ جُوَيْرِيَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ وَهِيَ فِي مَسْجِدِهَا ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحَى وَهِيَ جَالِسَةٌ فَقَالَ مَا زِلْتِ عَلَى الْحَالِ الَّتِي فَارَقْتُكِ عَلَيْهَا قَالَتْ نَعَمْ قَالَ النَبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ. رواه مسلم، وفي رواية له: سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله مداد كلماته: وفي رواية الترمذي: ألا أعلمك كلمات تقولينها؟ سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله مداد كلماته، سبحان الله مداد كلماته، سبحان الله مداد كلماته). [٤٥٩]

دایکی موسوڵمانان جووەیرییەی کچی حاریث (ڕەزای خوای لێ بێ) کەهاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) شەو لەلای من بوو، بەیانەکی زوو نوێژی بەیانی خوێندو دەرچووە دەرەوە، منیش لەوکاتەدا لەسەر بەرماڵ بووم، خەریکی ویرد خوێندن بووم، لەپاشا لەچێشتەنگاودا هاتەوە هێشتا من هەر لەسەر شوێنەکەیخۆم دانیشتبووم تەسبیحاتم دەکرد کەهاتەوە فەرمووی: ئەوە ئەوەتی من بە جێتم هێشتووە هەر ئەمە کارتە؟ عەرزیم کرد: بەڵێ، فەرمووی: دە من ئەوەتی لەتۆ جیابوومەتەوە سێ جار ئەم چوار ووشەیەم

---

[٤٥٨] موسلیم (٧٢٠). بڕوانە (١١٨/٢ ب - از - ١٣ ل - ١٣٢).

[٤٥٩] موسلیم (٢٧٢٦).

گوتووه، ئەگەر ئەم ویردەی منە هەڵبکێشرێت بەو هەموو تەسبیحاتو ویردەی کەتۆ لەبەیانی یەوە هەتا ئێستا دەیانکەی، هەردولا بەرابەر دەوەستێن! ئەمە ئەو چوار وشەیەیە: سبحان الله وبحمده عدد خلقه، ورضا نفسه، وزنة عرشه، ومداد كلماته: بەژمارەی مەخلووقاتو دروستکراوانی خوداو ئەوەندەی خودا خۆی پێی خۆش بێو بەقەد سەنگی بارەگاو تەختی حوکمڕانی خوداو، بەئەندازەی مەرەکەبی کەلیمەو وشەکانی خودا سوبحانەڵلاو ئەلحەمدولیلا بێ (موسلیم).

لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیم دا: سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله مداد كلماته. لەگێڕانەوەیەکی تری تیرمیذیدا: فەرمووی: ئەدی با ئەم وشەگەلەت فێر بکەم لەسەر ئەم شێوەیە بیانخوێنە: سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله رضا نفسه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله مداد كلماته، سبحان الله مداد كلماته، سبحان الله مداد كلماته.

١٤٣٤/٢٧-٤٧٨/ عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ). رواه البخاری.[٤٦٠]

ئەبو مووسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (درووودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: وێنەی نەستەقی ئەوکەسەی کەیادو ذیکری پەروەردگار خۆی دەکا دەق وەك وێنەی زیندوو وایە، کەچەند گەشو ناسكو نازدارە، وێنەی ئەنتیکەی ئەوکەسەی کەیادو ذیکری پەروەردگاری خۆی ناکا دەق وەك وێنەی سیسەوەبووی بێخێری مردوو وایە! (ب).

١٤٣٥/٢٨-٤٨٨/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ) متفق عليه.[٤٦١]

---

[٤٦٠] بوخاری (٦٤٠٧)و موسلیم (٧٧٩).

[٤٦١] بوخاری (٧٤٠٥)و موسلیم (٢٦٧٥).

لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودای گەورە لەحەدیثیکی قودسی (فەرمایشتێکی پیرۆزی) خۆیدا دەفەرموێ: بەندەی من گومانی چۆن بێ بەمن، من وادەبم لەگەڵیا، گومانی باشی بێ بەمن ئەوا باش دەبم بۆی، گومانی خراپ بێ بەمن ئەوا خراپ دەبم بۆی، لەودەمەدا کەئەو ناوی من دەباو یادو ذیکری من دەکا، ئا لەو دەمەدا من وام لەگەڵی دا، لەشەیتان دەیپارێزمو یاریدەی دەدەم، ئەڵبەت هەمووکاتێ من وام لەگەڵ بەندەی یادکاردا، ئەگەر بەتەنیا هەر خۆی یادو ذیکری من بکا، بەمەرجێ ساخ بۆ ڕەزای من بێ، ئەوا منیش هەر خۆم یادی ئەو دەکەم، بەندەم ئەگەر لەناو دەستەو کۆڕێکدا یادو ذیکری من بکا، لەناو ئەڵقەی ذیکردا ذیکری من بکا ئەوا منیش لەناو کۆڕو دەستەیەکی هەڵبژاردەی باشتردا یادی ئەو دەکەم (ش).

٢٩/١٤٣٦-٤٨٩/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ، قَالُوا: وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: الذَّاكِرُونَ اللّٰهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ). رواه مسلم.[٤٦٢]

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەتەنیا ماوەکان، یا تاکپەروەرەکان ناویان کردو وەپێش کەوتن. یاران گوتیان: قوربان! بەتەنیا ماوەکان کێن؟ فەرمووی: ئەو پیاوو ژنانەن کەهاوتاو هاوتەمەنەکانیان هەموو دەمرنو خۆیان بەتەنیا دەمێننو هەریادو ذیکری خودا دەکەن، زۆر زۆر (م).

٣٠/١٤٣٧-٤٩٠/ عَنْ جَابِرٍ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ قَالَ سُبْحَانَ اللّٰهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ، غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الْجَنَّةِ) رواه الترمذي وقال: حَدِيثٌ حَسَنٌ.[٤٦٣]

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی یەکجار بڵێ: سبحان الله وبحمده: یەك دارخورمای لەبەهەشتا بۆ دەنێژرێ، وەئەوەی زیاتر بڵێ زیاتری بۆ دەنێژرێ (ت:ح/ح).

---

[٤٦٢] موسلیم (٢٦٧٦).

[٤٦٣] تیرمیذی (٣٣٨٠).

١٤٣٨/٣١-٤٩١/ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (أَفْضَلُ الذِّكْرِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ). رواه الترمذي وقال: حديث حسن.[٤٦٤]

**دیسان فەرمووی: لە حەزرەت خۆیم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): گەورەترین یادی خودا وشەی پیرۆزی (لا إله إلا الله) یە (ت: ح/ح).**

١٤٣٩/٣٢-٤٩٢/عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) (أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ؟ قَالَ: لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ). رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.[٤٦٥]

**عەبدوڵلای کوڕی بوسر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەسایەی خوداوە مەسئەلەکانی شەریعەتی ئیسلام زۆر بوونو پەرەیان سەندووەو لەبەر زۆری فریای کردنی هەموویان ناکەوم، دەی شتێکی وام پێ بفەرموو کەتەرکی نەکەمو تۆڵەی ئەرکی سوننەتەکانی ترم بۆ بکاتەوە؟ فەرمووی: باهەمیشە زمانت بەذیکری خودا پاراو بێ! (ت: ح/ح).**

١٤٤٠/٣٣-٤٣٩/ عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَقِيتُ إِبْرَاهِيمَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَقْرِئْ أُمَّتَكَ مِنِّي السَّلَامَ، وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ الْجَنَّةَ طَيِّبَةُ التُّرْبَةِ، عَذْبَةُ الْمَاءِ، وَأَنَّهَا قِيعَانٌ، وَأَنَّ غِرَاسَهَا: سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ). رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.[٤٦٦]

**ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: شەوی ئیسرا، لەکن بەیتولمەعموور گەیشتم بە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی موحەممەد! سڵاوی من رابگەیەنە بەگەلی خۆت، وە[٤٦٧] پێیان بفەرموو: کەبەهەشت خاکەکەی پاكو باشەو ئاوەکەی شیرینو سازگارە، وەدەشتاییو**

---

[٤٦٤] تیرمیذی (٣٣٧٢).

[٤٦٥] تیرمیذی (٣٤٦٠).

[٤٦٦] تیرمیذی (٣٤٥٨).

[٤٦٧] وعليه السلام ورحمة الله وبركاته: سڵاوو ڕەحمەتو بەرەکەتی زۆری خودا لە حەزرەتی ئیبراهیمیش بێ. ئەوەی لە ئۆمەتی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم سڵاوەی ئیبراهیمی پێ گەیشت، سوننەتە ئاوا وەڵام بداتەوە. (وەرگێڕ)

نـەرمايیو بـەيارى زۆرى تيادايـە، ئـەو شـەتڵو نەمامەيشى لـەو بـەيارەدا دەڕوێو دەچێنرێ ئەم وتە پيرۆزەيـە: سُبْحَانَ اللّٰهِ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰـهُ، وَاللّٰـهُ أَكْبَـرُ: خودا پاكو پيرۆزە، سوپاس هـەر بـۆ خودايـە، هـەر خـودا خـوداى بەهەقـەو بـەس، خودا لەهەموو شت گەورەترە (ت: ح/ح).

٣٤/١٤٤١-٤٩٤/ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيّصَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَلَـا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ وَخَيْرٌ لَكُمْ مِـنْ إِنْفَـاقِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ قَالُوا بَلَى قَالَ ذِكْرُ اللّٰهِ تَعَالَى). رواه الترمذي، وقال: الحاكم أبو عبدالله: إسناده صحيح. [٤٦٨]

ئەبو دەرداء (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: حۆشەويست (درووودى خواى لەسەر بێ) فەرمووى: ئـەدى باپێتان بێژم كەباشترينو پاكترين كردەوەتان، لەلاى خوداوەندتان، كە گـەورەترين پاداشتانە چييە؟ كەلەهەمان كاتا دەبێ بەهۆى بڵندترين پلەو پايـەى بـاش بۆتـان، كەلەبەخشينەوەى زێـڕو زيويش باشـتربێ بۆتـان، تەنانـەت لـەو پايـە گەورەيـەيش باشترە كەبەرەنگارى دوشمنى خۆتان ببنو لەبەرەى شـەڕدا بەشيرو بەچـەك بـدەن لەگـەردنيان، يـا لـەپێناوى بـەرزەوە بـوونى شـەريعەتى خـودادا بيـانكوژن؟ يـاران گوتيان: قوربان! فەرموو. فەرمووى: ئـەوە يـاد كردنـى خودايـە، بـەزمانێكى پـاراوو بەدڵێكى هۆشيار، بەشێوەيەكى وا كەببێ بەپيشەى هەميشەى يادكار! (ت: س/ص).

٣٥/١٤٤٢-٤٩٥/ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ (أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ عَلَى امْرَأَةٍ وَبَيْنَ يَدَيْهَا نَوًى أَوْ قَالَ حَصًى تُسَبِّحُ بِهِ فَقَالَ أَلَا أُخْبِرُكِ بِمَـا هُـوَ أَيْسَـرُ عَلَيْكِ مِنْ هَذَا أَوْ أَفْضَلُ سُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي السَّمَاءِ وَسُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا خَلَـقَ فِي الْأَرْضِ وَسُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا بَيْنَ ذَلِكَ وَسُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا هُوَ خَالِقٌ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ مِثْلَ ذَلِكَ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ مِثْلَ ذَلِكَ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ مِثْلَ ذَلِـكَ). رواه الترمـذي وقـال: حديث حسن. [٤٦٩]

سەعدى كوڕى ئەبو وەققاص (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: جارێ لەخزمەتى حەزرەتـدا (درووودى خواى لەسەر بێ) چووين بۆلاى ئافرەتێ، كەلەكەسوكارى حەزرەت بوو، ژنەكە خەريكى ذيكر كردن بوو، هەنێ ناوكە خورما، ياهەنێ وردەبەردو چەوى لەبەردەستدا بـوو،

---

[٤٦٨] تيرميذى (٣٣٧٤)و حاكم لە (المستدرك) دا (٤٩٦/١).

[٤٦٩] تيرميذى (٣٥٦٣).

تەسبیحاتی پێ دەژمارد، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێی: شتێکت پێ دەڵێم لەمە ئاسانتر بێ بۆت یا فەرمووی: لەمە باشتربێ، یا فەرمووی: ئەوەیش ئەمەیە کە دەفەرمویێ: سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي السَّمَاءِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي الْأَرْضِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا بَيْنَ ذَلِكَ وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا هُوَ خَالِقٌ وَاللَّهُ أَكْبَرُ مِثْلَ ذَلِكَ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ مِثْلَ ذَلِكَ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ مِثْلَ ذَلِكَ: بەژمارەی ئەوەی کەخودا دروستی کردووە لەئاسمانو زەویداو لەنێوانی ئەم دوانەدا هەتا ئێستا، وەبەژمارەی ئەوەی کە خودا لەمەولا دروستی دەکا، سوبحانەڵڵا بێ، وەلا حەولە وەلا قووەتە ئیللا بیللا بێ (ت: ح/ح).

١٤٤٣/٣٦-٤٩٦/ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ: لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ؟ فَقُلْتُ بَلَى، فَقَالَ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ). متفق عليه.[٤٧٠]

ئەبو مووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ئەی ئەبو مووسا! هۆشیارەوەبە با گوتەیەکت پێ نیشان بدەم، کەیەکێکە لەگەنجەکانی بەهەشت؟ گوتم: فەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ: گەنجێکە لەگەنجەکانی بەهەشت (ش).

## (٢٤٥) باسی یادی خودای گەورە لەهەموو حاڵێکا: بەسەرپێوە، بە دانیشتنەوە، بەراکشانەوە، بەدەسنوێژەوە، بەبێ دەسنوێژ، بەلەشی پاکەوە، بەلەشی پیسەوە، لەکاتی بێ نوێژی و زەیستانی دا لەم کاتانەدا گشت ذیکرێکی خودا دروستە تەنیا بۆ لەشپیس و ئافرەتی بێنوێژو زەیستان قورئان خوێندن دروست نییە بەنییەتی تیلاوەتی قورئان، بەڵام بۆ تەبەروك و حیفظ و دوعاو ذیکر دروستە. وەك بیسمیللا کردن لەکاتی خواردندا:

## باب ذكر الله تعالى قائما وقاعدا ومضطجعا ومحدثا وجنبا وحائضا الا القرآن فلا يحل لجنب ولا حائض

قال الله تعالى: (إن في خلق السموات والأرض واختلاف الليل والنهار لآيات لأولي ألباب، الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم) (١٩١/٣).

ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزە لەم شوێنەدا رابورد (ب ـ ١ ز ـ ٩).

---

[٤٧٠] بوخاری (٦٤٠٩) و موسلیم (٢٧٠٤).

١/١٤٤٤-٤٩٧/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ) (يَذْكُرُ اللّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ). رواه مسلم. [٤٧١]

عائيشەی هاوسەری حەزرەت - دروودی خودا لە حەزرەتو ڕەزای خودا لەعائیشە بێ - فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگشت کاتێکیدا یادو ذیکری دەکرد (م).

٢/١٤٤٥-٤٩٨/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: (لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ قَالَ: بِاسْمِ اللّهِ اللّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا فَقُضِيَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ لَمْ يَضُرُّهُ). متفق عليه. [٤٧٢]

ئیبنوعەبباس - خۆشنوودی خودا لەخۆیو باوکی بێ - فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ یەکێ لەئێوە دەیەوێ بڕواتە لای خێزانی خۆی ئەگەر بڵێ: بِاسْمِ اللّهِ اللّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا: بەناوی خودا! ئەی خوداوەندا! شەیتانمان لەکۆڵ بکەوەو شەیتان دوور بخەرەوە لەم ڕۆزیی خۆتە کەداوتە بەئێمە. هەرکەسەتان لەم کاتەدا ئاوا بڵێ ئەگەر لەوجارەدا منداڵ لەچارەیان نووسرابێ شەیتان زیانی بۆی نابێ (ش).

## (٢٤٦) گوتەی کاتی نووستن و کاتی خەبەر بوونەوە
## باب مايقوله عند نومه واستيقاظه

١/١٤٤٦-٤٩٩/ فەرموودەی: (كان رسول الله إذا أوى إلى فراشه..). [٤٧٣]

## (٢٤٧) باسی بەهرەو خێری کۆڕی ذیکرو ئالوودەبوونی و جڵەوگیریی لەوازلێهێنانی، مەگەر لەبەرناچاری (عوذر)

١/١٤٤٧-٥٠٠/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (إِنَّ لِلّهِ مَلَائِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ فَإِذَا وَجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللّهَ تَنَادَوْا

---

[٤٧١] موسليم (٣٧٣).

[٤٧٢] بوخاری (٣٢٧١)و موسليم (١٤٣٤).

[٤٧٣] بڕوانە: (١/٨١٤ ب - ٢ ز - ١٢٧ ل - ٢٩٦).

هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ قَالَ فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا قَالَ فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ مَا يَقُولُ عِبَادِي قَالُوا يَقُولُونَ يُسَبِّحُونَكَ وَيُكَبِّرُونَكَ وَيَحْمَدُونَكَ وَيُمَجِّدُونَكَ قَالَ فَيَقُولُ هَلْ رَأَوْنِي قَالَ فَيَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ مَا رَأَوْكَ قَالَ فَيَقُولُ وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي قَالَ: يَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيدًا وَتَحْمِيدًا وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحًا قَالَ: يَقُولُ: فَمَا يَسْأَلُونِي قَالَ يَسْأَلُونَكَ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: يَقُولُ: وَهَلْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُ فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصًا وَأَشَدَّ لَهَا طَلَبًا وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً قَالَ فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ قَالَ يَقُولُونَ مِنْ النَّارِ قَالَ يَقُولُ وَهَلْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُ فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا فِرَارًا وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً قَالَ فَيَقُولُ فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ قَالَ يَقُولُ مَلَكٌ مِنْ الْمَلَائِكَةِ فِيهِمْ فُلَانٌ لَيْسَ مِنْهُمْ إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ قَالَ هُمْ الْجُلَسَاءُ لَا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ). **متفق عليه.**

وفي رواية لمسلم: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ لِلَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى مَلَائِكَةً سَيَّارَةً فُضُلًا يَتَتَبَّعُونَ مَجَالِسَ الذِّكْرِ فَإِذَا وَجَدُوا مَجْلِسًا فِيهِ ذِكْرٌ قَعَدُوا مَعَهُمْ وَحَفَّ بَعْضُهُمْ بَعْضًا بِأَجْنِحَتِهِمْ حَتَّى يَمْلَئُوا مَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَإِذَا تَفَرَّقُوا عَرَجُوا وَصَعِدُوا إِلَى السَّمَاءِ قَالَ فَيَسْأَلُهُمْ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ مِنْ أَيْنَ جِئْتُمْ فَيَقُولُونَ جِئْنَا مِنْ عِنْدِ عِبَادٍ لَكَ فِي الْأَرْضِ يُسَبِّحُونَكَ وَيُكَبِّرُونَكَ وَيُهَلِّلُونَكَ وَيَحْمَدُونَكَ وَيَسْأَلُونَكَ قَالَ وَمَاذَا يَسْأَلُونِي قَالُوا يَسْأَلُونَكَ جَنَّتَكَ قَالَ وَهَلْ رَأَوْا جَنَّتِي قَالُوا لَا أَيْ رَبِّ قَالَ فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا جَنَّتِي قَالُوا وَيَسْتَجِيرُونَكَ قَالَ وَمِمَّ يَسْتَجِيرُونَنِي قَالُوا مِنْ نَارِكَ يَا رَبِّ قَالَ وَهَلْ رَأَوْا نَارِي قَالُوا لَا قَالَ فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا نَارِي قَالُوا وَيَسْتَغْفِرُونَكَ قَالَ فَيَقُولُ قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ فَأَعْطَيْتُهُمْ مَا سَأَلُوا وَأَجَرْتُهُمْ مِمَّا اسْتَجَارُوا قَالَ فَيَقُولُونَ رَبِّ فِيهِمْ فُلَانٌ عَبْدٌ خَطَّاءٌ إِنَّمَا مَرَّ فَجَلَسَ مَعَهُمْ قَالَ فَيَقُولُ وَلَهُ غَفَرْتُ هُمْ الْقَوْمُ لَا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ). [٤٧٤]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خوادای گەورە چەشنە فریشتەیەکی هەیە، ئیشیان ئەوەیە بەڕێو بانانا دەسووڕێنەوەو بەشوێن ئەهلی ذیکردا دەگەڕێن، جا هەر کاتێ دییان وا کۆمەڵێ**

---

[٤٧٤] بوخاری (٦٤٠٨)و موسلیم (٢٦٨٩).

یادی خودا دەكەنو كۆڕی ذیكریان دابەستووە، قاو لەیەكتر دەكەنو بەیەك دەڵێن: وەرن بەلای كاری خۆتانەوە ئەمە ئەوەیە كەئێوە بۆی دەگەڕێن فەرمووی: ئیتر كەڵەكە دەكەن لەدەوریانو هەتا ئاسمانی خواروو بەباڵ دەخولێنەوە بەگردنیاندا، جا پەروەردگاریان لێیان دەپرسێ - هەرچەن خۆی باشتر حاڵەكە دەزانێ - دەفەرموێ: ئەم بەندانەی من دەڵێن چی؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): فریشتەكان دەفەرموون: (سبحان الله) دەكەنو تۆ بەپاكو پیرۆزو بێ خەوش دەزاننو (الله أكبر) دەكەنو خودای خۆیان بەگەورە دەگرنو (الحمد لله) دەكەنو سوپاسو ستایشی تۆ دەكەنو بەهەموو جۆرێ بەشانو شكۆی تۆدا هەڵ دەدەن، جا دەفەرموێ: ئایا ئەمانە منیان بینیوە؟ دەفەرموون: نەبەخوا نەتیان دیوە، جا دەفەرموێ: ئەی ئەگەر بم بینن چۆنە؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): دەفەرموون: ئەگەر بتبینن باشتر بەندەییت بۆ دەكەنو زیاتر باسی بێ خەوشیت دەكەن، جا خودا دەفەرموێ: ئەی باشە داوای چیم لێ دەكەن؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): دەفەرموون: داوای بەهەشتت لێ دەكەن، فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ): دەفەرموێ: ئایا دیوتانە؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): دەفەرموون: نە بەخودا - ئەی خودایە! - نەیان دیووە فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): دەفەرموێ: ئەی ئەگەر بیبینن چۆنە؟ دەفەرموون: ئەگەر بیبینن باشتر سوور دەبن لەسەریو باشتر هەڵپەی بۆ دەكەنو زیاتر حەزی لێ دەكەن، دەفەرموێ: ئەی لەچی دەترسنو خۆیانی لێ دەپارێزن؟ فەرمووی: دەفەرموون: لەئاگر دەترسنو پەنا دەگرن بەخودا لێی؟ فەرمووی: دەفەرموێ: ئایادیویانە؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): دەفەرموون: نەبەخوا نەیان دیوە دەفەرموێ: ئەی ئەگەر بیبینن چۆنە؟ فەرمووی: دەفەرموون: ئەگەر بیبینن زیاتر لەدەستی هەڵدێنو باشتر كۆی لێ دەكەنەوە. فەرمووی: ئەوجا دەفەرموێ: دەئێوە بەشایەت بن ئەوا من لێیان خۆش بووم، جا فریشتەیێ لەفریشتەكان دەڵێ: كابرایەكیان لەناودایە لەوان نییە، پیاوێكی خراپە، بۆ ذیكری خودا نەهاتبوو، بۆ كارێكی خۆی هاتبوو؟ دەفەرموێ: كۆمەڵی ئاوا كۆڕێ، لەبەرخاتری ئەوان هاونشینیشیان لەبەدبەختی ڕزگاری دەبێو بەهۆی ئەوانەوە ئەویش خۆش بەخت دەبێ! (ش) لەگێڕانەوەیەكی تری ئیمامی موسلیم دا (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) لە ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا جۆرە فریشتەیەكی گەڕۆكی زۆر بەقەدری هەیە، منەی كۆڕی

یادی خودا دەكەن‌و عەودالْن بەشوێن ئەڵقەی ذیكرو یاددا، هەركە كۆڕێكی ذیكریان دەست كەوت كە ذیكری تیابكرێ گورج لەگەڵیانا دادەنیشن‌و گەماڕۆی كۆڕەكە دەدەن‌و بەباڵیان دەخولێنەوە بەدەوریاناو لەسەر یەك كەڵەكە دەبەستن، هەتا نێوانی زەوی‌و ئاسمانی خواروو پڕدەكەن! كاتێ خەڵكەكە بڵاوەی لێ دەكەن ئەوانیش بەرز دەبنەوەو سەردەكەون بۆ ئاسمان، خودای باڵادەست‌و شكۆدار ـ كەخۆی باشتر شتەكە دەزانێ ـ لەبەر حیكمەتێ لێیان دەپرسێ: ئێوە لەكوێوە هاتوون؟ دەڵێن: لەلای بەندەگەلێكی تۆوە هاتووین، كەوان لەسەر زەوی، حاڵیان وایە سوبحانەڵلا دەكەن، ئەڵلاهو ئەكبەر دەكەن، تەلیلە دەكەن، ئەلحەمدولیلا دەكەن، داوای بەخشش‌و خەڵات لەتۆ دەكەن، دەفەرموێ: داوای چیم لێ دەكەن؟ دەفەرموون: داوای بەهەشتت لێ دەكەن، دەفەرموێ: ئایا بەهەشتی منیان دیوە؟ دەڵێن: نەء ئەی خودایە! دەفەرموێ: دەبێ ئەگەر بەهەشتی من بەچاوی خۆیان ببینن حاڵیان چۆن بێ؟ دەڵێن: هەروا خۆیان فڕە داوەتە راو بەختی تۆوە. دەفەرموێ: لەتاو چی خۆیان فڕە داوەتە پەنای منەوە؟ دەڵێن: لەتاوی ئاگری تۆ، دەفەرموێ: ئایا ئاگری دۆزەخی منیان دیوە؟ دەڵێن: نەء، دەفەرموێ: دەبێ ئەگەر ئاگری دۆزەخی من ببینن دەشێ ئەوسا حاڵیان چۆن بێ؟ دەڵێن: هەروەها داوای لێخۆشبوونت لێ دەكەن. دەفەرموێ: دەسا وا لێیان خۆش بووم‌و ئەوەیشی كەداوای دەكەن ئەوا دام پێیان‌و ئەوا ئەمانیان دەدەمێ‌و لەوەیشی كەلێی دەترسن‌و لەتاوی هانایان بۆ من هێناوە پەنایان دەدەم. فەرمووی: دەفەرموون: خودایە! كابرایەكیان لەناودایە، بەندەیەكی زۆر بەدكارە، لەوان نییە، بۆ ذیكر نەهاتووە، بەڕێكەوت لەوێوە رەت بوو، ئیتر لەگەڵیانا دانیشت، دەفەرموێ: لەویش خۆش بووم، هۆزی وا هاونیشانیان ـ بەهۆی پیرۆزیی ئەوانەوەو لەبەرخاتری ئەوان ـ قەت بەدبەخت نابێ.

٢/١٤٤٨-٥٠١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قالا: قالَ: رسول الله ﷺ: قَالَ: لَا يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَذَكَرَهُمُ اللّٰهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ). رواه مسلم. [٤٧٥]

---

[٤٧٥] موسلیم (٢٧٠٠). بڕوانە: (٢٤٥/٢ ب ـ از ـ ٢٩ ل ـ ٢١٦).

ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعید (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموون: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکۆمەڵێ لەشوێنێ بۆ ذیکر کردنی خودا دابنیشن.. تاد، باقی مەندەی ئەم فەرموودە لەم شوێنەدا رابوورد: (ب ـ ١ ز ـ ٢٩ ل ـ ف ـ ٢).

٣/ ١٤٤٩-٥٠٢/ عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ إِذْ أَقْبَلَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَذَهَبَ وَاحِدٌ قَالَ فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا وَأَمَّا الْآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكُمْ عَنْ النَّفَرِ الثَّلَاثَةِ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّهِ فَآوَاهُ اللَّهُ وَأَمَّا الْآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ وَأَمَّا الْآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ). متفق عليه.[٤٧٦]

ئەبو واقیدی لەیثی (رەزای خوای لێ بێ) ـ کەناوی حاریثی کوڕی عەوفە ـ فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەمزگەوت دانیشتبوو، خەڵکەکەیش هاتنە بەرەوە بۆلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) و ئەوی تریان رۆیشت، جا دوو کەسەکە لەدیار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) راوەستان، تایەکێکیان کەلێنێکی لەئەڵقەی کۆڕەکەدا بەدی کردو تیا دانیشت، وە ئەویتریشیان لەپشتیانەوە دانیشتو سێهەمیشیان هەڵی توڕاندو رۆیشت، جا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەفەرمایشتەکەی لێ بۆوە فەرمووی: باباسی حاڵی ئەم سێ کەسەتان بۆبکەم: یەکێکیان هانای بردە بەرخوداو خودا هانای دا، یەکێکیشیان شەرمی کردو خودایش شەرمی لەو کرد، ئەوی تریشیان پشتی لەخودا هەڵکردو خودایش پشتی لەو هەڵکردو لێی توورە بوو.

٤/ ١٤٥٠-٥٠٣/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: (خَرَجَ مُعَاوِيَةُ عَلَى حَلْقَةٍ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ مَا أَجْلَسَكُمْ قَالُوا جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ قَالَ آللَّهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلَّا ذَاكَ قَالُوا وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلَّا ذَاكَ قَالَ أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ وَمَا كَانَ أَحَدٌ بِمَنْزِلَتِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقَلَّ عَنْهُ حَدِيثًا مِنِّي وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ مَا أَجْلَسَكُمْ قَالُوا جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا

---

[٤٧٦] بوخاری (٦٦)و موسلیم (٢١٧٦).

لِلْإِسْلَامِ وَمَنَّ بِهِ عَلَيْنَا قَالَ آللّٰهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلَّا ذَاكَ قَالُوا وَاللّٰهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلَّا ذَاكَ قَالَ أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ وَلَكِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَنِي أَنَّ اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ يُبَاهِي بِكُمْ الْمَلَائِكَةَ). رواه مسلم. [٤٧٧]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: موعاوییە (ڕەزای خوای لێ بێ) چوو بەسەر کۆڕێکی ذیکردا لەناو مزگەوتدا ئەڵقەیان دابوو، فەرمووی: ئەوە بۆچی دانیشتوون؟ گوتیان: دانیشتووین یادو ذیکری خودا دەکەین، فەرمووی: توو خودا هەربۆئەوە دانیشتوونو بەس؟ گوتیان: بەڵێ بەخودا هەر بۆئەوە دانیشتووینو بەس؟ فەرمووی: دەبزانن من لەبەرئەوە سوێندم نەدان کەباوەڕتان پێ نەکەم، (بەڵکو لەبەر شتێکی ترە کەمن ئێستا بۆتان باس دەکەم). کەس نییە کەپایەی منی بووبێ لەلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) و لەگەڵ ئەوەشدا وەك من ئاوا فەرموودەو فەرمایشتی ئەوزاتە کەم بگێڕێتەوە (چوونکە من ژن برای حەزرەت بوومو نووسەری سرووشی بوومو زۆریش لەخزمەتی دا بووم، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا فەرموودەیێ تا نەچمە بنچو بنەوانیو بەباشی لێم روون نەبێ کەهی ئەو زاتەیە نایگێڕمەوە، ئەنجا موعاوییە فەرمووی) جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەرچوو، رۆیشت بۆ مزگەوت، لەوێ چوو بەسەر دەستەیێ لەهاوڕێیانی دا، بەئەڵقە کۆڕی ذیکریان دابەستبوو، فەرمووی: ئەوە خەریکی چینو بۆچی وادانیشتوون؟ گوتیان: دانیشتووین یادو ذیکری خودا دەکەینو حەمدو سوپاسی لەسەر ئەوە دەکەین کەشارەزای کردووین بۆ وەرگرتنی ئایینی ئیسلامو ئەم بەهرە گەورەیەی پێ بەخشیووین. فەرمووی: توخوا هەربۆ ئەوە دانیشتوونو بەس؟ گوتیان: ئەرێ بەخودا هەر بۆ ئەوە دانیشتووینو بەس. فەرمووی: دەبزانن کەمن لەبەر ئەوە سوێندم نەدان کەباوەڕتان پێ نەکەم، بەڵکوو لەبەر ئەم مژدە خۆشەیە: جوبرائیل - دروودو سلاوی خوای لێ بێ - هاتەلام پێی فەرمووم: کەخوادای گەورەو مەزن شانازیتان پێوە دەکا بەسەر فریشتەکاندا! (م).

[٤٧٧] موسلیم (٢٧٠١).

## (٢٤٨) باسی ویرد خوێندنی بەیانیانو ئێواران - باب الذكر عند الصباح والمساء

قال الله تعالى: (واذكر ربك في نفسك تضرعا وخفية ودون الجهر من القول بالغدو والآصال ولا تكن من الغافلين) (٢٠٥/٧). قال أهل اللغة/ الآصال جمع أصيل: وهو مابين العصر والمغرب.

نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: زانایانی زمان دەفەرموون: وشەی (ئاصال) كۆی وشەی (ئەصیل) ی عەرەبی یە، كەبرێتی یە لەنێوانی عەسرو شێوان.

وقال تعالى: (وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل غروبها)

وقال تعالى: (وسبح بحمد ربك بالعشي والأبكار )

قال أهل اللغة: العشي: مابين زوال الشمس وغروبها.

وقال تعالى: (في بيوت أذن الله أن ترفع ويذكر فيها اسمه يسبح له بالغدو والآصال رجال لا تلهيهم تجارة ولا بيع عن ذكر الله ) وقال تعالى: (إنا سخرنا الجبال معه يسبحن بالعشي والاشراق).

مەبەست لەئایەتەكان هەمان مەبەستە كەلەزنجیرە (٢٤٤) دا باسكراوە. دانەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: زاناكانی زمان دەفەرموون: عەشی: لەنیوەڕۆوەیە هەتا خۆرئاوا بوون.

١٤٥١/١-٥٠٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ أَوْ زَادَ). رواه مسلم.[٤٧٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەركەسێ سەرلەبەیانیو سەر لەئێوارێ سەدجار بڵێ: سبحان الله وبحمده: لەڕۆژی ژینەوەدا كەسێ تر كردەوەی وا نایاب لەگەڵ خۆی ناهێنێ بۆ مەیدانی حیساب، كەلەبابەتی یادی خودابێ، مەگەر كەسێ كەئەویش ئەوەندەی ئەوی گوتبێ، یا لەوە پتری كردبێ! (م)

---

[٤٧٨] موسلیم (٢٦٩٢).

٢/١٤٥٢-٥٠٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَقِيتُ مِنْ عَقْرَبٍ لَدَغَتْنِي الْبَارِحَةَ، قَالَ: أَمَا لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ تَضُرَّكَ) رواه مسلم.[٤٧٩]

دیسان فەرمووی پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: قوربان؟ دوێ شەو دووپشکێ پێوەی دام، ئای چی لێ کردم، ئێشی بردە ناو دڵم، فەرمووی: ئەدی سەر لەئێوارێ ئەگەر بتگوتبا: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خودا لەزیانی ئەوەی کەخودا خۆی دروستی کردووە. ئەگەر ئەم نزایەت بخوێندبایێ مەگەر حەزی خودای لەسەر بوایە دەنا زیانی نەدەبوو بۆت (م).

٣/١٤٥٣-٥٠٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: (إِذَا أَصْبَحَ اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا وَبِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ وَإِذَا أَمْسَى قَالَ اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ). رواه أبو دادوود والترمذي، وقال: حديث حسن.[٤٨٠]

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەیانیان دەستووری وابوو دەیفەرموو: اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ: خوداوەندا! بەپشتی تۆ وا رۆژمان کردەوە، وەهەر بەپشتی تۆیش شەودەگەینەوە، لەسایەی تۆوە دەژینو بەفەرمانی تۆ دەمرین، کاتێکیش زیندو دەبینەوە دەگەڕێینەوە بەردەستی خۆت (د/ت: ح/ح).

شـــەلەباوانەو کـــوێرە باوانـــە

دوا خانـــەی بەنـــدەیش قـــاپی یەزدانـــە

٤/١٤٥٤-٥٠٧/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: (أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مُرْنِي بِكَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ قَالَ قُلْ: اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ

---

[٤٧٩] موسلیم (٢٧٠٩).

[٤٨٠] ئەبو داوود (٥٠٦٨)و تیرمیذی (٣٣٨٨).

أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ قَالَ قُلْهَا إِذَا أَصْبَحْتَ وَإِذَا أَمْسَيْتَ وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ). رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.[٤٨١]

ديسان فەرمووی: ئەبوبەكری صەدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! چەن وشەیەكم پێ بڵێ كەلەكاتی بەیانیو ئێوارەدا بیانڵێم، فەرمووی: بڵێ: اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ: خوداوەندا! ئەی دروسكەری ئاسمانەكانو زەوی لەنەبوون، ئەی زانا بەهەموو نهێنیو ئاشكرایێ! ئەی ئەوكەسەی كە ئاگات لەهەموو شتێكەو هیچت لێ ون نابێ! ئەی پەروەردگاری هەموو شتێ! ئەی پادشای هەموان! شایەتی دەدەم كەهیچ خودایێ نییە تۆ نەبێ، پەنا دەگرم بەتۆ لە شەڕی نەفسی خۆم، وە لەشەڕی شەیتان، وە لەشەڕی شیركو هاوبەشی دانانی شەیتان بۆ زاتی پاكی بێ وێنەی یەزدان. فەرمووی: كاتی بەیانیو كاتی ئێوارێو كاتی خەوتن ئەمە بڵێ (د/ت: ح/ح/ص).

٥/١٤٥٥-٥٠٨/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا أَمْسَى قَالَ أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَخَيْرِ مَا فِيهَا وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ وَسُوءِ الْكِبَرِ وَفِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ فِي الْقَبْرِ) وإذا أصبح قال ذلك أيضا: أصبحنا وأصبح الملك لله. رواه مسلم.[٤٨٢]

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وا بوو ئێواران دەیفەرموو: أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَخَيْرِ مَا فِيهَا وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ وَسُوءِ الْكِبَرِ وَفِتْنَةِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ فِي الْقَبْرِ: ئەوا ئێوارە هات، هەموو بەردەوام موڵكی خوداین، سوپاس بۆ خودا، یەزدانی پاك نەبێ خوای تر نییە، خودایەكی تاقو تەنیایە، بێ هاوڕێ یە، هیچ هاوبەشی نییە، موڵك هەر موڵكی ئەوە، سوپاسو ستایش هەر بۆ ئەوە، ئەو

---

[٤٨١] ئەبو داوود (٥٠٦٧)و تیرمیذی (٣٣٨٩).

[٤٨٢] موسلیم (٢٧٢٣).

خودایه تەوانای گشت شتێكی هەیە، ئەی پەروەردگارم! داوای ئەو چاكەیەت لێ دەكەم كەلەم شەوەدا هەیە، وەداوای ئەو چاكەیەت لێ دەكەم كەلەپاش ئەم شەوەوە هەیە، وە داوای ئەو چاكەیەت لێ دەكەم كەلەم شەوەدا هەیە، وەپەنا دەگرم بەتۆ لەو شەڕەی كەلەم شەوەدا هەیە، وە پەنا دەگرم بەتۆ لەوشەڕەی كەلەپاش ئەم شەوەوە هەیە، پەروەردگارا! پەنا دەگرم بەتۆ لەسزای دۆزەخو لەسزای گۆڕ. ئیبنومەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەیانیانیش دیسان هەرەوای دەفەرموو: بەڵام لەجیاتی (أمسينا وأمسى الملك) دەیفەرموو(درودی خوای لەسەر بێ): (أصبحنا وأصبح الملك لله) هەتا (.. وعذاب في القبر) (موسلیم. ڕەزای خوای لێ بێ).

٦/١٤٥٦-٥٠٩/ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خُبَيْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُمْسِي وَحِينَ تُصْبِحُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ تَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ). رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح. (٤٨٣)

عەبدوڵڵای كوڕی خوبەیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: سوورەتی (قل هو الله أحد)و سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق)و سوورەتی (قل أعوذ برب الناس) ئێواران‌و بەیانیان سێ جار بخوێنە، ئیتر بۆ هەموو شتێ بەست دەكا (د/ت: ح/ح/ص).

٧/١٤٥٧-٥١٠/ عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَوْمٍ وَمَسَاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ). رواه أبو داود والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح. (٤٨٤)

عوثمانی كوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر بەندێ سەرلەبەیانی هەموو ڕۆژێ‌و سەر لەئێوارەی هەموو ڕۆژێ سێ جار بڵێ: بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ: بەپیرۆزی ناوی ئەو خودایە چاوەزار

---

(٤٨٣) ئەبو داوود (٥٠٨٢)و تیرمیذی (٣٥٧٠).

(٤٨٤) ئەبو داوود (٥٠٨٨)و تیرمیذی (٣٣٨٥).

بۆخۆم دەکەم‌و خۆم لەهەموو دەردو بەڵایێ دەپارێزم، کەلە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێ زیانی نابێ، چ لەزەویدا بێ، چ لەئاسمان دا بێ، وەئەو خودایەکی وایە کەهەموو شتێ دەزانێ‌و ئاگای لەهەموو شتێکە بەڕاستی هەر خۆی ژنەواو زاناو دانایە. هەر بەندەیێ سێ جار ئەمە بڵێ ئیتر هیچ شتێ زیانی نابێ بۆی (د/ت: ح/ح/ص).

## (٢٤٩) باسی گوتەی کاتی نووستن - باب ما يقول عند النوم

قال الله تعالى: (إن في خلق السموات والأرض واختلاف الليل والنهار..) لآيات. راڤەی لەم شوێنەدا رابوود: (ب ـ ١ ز ـ ٩ ل ـ ٩٨).

١٤٥٨/١-٥١١/ بەڵام لەم شوێنەدا شێوەی نزاکە ئاوایە: باسمك أللهم أحيا وأموت.[٤٨٥]

١٤٥٩/٢-٥١٢/ عَنْ عَلِيّ ﷺ أَنَّ رَسُلَ اللهِ ﷺ قالَ لهُ ولِفاطمة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) : (إذَا أَوَيْتُمَا إِلَى فِرَاشِكُمَا أَوْ أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا فَكَبِّرَا ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَسَبِّحَا ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ وَاحْمَدَا ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ: وفي رواية: التسبيح أربَعاً وثلاثينَ وَفي رواية التكبير أربعا وثلاثين). متفق عليه.[٤٨٦]

عەلی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەمن‌و بەفاطیمەی فەرموو: کەچوونە سەر نوێن بۆ نووستن یا فەرمووی: کە راکشان لەسەر نوێنەکەتان سیی‌و سێ جار بڵێن: (الله أكبر)و سیی‌و سێ جار بڵێن: (سبحان الله)و سیی‌و سێ جار بڵێن (الحمد لله) لەگێڕانەوەیەکا: سیی‌و چوار جار (سبحان الله) بکەن. لەگێڕانەوەیەکی تردا: سیی‌و چوار جار بڵێن (الله أكبر) (ش).

١٤٦٠/٣-٥١٣/ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ ثُمَّ يَقُولُ: بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ). متفق عليه.[٤٨٧]

---

[٤٨٥] بڕوانە: (٨١٧/٤ ب ـ ٢ ز ـ ١٢٧ ل ـ ٢٩٧).

[٤٨٦] بوخاری (٥٣٦١) و (٦٣١٨)و موسلیم (٢٧٢٧).

[٤٨٧] بوخاری (٦٣٢٠)و موسلیم (٢٧١٤).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ دەچنە سەرنوێن بۆ خەوتن، بەبەری جلەکەتان نوێنەکە بتەکێنن (واتە: بەچمکی ناوەوەی ئیزار، یا بەهەر شتێکی تر) چونکە ئێوە نازانن کە لەپاش ئێوە نوێنەکە چی تێ دەچێ، لەوانەیە مارێ، دووپشکێ، یا ئازارێکی تری تێ چووبێ، ئەوجا بڵێن: بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ: ئەی پەروەردگارم! بە بەرەکەتی ناوی پیرۆزی تۆ تەنیشتم دادەنێم‌و دەخەوم، وەبەپشتی تۆ بەرزی دەکەمەوەو لەخەو هەڵدەسم، خودایە! ئەگەر گیانم گل دەدەیتەوەو لەم خەوتنەدا گیانم دەکێشی ئەوا ڕەحمی پێ بکە، وەئەگەر بەرەڵای دەکەیتەوەو لەم خەوە خەبەرم دەکەیتەوە ئەوا بیپارێزەو بەوەی کەبەندە باشەکانی خۆتی پێ دەپارێزی ئەویش بەوە ئاگاداریی بکە (ش).

٤/١٤٦١-٥١٤/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) (أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا فَقَرَأَ فِيهِمَا قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وَ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وَ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ). متفق عليه.[٤٨٨]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو کە دەچووە ناوجێگەوە هەردوو لەپی خۆی دەنا بەیەکەوەو فووی پیا دەکردن‌و ئینجا (قل هو الله أحد) و (قل أعوذ برب الفلق ) و (قل أعوذ برب الناس) ی بەناو هەردوو دەستی دا دەخوێند، ئینجا دەیهێنان بەسەر جەستەی خۆیدا. (ش) لەگێڕانەوەیەکی بوخاری‌و موسلیم دا (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەموو شەوێ، کەدەچووە ناو جێگەوە هەردوو لەپی دەستی خۆی دەنا بەیەکەوەو فوی پیادەکردن‌و ئەنجا (قل هو الله أحد) و (قل أعوذ) وەکانی بەناو هەردوو دەستی دا دەخوێند، ئینجا دەیهێنان بەسەر جەستەی خۆی دا سەرتاپا، ئەوەندەی کەدەستی پێی دەگەیشت، لەپێشا دەیهێنان بەسەر سەرو ڕوخساریا، ئینجا بە بەری لەشیا، ئەوجا بەدیوی لەشیا، سێ جار ئاوای دەکرد، بەتەڕی دەمی

[٤٨٨] بوخاری (٦٣١٩)و موسلیم (٢١٩٢).

فوی دەكردە ناو لەپەكانیو ئەوسا ئەو سوورەتانەی تیا، دەخوێندنو دەستی دەهێنا بەجەستەی خۆی دا ئەم سێ شتەی سێ جار دووبارە دەكردەوە (ش).

٥/١٤٦٢-٥١٥/ عَنْ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وَضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ وَقُلْ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ فَإِنْ مُتَّ مُتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ فَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَقُولُ). متفق عليه[٤٨٩].

بەرائی كوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: كاتێ دەتەوێ بچیتە سەر نوێنی نووستن، لەپێشدا دەستنوێژێ بگرە، وەك دەستنوێژی نوێژ، ئەنجا لەسەر لای ڕاستت ڕابكشێو بڵێ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ: خودایە! خۆم دایە دەستی تۆ، كاری خۆم سپارد بەتۆ، پەنام هێناوە بۆ پەنای تۆ، پشتم بەستووە بەتۆ، ئەمەش كەدەكەم چونكە مەترسیم لەقارو سزای تۆ هەیەو ئومێدیشم بەمیهرەبانیو ڕەحمەتی تۆهەیە، هیچ پەناو پاسار) لەقارو خەشمی تۆ نییە، مەگەر لەلای خۆت، پەنا هەر پەنای تۆیە، باوەڕم بەو نامە پیرۆزانە هەیە كەخۆت ناردووتن، كەیەكێكیان قورئانی گەورەیە، وە باوەڕم بەو پێغەمبەرەیش هەیە كەخۆت ڕەوانەت كردووە بۆسەر ئادەمیزادو پەری، كە حەزرەتی موحەممەدە. فەرمووی: جا ئەگەر لەپاش خوێندنی ئەم نزایە لەو شەوەدا بمریت لەسەر ئایینی پاكی ئیسلام دەمریت. فەرمووی: جا ئەم دووعاو نزایە بكە بە دوا قسەت (ش).

٦/١٤٦٣-٥١٦/ عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا فَكَمْ مِمَّنْ لَا كَافِيَ لَهُ وَلَا مُؤْوِيَ). رواه مسلم.[٤٩٠]

---

[٤٨٩] بوخاری (٦٣١٥)و موسلیم (٢٧١٠).

[٤٩٠] موسلیم (٢٧١٥).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) یاسای وابوو کەدەچووە سەر نوێن دەیفەرموو: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا فَكَمْ مِمَّنْ لَا كَافِيَ لَهُ وَلَا مُؤْوِيَ: سوپاس بۆئەو خودایەی کەنان‌و ئاومان بەشێکە سەرو بەر بەشمان بکا دەمان داتێ‌و بۆ هەمووشتێ خۆی بەسمانەو جێگەی حەسانەوەی پێمان داوەو دەمان حەوێنێتەوە، ئای چەندەها کەس هەن کەبێ کەس‌و بێ داڵدەو بێ جێگەو شوێن‌و بێ خانەو لانەن! (م ـ هەزار ڕەحمەتی لەسەر بێ).

٧/١٤٦٤-٥١٧/ وعَنْ حذيفةَ ﷺ النَبِـيّ(صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْقُدَ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى تَحْتَ خَدِّهِ ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ ثَلَاثَ مِرَارٍ) رواه الترمذي، وقال: حديث حسن و رواه أبو داود من رواية حفصة (رَضيَ اللهُ عَنها) وفيه أنه كان يقوله ثلاث مرات.[٤٩١]

حوذەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) کە دەیویست بخەوێ دەستی ڕاستی دەنایە ژێر کوڵمی ڕاستی، ئەوجا دەیفەرموو: اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ: خوداوەندا! لەو ڕۆژەدا کەهەموو بەندەکانی خۆت زیندو دەکەیتەوە لە سزای خۆت بمپارێزە. (ت: ح/ح) ئەبو داوودیش (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەفصەی دایکی موسوڵمانانەوە دەیگێڕێتەوە، وەلێ لەفەرموودەکەی ئەودا دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەر بێ): سێ جار وای دەفەرموو.[٤٩٢]

## (٢٥٠) نامەی نزاو پاڕانەوە - كتاب الدعوات

قال الله تعالى: (وقال ربكم ادعوني أسْتَجِبْ لكم) (٦٠/٤٠)

وقال تعالى: (ادعوا ربكم تضرعا وخفية انه لايحب المعتدين) (٥٥/٧)

وقال تعالى: (أمَّن يجيب المضطر إذا دعاه ويكشف السوء) الآية.[٤٩٣]

---

[٤٩١] تیرمیذی (٣٣٩٥)و ئەبو داوود (٥٠٤٥).

[٤٩٢] برا! هەستە درەنگە　　تاکەی ئەم شەوە زەنگە

ژینت خۆی بەری تەنگە　　زایەی مەکە بەم ڕەنگە

[٤٩٣]

تاکەی خەریکی خەوی　　بەشەو بۆ خەو بەدەوی

مەبەست لە ئایەتە پیرۆزەکان بەتێکڕایی: خودای پەروەردگار، لەڕووی رەحمەتەوە دەفەرموێ: ئەی بەندەکانی من! بەکوڵی دڵ، بەزمانێکی پاك داوای نیازی خۆتانم لێ بکەن، ئەوەی کەپێویست بێ بۆ گیرابوونی نیازتان‌و بۆ بەدیهێنانی مرازتان بەجێ بێنن، کەواتە بەدلگەرمی‌و بەملکەچی‌و بەکەساسی‌و بەنهێنی‌و بەبێ هات‌و هاوارو شاتە شات لەخودا بپاڕێنەوە، داوای بەشی باشی هەردوو جیهانی لێ بکەن، ، بەئەدەب‌و ڕێزەوە لەژێر لێوەوە بەشەرم‌و شکۆوە نیازی خۆتان عەرزی بارەگای خودا بکەن بەهەراو هوریاو هەیت‌و هووت‌و هاوار هاوار، خودا حەزی لەشتی وا نییە، چونکە ئەوە وەك بێ وێڵی‌و نەفامییە لەرادە دەرچوونیشەو پێلێهەڵبڕینی ناڕەوایشە.

ئەی خۆشەویست! تۆ رەحمەتی منیت، هەمیشە ئەڵقەی وەصڵی رەحمەتی من بە، دەی کاتێ بەندەکانی من لەتۆ دەپرسن باسوخواسی من، گەلێ بەنەزاکەت وەڵامیان بدەرەوە بەمژدەی خۆش دڵیان خۆشکە، بفەرموو پێیان کەخوا دەفەرموێ: من لەپەنا بەندەی باشی خۆمدام، لەنزیك نزیکیەوەم، گوێم لەهەموو رازو قسەیەکیەتی، چاوم لەحاڵیەتی، بۆیە هەمیشە نیازی گیرادەکەم‌و مرازی

---

| | |
|---|---|
| لەجێ دا لێی دەکەوی | دوور لەبێداری شەوی |
| هەستە روو لەخودا کە | خەو بەناخی عەرداکە |
| بەرگی نوور بەبەردا کە | خۆت لەهەردوو جودا کە |
| گلێ بەچاوی خەوا کە | شەو بەشەو نوێژ ناواکە |
| بەدەم‌و دڵ دووعاکە | دوعا چەکێ زۆر چاکە |
| نزا مەغزی خواناسی | ئەوانەی بەکەساسی |
| بەدڵگەرمی‌و بەڕاستی | بەدڵسۆزی‌و ئیخلاسی |
| دووعاو نزا دەخوێنن | خودای خۆیان دەدوێنن |
| ئەوانە لەهەر شوێنن | پەیکەری بەفرو خوێنن |
| واتە: پاك‌و بێ باکن | روو بەفرین‌و دڵپاکن |
| لای خودا پیاوی چاکن | روو سووری ناوی خاکن |

وەرگێڕ: نوری فارس - سلێمانی

ماموستایان - ١٩٩١/٩/١

دەدەمو دوعا گۆو نیازمەندی بارەگای خۆم نائومێد ناکەم، دەی با ئەوانیش بەوەفاو بەئەمەك بنو چاکەی منیان لەبەرچاو بێ، کەداوای تاعەتو بەندەیی یان لێ دەکەم، فەرمان نەشکێننو ئەركو واجبەکانی من بەجێ بێنن هەتا مایەی رزگاری بەدەست بێنن.

بزانن بێجگە لەخوا کەس رادەی ناکەوێ لەکاتی لێقەومانو بێ چارەیی دا فریای عەبدو بەندە بکەوێ، فریا رەسی بەراستی هەر خودایە، کەخودا ویستی بێ بەهاواری بەندەی بێچارەی لێقەوماوی خۆیەوە، زەمینەی ئەوە دەسازێنێو هۆی فریای بۆ دەرەخسێنێ.

١/١٤٦٥-٥١٨/ عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ عَنْ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: (الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ) رواه أبو داود والترمذي وقال: حديث حسن صحيح.[٤٩٤]

لەنوعمانی کوڕی بەشیرەوە (رەزای خوایان لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: نزاو پاڕانەوە لەخودا، باشترین عیبادەتو خودا پەرستییە. (د/ت: ح/ح/ص).

٢/١٤٦٦-٥١٩/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَحِبُّ الْجَوَامِعَ مِنْ الدُّعَاءِ وَيَدَعُ مَا سِوَى ذَلِكَ. رواه أبو داود بإسناد جيد.[٤٩٥]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) حەزی لە نزای هەمە گربوو، کە وشەکانی فرەگرو پڕ واتا بن، وەوازی لەئەوانی تر دەهێنا کە ئاوا نەبوون (د ـ إسناد جيد).

٣/١٤٦٧-٥٢٠/ عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) متفق عليه، زاد مسلم في روايته قال: وكان أنس إذا أراد أن يدعوا بدعوة دعا بها، فإذا أراد ان يدعوا بدعاء دعا بها فيه.[٤٩٦]

---

[٤٩٤] ئەبو داوود (١٤٧٩)و تیرمیذی (٢٩٧٣).

[٤٩٥] ئەبو داوود (١٤٨٢).

[٤٩٦] بوخاری (٦٣٨٩)و موسلیم (٢٦٩٠).

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: زۆرتری دووعای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەمە بوو: اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّار: خوداوەندا! لەدونیاو لەقیامەتا چاکمان بۆ بکە، لەدنیادا لەبەشی جوان بەشمان بدەو لەپاشە رۆژیشدا لەبەشی باش بەشمان بدە، وە لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە (ش) موسلیم (رەزای خوای لێ بێ) لەگێڕانەوەی خۆیدا ئەمەی پتر کردووە: قسە بەر (راوی) گوتی: جاران ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) کەدەیویست داوای مرازو نیازێ لەخودا بکا ئەم دوعایەی دەکرد، هەروەها کەدەیویست نزا بکاو بپاڕێتەوە ئەم دوعایەی لەناو نزاکەیدا دەخوێندو دەیکرد بەبەشێ لەپاڕانەوەکەی.

٤/١٤٦٨-٥٢١/ فەرموودەی: (.. أللهم إني أسألك الهدى..).

٥/١٤٦٩-٥٢٢/وَعَنْ طارق بن أشيم ﷺ قَالَ: (كَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَسْلَمَ عَلَّمَهُ النَبِيّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الصَّلَاةَ ثُمَّ أَمَرَهُ أَنْ يَدْعُوَ بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَعَافِنِي وَارْزُقْنِي) رواه مسلم. وفي رواية له: عَنِ طارق انه سمع النبيﷺ وأتاه رجل فقال: يا رسول الله، كيف أقول حين أسأل ربي؟ قال: قل أللهم اغْفِرْ لي وارحمني وعافني وارزقنى فإن هؤلاء تجمع لك دنياك وآخرتك. [٤٩٧]

طاریقی کوڕی ئەشیم (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پیاوێ موسوڵمان دەبوو، لەپێشا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژی فێر دەکرد، ئەوجا ئەم وشانەشی فێر دەکرد، کەنزایان پێ بکا بۆخۆی، پێی دەگوت کەبڵێ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَعَافِنِي وَارْزُقْنِي: خوداوەندا! لێم خۆش بەو رەحمم پێ بکەو رێی راستم پێ نیشان بدەو بێ وەیو سەر ئاسوودەم کەو رۆژییەکی خەڵاڵی سەروبەرم بدەرێ. (م) لەگێڕانەوەیکی تری موسلیم دا (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لە طاریقەوە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: گوێم لێ بوو بەگوێی خۆم پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! کاتێ کەڕازو نیازو مرازی خۆم عەرزی بارەگای پەروەردگاری خۆم کرد چۆن عەرزی بکەمو بڵێم چی؟ فەرمووی: بڵێ: اللهم اغفر لي وارحمني وعافني وارزقني. چونکە ئەم وشەگەلە خێرو خۆشی هەردوو جیهانت دەگرێتەوە.

---

[٤٩٧] موسلیم (٢٦٩٧).

٦/١٤٧٠-٥٢٣/ عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قالَ: قالَ: رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (اللّٰهُمَّ مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ). رواه مسلم.[٤٩٨]

عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: اللّٰهُمَّ مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ: خوداوەندا! ئەی هەڵگێڕو وەرگێڕێ دڵان! دڵمان لەسەر تاعەتی خۆت ڕابگرە (م ـ خ).

٧/١٤٧١-٥٢٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ (كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ وَدَرَكِ الشَّقَاءِ وَسُوءِ الْقَضَاءِ وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ) قال سفيان أشك، انى زدت واحدة منها.[٤٩٩]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پەنا بەخودا، بگرن لەمانەو بڵێن: أعوذ باللّٰهِ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ وَدَرَكِ الشَّقَاءِ وَسُوءِ الْقَضَاءِ وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ: پەنا دەگرم بەخودا لەبەڵای بڕس بڕو لەتووشبوونی نەگبەتیو لەیەخەگرتنی چارە ڕەشیو لەچارەنووسی خراپو لە شادەكامیو پێخۆشبوونی دوژمنان! (ش ـ ڕەزای خوایان لێ بێ) لەگێڕانەوەیەكدا: سوفیان (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: وا دەزانم كەلەم چوارە من یەكێكیانم زیاد كردووە.

٨/١٤٧٢-٥٢٥/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللّٰهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي وَاجْعَلْ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ وَاجْعَلْ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرّ). رواه مسلم.[٥٠٠]

خوداوەندا! دینەكەم ـ كەمایەی خۆشیو باشی هەموو كارێكمە ـ ڕێكو پێكی بخەبۆم، وە دنیاكەم كەتیا دەژیم گوزەرانی تیا دەكەم ـ سازی بكە بۆم، وە دوا ڕۆژم ـ كە تیا زیندوو دەبمەوە ـ باشی بكە بۆم، خودایە! ئەم ژیانەی ئەم دنیایەم بۆ بكە

---

[٤٩٨] موسليم (٢٦٥٤).

[٤٩٩] بوخارى (٦٦١٦)و موسليم (٢٧٥٧).

[٥٠٠] موسليم (٢٧٢٠).

به هۆی هەموو زیادە خێرێ، وەمردنیشم بۆ بکە بەدەسمایەی سەرفرازیو حەسانەوە لەدەستی گشت شەڕێ (م).

٩/١٤٧٣-٥٢٦/ عَنْ عَلِيّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (قُلْ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي) وَفِي رواية: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالسَّدَادَ. رواه مسلم.[٥٠١]

عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي: ئەی خودایە! ڕێگەی هەقم پێ نیشان بفەرموو، ئاراستەی هەموو کاروبارێکی باشم بکە. لەگێڕانەوەیەکا: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالسَّدَادَ: ئەی خودایە! داوای ئەم دوو خەلاتەت لێ دەکەم: کەڕێی ڕاستم پێ نیشان بدەیتو ئاراستەی گشت کاروبارێکی چاکم بکەی.

١٠/١٤٧٤-٥٢٧/ عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ وَالْبُخْلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ) وَفِي رواية: (وضلع الدين وغلبة الرجل) رواه مسلم.[٥٠٢]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ وَالْبُخْلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ: خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەبێ کارەییو تەوەزەلیو ترسنۆکیو ئیفتادەییو چرووکیو ڕەزیلیو ئازاری گۆڕ، هەروەها پەنا دەگرم بەتۆ لەئاژاوەی ژیانو مردن. لەگێڕانەوەیەک دا: اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن والعجز والكسل والجبن والبخل وضلع الدين وغلبة الرجال: خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەباری خەمو خەفەتو لەکۆڵەواریو بێ کارەییو تەمبەڵیو تەوەزەلیو ڕژدیو لەکەڵەکە بوونی قەرزو قوڵەو بوون بەژێرباری قەرزدارییەوەو لە زاڵبوونی دوشمنان (م/ تاج)

١١/١٤٧٥-٥٢٨/ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي قَالَ: (قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا

---

[٥٠١] موسلیم (٢٧٢٥).

[٥٠٢] موسلیم (٢٧٠٦).

كَثِيرًا وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي إِنَّك أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ). متفق عليه، وفي رواية: (وفي بيتي) وروي ظلما كثيرا وروي كبيرا، بالثاء المثلثة وبالباء الموحدة، فينبغي أن يجمع بينهما فيقال: كثيرا كبيرا.[٥٠٣]

ئەبو بەكری صەدیق (رەزای خوای لێ بێ) عەرزی حەزرەتی كرد: قوربان! نزایەكم فێربكە كەلەناو نوێژەكەما بیكەم. فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ): اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي إِنَّك أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ: خودایە! من زۆرو ستەمێكی گەلێ زۆرم لەخۆم كردووە جگە لەتۆش كەسی تر رادەی ئەوەی نییە كەلەگوناھ خۆش بێ، دەی بەلوتفو كەرەمی خۆت لێم خۆش بەو میهرەبانیم لەگەڵ بنوێنە، بەڕاستی تۆ تاوانبەخشو میهرەبانیت. لەگێڕانەوەیەكا: ئاوایە: في صلاتی وفي بيتي: نزایەكم فێر بكە كەلەناو نوێژەكەما بیكەمو لەماڵەوەشم بیڵێم وشەی (كثیرا) بە دوو شێوە گێڕاویانەتەوە جارێ ئاوا (كثیرا) بەثێی نوختەدار ، جارێ ئاوا: (كبیرا) بەبێ ی یەك نوختە، كەواتە واباشە دوعا خوێن هەردوو شێوەكە كۆ بكاتەوەو بڵێ: (إني ظلمت نفسي ظلما كثيرا كبيرا..) تاد. واتە: بەڕاستی من زۆرو ستەمێكی گەلێ زۆرو گەورەم لەخۆم كردووە.. تاد.

دەلیلولفالیحین دەفەرموێ: گشت نزاو دوعایێ كەبە چەن شێوەیێ روایەت كرابێ، وا پەسەندە كەلەسەر ئەم شێوەیە هەموو شیوەكان كۆ بكرێنەوە، هەرچەند هەندێ كەس فەرموویانە: كەواباشە دوعاكە هەرجارەی بەروایەتێ بخوێنرێ، تا هەموو روایەتەكان تەواودەبن (وەرگێڕ).

١٢/١٤٧٦-٥٢٩/ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي جِدِّي وَهَزْلِي وَخَطَئِي وَعَمْدِي وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). متفق عليه.[٥٠٤]

---

[٥٠٣] بوخاری (٨٣٤) و موسلیم (٢٧٠٥).

[٥٠٤] بوخاری (٦٣٩٨) و موسلیم (٢٧١٩).

**ئـەبو مووسـا** (رەزای خوای لێ بێ) **فـەرمووی: پـێغەمبـەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **گـەلێ جـار ئـەم دوعایەی دەكرد، دەیفـەرموو:** اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي جِدِّي وَهَزْلِي وَخَطَئِي وَعَمْدِي وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ:

**خوداوەنـدا! لـێم خـۆش بـە! لەهـەموو جـۆرە گونـاهێكم خـۆش بـە، لـەنادانیو نەفامیم خۆش بە (تۆ بۆخۆت دەفەرمویَ: إنما التوبة على الله للـذين يعملـون السـوء بجهالة) (٤/١٧) پەیمانو بەڵێنە لەسەر خودا تەوبەی ئەو كەسانە گیرا بكا، كەلەبـەر نەفامیو نەزانی خۆیان خراپەو گوناه دەكەن)، لەزیادەڕەویو شووڵ لێ هەڵكێشانم لە هەموو كارێكما خۆش بە، لەو گوناهەیشم خۆش بە كەخۆت لـەمن باشـتر ئاگـات لێیەتیو دەیزانی، خودایە! تاوانەكانم هەموو بپۆشە، چ بەڕاستیو بەئەنقەست بن، چ بەگاڵتەوەبن، چ بەهەڵە بن، چ بەئارەزوو بن، وەئەم جۆرە گوناهانەیشم هـەموو هەن، خودایە! تاوانی كۆنو نوێم بپۆشە، تـاوانی لەمـەوپێشو لەمەوپاشـم بپۆشـە، هەروا تاوانی نهێنیو ئاشكرام بپۆشە، هەروا لەو گوناهەیشم خۆش بە كـەتۆ لـەمن باشتر دەیزانی، پێشخستنو پاشخستن بەدەستی تۆیە: پێشخەرو پاشخەر هـەر تـۆی! وە هەموو شتێ لای تۆ ئاسانەو تۆ دەسەڵاتی هەموو شتێكت هەیە (ش).**

١٣/١٤٧٧-٥٣٠/ وَعَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَـانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ). **رواه مسلم.**[505]

**عائیشە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پـێغەمبـەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **گـەلێ جـار لەپاڕانـەوەدا دەیفەرموو:** اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ: **خودایە! پـەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی ئەوەی كەلـەرابوردودا كردوومـەو لەشـەڕی ئـەوەی كەلەمـەولا لەئاییندەدا دەیكەم (م).**

١٤/١٤٧٨-٥٣١/عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (كَانَ مِـنْ دُعَـاءِ رَسُـولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ زَوَالِ نِعْمَتِـكَ وَتَحَـوُّلِ عَافِيَتِـكَ وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ وَجَمِيعِ سَخَطِكَ). **رواه مسلم.**[506]

---

[505] موسليم (٢٧١٦).

[506] موسليم (٢٧٣٩).

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەمە دوعایێ بوو لەدووعاکانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ): اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ وَجَمِيعِ سَخَطِكَ:

خودایە! ئەی یەزدانی پاك! ئەی پادشای بێ باك! پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی کەلەپڕێکا بەهرەو نازو نیعمەتێ کەتۆ رژاندووتە بەسەرما پشتم تێ بکاو نەمێنێ، لەوەیش کەئەو بێ وەیی‌و ئاسوودەییەی کە داوتە پێم لەناکاوێکا لێم وەرگریتەوە، لەوەیش کەناگەهان تۆڵەیەکی کوتوپڕم لێ بسەنی، هەروا پەنا دەگرم بە تۆ لەهەرچی دەبێ بەهۆی نارەزایی تۆ (م).

١٥/١٤٧٩-٥٣٢/ وَعَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَهَا). رواه مسلم.[٥٠٧]

زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَهَا: خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەبێ کارەبایی‌و تەوە زەلی‌و ترسنۆکی‌و زەلیلی‌و ئیفتادەیی‌و ئازاری گۆڕ، خوداوەندا! سام‌و ترسی خۆت بخەرە ناودڵمەوەو بیکە بە خاوەن تەقواو ناو دەروونم لەچڵك‌و دەغەزو کینە پاك بکەرەوەو خاوێن‌و تەمیز رای بگرەو بەنووری خوا ناسی رۆشن‌و ڕوناکی بکەرەوە، تۆ لەهەموو کەس باشتر دەتوانی کەپاك‌و خاوێنی بکەیتەوە، تۆ خۆت هەم خاوەن‌و هەم گەورەی خودی منیت، خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەزانستی بێ سوودو بێ کەڵك‌و لەدڵی بێ ئاگا، کەبەذیکری خودا رانەچەنێ‌و سامی لێ نەنیشێ‌و، لەدەروونی چاوبرسی

---

[٥٠٧] موسليم (٢٧٢٢).

چاوچنۆكو، له دووعاو نزايێ كه گیرانەبێو بدرێتەوه بەسەر خاوەنەكەیدا! (م/ تاج).

١٦/ ١٤٨٠-٥٣٣/ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَنَّ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ خَاصَمْتُ وَبِكَ حَاكَمْتُ فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ).زاذ بعض الرواة (ولا حول ولا قوة إلا بالله) متفق عليه.[٥٠٨]

ئیبنو عەبباس ـ رەزای خوایان لێ بێ ـ فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گەلێ جار دەیفەرموو: اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ خَاصَمْتُ وَبِكَ حَاكَمْتُ فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَأَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ: ئەی خودایە! خۆم سپارد بەتۆو، باوەڕم هەیە بەتۆ، پشتو پەنام هەرتۆی، دالْدەم هێناوەتە بەرتۆ، بەپشتی تۆ دەچم بەگژ ناحەزی خۆما، مەحكەمەو دادی خۆم دێنمە لای تۆو تۆ دەكەم بەحەكەم لەنێوانی خۆمو نەیارما، سا تۆیش بەكەرەمو بەخششی خۆت لەگوناهی بەرودوام خۆش بە، هەروا لەگوناهی نهێنیو ئاشكرام، پەروەردگارا! پێشخستنو پاشخستن بەدەستی تۆیە، خودای راستو رەوان هەر تۆی. هەندێ گێڕەرەوە ئەمەی پترە: (ولا حول ولا قوة إلا بالله..) خودای راستو دروست هەرتۆی، بزووتنو هێزو تەوانایی هەر بەدەستی خودا خۆیەتیو بەس.

١٧/١٤٨١-٥٣٤/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ وَمِنْ شَرِّ الْغِنَى وَالْفَقْرِ). رواه أبو داود والترمذی، وقال: حديث حسن صحيح. وهذا لفظ أبي داود.[٥٠٩]

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گەلێ جاران بەم وشانە نزای بۆخۆی دەكرد، دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ وَمِنْ

---

[٥٠٨] بوخاری (١١٢٠)و موسلیم (٧٦٩).

[٥٠٩] أبو داوود (١٥٤٣) تیرمیذی (٣٤٨٩).

شَرِّ الْغِنَى وَالْفَقْرِ: خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لە فەرتەنەی دۆزەخو سزای ئاگرو لەشەڕی دەوڵەمەندییو لەشەڕی هەژاریی (د/ت: ح/ح/ص).

١٨/١٤٨٢-٥٣٥/ عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلَاقَةَ عَنْ عَمِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الْأَخْلَاقِ وَالْأَعْمَالِ وَالْأَهْوَاءِ). رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.[٥١٠]

زیادی کوڕی عیلاقە گوتی: مامەم قوطبەی کوڕی مالیك ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ فەرمووی: جاران خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الْأَخْلَاقِ وَالْأَعْمَالِ وَالْأَهْوَاءِ: خودایە! ئەی پەروەردگاری خۆم! پەنا دەگرم بەتۆ لەڕەفتاری ناپەسەندو لەکرداری گەندو لەئارەزوو بازی! (ت: ح/حەزرەت).

١٩/١٤٨٣-٥٣٦/ وَعَنْ شَكَلِ بْنِ حُمَيْدٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي دُعَاءً؟ قَالَ: (قُلْ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي وَمِنْ شَرِّ بَصَرِي وَمِنْ شَرِّ لِسَانِي وَمِنْ شَرِّ قَلْبِي وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي). رواه أبو داود والترمذيوقال: حديث حسن.[٥١١]

شەکەلی کوڕی حومەید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا نزایەکی گرنگم فێربکە؟ فەرمووی: بڵێ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي وَمِنْ شَرِّ بَصَرِي وَمِنْ شَرِّ لِسَانِي وَمِنْ شَرِّ قَلْبِي وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي: خوداوەندا! پەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی گوێمو لەشەڕی چاومو لەشەڕی زمانمو لەشەڕی دڵمو لەشەڕی تۆماوی خۆم (د/ت: ح/حەزرەت).

٢٠/١٤٨٤-٥٣٧/ عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْبَرَصِ وَالْجُنُونِ وَالْجُذَامِ وَمِنْ سَيِّئْ الْأَسْقَامِ). رواه أبو داود بإسناد صحيح.[٥١٢]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) زۆرجاران دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبَرَصِ وَالْجُنُونِ وَالْجُذَامِ وَمِنْ سَيِّئْ الْأَسْقَامِ:

---

[٥١٠] تیرمذی (٣٥٨٥).

[٥١١] تیرمیذی (٣٥٨٥).

[٥١٢] ئەبو داوود (١٥٥٤).

خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەبەڵەکیو، لەشێتیو لەگولیو لەهەموو دەردێکی خراپو پیس! (د ـ س/ص).

٢١/١٤٨٥-٥٣٨/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ). رواه أبو داود بإسناد صحيح.[٥١٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران زۆرجاران خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) کەدەپاڕایەوە دەیفەرموو: اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ: خودایە! ئەمن پەنا دەگرم بەتۆ لەبرسێتی، چونکە بەڕاستی هاونوێنێکی بەدە، وەپەنا دەگرم بەتۆ لەگزێتیو ناپاکی، چ لەگەڵ خوداداو، چ لەگەڵ بەندەی خودادا، چونکە بەڕاستی هاودەستێکی بەدە. (د ـ س/ص).

٢٢/١٤٨٦-٥٣٩/ عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ مُكَاتَبًا جَاءَهُ فَقَالَ: (إِنِّي قَدْ عَجَزْتُ عَنْ كِتَابَتِي فَأَعِنِّي قَالَ أَلَا أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ عَلَّمَنِيهِنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَوْ كَانَ عَلَيْكَ مِثْلُ جَبَلٍ دَيْنًا أَدَّاهُ اللّٰهُ عَنْكَ قَالَ قُلْ: اللّٰهُمَّ اكْفِنِي بِحَلَالِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ). رواه الترمذي، وقال: حديث حسن.[٥١٤]

بەندەیەکی کاغەز پێدراو (موکاتەب) هاتە خزمەتی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: تەوانام نییە کە سەرقەبڵانەکەم بدەم (واتە: قیسطەکەی سەرم لەکاتی خۆیدا، هەتا بەتەواوی لەدەست کۆیلەیی ڕزگارم بێو وەك ئەو خەڵکەی تر منیش ئازادو سەربەست ببم) کەواتە باربوویەکم بکە بۆئەمە.

عەلیش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هۆشیار بە، با ئەم چەند وشەیەت فێربکەم، کەکاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوانەی فێری خۆم کردووە، ئەگەر گریمان بەقەد چیایەکیش قەرزو قۆڵەت لەسەربێو ئەو وشانە بڵێی خودا بۆتی دەداتەوە، بڵێ: اللّٰهُمَّ اكْفِنِي بِحَلَالِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ: خودایە! بەحەڵاڵی

---

[٥١٣] ئەبو داوود (١٥٤٧).

[٥١٤] تیرمیذی (٣٥٥٨).

خۆت بێ زیانم بكە لەحەرامی خۆت، وەلەسایەی خۆشتەوە داماوی دەستی كەسی ترم مەكە (ت: ح/ح).

٥٤٠-١٤٨٧/٢٣/ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أن النَبِيّ ﷺ علم أباه حصينا كلمتين يدعوا بهما: (اللَّهُمَّ أَلْهِمْنِي رُشْدِي وَأَعِذْنِي مِنْ شَرِّ نَفْسِي) رواه الترمذی وقال: حديث حسن.[٥١٥]

عیمرانی كوڕی حوصەین - ڕەزای خوایان لێ بێ - فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دوو وشەی فێری حوصەینی باوكم كرد، نزای پێ دەكردن: اللَّهُمَّ أَلْهِمْنِي رُشْدِي وَأَعِذْنِي مِنْ شَرِّ نَفْسِي: ئەی خودایە! دڵم شارەزای ڕێی ڕاست بفەرموو، وەپەنام بدە لەشەڕی دەروونی خۆم (ت: ح/حەزرەت).

٥٤١-١٤٨٨/٢٤/ عَنْ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي شَيْئًا أَسْأَلُهُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَ: (سَلْ اللَّهَ الْعَافِيَةَ فَمَكَثْتُ أَيَّامًا ثُمَّ جِئْتُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي شَيْئًا أَسْأَلُهُ اللَّهَ فَقَالَ لِي يَا عَبَّاسُ يَا عَمَّ رَسُولِ اللَّهِ سَلْ اللَّهَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ). رواه الترمذي، وقال: حديث صحيح.[٥١٦]

ئەبولفەضل - واتە: عەباسی كوڕی عەبدولموطەلیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! شتێكم فێربكە كە داوای ئاسوودەییو بێوەیی لەخودا بكەم! لەدوا چەن ڕۆژێكی تر دیسان چوومەوە بۆلای و عەرزیم كردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! شتێكم فێربكە كەداوای بكەم لەخودای گەورە؟ جا فەرمووی: ئەی عەبباس! ئەی مامەی پێغەمبەری خودا! داوای ئاسوودەییو بێ وەیی جیهانو دوا ڕۆژ لەخودا بكەن (ت: ح/ص).

٥٤٢-١٤٨٩/٢٥/ وَعَنْ شهر بنِ حوشب قالَ: قلت: لأم السلمة (رَضيَ اللهُ عَنها) يا أم المؤمنين ما أكثر دعاء رسول الله ﷺ إذا كان عندك؟ قالت: كان أكثر دعائه: (يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك). رواه الترمذی، وقال: حديث حسن.[٥١٧]

---

[٥١٥] تیرمیذی (٣٤٧٩).

[٥١٦] تیرمیذی (٣٥٠٩).

[٥١٧] تیرمیذی (٣٥١٧).

**شەهری کوڕی حەوشەب** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: عەرزی ئوممو سەلەمەی هاوسەری حەزرەتم کرد: ئەی دایکی موسوڵمانان! جاران حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کەتەشریفی لەلای تۆ دەبوو بەزۆری دووعاو نزاو پاڕانەوەی چی بوو، فەرمووی: زۆرتر نزای حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەکن من ئەمەبوو: یا مقلب القلوب ثبت قلبي علی دینك: ئەی خودایە! ئەی هەڵسوڕێنەی دڵان! دڵم ڕاگرە لەسەر ئایینی خۆت! (ت: ح/ح).**

٢٦/١٤٩٠-٥٤٣/ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ مِنْ دُعَاءِ دَاوُدَ ﷺ يَقُولُ: (اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ وَالْعَمَلَ الَّذِي يُبَلِّغُنِي حُبَّكَ اللّٰهُمَّ اجْعَلْ حُبَّكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي وَأَهْلِي وَمِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ). **رواه الترمذی وقال: حدیث حسن.**[٥١٨]

**ئەبو دەرداء** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: یەکێ لەشێوەی پاڕانەوەکانی داوود** (سەلامی خوای لێ بێ) **ئەمە بوو:** اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ وَالْعَمَلَ الَّذِي يُبَلِّغُنِي حُبَّكَ اللّٰهُمَّ اجْعَلْ حُبَّكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي وَأَهْلِي وَمِنْ الْمَاءِ الْبَارِدِ: **خودایە! من داوای خۆشەویستی ی خۆتت لێ دەکەم وەخۆشەویستی ی ئەوکەسەیش کەتۆی خۆش دەوێ، وەداوات لێ دەکەم کەفرسەتم بدەی لەسەر کردنی ئەو کردەوە باشانەی کەدەبن بەمایەی خۆشەویستی تۆ، پەروەردگاری نازدارم! ئەی خودای کردگارم! خۆشەویستی ی خۆشەویستی خۆت بکە بەگەورەترین ئاواتم، کەزیاتر لەخۆشەویستی ی خۆمو کەسوکارم هەوڵی بۆ بدەم، کەگەلێ گەلێ لەئاوی سافی شیرینی خۆشی سارد لەکنم شیرینترو خۆشەویست تربێ! (ت: ح/حەزرەت).**

٢٧/١٤٩١-٥٤٤/ عَنْ أَنَسْ ﷺ قَالَ: رَسولُ اللهِ ﷺ (ألظوا بياذا الجلال والإكرام). **رواه الترمذي والنسائي من رواية ربيعة بن عامر الصحابي قال: حديث صحيح الإسناد.**[٥١٩]

**ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: هەمیشە بیکەن بەپیشە بڵێن: یا ذاالجلال والإكرام: ئەی خاوەن شانو شکۆو قەدرو ڕێز! (ن/ حاکم: ح/س/ ص).**

---

[٥١٨] تیرمذی (٣٤٨٥).

[٥١٩] تیرمذی (٣٥٢٣) حاکم لە مستدرکا ١/ ٤٩٨-٤٩٩.

٢٨/ ١٤٩٢-٥٤٥/ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: (دَعَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِدُعَاءٍ كَثِيرٍ لَمْ نَحْفَظْ مِنْهُ شَيْئًا قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ دَعَوْتَ بِدُعَاءٍ كَثِيرٍ لَمْ نَحْفَظْ مِنْهُ شَيْئًا؟ فَقَالَ: أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَجْمَعُ ذَلِكَ كُلَّهُ تَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ وَعَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ).رواه الترمذى وقال: حديث حسن.[٥٢٠]

ئـەبو ئومامـە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نـزاو پاڕانەوەیـەکی زۆری کـرد، بۆمـان لەبـەر نـەکرا، گوتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! نـزایـەکی زۆرت فـەرموو، هیچمان لـێ ی لەبـەر نـەکرد، فـەرمووی: هۆشـیارەوەبن! بانزایەکتان پێ نیشان بدەم کەئەوە هەمووی بگرێتـەوە: اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ وَعَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ: ئەی خودایە! داوات لێ دەکەم کەبەشم بدەی لەو خێـرو بێرانـەی کـە موحەممـەدی پێغەمبەری تۆ داوای کردوون لەتۆ، وەپەنای دەگـرم بەشـەڕی ئـەو شـتە خراپانـەی کە موحەممەدی پێغەمبەری تۆ پەنای گرتووە بـەتۆ لەشـەڕیان، خودایـە! پشـتیوان هەرتۆی، پەنای بێ پەنایان هـەرتۆی، جێگـەی ئومێـدو گەیشـتن بـەئاواتی هـەردوو ژیـانی هـەردوو جیهـان هـەرتۆی، وەپـارێز لـەتاوانو تاقـەت لەسـەر تاعـەتو خوداپەرسـتیو هەڵسوکەوتو هێـزو تـەوانایی هـەمووی هـەر بەدەسـتی تۆیـە (ت: ح/حەزرەت).

٢٩/ ١٤٩٣-٥٤٦/ وَعَنْ ابنْ مَسْعُودٍ ﷺ قالَ: كانَ مِنْ دُعاءِ رَسول اللهِ ﷺ: (أللهم إني اسألكَ موجبات رحمتك وعزائم مغفرتك، والسلامة منْ كل اثم والغنيمة من كل بر، والفوز بالجنة والنجاة من النار) رواه الحاكم أبو عبدالله، وقال: حديث صحيح على شرك مسلم.[٥٢١]

---

[٥٢٠] تيرمذى (٣٥١٦).

[٥٢١] حاكم له مستدركا ٥٢٥/١.

ئیبنومەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: نزایێ بوو لەنزاکانی خۆشەویست (درووودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: أللهم إني اسألكَ موجبات رحمتك وعزائم مغفرتك، والسلامة منْ كل اثم والغنيمة من كل بر، والفوز بالجنة والنجاة من النار: خودایە! ئەی پەروەردگاری کردگار! ئەی کەریمی کارساز! داوای ئەوشتانەت لێ دەکەم کەدەبن بەهۆی میهرەبانیو مایەی ڕەحمەتی تۆ، وە هەروەها ئەوشتانەیش کەدەبن بە هەوێنی لێ بوودرنی تۆ، داوای بەشە خەڵات لەهەموو چاکەیەكو ڕزگاربوون لەهەموو گوناهێکت لێ دەکەم، خودایە! داوای شاد بوون بەبەهەشتت لێ دەکەم، هەروەها داوای ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخت لێ دەکەم (ئیمامی حاکیم - ڕەزای خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوەو فەرموویەتی: حەدیثیکی صەحیحە لەسەر شەرطی ئیمامی موسلیم - ڕەزای خوا لەهەموو موحەددیثو ڕاوی یەکان بێ).[٥٢٢]

## (٢٥١) خێری نزایێ لەڕوو نەبێ - باب فضل الدعاء بظهر الغيب

قال الله تعالى: (والذين جاءوا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالإيمان) (٥٩/١٠).

ڕاڤەکەی لەم شوێنەدا ڕابورد: (باب الصدقة من الميت والدعاء له (ز - ١٦٢ ب - ٣ ل ).

وقال تعالى: (واستغفر لذنبك وللمؤمنين والمؤمنات) (٤٧/ ١٩)

واتە: ئەی موحەممەد! داوای لێبووردن لەگوناه لەخودا بکە، هەم بۆ گوناهی خۆت، هەم بۆ گوناهی موسوڵمانان چ هی پیاویان چ هی ژنیان!

---

[٥٢٢] دانەری دەلیلولفالیحین (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: مەبەستی سەرەکی لەنزا، وەکی گشت خودا پەرستییەکی تر بەجێ هێنانی عوبودییەتو ماڤی بەندەیی یە بۆ خودا، دوا ئامانجیش فوتار بوونە لەدۆزەخو شادبوونە بە بەهەشت، شاعیر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ:

ان ختم الله برضوانه فكل ما لقيته سهل

واتە:

ئەوەی سەرەنجام خۆشنوودی نۆشە کەرجان بکێشێ هێشتا هەر خۆشە

(وەرگێڕ: ١٩٩١/٩/٦).

وقال تعالى إخباراً عن إبراهيم (سەلامی خوای لێ بێ): (ربنا اغفر لي ولوالدي وللمؤمنين يوم يقوم الحساب) (١٤/١٤)

واتــە: خــودای گــەورە هــەواڵی ئیبراهیمـمــان بــۆ دەگێڕێتــەوە کــەنزایکردووەو فەرموویــەتی: ئــەی پــەروەردگارم! هــەم لــەخۆم، هــەم لــەباوك و دایکــم، هــەم لەموسوڵمانان خۆش بە، لەڕۆژی قیامەتا، کەئـەهلی حیسابو لێپرسینەوە بـەپێوە لـەبارەگای دادگـای خوداوەندیـدا دەوەسـتن هـەتا حیسابو لێپرسینەوەیان لەگـەڵ دەکرێ.

١/١٤٩٤-٥٤٧/ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَـا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَدْعُو لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ إِلَّا قَالَ الْمَلَكُ وَلَكَ بِمِثْلٍ). رواه مسلم. [٥٢٣]

ئـەبو دەرداء (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەخۆشەویسـتم بیسـت دەیفـەرموو: هـەر بەندەیەکی موسوڵمان لەنادیار نزایەکی باش بۆ برایەکی موسوڵمانی خۆی بکا، کـە نزا بۆکراوەکە خۆی لەڕوو نەبێ، فریشتەیێ راسپێردراوە وەڵامـی دەداتـەوەو دەڵـێ: ئەوەندەی ئەوەیش بۆتۆ بێ (م).

٢/١٤٩٥-٥٤٨/ وعَنهُ أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ يقول: (دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْـبِ مُسْتَجَابَةٌ عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ كُلَّمَا دَعَا لِأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ آمِينَ). رواه مسلم [٥٢٤]

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) جاران دەیفەرموو: دووعای موسوڵمان بـۆ بـرای دینـی خـۆی، چ پیـاو بـێ چ ژن، کەلەپاشـەملە بـێ، دووعـای وا گیرایـە، لەڕاسەریەوە فریشتەیە راسپێردراوە، گشت جارێ کە ئـەو نزایـەکی بـاش لـەنادیارو پاشەملە بۆ برای ئایینی خۆی بکا، یا بۆ خوشکی ئایینی خۆی بـکا، فریشتەکەیش دەڵێ: ئامین یاخوا نزاکەت گیرابێ، وەئەوەندەی ئەوەیش بۆتۆ بێ (م).

---

[٥٢٣] موسلیم (٢٧٣٢).

[٥٢٤] موسلیم (٢٧٣٣).

## (٢٥٢) باسی چەند بابەتێکی تایبەتی نزا - باب في مسائل من الدعاء

١٤٩٦/١-٥٤٩/ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ فَقَالَ لِفَاعِلِهِ جَزَاكَ اللّٰهُ خَيْرًا فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ). رواه الترمذی وقال: حديث حسن صحيح. [٥٢٥]

ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: کەسێ چاکەیەکی لەگەڵدا بکریٚو لەپاداشی ئەوەدا بەچاکە کەرەکە بڵێ: جزاك الله خيرا: خودا پاداشی باشت بداتەوە. ئەوە زۆر بەجوانی ستایشی ئەوی بەجێ هێناوە. (ت: ح/ح/ص).

١٤٩٧/٢-٥٥٠/ وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى خَدَمِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ لَا تُوَافِقُوا مِنْ اللّٰهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى سَاعَةَ نَيْلٍ فِيهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجِيبَ لَكُمْ). رواه مسلم. [٥٢٦]

جابير (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: تووكو دووعای شەڕو نزای خراپ مەکەن: نە لەخۆتانو نەلەماڵو منداڵو نۆکەرو دەستوپێوەندی خۆتان، نەوەکوو ڕێکەوتی ئەوحەلە بکەن کە خودا نزای تیاگیرا دەکاو دووعا شەڕەکەتان گیرا ببیٚو دیارە لەدواییدا کە ڕقەکەتان نیشتەوە پەشیمان دەبنەوە (م).

١٤٩٨/٣-٥٥١/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ). رواه مسلم. [٥٢٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: هیچ کاتێ بەندە وەك کاتی ناو سەجدەو کوڕنووش بردن بۆ خودا لە پەروەردگاری خۆیەوە نزیك نابێتەوە، کەواتە لەوکاتەدا دوعاو نزا زۆر بکەن (م).

---

[٥٢٥] موسليم (٢٠٣٦).

[٥٢٦] موسليم (٩٢٠).

[٥٢٧] موسليم (٤٨٢). بڕوانە (ب/٣ ز- ٢٤٤ ژمارە ١٤٢٨/٢١).

١٤٩٩/٤-٥٥٢/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ فَيَقُولُ قَدْ دَعَوْتُ رَبِّي فَلَمْ يَسْتَجِبْ لِي) متفق عليه. وفي رواية لمسلم: (لَا يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ مَا لَمْ يَسْتَعْجِلْ قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الِاسْتِعْجَالُ قَالَ يَقُولُ قَدْ دَعَوْتُ وَقَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ أَرَ يَسْتَجِيبُ لِي فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذَلِكَ وَيَدَعُ الدُّعَاءَ). (٥٢٨)

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نزاتان گیرادەبێ، ئەگەر پەلە نەکەن، وەك ئەوە بەدەم، یا لەدڵەوە بڵێن: هەر لە خودا دەپاڕێمەوەو هەرگیرای ناکا (ش) لەگێڕانەوەیەکی موسلیم دا (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: هەمیشە نزای بەندە قەبووڵ دەبێو خودا گیرای دەکا، بەمەرجێ دووعای ناهەق نەبێ، وەك ئەوە نزا بۆ بڕینی رشتەی خزمایەتی بکا، وەلێ بەمەرجی ئەوەیش کە پەلە پەل نەکا. عەرزی حەزرەت کرا: قوربان! پەلەکردن لەنزا چۆنە؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ) وەك ئەوە بڵێ: ئای چەندە من نزا دەکەم کەچی نابینم هیچی گیرابێ، ئیتر کۆڵ دەداو هەست بەنا ئومێدیی دەکاو لەنزا کردن واز دەهێنێ!

١٥٠٠/٥-٥٥٣/ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا عَلَى الْأَرْضِ مُسْلِمٌ يَدْعُو اللَّهَ بِدَعْوَةٍ إِلَّا آتَاهُ اللَّهُ إِيَّاهَا أَوْ صَرَفَ عَنْهُ مِنْ السُّوءِ مِثْلَهَا مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْقَوْمِ إِذًا نُكْثِرُ قَالَ اللَّهُ أَكْثَرُ). رواه الترمذي، وقال: حديث حسن صحيح، ورواه الحاكم من رواية أبي سعيد وزاد فيه: أو يدخر له من الأجر مثلها. (٥٢٩)

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ لەسەر ئەم زەمینە هەر نزایێ لە خوا داوابکا، مسۆگەر کە خودا ئەو نزایەی گیرا دەکاو مرازەکەی دەدا، یا ڕێك بەقەد مرازەکەی ناخۆشیو خراپەی لەکۆڵ دەخا، بەمەرجێ نزای ناهەق نەبێ، یا نزای بڕینی ڕشتەی خزمایەتی نەبێ.

---

(٥٢٨) بوخاری (٦٣٤٠) و موسلیم (١٧٣٥).

(٥٢٩) تیرمیذی (٣٤٩٤).

پیاوێ لەیاران فەرمووی: کەواتە زۆر نزا دەکەین! فەرمووی: دەی خودا زۆرتری لەدەست دێ، ئەگەر خودا هەموو نزایەکی باشی ئێوە گیرا بکا، چی تێ دەچێ بۆئەو.

٦/١٥٠١-٥٥٤/ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: (قِيلَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الدُّعَاءِ أَسْمَعُ؟ قَالَ: جَوْفَ اللَّيْلِ الْآخِرِ وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ) رواه الترمذی، وقال: حديث حسن.[٥٣٠]

ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمویْ: عەرزی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) کرا: قوربان! لەچی کاتێکدا نزا باشتر گیرادەبێ؟ فەرمووی (درودی خوای لەسەر بێ): نزای سێیەمی دوایی شەو، نزای پاش نوێژە فەرزەکان (ت: ح/ح)

٧/١٥٠٢-٥٥٥/ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ). متفق عليه.[٥٣١]

ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی سەخڵەتیو دڵتەنگیو مەینەتدا دەیفەرموو: لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ: خودای بەهەق بەس یەزدانی پاکە، کەخودایەکی گەورە خاوەن حیلمو حەوسەڵەیە، خودای بەهەق بەس یەزدانی پاکە، کەخاوەنی عەرشی گەورەیە، کەتەختو بارەگای حوکمڕانی خۆیەتی، خودای بەهەق بەس یەزدانی پاکە کەخاوەنی یەك بەیەکی گشت ئاسمانەکانو زەمینە، کەخاوەنی عەرشو بارەگای نازداری خودایە (ش).

## (٢٥٣) باسی بەهرە (کەرامەت)ی پیاوچاکان - باب كرامات الأولياء وفضلهم

قال تعالى: (ألا أن أولياء الله لا خوف عليهم ولا هم يحزنون الذين آمنوا وكانوا يتقون * لهم البشرى في الحياة الدنيا وفي الآخرة لا تبديل لكلمات الله ذلك هو الفوز العظيم) (٦٤/٦١/١٠).

[٥٣٠] تيرميذی (٣٦٠٢).

[٥٣١] بوخاری (٦٣٤٥)و موسليم (٢٧٣٠).

وقال تعالى: (وهزي اليك بجذع النخلة تساقط عليك رطبا جنيا فكلي واشربي وقري عينا) (١٩/٢٥ـ الآية)

وقال تعالى: (كلما دخل عليها زكريا المحراب وجد عندها رزقا قال: يا مريم أنى لك هذا؟ قالت: هو من عند الله، ان الله يرزق من يشاء بغير حساب) (٣/٣٧).

وقال تعالى: (وإذا أعتزلتموهم وما يعبدون الا الله فأوو الى الكهف ينشر لكم ربكم من رحمته ويهيئ لكم من أمركم مرفقا وترى الشمس إذا طلعت تزاور عن كهفهم ذات اليمين وإذا غربت تقرضهم ذات الشمال) (١٨/١٦ـ ١٧) ألآية.

بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزانەو چەن فەرمایشتێکی تر ئەم باسە ڕون دەبێتەوە، کەدۆستانی خودا ـ واتە: (أولياء الله) وەگەڵ شتی سەیر سەیرو عەجایەبیان لەسەر دەستا رووودەداو دەبن بەخاریقەلعادەو کەرامەت بۆیان، یەزدانی مەزن دەفەرموێ: بزانن دۆستانی خودا، نزیکانی بارەگای خوداوەندی، کەئەوانە موسوڵمانی ساخن‌و روو لە خودان‌و خاوەن تەقوان‌و لەخودا دەترسن‌و گشت فەرمانەکانی بەجێ دەهێنن، ئەم زاتە پیرۆزانە خودا بەلوتف‌و بەخششی خۆی بەسەریان دەکاتەوەو خەمیان دەڕەوێنێتەوەو ترسیان دەنیشێنێتەوە، ئەوەتانێ لەقورئانی پیرۆزداو لەفەرمایشتی پێغەمبەردا مزگێنی گەورەیان پێ دراوە، کەسەر بەرزو سەرفرازی هەردوو ژیانی هەردوو جیهانن، هەروا خەونی باشی خۆشی ڕاست‌و دروست دەبینن‌و جاروبار خودا دڵ‌و چاوو دەروونیان ڕۆشن دەکاتەوەو دەبن بەخاوەن کەشف‌و کەرامات‌و قسەو گوفتوگۆو ڕۆژباشی لەگەڵ فریشتەکان دەکەن‌و پیرۆزبایی هەواری نوێ‌و رزگاریی ئێجگاری یان لێ دەکەن، بەڵێنی خودا پاشگەزبوونەوەی بۆ نییە، گفتەی خودا دێتەدی‌و قسەی‌و فەرمایشتی گۆڕانی بۆنییە، کەواتە ئەم مژدانەی کە بەم مەردانە دراوە گەورەترین پیرۆزی‌و سەرکەوتنی هەر دوو جیهانیانە. ئەمەیش چەند نموونەیەکە لەداستانی ئەو دۆستە خۆشەویستانەی خودا کە لەقورئانی پیرۆزدا باس کراوە: یەکەم داستانی لەدایکبوونی مەریەم‌و عیسای کوڕی، کەیەك لەیەك سەیر ترو عەجیبتر بوون، حەننەی هاوسەری عیمران، پیر بوو، منداڵی نەدەبوو، ڕۆژێ دێ کەوا باڵندەیێ خواردەمەنی دەدا بەبەچکەکەی، ئیتر ئەویش ئارەزووی منداڵی جووڵاو بەسۆزی دڵ لەخودا پاڕایەوەو داوای لێ کرد کەمنداڵێکی بداتێ، لەگەڵ ئەوەشدا کەلەسك‌وزا وەستا بوو،

بەڵام بەفەرمانی خودا سکی پڕ دەبێ، ئیتر بۆ سوپاسگوزاری‌و شوکرانەی نیعمەت‌و لەبەرچاو بوونی چاکەی خودا سکەکەی نەزر کرد بۆخزمەتی مزگەوتی بەیتولمەقدیس. ئەو سکە کەلەسەر ئەو حاڵە سەیرو عەجیبە پەیدابوو مەریەمی کچی عیمران بوو، سەرەنجام مەریەم لەناو بەیتولمەقدیس دا سەقامگیر بوو، لەخەڵوەخانەی خۆیدا هەمیشە سەرگەرمی خودا پەرستی بوو، حەزرەتی زەکەریا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) جاروبار دەچوو بۆ دینی ی‌و دەرۆیشتەناو هۆدەکەی خەڵوەخانەکەیەوەو بەرە بەرە شتی سەیر سەیرو کەرامەتی گەورە گەورەی لەحاڵی پیرۆزی مەریەم دەبینی، سەرنجی دەدا رزق‌و رۆزی یەکی باشی لەلایە، وەك گوتراوە:

لەزستان میوەی هاوینەی زۆر بوو لەهاوین میوەی زستانەخۆر بوو!! [٥٣٢]

تا عەرزی مەریەمی کرد: ئەی مەریەم! ئەمەت لەکوێ بوو؟ فەرمووی! ئەمە خەڵاتی خودایە، لەبارەگای ئەوەوە بۆم دێ لەخەزێنەی غەیبەوە دەیرەخسێنێ بۆم، کاری خودا سەیرە بۆ خودا هیچ شتێ هیچی تێ ناچێ، بەراستی خودای گەورە ئەگەر مەیلی لەسەربێ بەبێ شومار، لەرادەبەدەر رزق‌و رۆزی دەدا. حەزرەتی زەکەریاش کەئەم کەرامەتە گەورەیەی دی لەخودا پاڕایەوە کەکوڕێکی پاکی پێ ببەخشێ، لەگەڵ ئەوەشدا کەخۆی پیر بوو بوو وەژنەکەی نەزۆك بوو، وەلەسك وەستابۆوە خودا بەخەرقی عادەت حەزرەتی یەحیای پێ بەخشین. با بچینەوە سەرباسی ژنە باشەکەو کوڕە باشەکەی، وەك گوتمان یەکێ لەم مەردە نازدارە بەهرەمەندانە مەریەم بوو ئەوەبوو رۆژێ دەچێ بۆ کوڵ‌و کانی، لەوێ بەفەرمانی خودا حەزرەتی جوبرائیل فووی کرد بەبەرۆکی کراسەکەیاو ئیتر جوبرائیل خۆی لەبەرچاو ون بوو، وە حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کەوتە سکی مەریەم،جا ئەوەبوو لەوەدوا کەکاتێ بەسکەکەیەوە ژان گرتی رووی کردە باخە خوورمایەکی نزیك، لەوێش چووە پاڵ دارخورمایەك‌و پشتی پێوەی داو هەم کردی بەپەردەو هەم کردی بەپاڵپشت. لەشەرمانا لەبەر ئەم بارودۆخە نائاساییە خەم‌و پەژارە دایگرت‌و

---

[٥٣٢] ئەم نیوەیە لەطافەتی تێدایە ئەم مەعنایەش هەڵدەگرێ واتە: لەبەر عیبادەت نەی دەپەرژا لەخەڵوەخانەکە دەرچێ، لەبەر ئەوە خۆر کەمیوەی زستانە لەهاوینیشدا بۆ ئەو وەك میوەی میوان وابوو. (وەرگێڕ).

مەرگی خۆی بەئاوات خواستو فەرمووی: ئای لەم شەرمەزارییە! کێ بڕوا دەکات کوڕ بەبێ باب لەدایك ببێ، چی ڕزگارم دەکا لەزمانی پیس. کەبەقەد گوریسێ درێژە، کاشکی پێش ئەم رووداوە، هەر لەمێژەوە دەمردمو ئەمەم بەسەر نەدەهاتو ئێستا بۆخۆم لەبیر چووبومەوەو کەس ناونیشانیشی نەدەزانیم! لەم حاڵی شەکەتیو نائومێدیو بێ کەسییەدا کەسی بێ کەسان گەیشتە فریای کەنیزی خۆیو عیسا لە دایکبوو، خودا هێنایە زمانو دڵنەوایی دایکی دایەوەو بەزمانێکی ڕەوان عەرزی کرد، دایە گیان! بار باری خودایە، لاریت لەباری خودا نەبێ، شوکرانەی لەسەر بکە، واز لەخەمو پەژارە بێنە، ئەگەر کەسێکت دی، من وەڵامی دەدەمەوە لەباتی تۆ، ئەوەتا خودا بۆنەوازشو دڵنەوایی تۆ لەم وەرزی زستانەدا جۆگەلەیێ ئاوی ساف خۆشی لەبەردەمتەوە رەوان کردووە، دەدەی ئەو بنکە دارخورما وشکەیش بۆلای خۆت ڕابوەشێنە، تا بەفەرمانی خودا، بەشێوەیەکی موعجیزەئاسا سەوز دەبێتەوەو فەریکە خورمای تەڕو تازە دەگرێ، ئیتر مەریەمیش وای کرد، جا روتابی شیرینو تەڕو تازە لەدارخورماکەوە دەباری بەسەریدا، ئەوجا عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) وەك منالێکی دڵسۆزی باشو چاك بۆ دایکی عەرزی کرد: ئادەی دایە گیان! لەم خورما تەڕە پیرۆزەی تەبیعەت گەرمەی، باش بۆ ژنی زەیستانە بخۆ، وە لەو ئاوە سافە سازگارە خۆشە رەوانە بکە بەسەریدا، نۆشی گیانت بێ، چاوو دڵیشت رۆشن وا کوڕت بوو!

بەڵێ دایە گیان! چاوو دڵت ڕۆشن، من کوڕی تۆم، کوڕێکی باشو بەوەفاو بەئەمەك دەبم بۆ تۆ.

ئەمە یەکەم داستانی ئەم باسە بوو، کەسەراپا پڕە لەبەهرەی خوداوەندیو کەراماتو خاریقولعاداتو شتی وا. ئەمەیش دووەم داستان کەمەشهوورە بە داستانی یارانی ئەشکەوت (قصة أصحاب الكهف) کە ئەویش وەك داستانی عیساو مەریەم پڕە لەدانایيو حیکمەتو کەراماتی ئەولیاو بەهرەکانی دۆستانی خودا. ئەمە کورتەیەکیەتی: پادشایێ دەبێ، ناوی دەقیانووس دەبێ، گەلێکی بتپەرستی دەبێ، خۆی ستەمکارو گەلەکەی لاسار دەبێ، کۆمەڵێ لاوی لەخودا ترسی خوداناس لەدەست زوڵمو زۆری پادشاو لەتاو تاوانی گەلەکەی هەڵدێنو لەشوێنێکا خۆیان حەشار دەدەن، جا لەناو خۆیانا راوتەگبیر دەکەنو دەڵێن: وا ئێمە لەمانە

کەنارەمان گرت، ئیتر روو ناکەینەوە ناویان، کەواتە رووبکەنە ئەشکەوتێ، تا خودا رەحمەتی خۆیتان بەسەردا پەخش بکاتەوەو مایەی ئاسایش و هۆی ئەنجامی خێرتان بۆ بسازێنێ، ئیتر پەنا دەبەنە بەر ئەشکەوتێ و لەوێ لەخودا دەپاڕێنەوە کەپەنایان بداو لەدەستی ستەمکارو میللەتی بۆگەنی بتپەرست قوتاریان بکا. جا خودا نزاکەیان گیرا دەکاو لەو ئەشکەوتەدا چەن ساڵێکی زۆر خەویان لێ دەخاو لە سەر ئەو حاڵە دەمێننەوە، سەگێکیان دەبێ لەبەردەرگای ئەشکەوتەکەدا هەردوو باسکی رادەخاو لەسەردەم لەحاڵەتی ئامادەیی دا رادەکشێ و پاسیان دەکا، نەوەکوو دڕندەوشتی وا بچێ بیان خوا. لەو ماوەیەدا فریشتەی خودا لەشیان ئەم دیوەو دیودەکەن، هەتا نەڕزێن، تا لە ئەنجامدا خودا لەوخەوە خەبەریان دەکاتەوە.. تاد.

مەبەستم لەم تەفسیرە دوورو درێژە، کەلەسەرچاوەی زۆر رۆشن هەڵیم هێنجاوە ئەم خاڵە گرنگەیە: ـ

وەلیێ ـ واتە: دۆستی نزیکی بارەگای خوداوەندی ـ هەیەو هەقە. ئەویش ناگا بەوپایە بەرزو بڵندە مەگەر بەهەوڵێکی زۆرو بەتاعەتێکی جوان. کەراماتی ئەولیاو بەهرەی دۆستانی خودا هەقەو راستە، کەبرێتی یە لەڕوودانی هەندێ کاری نائاسایی لەسەر دەستی پیاوچاکاندا، بەبێ بەکارهێنانی هۆی ئاشکرای ئاسایی! وەك ئەم رووداوانەی لەم فەرموودانەی دواوە دێن.

چونکە هەندێ ناشارەزایی بارەگای خوداوەندی ـ هەیەو هەقە. ئەویش ناگا بەوپایە بەرزو بڵندە مەگەر بە هەوڵێکی زۆرو بەتاعەتێکی جوان. کەراماتی ئەولیاو بەهرەی دۆستانی خودا هەقەو راستە، کەبرێتی یە لەڕوودانی هەندێ کاری نائاسایی! وەك ئەم رووداوانەی لەم فەرموودانەی دواوە دێن.

چونکە هەندێ ناشارەزایی وشکی دڵتاریکی کورتبینی تەنگە جیقڵدان پەیدا بوون، ئەقڵەکوێتی خۆیان کردووە بەپێشڕەوو پێشەوای خۆیان، هەرچی رێکی هۆشی نەخۆشی ئەوان نەبێ باوەڕیان پێی نییە، گوایە بەخێرێ دەیانەوێ دین لەپڕو پووچ و هەلەق مەلەق پاك بکەنەوەو بیبەنەوە سەر بناغە ساخە راست و دروستەکەی جارانی سەردەمی حەزرەت و یارانی..!

لەبەرئەوە هەوڵ و کۆشش و تەقەللایەکی زۆری بۆ وچان دەدەن کەبیبەنە مێشکی ئەو خەڵکەوە کە هەرچی هۆیەکی ئاشکراو سەبەبێکی ظاهیری نەبێ درۆیەو دوورەلەدین و قسەی پڕو پووچ و ئەفسانەو مەفسانەیە!

من خۆم - بەش بەحاڵی خۆم - باوەڕم بەزۆری ئەو گوتی گوتی و قیل و قال و هەقایەتە بێ هێزو لاوازانە نییە کەلەناو ڕەشەخەڵکەکەدا بڵاوبوونەتەوە، ئەوانەیش دەبێ بەهێمنی و بەهێدی لەبیر ئەو خەڵکە ببرێتەوە، بگرە دەبێ لەشوێنی ئەو دڕکانە گوڵ بنێژرێ، تابۆشایی لە دڵ و دەروونی خەڵکەکەدا نەبێ!

لەڕاستی دا گەلێ لەو داستان و هەقایەتە بێ سەنەدانەی کەلەناو کتێبی وەعزو ئامۆژگاری دا هەن، لەوێنەی ئەم داستان و چیرۆك و شانۆو نواندن و فیلمانەوان، کەلەم ڕۆژگارەی ئێمەدا دەنوێنرێن و بڵاو دەکرێنەوە، لەبەرئەوە زۆربەیان ڕەوشتی جوان دەبینن!

بەڵام خوا هەقە دین دینە، جیایە لەیاسای جیهانی و فڕوفێڵی سیاسی و بەرنامەی ڕەشەخەڵك خەڵەتێن و قسەی بێ سەرو بەر، دین بەرنامەیەکی خودایییە، زەمان و مەکان و ئینسان طەی ی دەکا، وەلێ ئیلغایان ناکا، گەلێ یاساو دەستوور لە دین دا مەبەست سوودی مرۆڤە، هەیە مەبەست لێی ناسینی خودایە، هەیە مەبەست لێی تاقی کردنەوەی پلەی یەقین و باوەڕی باوەڕدارانە، زۆر لەوشتانەی کەبەدیمەن لەگەڵ هۆش و زانستدا ناگونجێن لەم بابەتەن.

دەی کەواتە بۆچی دەبێ کەراماتی ئەولیا خورافات بێ، چونکە ئەقڵی هەندێ کەم ئەقڵ قبوڵی ناکاو وەری ناگرێ.

باشە دووسەد ساڵێ لەمەوبەر کێ بڕوای دەکرد کە ئەم هەموو کەرامات و خەواریقولعاداتە لەسەر دەستی مام کارەبادا روو بدات و ئەدیسۆن ناوێ پەیدا دەبێ سەر رووی زەوی - بەواتای وشە - دەگۆڕێ و ئەوەی دەیکا بەهۆی دوو تەلی باریکەوە بەدێوەکانی حەزرەتی سولەیمانیش ناکرێ، کێ بڕوای دەکرد کەکێوی ئاسن بفڕێ، کەروێشك لەژێر پێی کیسەڵێکی قاوغداری بێ ڕۆحی چوار بێچکەدار دەرنەچێ! کێ بڕوای دەکرد کەعیلم ئاوا پێش بکەوێ و ببێ بە ڕەسوولی عەصرو ئەم هەموو کەشف و کەرامات و غەرائیب و عەجایبەی لەسەر دەستا ڕووبدا!!

دەی برا! بۆ لەتۆ وایە کەدینیش وەك ریاضیاتو ئەندازەو جەبرو لۆغارتیماو مەنطیقو فەلسەفە، برێتی یە لەچەند یاساو دەستوورو پرۆگرامێکی وشكو برینگی زانستی ی رووت، کەبەهیچ جۆرێ پەیوەندی بەسۆزی دڵو عاتیفەو هەستو نەستی دەروونەو نەبێ!

بەم قسەیە بێ دەبێ نوێژکەریش کەنوێژ دەکا دەق وەك ئەو سەربازە وابێ، کە بەزەبری قەمچی عەریفەکەی مەشقی یەسیەمو چەپراست دەکا.

یارێك وەك بێگارکەر، ئەرکە ئایینی یە پیرۆزەکەی سەرشانی خۆی بە سوخرەو بێگار دەزانێ.نەکا کە برا! وانییە، گەرچی وەك خەسووم، رەحمەتی خودای لێ بێ، دەیگوت: ئەمە نوێژ نییە کەئێمە دەیکەین، ئەمە تفەنگ نانە بەتاریکی یەوە، لەگەڵ ئەمەیشا نوێژو رۆژوو تاعەتی خودا سوخرەو بێگارنین، نوێژ نوورە، رووناکی چاوە، خۆراکی گیانە، ئارامی دڵە، سۆمای بینایی یە، هێزی ئەژنۆیە، مایەی گەیشتنە بەپلەی باوەڕی تەواو، سەرم لەکاری ئەو کەسە سووڕ دەمێنێ کەچل شەو نوێژێکی جوانی ڕێكو پێك بۆ خودای خۆی دەکا کەچی بەری چاوی دڵی رۆشن نابێتەوە! یان وەك فریشتە بەرەو کابە باڵ ناگرێتەوە!

هەروا هەموو ئەرکە ئایینیەکانی تر دەبن بەمایەی حەوانەوەی رۆحو حەسانەوەی مێشكو ئارامی دڵو دامەزراندنی دەروونو شادبوون بەڕەزای خودای گەورەو پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست - دروودی خوای لەسەربێو لەسەر ماڵو منداڵو هەستو نەست بە قوربانی گەردی پیرۆزی بێ - وەلێ لەگەڵ ئەمەیشا، تاعەتی خودا هەرچۆنێ بێ باشە، چونکە خودا یاربێ، زوو یادرەنگ فریای خاوەنەکەی دەکەوێ، کەم یا زۆر بەهرەمەندی دەکا!

بەڵێ نوێژو رۆژوو حەجو زەکاتو تاعەتی خودا ئەگەر بەرە بەرە مرۆڤی لەخودا نزیك کردەوە ئەوە خواپەرستیو عیبادەتن، دەنا ئەوە خۆپەرستیو عادەتن!

دەی باشە مەلا نووری! تۆ خۆت بۆ وا لەخودا دووری؟!قاعیدەیەکی ئوصولی هەیە دەفەرموێ: موتەکەللیم موشموول نییە بە قسەی خۆی دەقاو دەق دەمە تۆی! بۆیە وا بێ بەروبۆی!

وەڵێ خوا هەقە مادام قسەکانت ڕێکی شەریعەتی خودایەو خوا حەزکا دەبێ بەچاو ڕۆشنکەرەوەی دڵو دەروونی موسوڵمانان، مادەم وایە قسەکانت ڕەوایە لەسەر سەرو چاوانە، سا بەشکوو بەهۆی نزای خوێنەرێکی خودا پێداوەوە خودا ڕەحم بەحاڵی شڕت بکاو لە ماددیات دوورت بخاتەوەو بەرەو خودا بات پێ بداتەوە. ئامین

دڵنیام خوداپێداوانو پیاوچاکان هەتا لەخواد نزیکتربن، چالاکترو ئاسوودەترن، هەتا لەدونیاو ماديات نزيك بن دڵيان پەست دەبێ هەناسەيان سواردەبێ ماڵيان وێران دەبێ! ئاخ نووری! چەند کردارو گوفتارت لەیەك دوورن! ئەوە زیاتر لەچارەکە سەدەیەکە وای لەخزمەت ئەم فەرموودە گەلەدا، کەچی دڵە بەردە ئەستێکەت تائێسات شەوقی - تررووسکەیەکی نەبوو، بگرە ڕۆژ بەڕۆژ ڕەقترو سەختتردەبێ!

وەڵێ - بەهەرحاڵ - مەمنوونی خودا بە کەخەریکی ئەم کارە پیرۆزەیتو کردووتە بەپیشەی شەوو ڕۆژت، کەوایە هەقتە کەبەو خەڵکە دەڵێی:

چاو لەمن مەکەن، من کەندووی خاڵیم
وەڵێ ــ خوا هەقە - لەم دینە حاڵیم
خودا شایەتە، من دڵسۆزی تۆم
گەرچی بێ خێرم لەبۆ خودی خۆم
بزانن ئايين بەرنامەی خوایە
مایەی سەربەرزی هەردوو دنیایە
دینەکەی خۆمان ڕاستو ڕەوایە
لەکۆنا چۆن بوو ئێستایش هەر وایە !
ئەحکامی ئیسلام لەسەر تا پايين
گشتی بۆگشتە بەبێ جیایین
نموونەی زۆرە برایی ئايين
هێندێ لەوانەی کەزۆر ئاسايين
وەک نوێژو ڕۆژوو، وەک حەجو زەکات
کەفەرزە گشت کەس وەکوو یەک بیکات

جیـــاوازیی نییـــه بـــەپێی جێگـــەو کـــات
نـــەکاتی ناشـــتی، نـــەکاتی شـــکات!
مـــەرکەن مـــەردوم وەک کفنـــی ئیحـــرام
ئـــاوا یەکســـان بـــێ بەشـــەرعی ئیســـلام!
گـــەر پێمـــان ببـــڕێ یـــەک لـــۆ کفنـــی خـــام
لەگـــەڵ ئیمانـــا، تـــۆ بڵـــێ: پاشـــام
بـــەش بـــەحاڵی خـــۆم بڵـــێم بـــەبرام
نایگـــۆڕمـــەوە بەپاشـــایی شـــام
یـــەک دەم لـــەحاڵی بـــەزمی دەروێشـــان
گـــەر خـــوداو راســـان دڵ کابـــە نیشـــان
حەوت پەردەی تاریک طەی دەکا وەک خـۆر
دەبـــێ بەپادشـــا، دارای مـــوڵکی زۆر!

(وەرگێڕ)

١/١٥٠٣-٥٥٦/ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) (أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا أُنَاسًا فُقَرَاءَ وَأَنَّ النَّبِيَّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَالِثٍ وَإِنْ أَرْبَعٌ فَخَامِسٌ أَوْ سَادِسٌ وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلَاثَةٍ فَانْطَلَقَ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعَشَرَةٍ قَالَ فَهُوَ أَنَا وَأَبِي وَأُمِّي فَلَا أَدْرِي قَالَ وَامْرَأَتِي وَخَادِمٌ بَيْنَنَا وَبَيْنَ بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ تَعَشَّى عِنْدَ النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ لَبِثَ حَيْثُ صُلِّيَتْ الْعِشَاءُ ثُمَّ رَجَعَ فَلَبِثَ حَتَّى تَعَشَّى النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَاءَ بَعْدَ مَا مَضَى مِنْ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللَّهُ قَالَتْ: لَهُ امْرَأَتُهُ وَمَا حَبَسَكَ عَنْ أَضْيَافِكَ أَوْ قَالَتْ: ضَيْفِكَ قَالَ: أَوَمَا عَشَّيْتِيهِمْ قَالَتْ: أَبَوْا حَتَّى تَجِيءَ قَدْ عُرِضُوا فَأَبَوْا قَالَ فَذَهَبْتُ أَنَا فَاخْتَبَأْتُ فَقَالَ: يَا غُنْثَرُ فَجَدَّعَ وَسَبَّ وَقَالَ كُلُوا لَا هَنِيئًا فَقَالَ: وَاللَّهِ لَا أَطْعَمُهُ أَبَدًا وَايْمُ اللَّهِ مَا كُنَّا نَأْخُذُ مِنْ لُقْمَةٍ إِلَّا رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرُ مِنْهَا قَالَ: يَعْنِي حَتَّى شَبِعُوا وَصَارَتْ أَكْثَرَ مِمَّا كَانَتْ قَبْلَ ذَلِكَ فَنَظَرَ إِلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ فَإِذَا هِيَ كَمَا هِيَ أَوْ أَكْثَرُ مِنْهَا فَقَالَ: لِامْرَأَتِهِ يَا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ مَا هَذَا قَالَتْ لَا وَقُرَّةِ عَيْنِي لَهِيَ الْآنَ أَكْثَرُ مِنْهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِثَلَاثِ مَرَّاتٍ فَأَكَلَ مِنْهَا أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنْ الشَّيْطَانِ يَعْنِي يَمِينَهُ ثُمَّ أَكَلَ مِنْهَا لُقْمَةً ثُمَّ حَمَلَهَا إِلَى النَّبِيّ(صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمٍ عَقْدٌ فَمَضَى الْأَجَلُ فَفَرَّقَنَا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا مَعَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أُنَاسٌ اللَّهُ أَعْلَمُ كَمْ مَعَ كُلِّ رَجُلٍ فَأَكَلُوا مِنْهَا أَجْمَعُونَ).

وفي رواية: (فَحَلَفَ أَبو بكر لا يطعمه، فحلفت الْمَرْأَةُ لَا تَطْعَمُهُ حَتَّى يَطْعَمَهُ فَحَلَفَ الضَّيْفُ أَوْ الْأَضْيَافُ أَنْ لَا يَطْعَمَهُ أَوْ يَطْعَمُوهُ حَتَّى يطْعَمَهُ فقَالَ أَبُو بَكْرٍ كَأَنَّ هَذِهِ مِنْ الشَّيْطَانِ فَدَعَا بِالطَّعَامِ فَأَكَلَ وَأَكَلُوا فَجعَلُوا لَا يَرْفَعُونَ لُقْمَةً إِلَّا رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرُ مِنْهَا فَقَالَ يَا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ مَا هَذَا فَقَالَتْ وَقُرَّةِ عَيْنِي إِنَّهَا الْآنَ لَأَكْثَرُ قَبْلَ أَنْ نَأْكُلَ فَأَكَلُوا وَبَعَثَ بِهَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ أَنَّهُ أَكَلَ مِنْهَا).

وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَّ أبابكر قَالَ: لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ دُونَكَ أَضْيَافَكَ فَإِنِّي مُنْطَلِقٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَافْرُغْ مِنْ قِرَاهُمْ قَبْلَ أَنْ أَجِيءَ فَانْطَلَقَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَأَتَاهُمْ بِمَا عِنْدَهُ فَقَالَ اطْعَمُوا فَقَالُوا أَيْنَ رَبُّ مَنْزِلِنَا قَالَ اطْعَمُوا قَالُوا مَا نَحْنُ بِآكِلِينَ حَتَّى يَجِيءَ رَبُّ مَنْزِلِنَا قَالَ اقْبَلُوا عَنَّا قِرَاكُمْ فَإِنَّهُ إِنْ جَاءَ وَلَمْ تَطْعَمُوا لَنَلْقَيَنَّ مِنْهُ فَأَبَوْا فَعَرَفْتُ أَنَّهُ يَجِدُ عَلَيَّ فَلَمَّا جَاءَ تَنَحَّيْتُ عَنْهُ فَقَالَ مَا صَنَعْتُمْ فَأَخْبَرُوهُ فَقَالَ يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَسَكَتُّ ثُمَّ قَالَ يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَسَكَتُّ فَقَالَ يَا غُنْثَرُ أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ إِنْ كُنْتَ تَسْمَعُ صَوْتِي لَمَّا جِئْتَ فَخَرَجْتُ فَقُلْتُ سَلْ أَضْيَافَكَ فَقَالُوا صَدَقَ أَتَانَا بِهِ قَالَ فَإِنَّمَا انْتَظَرْتُمُونِي وَاللَّهِ لَا أَطْعَمُهُ اللَّيْلَةَ فَقَالَ الْآخَرُونَ وَاللَّهِ لَا نَطْعَمُهُ حَتَّى تَطْعَمَهُ قَالَ لَمْ أَرَ فِي الشَّرِّ كَاللَّيْلَةِ وَيْلَكُمْ مَا أَنْتُمْ لِمَ لَا تَقْبَلُونَ عَنَّا قِرَاكُمْ هَاتِ طَعَامَكَ فَجَاءَهُ فَوَضَعَ يَدَهُ فَقَالَ بِاسْمِ اللَّهِ الْأُولَى مِنْ الشَّيْطَانِ فَأَكَلَ وَأَكَلُوا) متفق عليه.

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر ـ کەناسناوی ئەبو موحەممەدە ـ (ڕەزای خودا لەخۆیو لەبابی بێ) فەرمووی: دانیشتوانی میوانخانەی صوففە مەردومگەلێکی هەژار بوون، جارێ پێغەمبە (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی نانی دوو کەسی هەیە بایەکێ لەم میوانانە لەگەڵ خۆی بباتەوەو بیکا بەسێهەمیان، هەروا ئەوەی نانی چوارکەسی هەیە باپێنج هەمێ لەگەڵ خۆی بباتەوە، ئیتر ئەبو بەکریش (ڕەزای خوای لێ بێ) سێ کەسی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆماڵەوە، پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەر بێ) دە کەسی لەگەڵ خۆی بردەوە، بەڵام ئەبوبەکر خۆی چووە بۆلای حەزرەتو لەلای ئەو شێوی کردەوە، لەوێ مایەوە هەتا لەخزمەتیدا نوێژی خەوتنانی کردو ئەوجا هاتەوە بۆماڵەوە، کەهاتەوە ئەوەندەی خودا مەیلی لەسەر بوو لەشەو ڕابووردبوو، جا ژنەکەی پێی گوت: بۆچی درەنگ هاتیتەوە بۆلای میوانەکانت؟ ئەویش

بەدایكمی فەرمووو: بۆچی هەتا ئێستا شێوت بۆ دانەناون؟ دایكیشم فەرمووی: خولكیان كردن كەنانیان بۆ دابنێن بەلام رازی نەبوون تا خۆت نەیەیتەوە، عەبدوڕەحمان فەرمووی: منیش لەترسی باوكم چووم خۆمم شاردەوە. هەتا ئەبو بەكر گازی كردمو فەرمووی خوێری ئەوە لەكوێی؟ ئەی لچو لێوت بكرێ، ئەی والێكراو! ئەوە بۆ نانت بۆ ئەم میوانانە دانەناوە؟ جا كەلەحاڵەكە حاڵی بوو بەمیوانەكانی فەرمووو: دەبخۆن، بەنۆشی گیانتان نەبێ، دیارە سووچی خۆتان بووە، سا بەو خودایە من بەهیچ جۆرێ نابێ من لێی بخۆم، عەبدوڕەحمان فەرمووی: شتێكی سەیر رووی دا، بەهەقی خودا، هەر پارووپەكمان لە خواردەمەنی یەكە هەڵ دەگرت لەبن پارووەكەوە بەرز دەبۆوەو پتر زۆر دەبوو، ئیتر هەروا هەتا تێرمان خوارد، كەچی نانەكە زیادی كردبوو، كەمی نەكردبوو، ئەبو بەكریش بەوردی سەرنجی ئەم حاڵەی داو فەرمووی بەدایكم: ئەرێ كچەكەی بەنی فیراس! ئەوە چییە؟ دایكیشم فەرمووی: منیش وەك تۆی لێ دەزانم، بەلام بەوەی كەبووە بەمایەی ئەم چاوو دڵ رۆشنی یەم نانەكە ئێستا سێ قاتی پێشتری یەتیو لەپیتو فەڕی تۆو میوانەكانتەوە خودا بەرەكەتی تێ خستووە، لەبەرئەوە ئەبو بەكریش (رەزای خوای لێ بێ) سوێندەكەی خۆی شكاندو تیكەیەكی، بۆ مووفەڕكی لەو نانە مووفەڕكە خواردو فەرمووی: دیارە ئەو سوێندەی كە خواردم لەم نانە نەخۆم ئەوە لەشەیتانەوە بوو، چونكە نانی پیرۆزی وا حەیفە مرۆڤ لێی نەخوا، ئەوجا قەرەوانەكەی بەخواردەمەنییەكەوە هەلگرتو بردی بۆ خزمەت پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) لەوێ دایان نا بۆ بەیانی، عەبدوڕەحمان فەرمووی: لەوەپێش لەنێوانی هۆزێكی تردا پەیمانێ هەبوو ماوەی پەیمانەكەمان تەواو بوو بوو سوپاكە، كەهاتنەوە بۆ مەدینە حەزرەت (درووودی خوای لەسەر بێ) كردنی بەدوازدە بەشەوە، هەربەشێ لەو سوپایە سەركردەیەكی بۆ دانا، هەر سەركردەیێ مەگەر خودا بۆخۆی بزانێ چەن كەسی لەگەڵ دا بوو، لەسەرەتاوە بە بەرەكەتی ئەبو بەكری صەدیقو لەدوایی دا بەپیرۆزی حەزرەت (درووودی خوای لەسەر بێ) بەرەكەتێكی ئاشكرای وای تێ كەوت بەشی ئەو هەموو سوپایەی كردو ئەوانیش گشتیان لێیان خواردو بەشی كردن؟

لەگێڕانەوەیەكی بوخاریدا: فەرمووی: جا ئەبو بەكر سوێندی لێ خوارد كەلێی نەخواتو ژنەكەیو هەروا میوانەكان سوێندیان خوارد كە لێی نەخۆن تا ئەبوبەكر

لێی نەخوات، جا ئەبوبەکر فەرمووی: ئەمە لەشەیتانەوەیە ئیتر بانگی کرد نانەکەیان هێناو خۆی لێی خواردو ئەوانیش نانی تەواویان خوارد، کەچی هەموو جارێ لە ژێر پاروەکەی ئەوانەوە تێی دەزایەوەو جار لەگەڵ جاردا پتر تر دەبوو. بۆیە باوکم بەدایکمی فەرموو: ئەرێ کەنیشکەی بەنی فیراسی؟ ئەمە چییە؟ گوتی: بەبینایی چاوم، ئێستا نانەکە لەجارانی پترەو کەلێمان نەخواردو ئەوجا ئەبو بەکر ناردی بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) عەبدورەحمان فەرمووی: جا حەزرەتیش لێی خوارد.

لەگێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا: ئەبوبەکر بەئەورەحمانی فەرموو: ئاگات لەمیوانەکانت بێ من ئیشی خۆم هەیە دەچمەوە بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) هەقتان بەسەر هاتنەوەی منەوە نەبێ، تۆ میوانەکان دابکەو نانی خۆتان بخۆن، جا عەبدورەحمان دەچێ چی خودا دابووی بۆیان دەهێنێ‌و بۆیان دادەنێ‌و فەرموویان لێ دەکاو دەفەرموێ: بفەرموون، شیوەکەتان بخۆن گوتیان: ئەی خاوەن ماڵ خۆی لەکوێ یە؟ ئەی کوا خانە خوێکەمان؟ دەفەرموێ: ئێوە نانی خۆتان بخۆن هەقتان بەسەر ئەوەوە نەبێ، وەلێ گوتیان: شتی وا ناکەین‌و نان ناخۆین تا ئەو نەیەتەوە، ئەویش گوتیەوە: ئێوە نانی خۆتان بخۆن، چونکە کەهاتەوە، ئێوە نانتان نەخواردبێ، ئەو لەئێمە توورە دەبێ‌و ئێمە تووش دەبین بەدەستیەوە، وەلێ میوانەکان قایل نەبوون. منیش زانیم کەهاتەوە لەسەر من زیز دەبێ، لەبەرئەوە کەهاتەوە لێی دوور کەوتمەوە، فەرمووی: میوانەکان نانیان خوارد؟ گوتیان: حاڵەکە ئاوا بوو، ئەویش فەرمووی: هۆ عەبدورەحمان! بۆ جاری دوەم فەرموویەوە: هۆ عەبدورەحمان، هەر وەڵامم نەدایەوەو دەنگم نەکرد، هەتا فەرمووی: بۆچی چرکە ناکەی؟ تو خودا ئەگەر گوێت لەدەنگمە وەرە بۆئێرە، منیش لەحەشارگاکەم دەرچووم‌و عەرزیم کرد: لەمیوانەکانت بپرسە، ئایا سووچی من لەمەدا هەیە؟ گوتیان: راست دەکا، نانی بۆ هێناین. فەرمووی: کەوابێ چاوەڕوانی هاتنەوەی من بوون، دەسا بەو تاقە خودایە نابێ ئەم شەو تامی بکەم، ئەوانیش گوتیان: دەسا بە خودا ئێمەیش نان ناخۆین، تا تۆ نەخۆی، فەرمووی: خانەخراپینە! دە نانەکەتان بخۆن، ئاخر ئێوە میوانن هەقی خۆتان لەسەرمانە، ئادەی ئەورەحمان نانەکەت بێنە، ئەویش نانەکەی هێناو بۆی دانان‌و ئەبو بەکر دەستی بۆی بردو فەرمووی:

بەناوی خودا، دەی بفەرموون، ئەوەی پێشوو لەختەدان و وەسوەسەی شەیتانەوە بوو، بۆیە ئەو سوێندەم خوارد، جا هەم ئەبو بەکر خواردی و هەم میوانەکان. (ش = ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم. رەزای خودای گەورەیان لێ بێ و لەبەر خاتری نازەنینی و نازداریی ئەوان خودا بەڕەحمەتی خۆی ڕەحم بەحاڵی شڕی ئێمەیش بکا).

٢/١٥٠٤-٥٥٧/ وعن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ (لقد كان فيما قبلكم من الأمم ناس محدثون، فان يك في أمتي أحد فإنه عمر) رواه البخارى، ورواه المسلم من رواية عائيشة، وفي روايتها قال ابن وهب: محدثون: أي ملهمون. [٥٣٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپێشینان، لەنەتەوەکانی پێش ئێوە کەسانێ هەبوون بەتایبەتی لەنەوەی ئیسرائیل، لەگەڵ ئەوەدا کە پێغەمبەر نەبوون، بەڵام قسەیان ڕاست دەردەچوو، وەك خودا بیخاتە ناو دڵیان، یا فریشتە قسەیان بۆ بکا ئاوا، دەی لەناو ئۆمەتی منیش دا لەم جۆرە خوا پێداوانە دەبن، وە یەکێکیش لەوانە عومەری کوڕی خەطابە (م/ب). ئیبنو وەهب دەفەرموێ: وشەی (موحەددەثوونە) واتە: (مولهەموونە) یانی کەسانێ کەخودا لەشت حاڵیان دەکاو گەلێ شت دەخاتە ناو دڵیانەوە، وەك وەلی و پیاو چاك و نزیکانی بارەگای خوداوەندی. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم فەرموودەیە سوود لەتاج وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

٣/١٥٠٥-٥٥٨/ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: (شَكَا أَهْلُ الْكُوفَةِ سَعْدًا يعني ابن أبي وقاص رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ إِلَى عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَعَزَلَهُ وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ عَمَّارًا فَشَكَوْا حَتَّى ذَكَرُوا أَنَّهُ لَا يُحْسِنُ يُصَلِّي فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَقَالَ يَا أَبَا إِسْحَاقَ إِنَّ هَؤُلَاءِ يَزْعُمُونَ أَنَّكَ لَا تُحْسِنُ تُصَلِّي قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ أَمَّا أَنَا وَاللَّهِ فَإِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي بِهِمْ صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَخْرِمُ عَنْهَا أُصَلِّي صَلَاةَ الْعِشَاءِ فَأَرْكُدُ فِي الْأُولَيَيْنِ وَأُخِفُّ فِي الْأُخْرَيَيْنِ قَالَ ذَاكَ الظَّنُّ بِكَ يَا أَبَا إِسْحَاقَ فَأَرْسَلَ مَعَهُ رَجُلًا أَوْ رِجَالًا إِلَى الْكُوفَةِ فَسَأَلَ عَنْهُ أَهْلَ الْكُوفَةِ وَلَمْ يَدَعْ مَسْجِدًا إِلَّا سَأَلَ عَنْهُ وَيُثْنُونَ مَعْرُوفًا حَتَّى دَخَلَ مَسْجِدًا لِبَنِي عَبْسٍ فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ أُسَامَةُ بْنُ قَتَادَةَ يُكْنَى أَبَا سَعْدَةَ قَالَ أَمَّا إِذْ نَشَدْتَنَا فَإِنَّ سَعْدًا كَانَ لَا

---

[٥٣٣] بوخاری (٣٦٨٩).

يَسِيرُ بِالسَّرِيَّةِ وَلَا يَقْسِمُ بِالسَّوِيَّةِ وَلَا يَعْدِلُ فِي الْقَضِيَّةِ قَالَ سَعْدٌ أَمَا وَاللَّهِ لَأَدْعُوَنَّ بِثَلَاثٍ اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ عَبْدُكَ هَذَا كَاذِبًا قَامَ رِيَاءً وَسُمْعَةً فَأَطِلْ عُمْرَهُ وَأَطِلْ فَقْرَهُ وَعَرِّضْهُ بِالْفِتَنِ وَكَانَ بَعْدُ إِذَا سُئِلَ يَقُولُ شَيْخٌ كَبِيرٌ مَفْتُونٌ أَصَابَتْنِي دَعْوَةُ سَعْدٍ قَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ بن عمير الراوي عن جابر بن سمرة فَأَنَا رَأَيْتُهُ بَعْدُ قَدْ سَقَطَ حَاجِبَاهُ عَلَى عَيْنَيْهِ مِنْ الْكِبَرِ وَإِنَّهُ لَيَتَعَرَّضُ لِلْجَوَارِي فِي الطُّرُقِ يَغْمِزُهُنَّ). متفق عليه.[٥٣٤]

جابیری كوڕی سەموورە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خەڵكی كووفە لەلای عومەری كوڕی خەطاب، سكاڵایان لەسەعدی كوڕی ئەبو وەقاص كرد، ئەویش لەسەركار لایبردو عەمماری كوڕی یاسیری كرد بە سەركاریان. سكاڵایەكی زۆریان لێ كرد تەنانەت دەیانگوت: نازانێ نوێژیش بەجوانی بكا، ئیتر عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) ناردی بە شوێنی داو گوتی: ئەی ئەبو ئیسحاق! ئەمانە دەڵێن: گوایە تۆ هەتا نوێژیش بەجوانی نازانی بكەی! ئەویش فەرمووی: وەڵێ بەخودا من زۆر بەجوانی بەرنوێژیم بۆ دەكردن، ڕێك وەك بەرنوێژیكردنی حەزرەت خوای كەبۆ ئێمەی دەكرد، یەك دەنكم لێ كەم نەدەكردەوە، كەنوێژی شێوان‌و خەوتنان دەكەم لەڕكاتی یەكەم‌و دوەمیاندا بەدوورو درێژی دەوەستم‌و فاتیحا دەخوێنم‌و لەپاش فاتیحا قورئانێكی زۆر دەخوێنم، وەڵێ لەڕكاتەكانی تریاندا قورئانخوێندنی پاش فاتیحا كورت دەكەمەوە، عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی باوكی ئیسحاق! ئەوە بیروباوەڕی هەموو كەسێكە بەتۆ، كە ئاوا بەجوانی نوێژ بكەی. جا بۆ دڵنیایی، پیاوێ ـ یا چەند پیاوێكی ـ لەگەڵ سەعددا نارد بۆ كووفە، كەلەبارەی سەعدەوە لەخەڵكی كووفە بپرسن، ئەویش مزگەوت نەما لەكووفە لەبارەی سەعدەوە پرسیاریان لێ نەكا، هەموو تاریفی سەعدیان دەكردو پەسنی جوانیان دەكرد، هەتا گەیشتنە مزگەوتەكەی بەنی عەبس، لەوێ پیاوێكیان هەڵسا، ناوی ئوسامەی كوڕی قوتادە بوو كەسناوی ئەبو سەعدەبوو، هەستا گوتی: چونكە داوای شایەتیمان لێ دەكەی، دەسا من ئاگام لێ بێ سەعد ئەم سێ خراپەی هەبوو: سەعد لەسوپا خۆی دەدزیەوەو نەدەچوو بۆ غەزا،دوەم: لەخەڵات بەخشینیشدا تالانی‌و شتی وای بەیەكسان دابەش نەدەكردو خۆمانە خۆمانەی دەكرد، سێیەم: لەدادپرسی‌و

---

[٥٣٤] بوخاری (٧٥٥)و موسلیم (٤٥٣).

موحاكەمـەيش دا دادپـەروەر نـەبوو، سـەعديش فـەرمووى: دەى واى لىٰ هـات دەسـا بەخودا منيش ئەم سىٰ نزايەت لىٰ دەكـەم، هـۆ خودايـە! ئەگـەر ئـەم بەندەيـەى تـۆ درۆزنەو درۆ دەكاو ئـەم قسانەى بۆرِيايى دەكاو بۆ چاوەرِوو‌پايى هەڵساوە، ئـەوا تـۆ تۆڵەى منى لىٰ بستێنەو لـەباتى ئـەم سىٰ بوختانـە تووشى ئـەم سىٰ سـزايەى بكـە: يەكـەم: تەمـەنى درێـژ كـە، دووەم: بەدرێـژايى تەمـەنى هـەژاربىٰ، سـێيەم: تووشـى ئاژاوەشى بكە. ئيتر رێك نزاكەى سەعدى لىٰ گيرابوو، لەوەدوا كە لەئەبوسـەعدەيان دەپرسى: چۆنيت؟ دەيگوت: پيرەمێرديكى دێوانەو شـێتۆڵكەم نـزاى سـەعدى كـورِى ئـەبو وەققاصـم لىٰ گيرابـووە عەبدولمـەليكى كـورِى عومـەير - كـە لـەجابيرى كـورِى سـەموورەوە (رەزاى خودايان لىٰ بىٰ) ئـەم داسـتانە دەگێرِێتـەوە، دەفـەرمووىٰ: لـەوەدوا مـن ئـەو كابرايەم دەدى، لەبەر پيريى برۆكانى بەسەرچاوەكانى دا شۆرِ بوو بوونـەوە كەچـى هێشـتا رِێگـەى بـەكچو كـەنيزەك دەگـرتو چـرِنووكى لىٰ دەگـرتن! (ش - رەزاى خودايان لىٰ بىٰ).

٤/١٥٠٦-٥٥٩/ عن عروة بن الزبير ان سعيد بن عمـرو بـن نفيـل ﷺ (خَاصَـمَتْهُ إِلَـى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ فَقَالَ سَعِيدٌ أَنَا كُنْتُ آخُذُ مِنْ أَرْضِهَا شَيْئًا بَعْدَ الَّذِي سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ وَمَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مَنْ أَخَذَ شِبْرًا مِنْ الْأَرْضِ ظُلْمًا طُوِّقَهُ إِلَـى سَبْعِ أَرَضِينَ فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ لَا أَسْأَلُكَ بَيِّنَةً بَعْدَ هَـذَا فَقَـالَ اللَّهُـمَّ إِنْ كَانَـتْ كَاذِبَـةً فَعَـمِّ بَصَرَهَا وَاقْتُلْهَا فِي أَرْضِهَا قَالَ فَمَا مَاتَتْ حَتَّى ذَهَبَ بَصَرُهَا ثُمَّ بَيْنَا هِيَ تَمْشِي فِي أَرْضِـهَا إِذْ وَقَعَتْ فِي حُفْرَةٍ فَمَاتَتْ). متفق عليه.[٥٣٥]

عوروەى كورِى زوبەير فـەرمووى: ئـەرواى كچـى ئـەوس لـەلاى مـەرِوانى كـورِى حەكەم سكالاى لەسەعيدى كورِى زەيدى كورِى عەمرى كورِى نوفـەيل كـرد، كـەزاقى ئەوەى لىٰ دەدا كەسەعيد هەندىٰ زەوىو زارى لىٰ داگير كردووەو زەوتى كـردووە بـۆ خـۆى. سـەعيديش فـەرمووى: مـن دەچـم زەوى لـەو زەوت دەكـەم، لەسـەر ئـەو فەرمايشتەى حەزرەتدا كەلەم بارەيەوە فەرموويەتى: كەبەگوێى خۆم گوێم لىٰ بوو، مەروان گوتى: لەم بارەيەوە چيت لە حەزرەت (دروودى خواى لەسەر بىٰ) بيستووە؟ فـەرمووى:

---

[٥٣٥] بوخارى (٣١٩٨)و موسليم (١٦١٠) رقم (١٣٨) و (١٣٩).

له حەزرەتم بیست دەیفەرموو (درودی خوای لەسەر بێ): ئەوەی بستێ زەوی بەناهەق لەکەسێ زەوت بکا، لەڕۆژی ژینەوەدا بەهەر حەوت چینەی زەمینەوە وەك کەڵەمە دەکرێ بەتەوق‌و دەکرێتە ئەستۆی‌و جەبرو زەبری لێ دەکەن کە هەڵی بگرێ‌و بیگوێزێتەوە بۆسارای مەحشەر. مەروان گوتی: ئیتر لەسەر ئەم فەرموودەیەدا داوای بەڵگەی ترت لێ ناکەم! سەعید فەرمووی: خودایە! ئەم ژنە لەم دوایەیدا لەسەر من ئەگەر درۆ دەکا پێی بنوێنەو چاوی کوێرکەو لەناو ئەم پارچە زەوییەی خۆیدا، کەوا لەپاڵ زەوییەکەی مندا، بیکوژە! عوروە: فەرمووی: ئەروا نەمرد، هەتا کوێر بوو، جارێکیش لەناو زەوییەکەیدا دەگەڕێ، لەوکاتەدا دەکەوێتە کەندەڵانێکەوەو دەمرێ‌و خودا پێی دەنوێنێ (ش).

لەگێڕانەوەیەکی موسلیم دا (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: قسەبەر دەفەرموێ: من بەچاوی خۆم ئەم رەوایەم دیبوو، کوێر بوو بوو، بەلەپ کوتان‌و پەلە کوتێ بەپاڵ دیوارەکاندا دەڕۆیشت، گەڵێ جار بەدەمی خۆی دەیگوت: نزاکەی سەعید پێکاومی‌و گولۆڵەی کردم هەتا جارێ دەچێ بۆسەر بیرێ کەلەناو ئەو خانوو زەوی‌و زارەدا دەبێ. کەلەسەری شکات لە سەعید دەکا، ئاگای لەخۆی نابێ دەکەوێتە ناوی‌و دەمرێ‌و ئەو بیرە دەبێ بەگۆڕی.

٥/١٥٠٧-٥٦٠/ عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (لَمَّا حَضَرَ أُحُدٌ دَعَانِي أَبِي مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ مَا أُرَانِي إِلَّا مَقْتُولًا فِي أَوَّلِ مَنْ يُقْتَلُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَإِنِّي لَا أَتْرُكُ بَعْدِي أَعَزَّ عَلَيَّ مِنْكَ غَيْرَ نَفْسِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِنَّ عَلَيَّ دَيْنًا فَاقْضِ وَاسْتَوْصِ بِأَخَوَاتِكَ خَيْرًا فَأَصْبَحْنَا فَكَانَ أَوَّلَ قَتِيلٍ وَدُفِنَ مَعَهُ آخَرُ فِي قَبْرٍ ثُمَّ لَمْ تَطِبْ نَفْسِي أَنْ أَتْرُكَهُ مَعَ الْآخَرِ فَاسْتَخْرَجْتُهُ بَعْدَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ فَإِذَا هُوَ كَيَوْمِ وَضَعْتُهُ هُنَيَّةً غَيْرَ أُذُنِهِ). رواه البخاری.[٥٣٦]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کەغەزای ئوحود رووی دا، شەو باوکم ناردی بەشوێنماو فەرمووی: دڵم خەبەری داوە، وا دەزانم کە من یەکەم کەس دەبم لەیارانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کەلەم غەزایەدا دەکوژرێم، لەدوا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەتۆ ئازیزترم نییە، هەندێ قەرزم لەسەرە بۆمی بەرەوە،

---

[٥٣٦] بوخاری (١٣٥١). بڕوانە (٤/ ٢٠٢ ب ـ ١ ز ـ ٥٢ ل ، ١٨٦).

چاوی خێریشت لەخوشکەکانت بێو راسپێریم ئەوەیە بۆ تۆ کەباش بی بۆیان، ئیتر وەك خوای فەرمووی بۆبەیانی یەکەم کەس بوو کەشەهید بوو، شەهیدەکانی ئەم غەزایە زۆر بوون، لەبەرئەوە شەهیدێکی تریشم لەگۆڕەکەیدا لەگەڵی دا ناشت، دوایی دڵم بەرایی نەدا کە باوکم لەگەڵ یەکێکی تردا، لەیەك گۆڕدا بێ، جا لەپاش شەش مانگ چووم تەرمەکەیم لەگۆڕەکە دەرهێناو لەگۆڕێکی سەربەخۆدا ناشتمەوە، کەرامەتێکی سەیرم لێی دی، روانیم لەشی وەك خوای ماوە هیچ تێك نەچووەو نەگۆڕاوە، رێك وەك ئەو رۆژەی کەشەهید بوو، وەڵێ گوێچکەی کەلەرۆژی شەهید بوونیا کافرەکان کردبوویان هەر لەپێشدا نەمابوو (ب).

٦/١٥٠٨-٥٦١/ عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ (أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ النَبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَا مِنْ عِنْدِ النَبِيِّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ وَمَعَهُمَا مِثْلُ الْمِصْبَاحَيْنِ يُضِيئَانِ بَيْنَ أَيْدِيهِمَا فَلَمَّا افْتَرَقَا صَارَ مَعَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا وَاحِدٌ حَتَّى أَتَى أَهْلَهُ). رواه البخاري من طرق وفي بعضهما: أن الرجلين: أسيد بن حضير وعباد بن بشر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا).

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عەببادی کوڕی بیشر لەخزمەتی پێغەمبەردا دەبن هەتا شەو درەنگ دەبێ خەریکی قسەو گوفتو گۆ دەبن، شەوەکەشی شەوەزەنگ دەبێ، کەلەلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەردەچن سەرودار دەستیان بەدەستەوە دەبێ، ئیتر فەرمانی خودا داردەستی یەکێکیان دەبێ بەچراو رۆشنایی یان بۆ دەکاو، لەبەر شەوقەکەی دەڕۆن هەتا رێگەکەیان لەیەك جیا دەبێتەوە، ئەوجا داردەستی ئەوی تریشیان دەبێ بەچراو رۆشنایی دەکا بۆی، ئیتر هەرکەسەیان لەبەرشەوقی داردەستی خۆی دەڕوا تادەگاتەوە ماڵی خۆی (ب/ تاج).

٧/١٥٠٩-٥٦٢/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشَرَةً عَيْنًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَاصِمَ بْنَ ثَابِتٍ الْأَنْصَارِيَّ جَدَّ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْهَدَاةِ بَيْنَ عَسْفَانَ وَمَكَّةَ ذُكِرُوا لِحَيٍّ مِنْ هُذَيْلٍ يُقَالُ لَهُمْ بَنُو لِحْيَانَ فَنَفَرُوا لَهُمْ بِقَرِيبٍ مِنْ مِائَةِ رَجُلٍ رَامٍ فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ حَتَّى وَجَدُوا مَأْكَلَهُمْ التَّمْرَ فِي مَنْزِلٍ نَزَلُوهُ فَقَالُوا تَمْرُ يَثْرِبَ فَاتَّبَعُوا آثَارَهُمْ فَلَمَّا حَسَّ بِهِمْ عَاصِمٌ وَأَصْحَابُهُ لَجَئُوا إِلَى مَوْضِعٍ فَأَحَاطَ بِهِمْ الْقَوْمُ فَقَالُوا لَهُمْ انْزِلُوا فَأَعْطُوا بِأَيْدِيكُمْ وَلَكُمْ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ أَنْ لَا نَقْتُلَ

مِنْكُمْ أَحَدًا فَقَالَ عَاصِمُ بْنُ ثَابِتٍ أَيُّهَا الْقَوْمُ أَمَّا أَنَا فَلَا أَنْزِلُ فِي ذِمَّةِ كَافِرٍ ثُمَّ قَالَ اللَّهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا نَبِيَّكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَمَوْهُمْ بِالنَّبْلِ فَقَتَلُوا عَاصِمًا وَنَزَلَ إِلَيْهِمْ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ عَلَى الْعَهْدِ وَالْمِيثَاقِ مِنْهُمْ خُبَيْبٌ وَزَيْدُ بْنُ الدَّثِنَةِ وَرَجُلٌ آخَرُ فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ أَطْلَقُوا أَوْتَارَ قِسِيِّهِمْ فَرَبَطُوهُمْ بِهَا قَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ هَذَا أَوَّلُ الْغَدْرِ وَاللَّهِ لَا أَصْحَبُكُمْ إِنَّ لِي بِهَؤُلَاءِ أُسْوَةً يُرِيدُ الْقَتْلَى فَجَرَّرُوهُ وَعَالَجُوهُ فَأَبَى أَنْ يَصْحَبَهُمْ فَانْطُلِقَ بِخُبَيْبٍ وَزَيْدِ بْنِ الدَّثِنَةِ حَتَّى بَاعُوهُمَا بَعْدَ وَقْعَةِ بَدْرٍ فَابْتَاعَ بَنُو الْحَارِثِ بْنِ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلٍ خُبَيْبًا وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ قَتَلَ الْحَارِثَ بْنَ عَامِرٍ يَوْمَ بَدْرٍ فَلَبِثَ خُبَيْبٌ عِنْدَهُمْ أَسِيرًا حَتَّى أَجْمَعُوا قَتْلَهُ فَاسْتَعَارَ مِنْ بَعْضِ بَنَاتِ الْحَارِثِ مُوسًى يَسْتَحِدُّ بِهَا فَأَعَارَتْهُ فَدَرَجَ بُنَيٌّ لَهَا وَهِيَ غَافِلَةٌ حَتَّى أَتَاهُ فَوَجَدَتْهُ مُجْلِسَهُ عَلَى فَخِذِهِ وَالْمُوسَى بِيَدِهِ قَالَتْ فَفَزِعْتُ فَزْعَةً عَرَفَهَا خُبَيْبٌ فَقَالَ أَتَخْشَيْنَ أَنْ أَقْتُلَهُ مَا كُنْتُ لِأَفْعَلَ ذَلِكَ قَالَتْ وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ أَسِيرًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ خُبَيْبٍ وَاللَّهِ لَقَدْ وَجَدْتُهُ يَوْمًا يَأْكُلُ قِطْفًا مِنْ عِنَبٍ فِي يَدِهِ وَإِنَّهُ لَمُوثَقٌ بِالْحَدِيدِ وَمَا بِمَكَّةَ مِنْ ثَمَرَةٍ وَكَانَتْ تَقُولُ إِنَّهُ لَرِزْقٌ رَزَقَهُ اللَّهُ خُبَيْبًا فَلَمَّا خَرَجُوا بِهِ مِنْ الْحَرَمِ لِيَقْتُلُوهُ فِي الْحِلِّ قَالَ لَهُمْ خُبَيْبٌ دَعُونِي أُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ فَتَرَكُوهُ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فَقَالَ وَاللَّهِ لَوْلَا أَنْ تَحْسِبُوا أَنَّ مَا بِي جَزَعٌ لَزِدْتُ ثُمَّ قَالَ اللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَدًا وَاقْتُلْهُمْ بَدَدًا وَلَا تُبْقِ مِنْهُمْ أَحَدًا وقال:

فَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِمًا
عَلَى أَيِّ جَنْبٍ كَانَ لِلَّهِ مَصْرَعِي
وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الْإِلَهِ وَإِنْ يَشَأْ
يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ

وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ سَنَّ لِكُلِّ مُسْلِمٍ قُتِلَ صَبْرًا الصَّلَاةَ وَأَخْبَرَ يعني النبي (صلى الله عليه وسلم) أَصْحَابَهُ يَوْمَ أُصِيبُوا خَبَرَهُمْ وَبَعَثَ نَاسٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلَى عَاصِمِ بْنِ ثَابِتٍ حِينَ حُدِّثُوا أَنَّهُ قُتِلَ أَنْ يُؤْتَوْا بِشَيْءٍ مِنْهُ يُعْرَفُ وَكَانَ قَتَلَ رَجُلًا عَظِيمًا مِنْ عُظَمَائِهِمْ فَبَعَثَ اللَّهُ لِعَاصِمٍ مِثْلَ الظُّلَّةِ مِنْ الدَّبْرِ فَحَمَتْهُ مِنْ رُسُلِهِمْ فَلَمْ يَقْدِرُوا أَنْ يَقْطَعُوا مِنْهُ شَيْئًا). رواه البخاري.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەستەیەکی دە** کەسی نارد، بۆ چاوگێڕان‌و سووسەکردنی هەواڵی دوژمـن، عاصیمی کوڕی ثـابیتی ئەنصاری ی کرد بەسەرکردەیان، دەڕۆن هەتا دەگەنە هودات، کەشوێنێکە دەکەوێتە

ناوەندی عوسفانو مەککەوە، لەوێ خێڵی بەنی لەحیان کەلەتیرەی هوزەیلن پێیان دەزانن، ئیتر بەنزیکەی سەد پیاوی تیر ئەندازەوە شوێنیان دەکەونو شوێنەوارو شوێن پێیان هەڵدەگرن، کەعاصیمو هاوڕێکانی پێیان دەزانن فرکەی لێ دەکەنو خۆیان دەگەیەننە گردێكو لەسەنگەردا خۆیان قایم دەکەن، وەلێ دوژمن ئابلۆقەیان دەدەنو پێیان دەڵێن: خۆتان بدەن بەدەستەوە بەڵێنو پەیمان بێ، کەستان لێ ناکوژین، عاصیم (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خزمینە! من بەش بەحاڵی خۆم بەئامانو پەیمانی کافری بێ بڕوا تەفرە ناخۆمو خۆم نادەم بەدەستەوە، هۆ خودا گیان! پەیامەمان بگەیەنە بەپێغەمبەری خۆت.

ئەوجا بێ بڕواکان بەتیر دایان گرتن، لەیەکەم دەسرێژدا عاصیمیان کوشت، لەدەستەکەی عاصیم سێ کەس مابوون ئەوان لەسەر ئامانو پەیمانی ئەوان خۆیان دا بەدەستەوە، یەکێکیان خوبەیب بوو، یەکێکیان زەیدی کوڕی دەثینە بوو، ئەویتریشیان پیاوێ تر بوو، جا هەر کەچنگیان لێیان گیردەبێو دەکەونە بەرهەوێڵیان گورج ژێی کەوانەکەیان دەتەرازێننو بەژێی کەوانەکانی خۆیان دەیان بەستنەوە، پیاوەکەی سێیەم دەفەرموێ: ئەمە نیشانەی بێ پەیمانیو ناپاکییە، ئەگینا بۆوامان لێ دەکەن، بەیەزدانی پاك یەك هەنگاو لەگەڵتان نایەم، منیش حاڵم حاڵی ئەم برا شەهیدانەمو ئەمانە باشترین پێشەواو سەرمەشقن بۆمن، جا هەرچەند هەوڵ دەدەن کەلەگەڵیان بڕواتو خەریك دەبن کە بەزۆر بەکێشی بکەنو ئازاری بدەن بەڵام بەگوێیان ناکاو ملیان پێ نادا، سەرەنجام دەیکوژن، خوبەیبو کوڕی دەثینەیش دیل دەکەنو دەیان بەن لەمەککە دەیان فرۆشن بەکافرەکانی مەککە، تا لەباتی کەسووکاری خۆیان کە لەبەدردا بەدەستی ئەودوو کەسە کوژرابوون بیان کوژنەوە.

کوڕەکانی حاریثی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدومەناف خوبەیبیان کڕی، تا لەباتی حاریث بیکوژنەوە کەلەشەڕی بەدردا بەدەستی خوبەیب کوژرابوو. ئەوجا خوبەیب بەدیلی لەکنیان بەند بوو، هەتا هەموویان بڕیاریان دا کەبیکوژن، رۆژێ خوبەیب لەکچێکی حاریث گوێزانێ دەخوازێ کەبەری خۆی پێ بتاشێ، ئەویش چەقۆیەکی سەرتاشی دەداتێ، ئەو کچەی حاریث کوڕێکی ساوای دەبێ بەگاگۆڵکەو دارەدارە خۆی دەگەیەنێتە لای خوبەیب، خوبەیب منداڵەکە لەسەر رانی

خۆی دادەنیٚ، دایکەکەی ئاگای لەم حاڵە نابیٚ، کەچاوی بەمە دەکەویٚ وا کوڕەکەی لەباوەشی خوبەیبا دانیشتووەو خوبەیبیش چەقۆکەی بەدەستەوە زەندەقی دەچیٚو وا دەشەڵەژیٚ خوبەیب پیٚی دەزانیٚو دەڵیٚ: ئەوە دەترسیت کەمن ئەم بیٚ تاوانە بکوژم، من شتی وا ناکەم [٥٣٧] ئەو ژنە دەیگوت: بەخودا دیلم نەدیوە کە ئاوا وەك خوبەیب موبارەك بیٚ، بەخودا رۆژیٚ بەچاوی خۆم دیم خوبەیب بۆڵیٚ تریٚی بەدەستەوە بوو، خەریك بوو دەیخوارد، لەوکاتەدا بەکەلەپچەی ئاسن شەکەت درابوو، وەئەوەی پیٚی بڵیٚی بەروو بووەو میوە لەوکاتەدا لەمەککەدا نەبوو، ژنەکە دەیگوت: دیار بوو ئەو هیٚشووە تریٚ یە رزقیٚکی تایبەت بوو خودا لەغەیبەوە رەخساندبووی بۆ خوبەیب کردبووی بەکەرامەت بۆی!

جا کاتیٚ ویستیان بیکوژن لەخاکی بەستو ئەرزی حەرەمی پیرۆزی مەککە بردیانە دەرەوە، تا لەخاکی دەرەوەی بەستدا بیکوژن، خوبەیب فەرمووی پیٚیان: مەودام بدەن با دوو رکات نویٚژ بۆ خودا بکەم، ئەوانیش وازیان لیٚ هیٚنا، لەشویٚنی مزگەوتەکەی تەنعیم دا دوو رکات نویٚژی کرد، ئەوجا فەرمووی: بەخودا ئەوەندە نویٚژم پیٚ خۆشە ئەگەر لەربەرئەوە نەبیٚ کە گومانی ئەوەم پیٚ ببەن لەمەرگ دەترسمو تۆقیوم بۆیە نویٚژ دەکەم دەنا دوو رکاتی تریشم دەکرد، هۆ خودا! هاوارمە لات یەك بەیەك تاقیان لیٚ دەرنەکەیتو تەفرو توونایان بکەی! وە فەرمووی:

فلست أبالي حين أقتل مسلما
على أي جنب كان لله مصرعي
وذلك في ذات الإله وان يشا
يبارك على أوصال شلو ممزع

واتە: بەمەرجیٚ بەموسوڵمانی شەهید بکریٚم کەساخ بۆ رەزای خودایە، ئیتر دەربەستی ئەوە نیم کەچۆن دەم کوژنو لەسەر چی لاییٚ تەرمم دەکەویٚ، گیانی پاك کەلاشە بەجیٚ دیٚلیٚ، چی لەسەر تەخت بمریٚو چی لەسەر رووی خاك یەکسانە

---

[٥٣٧] دەلیلولفالحین دەفەرمویٚ: ئەم منالە ئەبو حوسەینی مەککیە، کەموحەدیثیکی گەورە بوو، هاولفی زوهری بوو. (وەرگیٚڕ)

بۆئەو، خودایش ئەگەر مەیلی لەسەر بێ، پرزۆڵەی جەستەی هەنجراویش پیرۆزو موبارەك دەكا، جا ئاوا خوبەیب (رەزای خوای لێ بێ) یەكەم كەس بوو كەئەم نوێژ كردنەی لەم كاتەدا داهێناو كردی بەسوننەت بۆ هەموو موسوڵمانێ كەلەبەر كوشتندا رابگیرێ، لەپێش جێ بەجێ كردنی كوشتنەكەی دا دووركات نوێژی سوننەتی صەبر لەبەر باری خودادا بكا، چونكە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژەكەی ئەم حاڵەی خوبەیبی پەسەند كرد، ئیتر هەر ئەو رۆژە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) پەیامی شەهیدبوون‌و دیلبوونی ئەوانی بەیاران ڕاگەیاند، لەولایشەوە چەند كەسێ لەهۆزی قورەیش - كە ژنەوتیان وا عاصیم كوژراوە - چەند پیاوێكیان نارد بۆسەر لاشەكەی، كەنیشانەیەكی وای لێ بێنن كەپێی بناسرێتەوە، تا دڵنیابن لەكوشتنی، چونكە عاصیم لەوەپێش كەڵەمێردێكی ئەوانی كوشتبوو، بەڵام خودا لەغەیبەوە پوورەیێ هەنگی زۆری وەك پەڵە هەورێ ببێ بەسێبەر، بۆ نارد، ئەو هەنگانە پاسی تەرمەكەی عاصیمیان دەكردو نەیانهێشت كەئەو فروستادانەی قورەیش دەستیان پێی بگات‌و شتێكی لێ ببڕن‌و بیبەن. (بوخاری. رەحمەت لەگۆڕی نازداری) [٥٣٨]

ئای چەندەم دیوە نوێژی سەرەمەرگ
جێ سەجدەی سوور بوو بەخوێناوی جەرگ
هەر منم نیمان لەسەرما ماوە
گەرچی گۆی دڵم كوڵێ یەنماوە

وفي الباب أحاديث كثيرة صحيحة سبقت في مواضعها من هذا الكتاب، منها: حديث الغلام الذي كان يأتي الراهب والساحر، ومنها حديث جريج، وحديث أصحاب الغار الذين أطبقت عليهم الصخرة. وحديث رجل الذي سمع صوتا في السحاب يقول: اسف حديقة فلان، وغير ذلك، والدلائل في الكتاب كثيرة مشهورة. وبالله التوفيق.

لەبابەت ئەم بابەتەوە، كەباسی كەراماتی ئەولیاو بەهرەی پیاوچاكانە فەرموودەی ساخی زۆر لەپێشەوە لەشوێنی خۆیاندا، بەبۆنەی زۆر شتەوە، لەم كتێبەدا رابورد، وەك:

١- بڕوانە (٦/ ٣٠ ب - ١ ز - ٣ ل - ٤٩) داستانی كوڕە فەقێكەو پادشاكە.

---

[٥٣٨] بڕوانە بەرگی هەشتەمی تاجول ئوصوڵ بەكوردی زنجیرەی (١٠١) لاپەڕە (٢٤٥) فەرموودەی یەكەم، لەوێدا ئەم داستانەو چامەكەی خوبەیب بەتەواوی نووسراوە. (وەرگێڕ/ ٣/١ـ ٢٠٠١).

٢- بڕوانه(١٢/١٢ ب١ ز١ ل١٧)داستانی سێ کەسەکە لەئەشکەوتەکەدا گیریان خواردبوو.

٣- بڕوانه (٢٩٥/٨ ب - ١ ز- ٣٢ ل - ٢٢٦).

٤- بڕوانه (١٩/ ٥٦٢ ب - ٢ز - ٦٠ ل - ١١٦) فەرموودەی داستانی بێستان‌و باخەکە.

٥- بڕوانه (١/ ٩٥ ب - ١ ز- ١١ ل - ١٠٥) فەرمووده‌ی (من عاد لي وليا فقد آذنته).

٦- بڕوانه (١٠/ ١٥١ ب - ١ ز- ٢٥ ل - ١٤٢) حەدیثەکەی حەنظەلە.

٧- بڕوانه (٤/ ٢٠٢ ب - ١ ز- ٢٥ ل - ١٨٦) حەدیثەکەی زوبەیر.

٨- بڕوانه (٢٤٥/٢ ب - ١ ز- ٢٥ ل - ٢١٦) فەرمووده‌ی (من نفس..)

٩- بڕوانه (٢/ ٢٥٣+ ٢٥٧/٦+ ٨/ ٢٥٩)

١٠- بڕوانه (١٣/ ٣٧٢ ب١ ز٤٥ ل٢٩١) فەرمووده‌ی داستانەکەی ئوو‌ەیسی قەرەنی(خ)

١١- بڕوانه (٥١٨/٢٨ ب - ٢ ز- ٥٦ ل - ٨٤) فەرمووده‌ی (..نتلقى عيرا لقريش و..)

١٢- بڕوانه (١/ ٦٥٩ ب - ٢ ز- ٧٩ ل - ١٨٧ ف - ١+٢+٤)

١٣- بڕوانه (٩٩٨/٨ ب - ٣ ز- ١٨٠ ل - ..) فەرمووده‌ی (.. رجل يقرأ سورة الكهف..)

١٤- بڕوانه (١٠٢٠/٢ ب - ٣ ز- ١٨٣) فەرمووده‌ی (وكلني رسول الله...)

١٥- بڕوانه (١١٤٦/١ ب - ٣ ز- ٢٠٩ ل ..) فەرمووده‌ی (حدثني بأرجى عمل)

٨/ ١٠-١٥١٠-٥٣٣/ عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: (مَا سَمِعْتُ عُمَرَ لِشَيْءٍ قَطُّ يَقُولُ إِنِّي لَأَظُنُّهُ كَذَا إِلَّا كَانَ كَمَا يَظُنُّ).[٥٣٩] رواه البخاري.

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (هەموو جارێ کەعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: وەدەزانم ئەو شتە وا ڕوو دەدا. دەق وەك ئەوپێشبینی دەکرد، شتەکە ڕێك وا دەردەچوو).

**(١٥٤) نامەی ئەو کارانەی کەشەرع پەسندیان ناکات غەیبەت و ناوهێنانی خەڵك لەپاش ملە بەخراپە دروست نییە، پاراستنی زمان پێویستە**

**كتاب الامور المنهي عنها باب تحريم الغيبة والامر بحفظ اللسان**

قال الله تعالى: (ولا يغتب بعضكم بعضا، أيحب أحدكم أن يأكل لحم أخيه ميتا فكرهتموه، واتقوا الله أن الله تواب رحيم) (٤٩/ ١٢).

---

[٥٣٩] بوخاری (٣٨٦٦).

واته: خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا، لەسوورەتی حوجوراتدا کەسوورەتی چل‌و نۆهەمە لەئایەتی دوازدەهەمی ئەم سوورەتە پیرۆزەدا، لەبارەی ناپەسەندی ئەم باسەوە کەغەیبەت‌و پاشملە دوویی یە دەفەرموێ:

ئەی موسوڵمانینە! موسوڵمان برای موسوڵمانە، کەواتە غەیبەتی یەکتری مەکەن، دەزانن ئەوە چەند کارێکی دزێوە، کێ پێی خۆشە کەگۆشتی برای خۆی بەمردوویی بجوێ‌و بیخوا! دیارە کەس ئەمەی پێ خۆش نییە، تەنانەت دڕندەی کێوی گۆشتخۆریش شتی وا ناکەن‌و گۆشتی یەکتری ناخۆن، کەواتە لەخودا بترسن‌و فەرمانی مەشکێنن، بزانن‌و لەمە دڵنیابن کەخودا تەوبەو پەشیمانی هەموو کاتێ گیرا دەکا خودا میهرەبانە.

وقال تعالى: (ولا تقف ماليس لك به علم ان السمع والبصر والفؤاد كل اولئك كان عنه مسؤولا) (٣٦/١٧).

لەخۆتەوە بەبێ بەلگەی رۆشن‌و زانستی تەواوی دامەزراو شوێن‌و گومان‌و شەڵتاخی ناهەق‌و درۆو بوختان مەکەوە، قسە تانەچیتە بنج‌و بنەوانی مەیکە، لەڕاستی دا ئەوەی کەبەگوێی خۆت نەیبیستی، یا بەچاوی خۆت نەیبینی، یا بەقەناعەتی دڵ، بەپێی بەلگەو شایەت، وەری نەگری، دروست نییە کەبڕوای پێ بکەی، بەڵام حوکم بە ظەن بۆ هەندێ شت دروستە، وە ئەوە بەر ئەم نەهیە ناکەوێ.

وقال تعالى: (ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد) (١٨/٥٠)

واتە: ئادەمیزاد هەرچی لەدەمی دەربچێ‌و هەر قسەیێ بکا، گورج فریشتەی چاپوکی ئامادە کەچاودێرە بەسەریەوە لەدەمی دەقۆزێتەوەو دەینووسێ.

أعلم انه ينبغي لكل مكلف أن يحفظ لسانه عن جميع الكلام، إلا كلاما ظهرت فيه المصلحة، ومتى استوى الكلام وتركه في المصلحة فالسنةِ الامساك عنه لانه قد ينجر الكلام المباح الى حرام أو مكروه، وذلك كثير في العبادة، والسلامة لا يعدلها شيء:

ئەی خوێنەری بەڕێز! بزانە ئەوەی کە لە سەرخاوەن ئەرکە ئەمەیە دەبێ لەهەموو قسەیەکا ئاگای لەزمانی خۆی بێ، لەگشت ئاخاوتنێ زمانی خۆی بگرێ، مەگەر بەرژەوەندێکی ئاشکرای تیادابێ. تەنانەت قسە ئەگەر کردن‌و نەکردنی یەکسان بوو نەکردنی باشترە، چونکە واباوە گەلێ جار قسەی وا سەر دەکێشێ بۆ

قسەی نارەوا، یا بۆ قسەی خراپو ناپەسەند. قووتاربوونیش لەتاوانو لەگوناه هیچ شتێ هاوتای ناکا. فەرمایشتەکەی شێخی نەوەوی (رەزای خوای لێ بێ) تەواو.

لێرەدا بەندە ئەمەتان عەرز دەکەم:

ئەگەر ئێمەی بمانەوێ زوربەی خەڵکی ئەم چەرخە لەقسەی ئێمە رازی بن، دەبێ بەس بەناو موسوڵمان بین، من لەگەڵ ئەو رایەدا نیم کەئێمە مامەحەمەیی بۆ جەماوەر بکەینو لەو باوەڕەدام ئەوەی لەم رۆژەدا بیەوێ ئەم جەماوەرە لەخۆمان رازی بکەین، لەو باوەڕەدام ئەوەی لەم رۆژەدا بیەوێ ئەم جەماوەرە دنیا دۆستە لەخۆی رازی بکا خودا لە خۆی دەرەنجێنێ ئەوەی کەگومانی تیادا نییە دین هەقە، ئێمەیش کە کوردین، خودای گەورە ـ لێی بەزیاد بێ لەسایەی بەخششی خۆیەوە ـ باشترین ئایینی پێمان خەڵات فەرمووە، جا ئەوەی کەلەسەر ئێمەیە وەك برایەکی دڵسۆز، دینێکی راستو دروست، پێشکەش بەبرا موسوڵمانە کوردەکانی خۆمان بکەین، دەق وەك ئەوەی کە لەکتێبە گەورە باوەڕ پێکراوەکاندا روون کراوەتەوە، ئەوەی بەمە رازی یە ئەوە خودا یاربێ خودایش لەو رازی یە، وەڵێ ئەوەی دەیەوێ کە دینەکە بەئارەزووی ئەوبێو بەکەیفی خۆی بۆڵبژێری بکا، ئەوە بەئێمە ناکرێ. مەبەستم لەم گوتەیە ئەوە نییە کە خوا نەخواستە گومانی خراپی بە تێکڕای موسوڵمانان ببەم، بەڵکوو کەم کەس هەیە کە وەك من گومانی باشی بەتێکڕای موسوڵمانان هەبێ، بەمن بێ قەت باسی خراپەی خۆمان نەکەین، وەك دانایێ دەفەرموێ: من لەباتی ئەوەی قسەیێ بەشەیتان بڵێم سەڵاواتێ لەدیاری حەزرەت ـ دروودی خوای لەسەربێ ـ دەدەم. چونکە بۆدەبێ غەیبەتی خۆمان بکەین، ئەوەتانێ وا بەبەرچاوەوە ـ لەخودا بەزیاد بێ ـ وڵات پڕە لەمزگەوتو پەرستگاو تەکیەو خانەقاو مەلاو فەقێو سۆفیو دەروێشو نوێژکەرو کۆنگرەو میهرەجانو ئیستیعراضي ئیسلامی جیهانی!

بەبێ پەروا ئەوەیش دەدرکێنم کە زوربەی ئەو کەسانەی کە بەبێ تەقوا، بۆ چەرخی زیۆینی ئیسلام دەگرین، بۆ ئیسلام ناگرین، بەڵکوو بۆ وڵات گرتنو تاڵانکردن دەگرین، بەڵێ مەبەستم لەم گوتەیە ئەمە نییە، وەڵێ بەبێ پێچو پەنا عەرزی برای خۆم بکەم:

کەخۆشی ژیانی جیهان برێتی نییە لەگشت شت، لەڕاستی دا مرۆ ئەگەر هەموو جیهـان بـدۆڕێنێ، وەلێ ڕەزای خـودا بـۆ خـۆی مسـۆگەر بکـا ئـەوە گـەورەترین سـەرکەوتنە، کەواتـە ئازیزەکـەم ئامانجـت ڕەزای خـوداو پێغەمبـەربێ، بـۆ ڕەزاو مەرحەبای خەڵکی جیهان ڕەزای خودا مەدۆڕێنە! (وەرگێڕ)

١٥١١/١-٥٦٣/ وعن أبي هريرة ﷺ عـن النبـيﷺ قـال: (.. مـن كـان يـؤمن بـالله .. الحديث).[٥٤٠]

١٥١٢/٢-٥٦٤/ عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّـهِ أَيُّ الْإِسْـلَامِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ).[٥٤١]

ئـەبو مووسـا (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! کـام موسوڵمانە بەهرەمەندترە؟ فەرمووی: ئەو موسوڵمانەی کە موسـوڵمانان لـەزمان و لەدەستی ڕزگاربن (ش).

١٥١٣/٣-٥٦٥/ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ). متفق عليه.[٥٤٢]

لەسـەهلی کـوڕی سـەعدەوە، فـەرمووی: خۆشەویسـت (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: هەرکەسێ زامنی ی زمـان و دەم و داوێنـی خـۆیم بـۆ بکـا منـیش زامنـی ی مسـۆگەر بوونی بەهەشتی بۆدەکەم (ش ـ ڕەزای خودایان لێ بێ).

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: بـەگوێ ی خـۆم لـەزاری پـیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو: وا دەبێ بەندەیێ قسەیێ دەکا، وشەیێ بە دەمیـدا دێ، بەباشی لێی وردنابێتەوە کەباشە یا خراپە، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی ئەوەوە پتر لەنێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بەرەو ئاگری دۆزەخ دەخزێ! (ش).

١٥١٥/٥-٥٦٦/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) قَـالَ: (إِنَّ الْعَبْـدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَرْفَعُهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَاتٍ وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَـتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ). رواه البخاری[٥٤٣]

---

[٥٤٠] بڕوانە (٣٠٨/٦ ب ـ ١ ز ـ ٣٩ ل ـ ٢٥٤).

[٥٤١] بڕوانە (٢١١/٩ ب ـ ١ ز ـ ٣٩ ل ـ ١٩٨).

[٥٤٢] بوخاری (٦٤٧٧) و موسلیم (٢٩٨٨).

**دیسان فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: وا دەبێ بەندەیێ قسەیێ دەکا، هۆی خۆشنوودیی خودایە، ئەوەندەش دڵی ناداتێ، کەچی خودا بەهۆی ئەو قسەیەوە چەند پایەیێ بەرزی دەکاتەوە، هەروەها وادەبێ قسەیێ لەدەمی دەردەچێ، [٥٤٤] هۆی رق‌و تووڕەیی‌و نارەزایی خودای گەورەیە، ئەوەندەیش دڵی پێ نادا، کەچی خودا بەهۆی ئەو قسە نارەوایەوە لە ناوئاگری دۆزەخا غلی دەکاتەوە! (ب ـ رەزای خوای لێ بێ).**

**٦/١٥١٦-٥٦٧/** عَنْ بِلَالَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُك (إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللّٰهِ مَا يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ فَيَكْتُبُ اللّٰهُ لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللّٰهِ مَا يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ فَيَكْتُبُ اللّٰهُ عَلَيْهِ بِهَا سَخَطَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ). **رواه المالك في الموطأ والترمذی وقال: حديث حسن صحيح.** [٥٤٥]

**عەبدو ڕەحمان: بیلالی کوڕی حاریثی موزەنی** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: وادەبێ پیاوێ گوتەیێ دەڵێ: دەبێ بەهۆی ڕەزامەندیی خودای گەورە، خەیاڵی لای ئەوە نەبووە کە ئەو گوتەیە بگاتە ئەو پایە باشەی کەدەیگاتێ، جا خودای گەورە بەهۆی ئەو گوتەیەوە ڕەزامەندیی خۆیی بۆ دەنووسێ‌و ئیتر لێی ڕازی نابێ تا ئەو ڕۆژەی دەچێتەوە بەردەستی خودا (مالیك/ ت: ح/ح/ص).**

**٧/١٥١٧-٥٦٨/** عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ الثَّقَفِيِّ ﷺ قَالَ: (قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ حَدِّثْنِي بِأَمْرٍ أَعْتَصِمُ بِهِ؟ قَالَ: قُلْ رَبِّيَ اللّٰهُ ثُمَّ اسْتَقِمْ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَا أَخْوَفُ مَا تَخَافُ عَلَيَّ فَأَخَذَ بِلِسَانِ نَفْسِهِ). **رواه الترمذی، وقال: حديث حسن صحيح.** [٥٤٦]

**سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵا** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! کارێکی وام پێ بفەرموو کەبیکەم بە کەمەندی دەستی**

---

[٥٤٣] بوخاری (٦٤٧٤).

[٥٤٤] گەردی سەر گۆڕتان لەکوێ پەیداکەم          بۆ سوورمەی چاوی دڵە شەیداکەم

[٥٤٥] موطأ ٩٨٥/٢ تیرمیذی (٢٣٢٠).

[٥٤٦] تیرمیذی (٢٤١٢).

**خۆم، فەرمووی** (دروودی خوای لەسەر بێ)**: ڕەفتار بەم ئایەتە بکە، کە دەفەرموێ: (ان الذین قالوا ربنا الله ثم استقاموا) (٤١/٣٠) (تەفسیری ئایەتەکە لەپێشەوە لەبەرگی یەکدا لەزنجیرە/ ٨ دا رابورد). گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! زۆرتر لەچی دەترسی کەمن بەهۆی ئەوشتەوە لەناو بچم؟ حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **سەری زمانی خۆی گرت‌و فەرمووی: ئەمە ئەگەر نەیگری سەرت دەکا بەفوڕدا (ت: ح/ح/ص).**

٨/١٥١٨-٥٦٩/ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لَا تُكْثِرُوا الْكَلَامَ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللَّهِ فَإِنَّ كَثْرَةَ الْكَلَامِ بِغَيْرِ ذِكْرِ اللَّهِ قَسْوَةٌ لِلْقَلْبِ وَإِنَّ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْ اللَّهِ الْقَلْبُ الْقَاسِي). رواه الترمذی.[٥٤٧]

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ذیکرو یادی خودای گەورەی لێ دەرچێ قسە زۆر مەکەن چونکە زۆرگوتن - کە بۆ یادو ذیکری خودا نەبێ - مایەی دڵڕەقی یە، وەدوورترین کەسیش لەڕەحمەتی خوداوە خاوەنی دڵی ڕەقە: پیاوی دڵڕەش‌و دڵڕەقە! (ت - ڕەزای خودای لێ بێ - ئێمەی گوناهباریش بەر شەفاعەتی بکەوین).**

٩/١٥١٩-٥٧٠/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ وَقَاهُ اللَّهُ شَرَّ مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَشَرَّ مَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ). رواه الترمذی.[٥٤٨]

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوەی کەخودا بەمیهرەبانی خۆی لەشەڕی زمانی‌و لەشەڕی دامەنی بیپارێزێ دەچێتە ناو بەهەشت (ت: ح/ح/ص).**

١٠/ ١٥٢٠-٥٧١/ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: (قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا النَّجَاةُ؟ قَالَ: أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ وَلْيَسَعْكَ بَيْتُكَ وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ). رواه الترمذی.[٥٤٩]

**عوقبەی کوڕی عامیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چی دەبێ بەمایەی ڕزگاری؟ فەرمووی: زمانی خۆت بگرەو، لەماڵی خۆتدا توێتکە بگرەو، بۆ گوناهی خۆت بگری! (ت - ح/حەزرەت).**

---

[٥٤٧] تیرمیذی (٢٤١٣).

[٥٤٨] تیرمیذی (٢٤١٠).

[٥٤٩] تیرمیذی (٢٤٠٨).

١١/١٥٢١-٥٧٢/ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (إِذَا أَصْبَحَ ابْنُ آدَمَ فَإِنَّ الْأَعْضَاءَ كُلَّهَا تُكَفِّرُ اللِّسَانَ فَتَقُولُ اتَّقِ اللَّهَ فِينَا فَإِنَّمَا نَحْنُ بِكَ فَإِنْ اسْتَقَمْتَ اسْتَقَمْنَا وَإِنْ اعْوَجَجْتَ اعْوَجَجْنَا). رواه الترمذي.[٥٥٠]

**ئەبو سەعیدی خودری** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرموێ** (درودی خوای لەسەر بێ): **هەموو بەیانییەك كەڕۆژ دەبێتەوە، هەموو ئەندامەكانی لەشی ئادەمیزاد لەزمانی دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ئەی زمان! شەرمێ شكۆیێ لەخودا بكە، لەهۆی ئێمەوە لەخودا بترسەو بەهۆی غەیبەتو درۆو قسەی ناڕەواوە تووشمان مەكە، چونكە ئێمە بەتۆوە بەندینو بەسراوین بەتۆوە، ئەگەر تۆ ڕاستو ڕەوان بێ ئێمەیش ڕاستو ڕەوان دەبین، بەڵام ئەگەر تۆ خواروخێچو چەوتو چەوێڵ بی ئێمەیش وا دەبین (تیرمذی ـ ڕەزای خوای لێ بێت).**

١٢/١٥٢٢-٥٧٣/ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (فِي سَفَرٍ فَأَصْبَحْتُ يَوْمًا قَرِيبًا مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي عَنْ النَّارِ قَالَ لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ تَعْبُدُ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ وَتَصُومُ رَمَضَانَ وَتَحُجُّ الْبَيْتَ ثُمَّ قَالَ أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ الصَّوْمُ جُنَّةٌ وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ وَصَلَاةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ قَالَ ثُمَّ تَلَا تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنْ الْمَضَاجِعِ حَتَّى بَلَغَ يَعْمَلُونَ ثُمَّ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ كُلِّهِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ قُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ ثُمَّ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكَ بِمَلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ قُلْتُ بَلَى يَا نَبِيَّ اللَّهِ فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ قَالَ كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا فَقُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ فَقَالَ ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ). رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح.[٥٥١]

**موعاذی كوڕی جەبەل** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لەسەفەرێكا، لەخزمەتی حەزرەتدا بووم، ڕۆژێ بەدەم ڕۆیشتنەوە لێی نزیك بوومەوەو عەرزیم كرد: ئەی**

---

[٥٥٠] تیرمیذی (٢٤٠٩).

[٥٥١] تیرمیذی (٢٦١٩).

نێردراوی خودا! کارێکم پێ بفەرموو کەبمباتە ناوبەهەشتو لەئاگری دۆزەخ دوورم بخاتەوە، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): بەڕاستی لەشتێ گەلێ گەورە مەزنت پرسی، بەڵام ئاسانە بۆکەسێ کەخودا ئاسانی بکا بۆی: هەر خودا دەپەرستیتو هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا ناکەیتو نوێژەکانت دەکەیتو زەکات دەدەیت، ڕۆژووی ڕەمەزان دەگریتو حەجی خانەی خودا دەکەیت. ئەنجا فەرمووی: بادرگاکانی جۆرەها خێرو چاکەی تریشت نیشان بدەم: ڕۆژوو قەڵغانو سوپەرەو وەك سەنگەرێکی قایمی پۆڵایین ڕۆژووەوان دەپارێزێ، لەگوناهو تاوان، خێرو بەخششو چاکەیش گوناه دەکوژێنێتەوە وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە ئاوا، وە شەونوێژی پیاوی خودا پێداویش ـ لەجەرگەی شەودا کەمەردوم نووستووەو دۆست خەبەرداره ـ نیشانەو دروشمی پیاوچاکانە!

فەرمووی: ئەنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: (تتجافى جنوبهم عن المضاجع): تا گەیشتە (يعملون) سوورەتی سیو دوو، ئایەتی شانزەو حەڤدە واتە: بەشەو دوورە پەرێز لەنوێنو نووستن دەگرنو هەر خەریکی شەونوێژو شەو طاعەتنو هەرلەخودا دەپاڕێنەوەو، لاڵەو پاڵەو سکاڵا لەدەرگای پەروەردگاری خۆیان دەکەن، هەم لەترسی سزاو تۆڵەی سەختیو هەم بەتەمای ڕێژنەی ڕەحمەتی، وە لەو ڕزقو ڕۆژییە پاکەی کەخودا پێی داون خێرو خێراتی باشی لێ دەکەن، ئەمانە مەگەر هەرخودای مەزن خۆی بزانێ، کەلەباتی ئەم کردەوە باشانەیان، لەپەنامەکی یەوە لەژێر پەردەی غەیبەوە چی خێرو خۆشیو نازو نیعمەتێکی بۆئامادە کردوون!

ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: با لەسەر ڕشتەی هەموو کارێکی باشو کۆڵەکەو چڵەپۆپەی هەستوونەکەیت پێ بڵێم. عەرزیم کرد: بفەرموو ئەی ڕەهبەری خودا! فەرمووی: سەر ڕشتەی هەموو کارێکی باش ئیسلامەتی یە، وەکۆڵەکەکەی نوێژە، وەچڵەپۆپەی هەستوونەکەی خەباتو تێکۆشانە، لەڕێگەی خودادا، ئینجا فەرمووی: باشیرازەی ئەمانەیشت هەموو پێ بڵێم؟ عەرزیم کرد: بفەرموو قوربان! جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سەری زمانی خۆی گرتو فەرمووی: زمانی خۆت بگرە. منیش گوتم: بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا! لەسەر ئەو قسانەیش کەدەیانکەین تاوانبار دەبینو تووشی تۆڵەو سزادەبین؟ فەرمووی: ئەی موعاذ! دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ نەکا، ئەی چی ئەو خەڵکە لەسەر دەمو لەپەوورو لەناو

ئاگری دۆزەخدا دەگەوزێنێ، جگە لەدروێنەی داسی زمانیان؟ ئیتر چۆن پرسیاری وا ئاشکرا دەکەی؟ خۆتۆ لای خۆت زانایەکی بلیمەتیت (ت: ح/ح/ص).

دەلیلولفالیحین دەفەرموێ: وجملة الاستفهام معطوفة على مقدر دل عليه السلام: أى أوتسأل عن هذا مع ظهوره وأنت الفقيه الاعلى؟ لەبەر ئەمە بۆ زیاد روون کردنەوە منیش ئەم موقەددەرەم ئامێتەی وەرگەڕاوەکە کرد.

١٣/١٥٢٣-٥٧٤/ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ قِيلَ أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ قَالَ إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ اغْتَبْتَهُ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ). رواه مسلم.[٥٥٢]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست‌و نازدار (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەرێ دەزانن غەیبەت‌و لەپاشملەدوان کامەیە؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان زۆر باش دەزانن، فەرمووی: ئەوەتانێ کەباسی برای خۆت بکەی بە جۆرێکی وا کەپێی ناخۆش بێ! عەرزی کرا: ئەی ئەگەر ئەو قسەیەی دەیکەم لە براکەما هەبوو ئەوە چۆن؟ فەرمووی: ئەگەر ئەو قسەیەی تۆ دەیکەی‌و ئەو پێی ناخۆشە لە براکەتا هەبوو ئەوە لەم حاڵەدا غەیبەت‌و پاشملەیە، ئەگینا ئەگەر ئەوەی تیا نەبێ ئەوە ڕێك بوختانەو گەلێ لە غەیبەت خراپترە (م).

١٤/١٥٢٤-٥٧٥/[٥٥٣]

١٥/١٥٢٥-٥٧٦/ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (حَسْبُكَ مِنْ صَفِيَّةَ كَذَا وَكَذَا قَالَ غَيْرُ مُسَدَّدٍ تَعْنِي قَصِيرَةً فَقَالَ لَقَدْ قُلْتِ كَلِمَةً لَوْ مُزِجَتْ بِمَاءِ الْبَحْرِ لَمَزَجَتْهُ قَالَتْ وَحَكَيْتُ لَهُ إِنْسَانًا فَقَالَ مَا أُحِبُّ أَنِّي حَكَيْتُ إِنْسَانًا وَأَنَّ لِي كَذَا وَكَذَا). رواه المسلم.[٥٥٤]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بە پێغەمبەرم گوت: لەصەفییە ئەوەت بەسە کەئەوەی وایە، عائیشە لەم قسەیەی مەبەستی ئەوەبوو کە صەفییە کورتە باڵایە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بێ گومان ئەم قسە غەیبەتەی تۆ گوتت: ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە ئەگەر ئامێتەی هەموو ئاوی دەریاکان بکرێ هەمووی

---

[٥٥٢] موسلیم (٢٥٨٥).

[٥٥٣] بڕوانە (٢١٣/١١ ب ـ ١ ز ـ ٢٦ ل ـ ١٩٨).

[٥٥٤] أبو داوود (٤٨٧٥)و تیرمیذی (٢٥٠٤) و (٢٥٠٥).

ليخن‌و بۆگەن دەكا! عائيشە گوتی: جارێكیش لاسكایی مرۆڤێكم بۆی كردەوە، فەرمووی: ئەگەر بەماڵ‌و سامانێكی زۆریش بووە حەزناكەم لاسكایی كەس بكەمەوە! (د/ت: ح/ح/ص).

١٦/١٥٢٦-٥٧٧/ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (لَمَّا عُرِجَ بِي مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ يَخْمُشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ فَقُلْتُ مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرِيلُ قَالَ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ). رواه أبو داود.[٥٥٥]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو شەوەی كەچووم بۆ میعراج، لەلای كۆمەڵێكەوە ڕەت بووم، نینۆكی مسیان هەبوو، خۆش خۆش ڕووخسارو سینگی خۆیانیان پێ دەڕنی‌و دەڕووشان، گوتم: ئەی جوبرائیل! ئەمانە كێن كەوا لەخۆیان دەكەن؟ فەرمووی: ئەمانە ئەوانەن كەقاچ‌و قولی ئەم‌و ئەو دەبەن بەدەماو گۆشتی مەردم دەخۆن‌و بەغەیبەت‌و پاشەملەو شتی وا ئازاری دڵیان دەدەن، وەك بەقەپ‌و گاز گۆشتیان لێ ببڕن‌و بیخۆن ئاوا، وە هەروەها باسی ناموسیان لەخراپە دەكەن‌و بەقسەی ناڕەوا ئابڕوویان دەبەن (د ـ خ)

١٧/١٥٢٧-٥٧٨/ حەدیثی (لا تحاسدوا ولا تناجشوا..) تادوایی.[٥٥٦]

**(٢٥٥) دروست نییە گوێ لەپاشملەبگیرێ، پێویستە لەسەر ئەو كەسەی غەیبەتێكی نادروست دەبیستێ بەرپەرچی بداتەوە، وەنارەزایی خۆی دەربڕێ بۆ كابرای غەیبەتكەر، ئەگەر هەرچاری نەبوو لەو كورە هەڵسێ و ئەو كۆمەڵە بەجێ بێڵێ**

**باب تحريم سماع الغيبة**

**وأمر من سمع غيبة محرمة بردها والانكار على قائلها، فان عجز أو لم تقبل منه فارق ذلك المجلس ان أمكنه**

قال الله تعالى: (وإذا سمعوا اللغو أعرضوا عنه) (٥٥/٢٨) واتە: وەكاتێ كەوتاری ناباری بێ سوود ببیستن لەنەیاران گوێی پێ نادەن‌و دەیخەنە پشت گوێ.

وقال تعالى: (والذين هم عن اللغوا معرضون) (٣/٢٣) واتە: بەڕاستی ڕزگاری بوو لەسزای قیامەت ئەو خاوەن ئیمان‌و بڕوادارانەی كەئەم شتانە بەجێ دەهێنن:

---

[٥٥٥] ئەبو داوود (٤٨٧٨).

[٥٥٦] بڕوانە (٢٣٥/١٤ ب ـ ١ ز ـ ٢٧ ل ـ ٢١١).

نوێژێکی جوان بەسەرکزیو دلگەرمی دەکەنو لەشتی بێ هودەی بێ سوود، چ گوتاربێو چ کردار، خۆیان لادەدەن.. تا کۆتایی ئایەتەکان.

وقال تعالى: (ان السمع والبصر والفؤاد كل أولئك كان عنه مسؤولا) (٣٦/١٧) ← (زنجیرەی/٢٥٤).

وقال تعالى: (وإذا رأيت الذين يخوضون في آياتنا فأعرض عنهم حتى يخوضوا في حديث غيره، وإمّا ينسينك الشيطان فلا تقعد بعد الذكرى مع القوم الظالمين) (٦٨/١٦)

واتە: کاتێ کەئەوانە دەبینن سەردەکەنە شەنوکەو کردنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو بە قسەی پڕووپووچی خۆیان دەم دەژەننە فەرمایشتە بەرزەکانی ئێمە، کەهەریەکەیان بۆخۆی نیشانەیەکی گەورەو بەلگەیەکی رۆشنن لەسەر گەورەیی بێ سنووری ئێمەو جوانیو بێ گەردیی خۆیان، وەبەقسەی پڕوپووچی خۆیان تانەو تەشەر لەفەرمایشتە نەستەقەکانی ئێمە دەدەنو بەدرۆیان دەزانن، کاتێ لاژگەلاژگی ئەمانە دەبینن گورج بەبێ دەنگ دووریان لێ بگرنو پشتگوێیان بخەن، هەتا سەردەکەنە قسەیێ تر، (ئەگەر دنیا بوو بەهۆی ختەدانو دنەدانی شەیتانەوە) ئەمەتان لەبیر چوو، وەبەهەڵەو شتی وا لەگەڵیان کۆبوونەوە، هەر لەگەڵ ئەم نەهی لێکردنەی منتان وەبیرکەوتەوە ئیتر دەست بەجێ کۆڕەکەیان بەجێ بهێڵنو دوا ئەوە لەگەڵیان دامەنیشن، گوێ بۆ بیستنی خێرە، نەك بۆ ژنەوتنی شەڕو گوێگرتن لەقسەی ناڕەوا.

١٥٢٨/١-٥٧٩/ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ عَنْ النَبِيّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: (مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ رَدَّ اللّهُ عَنْ وَجْهِهِ النَّارَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).رواه الترمذي، وقال: حديث حسن صحيح.[٥٥٧]

ئەبو دەردا (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەر بێ): هەرکەسێ لەسەر نامووسی برای ئایینی خۆی بکاتەوەو لەسەر ئابڕووی هەڵ بداتێ، خودا لەڕۆژی قیامەتدا ڕوی لەئاگری دۆزەخ دەپارێزێ (ت: ح/ح).

١٥٢٩/٢-٥٨٠/ [٥٥٨]

---

[٥٥٧] تیرمیذی (١٩٣٢).

[٥٥٨] بڕوانە (٤١٧/٦ ب ـ ٢ ز ـ ٥١ ل ـ ٦).

٣/١٥٣٠-٥٨١/ [٥٥٩]

## (٢٥٦) باسی ئەوجۆرە پاشملەیەی کە دروستە - باب ما يباح من الغيبة

أعلم أن الغيبة تباح لغرض صحيح شرعي لايمكن الوصول اليه إلا بها، وهو ستة أسباب:

الأول: التظلم فيجوز للمظلوم أن يتظلم إلى السلطان والقاضي، وغيرهما ممن له ولاية أو قدرة على أنصافه من ظالمه، فيقول: ظلمني فلان بكذا.

الثاني: الاستعانة على تغيير المنكر ورد العاصي الى الصواب، فيقول لمن يرجو قدرته على إزالة المنكر: فلان يعمل كذا فازجره عنه ونحو ذلك، ويكون مقصوده التوصل الى ازالة المنكر، فإن لم يقصد ذلك كان حراما.

الثالث: الاستفتاء فيقول للمفتي: ظلمني أبي وأخي أو زوجي أو فلان بكذا، فهل له ذلك، وما طريقي في الخلاص منه، وتحصيل حقي، ودفع الظلم، ونحو ذلك؟ فهذا جائز للحاجة، ولكن الاحوط والافضل أن يقول: ما تقول في رجل او شخص أو زوج كان من أمره كذا، فلإنه يحصل به الغرض من غير تعيين، ومع ذلك فالتعيين جائز كما سنذكره في حديث هند ان شاء الله تعالى:

الرابع: تحذير المسلمين من الشر ونصيحتهم، وذلك من وجوه: منها جرح المجروحين من الرواة والشهود، وذلك جائز باجماع المسلمين بل واجب للحاجة، ومنها المشاورة في مصاهرة انسان أو مشاركته أو أيداعه أو معاملته بغير ذلك أو مجاورته.

ويجب على المشاور أن لايخفي حاله، بل يذكر المساوى التي فيه بنيه النصيحة. ومنها إذا رأى متفقها يتردد الى مبتدع أو فاسق يأخذ عنه العلم، وخاف أن يتضرر المتفقة بذلك فعليه نصيحة فليتفطن لذلك. ومنها أن يكون له ولاية عامة ليزيله ويولي من يصلح، أو يعلم ذلك منه ليعامله بمقتضى حاله ولا يغتر به، وان يسعى في أن يحثه على الاستقامة أو يستبدل به.

الخامس: أن يكون مجاهرا بفسقه أو بدعته، كالمجاهر بشرب الخمر ومصادرة الناس، وأخذ المكس، وجباية الاموال ظلما، وتولي الامور الباطلة، فيجوز ذكره بغيره من العيوب الا أن يكون لجوازه سبب آخر مما ذكرناه.

---

[٥٥٩] بروانە (٢١/٩ ب - ١ ز- ٢ ل - ٢٨) فەرموودەی تەوبەکەی کەعبی کوڕی مالیك.

السادس: التعريف فإذا كان الانسان معروفا بقلب: كالاعمش والاعرج والاصم والأعمى والاحول وغيرهم تعريفهم بذلك، ويحرم اطلاقه على جهة التنقيص، ولو أمكن تعريفه بغير ذلك كان أولى، فهذه ستة أسباب ذكرها العلماء، وأكثرها مجمع عليه، ودلائلها من الاحاديث الصحيحة مشهورة، فمن ذلك:

ئیمامی نەوەوی (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: بزانن غەیبەت یا ـ پاشملە ـ لەبەر مەبەستێکی رۆشنی رەوا دروستە، ئەگەر بەنیازێکی پاك بکرێ، بەمەرجێ ئەوە کەبەبێ غەیبەت ئەو مەبەستە رەوایە نەیەتەجێ. ئەو مەبەستەیش بەیەکێ لەم شەش هۆیانە دێتەجێ:

یەکەم: دروستە ستەمبار سکاڵای حاڵی خۆی بکاو لەلای خاوەن دەسەڵاتو دادپەروەرو کاربەدەستی تر، شکات لەدەستی ستەمکار بکا، بەتایبەت لەلای ئەو خاوەن دەستەڵاتانەی کەدەتوانن هەقی بۆ بستێنن، وەڵێ دەبێ هەرباسی زۆر لێکراوییەکەی خۆی بکا، بۆ نموونە بڵێ: ئەو کابرایە ئەو ناهەقییەی لەمن کرووە.

دوەم: داوای یارمەتی لەکەسێك بکەی، تابەری خراپەیێ بگرێ، یا کارێکی ناشایستە بگۆڕێ، یا لە ڕێگەدەرچوویێ بگێڕێتەوە بۆسەر ڕێگەی راست، وەك ئەوە بڵێ بەو کەسە کەهیوای ئەوەی لێ دەکرێ، ئەو ناشایستە ناهێڵێ، پێی بڵێ: ئەو کابرایە ئەو ئیشە خراپە دەکا، سەرزەنشتی بکەو مەهێڵە بیکا، وەڵێ دەبێ مەبەستی لەم قسەیە ئەوەبێ کەبەری ئەو خراپەیە بگرێ، دەنا قسەکەی نارەوایە.

سێیەم: بۆ رازانینو زانینی رابێ، وەك ئەوە بەمەلایە بڵێ: باوکم یا کاکم یا مێردەکەم یا ئەو کابرایە ئەو نارەواییەی لەمن کردووە، ئایا مافی ئەوەی هەیە؟ وەمن چۆن لەچنگی خۆم قووتاربکەم، وەچۆن هەقی خۆمی لێ بستێنم، یا لەکۆڵێ خۆمی بکەمەوە، یا ئەوەو ئەوە بڵێ پێی. ئەمە لەبەر ناچاریو بەپێی پێداویست دروستە، بەڵام ئاوا دووربینی ی پترەو باشترە کەبڵێ: ئێوە چی دەفەرموون لەبارەی کەسێکی واوەوە کەناهەقییەکی واوا لەکەسێکی واوا دەکا؟ چونکە بەم شێوەیش ئامانجە رەواکە جێ بەجێ دەبێو ناوی کەسیش دیاری ناکرێو نابێ بە غەیبەت بەهیچ جۆرێ، گەرچی لەم حاڵەدا ناو دیاریکردنیش دروستە، وەك لەحەدیثەکەی هیندا دەردەکەوێ، کەلەدواوە باسی دەکەین. خودای گەورە یاربێ.

چوارەم: هۆشیار کردنـەوەی موسـوڵمانانە لەشـەڕو زیـانی کەسـێ، بـەنیازی ئامۆژگاریکردنیـان، ئـەوەیش ڕێگـەی زۆرەو بـەزۆر شـێوە دەکـرێ: وەك دۆزینـەوەی لکـەو نـەنگ لـەو لەکـەدارو خـاوەن نەنگانـەی کـە فـەرمووده دەگێڕنـەوەو فەرموودەگێڕەوەن، یا دەبن بەشایەت، تا کەس پێیان هەڵنەخەڵەتێ، ئەمەیش - لەسەر رای گشتی موسوڵمانان رەوایە، بگرە بەپێی پێداویست پێویستە، یا وەك راوێژ کردن بەکەسێ لەبارەی ژنو ژنخوازی لەگەڵ کەسێکا، یا بوون بوهاوبەشی، یا شت پـێ سپاردن، یـا سـەوداو مامەڵـە کـردن لەگـەڵی دا، یـا هاوسـێتی کردنـی، یـا هەرشتێکی تری لەم بابەتە.

لەکاتی وادا لەسەر راوێژ پێکراوەکەیە حاڵەکە رۆشـن بکاتـەوە، وە خراپـەکان، بەدڵسۆزی - بەنیازی ئامۆژگاری ساخ نەك بە نیازێکی تـر - بـاس بکا بـۆی، یـا وەك ئەوە ئەگەر دی مەلایێ، یا فـەقێ یـێ هامووشـۆی بیدعـەتکارێ یا بـەدکارێ دەکاو زانستی لێ وەردەگرێ، وە مەترسی ئەوەی لێ دەکرێ کەئەو فەقێیـە لـەوەوە تووشـی زیانێ ببێ، ئەوە لەسەریەتی کەتەمێی بکاو بەیانی حاڵی کابرای بۆ بکا، وەلێ دەشێ نیازی پاك بێو مەبەستی تەمێ ی ئامۆژگاری خێربـێ، بـەڵام ئەوەنـدە هەیـە ئـەم بابەتەیان گەلێ کەس تیادا دەخەڵەتێو بەهەڵەدا دەچێ چونکە گەلێ جار بـەخیلی ئەوە بەقسەگۆ کە دەکا، شەیتانیش تەفرەی دەداو چەواشەی دەکاو بەخەیاڵی خۆی ئەوە قسەی هەقـەو غەیبـەت نییـە کەواتـە باهەمووکـەس ئاگـای لەمـەبێ. یا وەك کابرا سەرکاری سەر فەرمانێ بێ بەڵام هەقی خۆی نەداتێ و بەجوانی پـێ ی هـەڵ نەسێ بەم رەنگە شایستەی ئەو پایەیە نەبێ، یاخود بەدکاربێ، یالەڕێدەرچوو بـێ، یـا گێـلو لاژگ بـێ، یـا شـتێ تـری ئـاوابێ، جـا ئـەوە لەسـەریەتی کەئەمانـە روون بکاتەوە بۆ ئەو ئاغایەی کەدەستی بەسەر ئەمدا دەڕواو ئەم لەژێر ڕکێفـی ئەودایـە تا لای ببات لەسەر ئەوکارە کەسێ شایستە لەجێگەی ئەو دابنێ، یا تائاگای لـەحاڵی بێو بەپێی حاڵو بارودۆخی خۆی رەفتاری لەگەڵ بکاو پێـی دەسـخەڕۆنەبێ، یـا تـا ئاغاکەی هانی بدا لەسەرکار دروستیو کار راستی، یا بۆئەوەی کەبیگۆڕێ بەیەکێکی تر.

پێنجەم: وەك ئەوە کابرا بەئاشکرا لەڕێدەرچووبێو بیدعەتکار بـێو بەئاشـکرا خراپە بکا، بەم رەنگە بەبەرچاوەوە مەی بخواتەوە یاشتی خەڵك داگیربکا بۆ خۆی،

**یا باج وەربگرێ، یا بەناهەق سەرانەو سوورانە لەمەردوم بسەنێ، ئەوە دروستە کەباسی نەنگو خراپەی تری بکرێ، کەبەئاشکرا نایان کاتو، مەگەر بەهۆی شتێکی ترەوە گوتنەکەی دروست بێ.**

**شەشەم: بۆ ناسین، ئەگەر کەسێ بەنازناوێ، یا بەرەوشێ، یا بەناوێکەوە ناسرابوو، کەبۆنی کەمێتی لێ دەهات، وەك: ئەوە چاوکز بوو، یا شەلو لەنگ بوو، یا کەڕبوو، یا کوێر بوو، یا خێل بوو، یا شتێ تری لەم بابەتانە، ئەوە دروستە بۆناسینو بەو ناوەوە ناوببرێ، وەلێ ئەگەر بەنیازی بێ ڕێزیو بە چاوی کەم تەماشاکردنەوەبێ ئەوە دروست نییە.**

**ئا ئەمانە شەش هۆبوون، زاناکان فەرموویانن، زوربەیان جێگەی ڕەزای گشتین، بەلگەی ڕۆشنیش لەسەریان لەفەرموودەی راستو رەواندا زۆرەو بەناوبانگن وە ئەمانە:**

**١٥٣١/١-٥٨٢/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رجلا اسْتَأْذَنَ عَلَى النَبِيّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ائْذَنُوا لَهُ بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ). متفق عليه.[٥٦٠]**

**عائیشە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ داوای ڕێگادانی کرد کەبچێ بۆلای پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ڕێگەی پێ بدەن بابێ، بەڕاستی کابرایەکی زۆر بەدە (ش = بوخاریو موسلیم. ڕەزای خودایان لێ بێ).**

**نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: شێخی بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی کردووە بەبەلگەو شایەت لەسەر ئەوە کەغەیبەتو پاشملەی بەدکارو گومانبار دروستە.**

**١٥٣٢/٢-٥٨٣/ وَعَنْها (رَضيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ النَبِيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا أَظُنُّ فُلَانًا وَفُلَانًا يَعْرِفَانِ مِنْ دِينِنَا شَيْئًا). رواه البخاري قال: قال الليث ابن سعد أحد رواة هذا الحديث: هذان الرجلان كانا من المنافقين:[٥٦١]**

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: گومان نابەم کەهینو هین هیچ لەم ئایینەی ئێمە بزانن.**

---

[٥٦٠] بوخاری (٦٠٥٤) و موسلیم (٢٥٩١).

[٥٦١] موسلیم (٦٠٦٧).

بوخاری (رەحمەتی خوای لێ بێ) گێڕاویەتیەوەو فەرموویەتی: لەیثی کوڕی سەعد - کەیەکێکە لەگێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە - فەرموویەتی: ئەم دوو پیاوە لەمونافیقو ناپاکەکان بوون.

٣/١٥٣٣-٥٨٤/ عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أتيت النبي ﷺ فقلتُ: (أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَانِي فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلَا يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ)متفق عليه، وفي رواية لمسلم: وأما أبو الجهم فضراب للنساء. وهو تفسير لرواية: لايضع العصا عن عاتقه، وقيل: معناه كثير الاسفار.[٥٦٢]

فاطیمەی کچی قەیس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) گوتم: ئەبو جەهەمو موعاوییە خوازبێنیم دەکەن، تۆ فەرمانت بەچی یە؟ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرچی مەعاوییە یە بۆرە پیاوەو بێ ماڵە، هەرچی ئەبو جەهمیشە کۆڵ بەکۆڵەو گەڕۆکە، یاخود: لێدەرەو زۆر لەژن دەدا (ش).

٤/١٥٣٤-٥٨٥/ عَنْ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ ﷺ قَالَ: (خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ أَصَابَ النَّاسَ فِيهِ شِدَّةٌ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ لِأَصْحَابِهِ لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ وَقَالَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ فَأَتَيْتُ النَّبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرْتُهُ فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ فَسَأَلَهُ فَاجْتَهَدَ يَمِينَهُ مَا فَعَلَ قَالُوا كَذَبَ زَيْدٌ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِمَّا قَالُوا شِدَّةٌ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَصْدِيقِي فِي إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ فَدَعَاهُمْ النَّبِيّصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ فَلَوَّوْا رُءُوسَهُمْ). متفق عليه.[٥٦٣]

زەیدی کوڕی ئەرقەم (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا، جارێ لەخزمەتی حەزرەتدا بووین، خەڵکەکە تووشی سەختڵەتیو ناخۆشی بوون، گوێم لێ بوو عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی - کەناسراوە بەئیبنو سەلوول - دەیگوت: ماڵی خۆتان بۆ ئەوانە خەرج مەکەن کەوان لەگەڵ پێغەمبەری خودادا، هەتا بڵاوەی لێ بکەنو لێی بتەکێنەوە. وە دەیگوت: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، لەوێ لەئێمەو

---

[٥٦٢] موسليم (١٤٨٠).

[٥٦٣] بوخاری (٤٩٠٠)و موسليم (٢٧٧٢).

لەدەستەی موحەممەد، کێمان بەدەستو بەدەسەڵاتو ئازاتربێ، شاری مەدینە بە دەستەکوونیو بێ دەسەڵاتەکەی ترمان چۆڵ دەکەین! منیش چووم ئەمەم بۆ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گێڕایەوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول دا، ئەویش حاشای لێ کردو هەتا توانی بەدرۆ سوێندی خوارد کەمن قسەی وام نەکردووە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) باوەڕی بەخۆیو هاوڕێکانی کردو باوەڕی بەمن نەکرد، مەردومەکە گوتیان: ئەی زەید درۆی لەخزمەتی حەزرەت دا کردووە منیش تووشێ خەمێ بووم، هەرگیز تووشی خەمی وا نەبووموو لەماڵەوە دەستەئەژنۆ بەخەمو خەفەتەوە لێ ی دانیشتم تا خواو ڕاسان خودای گەورە ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە، بۆ پشتیوانی ڕاستگۆیی من، لەوێوە کە دەفەرموێ: (إذا جاءك المنافقون) هەتا (ليخرجن الأعز منها الأذل) لەپاشدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بانگی کردن کەبۆیان بپاڕێتەوە، وەلێ ئەوان لەوەیش سەرپێچی یان کردو لووتیان کرد بەولاوە (ش ـ ڕەزای خودایان لێ بێ).

٥/١٥٣٥-٥٨٦/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) (أَنَّ هِنْدَ بِنْتَ عُتْبَةَ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللّـهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ وَلَيسَ يُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِي إِلَّا مَا أَخَذْتُ مِنْهُ وَهُوَ لَا يَعْلَمُ فَقَالَ خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ) متفق عليه.[٥٦٤]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هیندی ژنی ئەبو سوفیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو سوفیانی مێردم پیاوێکی ڕژدو گیرەو ئەوەندەم ناداتێ کەبەشی خۆمو مناڵەکانم بکا، مەگەر خۆی پێ نەزانێ خۆم شتی تری ببەم، ئەوسا بەشمان بکا، فەرمووی: ئەوەندە ببە کەبەشی خۆتو مناڵەکانت بکا، بەشیوەیەکی پەسەند، بەپێی یاسای شەرع (ش).

---

[٥٦٤] بوخاری (٥٣٥٩)و موسلیم (١٧١٤).

# پێڕستی سەرباسەکان

# رياض الصالحين

من كلام سيد المرسلين (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم)

باخچەی پیاوچاکان لەفەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)

دانراوی:

ئیمامی نەوەوی (شرف الدین یحیی)

وەرگێڕانی

نوری فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی کردووە

بەرگی چوارەم – چاپی سێیەم




★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.


📖 ناوی کتێب: ﴿ رياض الصالحين﴾

📖 دانراوی: ئیمامی نەوەوی

📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان

📖 پێداچوونەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی: محمود أحمد محمد

📖 تیراژ: ٣٠٠٠ دانه

📖 ژمارەی سپاردن: ( ١٧٥- ساڵی ٢٠٠٦ز)

📖 چاپو دیزاین: ( روبار حسين ).

📖 ساڵی چاپ: ١٤٢٧ ك -٢٠٠٦ز

**٢٥٧- دووزمانی ناردروسته، كه بریتییه له هێنانو بردنی قسەو باس بۆ تێكبەردانی مەردووم لەیەكتری**

**باب تحريم النميمة، وهي نقل الكلام بين الناس على جهة الإفساد**

قال اللّٰه تعالى: {هماز مشاء بنميم} . (١١/٦٨-سورة القلم).

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی قەلەم دا، كە سورەتی شەشتو هەشتە، لە ئایەتی یازدەهەم دا دەفەرموێ: ڕەوشێكی بەدی تریشی هەیە: ئەوەیە كابرایەكی تێچێنی دووزمانی بەد گۆیە، بەقسەی خراپ ئاگر خۆش دەكا لەنێوانی خەڵكا.

وقال تعالى: {ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد} . (١٨/٥٠-سورة ق).

بڕوانە سەرەتای زنجیرە (٢٥٤) بۆ تەفسیری ئەم ئایەتە لەبەرگی سێیەم دا.

١/١٥٣٦/١- وعَنْ حذَيْفَةَ رضي اللّٰه عنهُ قالَ: قال رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: «لا يَدْخُلُ الجنةَ نمّامٌ» متفقٌ عليه[1].

حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دووزمان دوو پێی ناچێتە بەهەشتەوە! (ش).

٢/١٥٣٧/٢- وعَنْ ابن عَباسٍ رضي اللّٰه عَنْهُمَا أنَّ رَسُول اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: مرَّ بِقَبريْنِ فقال: «إنَّهُمَا يُعَذَّبان، وَمَا يُعَذَّبَانِ في كَبيرٍ، بَلى إنَّهُ كَبيرٌ: أمَّا أحَدُهمَا، فكَانَ يمشِي بالنَّمِيمَةِ، وأمَّا الآخرُ فكَانَ لا يَسْتَتِرُ مِنْ بولِه». متفقٌ عليه[2].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەلای دوو گۆڕدا ڕابوورد، فەرمووی: خاوەنی ئەو دووگۆڕە ئازارو سزا دەدرێن لەسەر شتێ سزا دەدرێن خۆیان بەگەورەو گرنگیان دانەناوەو بەبێ نرخیان زانیوە، بەلاّم ئەوشتە لەلای خودا تاوانو گوناهێكی گەورەیە، یەكێكیان لەسەرئەوە ئازاردەدرێ چونكە لەحاڵی ژیانی دا دووزمانی دەكردو تێچێنو قسە چێن بوو، قسەی دەهێناو دەبرد بۆتێكبەردانی خەڵك لەیەكتری، ئەوی

---

[1] البخاری (٦٠٥٥) ومسلم (١٠٥).

[2] البخاری (٢١٦) ومسلم (٢٩٢).

تریشیان خۆی لەگمێزی خۆی باش نەدەپاراستو لەکاتی میزکردن دا خۆی لەپاڵشتێك دا حەشار نەئەدا (ش).

داخەکەم لەم رۆژگارەی ئێمەدا هەندێ ئاودەستی تایبەتی بۆمیز هەیە، چوار پێنج مەبوە لە، لەچەشنی بلوێری میز بەڕیز لەپاڵ یەکدا بەبێ پەردە ریزکراوە، هەر خەڵکەو دێو بەبەرچاوی یەکترییەوە بەپێوە هەڵدەمیزێ. ئەمە کارێکی نادروستەو بەر هەڕەشەی ئەم فەرموودەیە دەکەوێ. خودا بمانپارێزێ لەهەموو بێ شەرعییەك.

٣/١٥٣٨/٣- وعن ابن مسْعُودٍ رضي اللَّه عنْهُ أنَّ النبـيَّ صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم قال: (ألا أُنَبِّئُكُم ما العَضْهُ ؟ هي النَّمِيمةُ، القَالَةُ بيْنَ النَّاسِ) رواه مسلم [٣].

ئیبنو مەسعوود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: باپێتان بڵێم دووزمانیو بوختانو درۆ کامەیە؟ بریتییە لەو تێچێنیو گوتی گوتییەی کەلەناو ئەو خەڵکەدا دەماو دەم دەیگێڕنەوە (م).

### ٢٥٨- قسەو دەنگو باس بردن لەسەر شێوەی تێچاندن، بۆ کاربەدەستان نادروستە، مەگەر لەبەر هۆیەکی ڕەوا، وەك مەترسی پەیدابوونی خراپەیێ
### باب النهي عن نقْل الحديث وكلام الناس إلى ولاة الأمورِ إذا لم تدعُ إليه حاجة كَخوفِ مفسدةٍ ونحوها

قال اللَّه تعالى: {ولا تعاونوا على الإثم والعدوان} (٥/٢ سورة المائدة).

یارمەتی یەکتری مەدەن لەسەر کردنی کاری خراپو تاوانکاریو دەست درێژی.

٤/١٥٣٩/١- وعن ابن مَسْعُودٍ رضي اللَّه عنهُ قالَ: قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا يُبَلِّغْني أحدٌ من أصْحابي عنْ أحَـدٍ شَـيْئاً، فَـإنِّي أُحِـبُّ أنْ أَخْـرُجَ إِلَيْكُمْ وأنا سليمُ الصَّدْرِ) رواه أبو داود والترمذي [٤].

ئیبنو مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەس لەهاوڕێکانم لەکەسێکی ترەوە هەواڵی ناخۆشم بۆ نەگێڕێتەوەو مەبن

---

[٣] موسلیم (٢٦٠٦).

[٤] أبو داوود (٤٨٦٠)، تیرمیزی (٣٨٩٣).

به جاسوس بەسەر یەكتريیەوە، چونكە من حەزدەكەم كە بێم بۆ ناوتان بەدڵێكی سافی بێگەردی پاكەوە بێمو دەربارەی كەستان دەغەزم لەدڵ دا نەبێ (د/ت).

## ٢٥٩- زەمی پیاوی دووڕوو - باب ذم ذي الوجهين

قال اللّٰه تعالى: {يستخفون من الناس ولا يستخفون من اللّٰه وهو معهم، إذ يبيتون ما لا يرضى من القول، وكان اللّٰه بما يعملون محيطاً}. (٤/١٠٨ – سورة النساء).

واتە: هەندێ كەس لەكاتی كردنی خراپەو گوناه دا خۆیان لەخەڵك دەشارنەوەو شەرمو شكۆ لەمەردووم دەكەنو بەبەر چاوی ئەوانەوە تاوان ناكەنو پێیان شوورەییە كە كەسێكی تر بەنهێنییەكانیان بزانێ، كەچی هیچ شەرمو شكۆیەك لەو خوای گەورەیە ناكەن، كەبە هەناسە بێ ئاگا نییە لەحاڵیان وە زۆرباش ئاگای لێیانە، لەو كاتەدا كە خەریكی درۆو دەلەسەو شایەتی ناهەقو قسەی ناڕەوان كە بەهیچ جۆرێ خوای گەورە ڕەزای لەسەر قسەی وا ناڕەوا نییە خودای گەورە بەزانینی خۆی ئابلۆقەی كارو كردەوەی ئەوانەی داوە.

١/١٥٤٠/٥– وعن أبي هُريرةً رضي اللّٰه عَنْهُ قالَ: قالَ رسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (تَجدُونَ النَّاسَ معادِنَ: خِيارُهُم في الجاهِلِيَّةِ خيارُهُم في الإسْلامِ إذا فَقُهُوا، وتجدُونَ خِيارَ النَّاسِ في هذا الشَّأنِ أشدَّهُمْ لهُ كَراهِيةً، وتَجدُونَ شَرَّ النَّاسِ ذا الوجْهيْنِ، الذي يأتي هؤلاءِ بِوجْهِ وَهؤلاءِ بِوَجْهِ) متفقٌ عليه[٥].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویێ: سەرنج دەدەن ئەم خەڵكە وەك كان وان، هەركەسەیان ڕەگەزی دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەكی خانەدان، یان بنەچەی دەچێتەوە سەر بەرەبابێكی ناڕەسەن، وە بەزۆری كردارو ڕەفتاریان لەحاڵی ژیانیانا بەپێی ڕەسەنیو

---

[٥] بوخاری (٣٤٩٣) موسلیم (٥٢٢٦).

نارِەسەنییانە، جا بۆیە ئەوانەی لەسەردەمی نەزانی دا ڕەسەنو باش بوون ئێستاش لەسەردەمی ئیسلامەتی دا دیسان ڕسەنو باش دەردەچن، بەمەرجێ ئەوە کە شارەزابنو ببن بە زاناو مامۆستا لەشەریعەت دا وەهەروەها سەرنج دەدەن باشترین کەس بۆ ئەم کارە کە ئایینی ئیسلامە ئەو کەسانەن کە لەپێش دا حەزیان لێی نەبووەو زۆریش ڕقیان لێی بووە تاکاتێ دەکەونە ناوی دەبنە باشترین دۆستی، هەروەها سەرنج دەدەن کە بەدترین کەس بۆئەم کارە ئادەمیزادی دوو ڕووە، کەلەلای ئێوە قسەیەك دەکاو لەلای ئەوان قسەیەکی تر دەکاو بەپێی سوودو قازانجی خۆیان گفت دەگۆڕن!
(ش=شەیخان=بوخاریو موسلیم).

٢/١٥٤١/٦- وعنْ محمدِ بن زَيْدٍ أنَّ نَاسًا قَالُوا لجَدِّهِ عبدِ اللّٰه بنِ عُمْرو رضي اللّٰه عنْهما: إنَّا نَدْخُلُ عَلَى سَلاطِينِنا فنقولُ لَهُمْ بِخلافِ ما نتكلَّمُ إذَا خَرَجْنَا مِنْ عِندِهِمْ قال: كُنَّا نعُدُّ هذا نِفَاقاً عَلَى عَهْدِ رسولِ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم. رواه البخاري[٦].

موحەممەدی کوڕی زەید فەرمووی: چەند کەسێ بەباپیرەم (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)یان گوت: ئێمە کەدەچین بۆلای کاربەدەستەکانمان لەڕوو قسەیەکیان بۆ دەکەین، وەك ئەوە تاریفیان دەکەین بەڵام لەپاشە ملە قسەیەکی تریان بۆ دەکەین، وەك ئەوە زەمیان دەکەین، ئایا ئەمە پێی دەڵێن چی؟ فەرمووی: ئێمە ئەمەمان لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) بەدوو ڕوییو نیفاقو ناپاکی دادەنا. (ب=بوخاری).

### ٢٦٠- درۆکردن نادروستە - باب تحريم الكذب

قال اللّٰه تعالى: {ولا تقف ما ليس لك به علم}. (٣٦-سورة الإسراء).
بڕوانە سەرەتای زنجیرە ٢٤٥.
وقال تعالى: {ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد}. (٥٠/١٨-سورة ق).

---

[٦] بوخاری (٧١٧٨).

بڕوانە سەرەتای زنجیرە ٢٤٥.

١٥٤٢/١/٧- «إنَّ الصِّدْقَ يهْدِي إلى.....» (بڕوانە ٥٤/١ ز/٤).

١٥٤٣/٢/٨- فەرمووده‌ی: «أَرْبعٌ منْ كُنَّ فِيهِ،....» بڕوانە ٦٩٠/٢ ز/٨٦).

١٥٤٤/٣/٩- وعن ابن عباسٍ رضي اللَّه عنْهُما عن النبـيُّ صَـلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم، قالَ: (مَنْ تَحلَّمَ بِحُلْم لَمْ يرَهُ، كُلِّفَ أنْ يَعْقِدَ بيْن شَعِيرتين، ولَنْ يفْعَلَ، ومن اسْتَمَع إلى حديثِ قَوْم وهُمْ لَهُ كارِهُونَ، صُبَّ في أُذُنَيْهِ الآنُكُ يَـوْمَ القِيامَـةِ، ومَـنْ صوَّر صُورةً، عُذِّبَ وَكُلِّفَ أنْ ينفُخَ فيها الرُّوحَ وَلَيْس بِنافخٍ) رواه البخاري[٧].

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خوایـان لـێ بـێ) دەفـەرموێ: حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: هەرکەسـێ خـەونێ بـەدرۆ هەڵبەسـتێ لـە ڕۆژی قیامـەتا داوای لێدەکرێ کە دوو دەنکە جۆی ئاگرین بەیەکەوە گرێ بدا، هـەرگیز ئەوەشـی بۆناکرێ، هەرکەسیش گوێ لەچپەی کۆمەڵێ بگرێ کە خۆیان پێیان نـاخۆش بـێ کـە ئـەو گوێیـان لێڕابگـرێ ئـەوە لـەڕۆژی قیامـەت دا قورقـوشمی سـورەوەکراوی تـواوە دەکرێتـە نـاو کرکراگـەی هـەردوو گوێچـکەیەوە. هەرکەسێکیش وێنەیێ بکێشێو ڕەسمی حـەیوانێ دروست بکا ئـەوا لـەڕۆژی ژینەوەدا ئازاری دەدرێو زۆری لـێ دەکەن کە دەبێ گیانی بکا بەبەردا، دیـارە کـە ئەوەشـی بۆنـاکرێ. (بڕوانـە: تـاج بـەرگی/٤ ل/١٦٤ + تەجریـدی بوخـاری بەرگی/٢ ژمارە/٩٥٥ + ریاض ژمارە/٢٥٧٧).

١٥٤٥/٤/١٠- وعن ابنِ عُمرَ رضي اللَّه عنْهُما قالَ: قال النبيُّ صَـلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (أفْرَى الفِرَى أنْ يُـرِيَ الرجُـلُ عيْنَيْـهِ مـا لَـمْ تَرَيـا). رواهُ البخـاري. ومعناه: يقولُ: رأيتُ فيما لم يره[٨].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: درۆترین درۆی داتاشراوی هەرە گەورەو هـەلاتی فـرە زل ئەوەیـە کەسـێ بڵـێ من ئەوەم بەچاوی خۆم دییوە وەنەیشی دیبێ، یا بڵێ لەخـەونا ئـەوەم دیـوە،

---

[٧] بوخاری (٧٠٤٢).

[٨] بوخاری (٣٥٠٩).

وەنەیشی دیبێ! (بوخاری – ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری). بڕوانە ژمارە/٨٤٤/٧/ ز/١٤٠).

٥/١٥٤٦/١١– وعن سَمُرَةَ بن جُنْدُبٍ رضي اللّٰه عَنْهُ قالَ: كانَ رَسُولُ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم مِما يُكْثِرُ أنْ يقولَ لأصحابِهِ: «هَلْ رَأَى أحدٌ مِنكُمْ مِن رؤيا؟» فيقُصُّ عليهِ منْ شاءَ اللّٰه أنْ يقُصَّ. وَإِنَّهُ قال لنا ذات غَداةٍ: «إنَّهُ أتاني اللَّيْلَةَ آتيان، وإنَّهُما قالا لي: انطَلِقْ، وإنِّي انْطلَقْتُ معهُما، وإنَّا أتَيْنا على رجُلٍ مُضْطَجِعٍ، وإذا آخَرُ قَائِمٌ عَلَيْهِ بِصَخْرَةٍ، وإذا هُوَ يَهْوِي بالصَّخْرَةِ لِرَأْسِهِ، فَيثْلَغُ رَأْسهُ، فَيتَدَهْدَهُ الحَجَرُ هاهُنا. فيتبعُ الحَجَرَ فيأْخُذُهُ، فلا يرجِعُ إلَيْه حَتَّى يَصِحَّ رَأْسُهُ كما كان، ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ، فَيفْعَلُ بهِ مِثْلَ ما فَعَل المَرَّةَ الأولى،» قال: قلتُ لهما: سُبْحانَ اللّٰهِ، ما هذان ؟ قالا لي: انْطَلِقْ انْطَلِقْ، فانْطَلَقْنا. فأَتَيْنا عَلى رَجُل مُسْتَلْقٍ لقَفَاه وَإذا آخَرُ قائمٌ عليهِ بكَلُّوبٍ مِنْ حَديدٍ، وإذا هُوَ يَأْتي أحَد شِقَّيْ وَجْهِهِ فيُشَرْشِرُ شِدْقَهُ إلى قَفاهُ، ومنْخِرهُ إلى قَفاهُ، وَعينَهُ إلى قَفاهُ، ثُمَّ يتحوَّل إلى الجانبِ الآخرِ فَيفْعَل بهِ مثْلَ ما فعلَ بالجانب الأول، فَما يَفْرُغُ مِنْ ذلكَ الجانب حتَّى يصِحَّ ذلكَ الجانِبُ كما كانَ، ثُمَّ يَعُودُ عليْهِ، فَيفْعَل مِثْلَ ما فَعلَ في المَرَّةِ الأولى. قال: قلتُ: سُبْحَانَ اللّٰه، ما هذان ؟ قالا لي: انْطلِقْ انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنا. فأتَيْنا عَلى مِثْل التَّنُّور فَأَحْسِبُ أنهُ قال: فإذا فيهِ لَغَطٌ، وأصْواتٌ، فَاطَّلَعْنا فيهِ فَإذَا فِيهِ رجالٌ ونساء عُراةٌ، وإذا هُمْ يأتِيهِمْ لَهَبٌ مِنْ أَسْفلِ مِنْهُمْ، فإذا أتَاهُمْ ذلكَ اللَّهَبُ ضَوْضَوُا، قلتُ ما هؤلاءِ ؟ قالا لي: انْطَلِقْ انْطَلِقْ، فَانْطَلقْنا. فَأتَيْنا على نهرٍ حسِبْتُ أنهُ كانَ يقُولُ: (أَحْمرُ مِثْلُ الدَّمِ، وإذا في النَّهْرِ رَجُلٌ سابِحٌ يَسْبحُ، وَإذَا على شَطِّ النَّهْرِ رجُلٌ قَد جَمعَ عِندَهُ حِجارَةً كَثِيرَة، وإذا ذلكَ السَّابِحُ يسبح ما يَسْبَحُ، ثُمَّ يأتِي ذلكَ الذي قَدْ جَمعَ عِنْدهُ الحِجارَةَ، فَيفْغَرُ لَهَ فاهُ، فَيُلْقِمُهُ حجراً، فَيَنْطَلِقُ فَيَسْبَحُ، ثُمَّ يَرْجِعُ إليهِ، كُلَّما رجع إلَيْهِ، فَغَر فاهُ لهُ، فَألْقمهُ حَجَراً، قلت لهما: ما هذان ؟ قالا لي: انْطلِقْ انطلِق، فانْطَلَقنا. فَأَتَيْنا على رَجُلٍ كريهِ المَرْآةِ، أوْ كأكْرَهِ ما أنت رَاءٍ رجُلاً مَرْأًى، فإذا هو عِنْدَه نارٌ يحُشُّها وَيسْعى حَوْلَها، قلتُ لهما: ما هذا ؟ قالا لي: انْطَلِقْ انْطلِقْ، فَانْطَلقنا. فَأتَينا على رَوْضَةٍ مُعْتَمَّةٍ فِيها مِنْ كلِّ نَوْرِ الرَّبيعِ، وإذا بيْنَ ظَهْرَي الرَّوضَةِ رَجلٌ طويلٌ لا أكادُ أرى رأسَهُ طُولاً في السَّماءِ، وإذا حوْلَ الرجلِ منْ أكْثرِ ولدان

ما رَأَيْتُهُمْ قطٌّ، قُلتُ: ما هذا ؟ وما هؤلاءِ ؟ قالا لي: انطَلقْ انْطَلِقْ فَانْطَلقنا. فأتيْنَا إلى دَوْحةٍ عظِيمَة لَمْ أر دَوْحةً قطٌّ أعظمَ مِنها، ولا أحْسنَ، قالا لي: ارْقَ فيها، فَارتَقينا فيها، إلى مدِينةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهبٍ ولبن فضَّةٍ، فأتينَا باب المَدينة فَاسْتفتَحْنَا، فَفُتحَ لَنا، فَدَخَلناهَا، فَتَلَقَّانَا رجالٌ شَطْرٌ مِن خَلْقِهم كأحْسنِ ما أنت راءٍ، وشَطرٌ مِنهم كأَقْبحِ ما أنتَ راءٍ، قالا لهم: اذهبوا فقعُوا في ذلك النَّهر، وإذا هُوَ نَهرٌ معتَرِضٌ يجْرِي كأن ماءَهُ المحضُ في البياض، فذَهبُوا فوقعُوا فيه، ثُمَّ رجعُوا إلينا قد ذَهَب ذلكَ السُّوءُ عَنهمْ، فَصارُوا في أحسن صُورةٍ.قال: قالا لي: هذه جَنَّةُ عدْنٍ، وهذاك منزِلُكَ، فسمَا بصَري صُعداً، فإذا قصر مِثلُ الرَّبابة البيضاءِ. قالا لي: هذاك منزِلُكَ. قلتُ لهما: بارك اللّه فيكُما، فَذراني فأدخُلَه. قالا: أما الآن فلا، وأنتَ داخِلُهُ. قلت لهُما: فَإنِّي رأَيتُ مُنْذُ اللّيلة عجباً ؟ فما هذا الذي رأيت ؟ قالا لي: إنَا سَنخبِرُك. أمَّا الرجُلُ الأوَّلُ الذي أتَيتَ عَليه يُثلَغُ رأسُهُ بالحَجر، فإنَّهُ الرَّجُلُ يأخُذُ القُرْآنَ فيرفُضُه، وينامُ عن الصَّلاةِ المكتُوبةِ. وأمَّا الذي أتَيتَ عَليْهِ يُشرْشرُ شِدْقُه إلى قَفاهُ، ومَنْخِرُه إلى قَفاهُ، وعَيْنهُ إلى قفاهُ، فإنه الرَّجُلُ يَغْدو مِنْ بَيْته فَيكذبُ الكذبةَ تبلُغُ الآفاقَ. وأمَّا الرِّجالُ والنِّساءُ العُراةُ الذين هُمْ في مِثل بِناءِ التَّنُّور، فإنَّهم الزُّناةُ والزَّواني. وأما الرجُلُ الَّذي أتَيْت عليْهِ يسبَحُ في النهْرِ، ويلْقمُ الحِجارة، فإنَّهُ آكِلُ الرِّبا. وأمَّا الرَّجُلُ الكَريهُ المَرآةِ الذي عندَ النَّار يَحُشُّها ويسْعى حَوْلَها فإنَّهُ مالِكُ خازنُ جهنَّمَ. وأما الرَّجُلُ الطَّويلُ الَّذي في الرَّوْضةِ، فإنه إبراهيم، وأما الولدانُ الذينَ حوْله، فكلُّ مُولُود ماتَ على الفِطْرَةِ) وفي رواية البَرْقَانِي: (وُلِد على الفِطْرَةِ). فقال بعض المسلمينَ: يا رسول اللّه، وأولادُ المشركينَ ؟ فقال رسولُ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «وأولادُ المشركينَ). وأما القوم الذين كانوا شطر منهم حسن وشطر منهم قبيح فإنهم قوم خلطوا عملاً صالحاً وآخر سيئاً تجاوز الله عنهم. رواه البخاري. وفي رواية له: (رأيتُ اللّيلَةَ رجُلَين أتَياني فأخرجاني إلى أرْضٍ مُقدَّسةٍ) ثم ذكَره. وقال: (فانطَلَقْنَا إلى نَقبٍ مثل التنُّور، أعْلاهُ ضَيِّقٌ وأسْفَلُهُ وَاسعٌ، يَتوَقَّدُ تَحتهُ ناراً، فإذا ارتَفعت ارْتَفعُوا حتى كادُوا أنْ يَخرُجوا، وإذا خَمدت، رَجَعُوا فيها، وفيها رجالٌ ونساء عراةٌ. وفيها: حتى أتَينَا على نَهرٍ من دَم، ولم يشك

فيه رجُلٌ قائمٌ على وسط النَّهرِ، وعلى شطِّ النَّهر رجُلٌ، وبيْنَ يديهِ حجارةٌ، فأقبل الرَّجُلُ الذي في النَّهرِ، فَإذا أراد أنْ يخْرُجَ، رمَى الرَّجُلُ بِحجرٍ في فِيه، فردَّهُ حيثُ كانَ، فجعلَ كُلَّمَا جاءَ ليخرج جعَلَ يَرْمي في فيه بحجرٍ، فيرْجِعُ كما كانَ.وفيهَا: (فصعدا بي الشَّجَرةَ، فَأدْخلاني داراً لَمْ أر قَطٌّ أحْسنَ منْهَا، فيها رجالٌ شُيُوخٌ وَشَباب). وفِيهَا: (الَّذي رأيْتهُ يُشقُّ شِدْقُهُ فكَذَّابٌ، يُحدِّثُ بالْكذبةِ فَتُحمَلُ عنْهُ حتَّى تَبْلُغَ الآفاق، فيصْنَعُ بهِ ما رأيْتَ إلى يوْم الْقِيامةِ). وفيها: (الَّذي رأيْتهُ يُشْدَخُ رأسُهُ فرجُلٌ علَّمهُ اللَّه الْقُرآنَ، فنام عنهُ بِاللَّيْلِ، ولَمْ يعْملْ فيه بِالنَّهَارِ، فيُفْعلُ به إلى يوم الْقِيامةِ). والدَّارُ الأولى التي دخَلْتَ دارُ عامَّةِ الْمُؤمنينَ، وأمَّا هذه الدَّارُ فدَارُ الشُّهَداءِ، وأنا جِبْريلُ، وهذا مِيكائيلُ، فارْفع رأسَك، فرفعتُ رأْسي، فإذا فوقي مِثلُ السَّحابِ، قالا: ذاكَ منزلُكَ، قلتُ: دَعاني أدْخُلْ منزلي، قالا: إنَّهُ بَقي لَكَ عُمُرٌ لَم تَستكمِلْهُ، فلَوْ استَكْملته، أتيت منْزِلَكَ) رواه البخاري[9].

سەموورەی كوڕی حوندوب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) گەلێ جاران بەیارانی خۆی دەفەرموو: كەستان خەونێكی بینیوە تا بیگێڕێتەوە بۆمان؟ جا ئەوكەسەی كەمەیلی خودای لەسەربوایە خەوی خۆی بۆحەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەگێڕایەوە. هەتا بەیانییەك خۆی بە ئێمەی فەرمووی: ئەدی من ئەمشەو دوو فریشتە هاتن بۆلام پێیان گوتم: وەرە منیش لەگەڵیان دا ڕۆیشتم هەتا گەیشتینە لای كابرایێ لەسەر گازەرەی پشت ڕاكشابوو، پیاوێكی تریش خڕكێكی (خڕك: بەردێكە پڕ بەمشت – فەرهەنگی خاڵ) پێ بوو، لەسەر سەری وەستا بوو، تلە بەردەكەی دەماڵی بەتەپڵی سەری دا، ئیتر كەللەی شەقو پەق دەبوو، گشت جارێ كە پەڵە بەردەكەی دەكێشا بەسەری كابرادا بەردەكە خلۆر دەبۆوەو گل دەبوەوە بەملاو بەولادا، ئەویش دوای دەكەوتو ئەچوو ئەیهێنایەوە، تا دەهاتەوە سەری كابرا وەك خۆی ساڕێژ دەبوەوەو وەك جاران چاك دەبوەوە جا ئەویش دیسان دەیكێشایەوە پیاداو وەك جاری جارانی لێ دەكردەوە! فەرمووی (دروودی

---

[9] بوخاری (٧٠٤٧).

خوای لەسەر بێ) پێیانم گوت: نامەخوا لەکاری خوا چەند سەیرە! ئەمە چییە؟ فەرموویان پێم: جارێ بابڕۆین، جا ڕۆیشتین تا چوینە لای کابرایەکی تر، لەسەر گازەرەی پشت پاڵ کەوتبوو زەلامێکی تریش بەقولاپێکی ئاسنەوە بەسەر سەریەوە ڕاوەستا بوو خۆش خۆش پەلاماری لایێ لەڕووی کابرای ژێردەستی دەداو بەقولاپەکە لالغاوەی هەتا پشتە ملیو کونە چاوی هەتا پشتملی هەڵ دەتلێشان، ئینجا دەیگواستەوە بۆئەولاکەی تری ئەویشی والێ دەکرد ئیتر تا ئەم لای وا لێ دەکردەوە ئەولاکەی تری چاك دەبووەوەو وەك خۆی لێ دەکردەوە! ئیتر هەروەها. فەرمووی: گوتم: نامە خوا سەیرە! ئەم دووانە چین؟ پێیان فەرموومەوە جارێ برۆ، جا ڕۆیشتین هەتا چوینە دیار شتێ وەك تەندوور وابوو، وابزانم فەرمووی: زڵە زڵو دەنگە دەنگی لێوەدەهاتو پڕی لەقاوقیژ بوو کەسەیری ناوەکەیمان کرد پڕبوو لەپیاوو ژنی ڕووتو قوت لە ژێریانەوە بڵێسەی ئاگر زمانەی دەکێشاو بۆیان دەچوو جا کە ئاگرە سوورەکە پەلاماری دەدان هاواریان لێهەڵدەساو دەیان کرد بەهەراو زەنا! گوتم: ئەمانە چین؟ پێیان گوتمەوە: جارێ بابڕۆین، ئەوسا کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە سەر قەراغ ڕووبارێ، وا دەزانم فەرمووی: چۆمەکە سورێکی تلیقی بوو وەکوو خوێن. کابرایەکی مەلەوان لەناوی دا مەلەی دەکرد، پیاوێکیش لەسەر لێواری چۆمەکە پەڵە بەردێکی زۆری لەبەر دەستا بوو گشت جارێ کە کابرای مەلەوان بەمەلە دەهات دەچوو بۆلای ئەوەی کە کۆمەڵە بەردەکەی لەلابوو، دەمی بۆی دادەچەقاند ئەویش بەردێکی دەکێشا بەناو دەمیا، دەیخنیە ناو دەمیو تەسی پێ دەکردەوە بۆ شوێنی پێشووی، ئیتر هەموو جارێ لەسەر ئەم شێوەیە تلێکی دەماڵی بەدەمو قەپۆزیا، کابرا دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، پێیانم گوت: ئەم دوانە چین؟ پێیان فەرمووم: بابڕۆین، دیسانەوە کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە لای زەلامێکی ئێسك قورس یا فەرموی: کە زەلامێکی ڕەزا قورسی وا لەوە ڕەزا قورستر بەچاوی خۆت نەبینیبێ! ئاگرێکی لەبەردەم دا بوو خۆش خۆش هەر ئاگرەکەی خۆش دەکردو بەدەوری دا دەهات پێم گوتن ئەمە چییە؟

فەرموویان پێم: جارێ بابڕۆین، دیسانەوە کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە ناو مێرگو مێرغوزارو باخێکی چڕ، پڕ بوو لەهەموو جۆرە گوڵو گوولێکی بەهارە، تەماشامان کرد وا لەناوەڕاستی باخەکەدا پیرە مێردێکی بالآبەرز لەبن شێخەڵێکی گەورەدا دانیشتبوو، ئەم ئیختیارە ئەوەندە قوچو درێژ بوو، سەریم بەئاستەم لەئاسمانا دەبینی، منالێکی زۆرو بێشوماری لەدەور بوو، قەد کۆمەڵە منالی وا زۆرم نەدیوە، گوتم: ئەم پیاوە چییەو ئەم منالانە چین؟ پێیان فەرمووم: جارێ بابڕۆین، ڕۆیشتین تا چوینە لای شا درەختێکی گەلێ گەورە کە لەژیانم دا شا درەختی وا گەورەو جوانم قەت نەدیوە، پێیان فەرمووم: ئادەی پیادا سەرکەوە! جا بەو شێخەڵەدا سەرکەوتین، گەیشتینە لای شارێ، دیوارەکانی لە خشتێکی زێرو لە خشتێکی زیو دروست کرابوو، جا چووینە بەر دەروازەی دەرەوەی شارەکەو لەدەرگای شارەکەمان داو، داوای کردنەوەمان کردو دەرگاکەیان بۆمان کردەوەو چووینە ناوی، توشمان بوو بە توش پیاوگەلێکی گەلێ سەیرەوە، نیوەی لەشیان تا بڵێی جوان بوو، ئەو نیوەکەی تریشیان تا بڵێی ناشیرین بوو، دوو فریشتەکە پێیان گوتن: ئادەی بڕۆن خۆتان بخەنە ناو ئەو چەمەوە، چەمەکە رووبارێکی پانو پۆڕ بوو، ئاوەکەی پڕ بە پانایی چەمەکە دەکشاو دەڕۆی، ئاوەکەی ئەوەندە سپی بوو دەتگوت چڕی خوڕی شیرە! ئەوانیش چوون خۆیان هەڵکێشا لەو ئاوە لەپاشا هاتنەوە بۆلای ئێمە، یەك دەنك چییە ناشیرینیان پێوە نەمابوو ئەوەندە جوان بوو بوون نەبێتەوە! چووبوونە جوانترین شێوە. فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوجا فەرموویان پێم: ئەم شارە بەهەشتی مانەوەی یەکجارییە، هۆ ئا ئەوەش لەوسەرەوە هەوارگەی تۆیە، کە چاوم سەرەو ژوور هەڵبڕی، وا کۆشکێکی بالا بە ئاسمانەوە دیارە، دەڵێی پەڵە هەوری سپییە، گوتیان پێم: ئەو تەلارە شوێنی تۆیە،

گوتم پێیان: پیرۆزیی خوداتان لێ بێ، دەی وازم لێبێنن با بۆخۆم بچمە ناوی، فەرموویان: هەر دەچیتە ناوی وەلێ ئێستاکە نا. پێیانم گوت: بەڕاستی ئەم شەو من شتی سەیرو عەنتیکەم بینی، ئەرێ پێم نالێن ئەمە چی بوو

کەمن دیم؟ پێیان فەرمووم: بەڵێ، وا هەواڵت دەدەینێ پیاوی یەکەم کەدیت بەبەرد سەریان دەشکاند ئەوە ئەو پیاوەیە کە لەپێشا قورئان لەبەر دەکاو لەپاشا لەبیری خۆی دەباتەوەو دەوری ناکاتەوە تا لەبیری نامێنێو لەهەمان کات دا نوێژی فەرزیش بۆ خەو دەچێنێ! ئیتر ئەمە هەتا ڕۆژی قیامەت هەروای لێدەکرێ.

ئەو کابرایەش کە چووین بەسەری دا، لا لغاوو لووتو چاویان هەتا پشتەملی دەدڕی، ئەوە ئەو پیاوەیە کە لەماڵ دەردەچێو درۆیێ هەلاتێ هەڵدەبەستێو لەدەمی ئەوەوە بەهەرچوار لادا بڵاو دەبێتەوە! ئەویش هەتا ڕۆژی قیامەت ئەوە حاڵیەتی.

ئەو پیاوگەلو ژنگەلە ڕووتو قوتانەش کەلەناو نیمچە تەنوورخانەکەدا بوون ئەوانیش پیاوی شەرواڵ پیسو ژنی داوێن پیس بوون.

ئەو کابرایەش کەدیت لەناو چۆمەکەدا مەلەدەکاو بەردی دەرخوارد دەدەن ئەوە سوو خۆر بوو.

زەلامە ڕەزا تاڵەکەش کەخۆش خۆش ئاگرەکەی خۆش دەکردو لەدەوری ئەهاتو ئەچوو ئەویش مالیکی ئاگردانی دۆزەخ بوو.

پیاوە کەڵەگەتەکەش کەلەناو باخەکەدا بوو ئەویش ئیبراهیم بوو دروودو سڵاوی خوای لەسەر بێ ئەو منداڵانەشی کە لەدەوری بوون، ئەوە ئەو منداڵانە بوون کەلەسەر ئایینی سروشتی خواکرد مردبوون کە ئایینی پاکی ئیسلامە.

لە گێڕانەوەیەکی تری بەرقانی دا: ئەوە ئەو منداڵانەبوون کەلەسەر ئیسلامەتی لەدایك بوون، جا بازێ لەموسوڵمانان گوتیان: ئەدی باشە قوربان ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی منداڵی هاوبەشپەیدا کەرەکانو منداڵانی ناموسوڵمانەکان چی؟ فەرمووی: منداڵانی ئەوانیش حاڵیان حاڵی منداڵە موسوڵمانەکانە.

ئەو کۆمەڵە پیاوەش کە لایەکی لەشیان جوانو لایەکی لەشیان ناشیرین بوو ئەوانەن کەلە چاكو خراپ تێیان گوشیوەو کردەوەی باشو کردەوەی

خراپیان هەیە، ئەوەبوو خودا چاوپۆشی لێکردن‌و لێیان خۆش بوو. (بوخاری – ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).

لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاری دا (کە ئەمە دەقەکەیەتی لە تاجول ئوصول دا): سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کە نوێژی بەیانی بۆمان دەکرد، ڕووی تێ دەکردین‌و دەیفەرموو: کەستان ئەمشەو خەونی نەدیوە؟ جا ئەگەر کەسێ خەونێکی بدیبایە ئەوا ئەیگێڕایەوە، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوەندەی خوا مەیلی لەسەر بوایە لێکی دەدایەوەو خەو پەرژینی دەکرد. جا ڕۆژێ لێمانی پرسی، فەرمووی: ئەرێ کەستان خەونی دیوە؟ عەرزیمان کرد: نەخێر، فەرمووی: بەڵام من ئەم شەو لە خەونم دا دوو پیاوم دی هاتن‌و دەستیان گرتم‌و بردمیان بۆ خاکی پاکی پیرۆز، بۆ وڵاتی شام، لەوێ تەماشام کرد وا کابرایێ دانیشتووەو پیاوێکیش قولاپێکی ئاسنینی بەدەسەوەیە... تا دەگاتە ئەوەی: کە دەفەرموێ: جا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە لای کونێ لەسەرەوە تەسك‌و لەبنەوە پان‌و دەڵب بوو، تەماشام کرد پڕبوو لەپیاوو ژنی زۆر، ئاگر لەژێری دا دەسووتاو بڵێسەی ئاگرەکە نێڵە نێڵی دەهات، جا کەتاوی دەسەند ئاوەکەی ناوی دەکوڵاو قوڵپە قوڵپی دەکردو زەلامەکانی ناوی وەك دەنکی دانوولەی سەر ئاگر چۆن چۆن لەکاتی قوڵتە قوڵت دا هەڵبەزو دابەز دەکا ئەوانیش ئاوا بەرز دەبوون‌و خەریك بوو هەڵبچن! بەڵام کە گرپەو کڵپەی ئاگرەکە کپ دەبوو دەکەوتنە بنەکەی، گوتم: ئەمە چییە؟ گوتیان جارێ برۆ، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەر ڕووبارێکی خوێن، کابرایێ لەناوی دا بەپێوە وەستا بوو، پیاوێکیش لەسەر قەراغی چۆمەکە بوو، خرە بەردێکی زۆری لەبەردەست دا بوو، گشت جارێ کە کابرای ناو چۆمەکە دەهات دەربچێ لێی کە دەگەیشتە لای ئەو بەردێکی چاکی دەماڵی بەناو دەمیاو تەسی پێ دەکردەوە بۆ شوێنی پێشوی، ئیتر هەموو جارێ هەروا، گوتم: ئەی ئەمە چییە؟ گوتیان: جارێ برۆ، جا کەوتینە ڕێ هەتا گەیشتینە لای باخێکی سەرتاپا سەوز، درەختێکی گەورەی تێدابوو (ناوی سیدرەتولونتەها) بوو، واتە: دارمۆردی هەرە ئەوپەڕ،

پیره مێردێکی نورانی لەبن دا بوو، منداڵێکی زۆر زۆری لەدەور بوو، پیاوێکی تریش لەنزیك درەختەکەوە ئاگرێکی لەبەردەم دا بوو، هەر ئاگرەکەی خۆش دەکرد، ئینجا دوو فریشتەکە منیان بەو شێخەڵەدا سەرخستو بردمیانە ناو خانوویەکەوە، قەت خانووی وا جوانم نەدیووە، پڕیبوو لە پیاوی پیرو لە لاوو لەژنو لە مناڵ، ئەنجا لەویٚ هێنامیانە دەرەوەو دیسان بە شێخەڵەکەدا زیاتر سەریان خستمو بردمیان تا بردمیانە ناو خانوویەکی ترەوە، کە گەلیٚ لەخانووی پێشوو جوانترو باشتر بوو، پڕی لە پیرو لاو بوو، ئەوجا گوتم: ئەریٚ ئەم شەو منتان سوڕانەوە، دەپێمبڵێن ئەمەی من دیم چی بوو؟ فەرموویان: بەڵیٚ، باشە ئەوەی کە دیت لا شویلگەیان هەڵ دەدڕی ئەوە ئەو درۆزنەیە کە درۆییٚ هەڵدەبەستیٚو لەدەمی ئەوەوە دەماو دەم دەکەویٚ بەگشت لادا بڵاو دەبێتەوە. ئیتر ئەوە هەتا رۆژی قیامەت هەرەوای لیٚ دەکریٚ، ئەوەیشی کەدیت سەریان دەشکاند ئەوە ئەو پیاوەیە کە خودای گەورە فێری قورئانی کردووە کەچی بەشەو دەخەویٚو دەوری ناکاتەوەو بەڕۆژیش ڕەفتاری پیٚ ناکا، تا رۆژی قیامەت هەرەوای لیٚ دەکریٚ، ئەوانەشی کەلەناو جوڕنە[10] کەدا بوون ئەوانە شەڕواڵپیسەکان بوون، ئەوەیشی کەلەناو چۆمەکەدا دیت بەردەکەیان دەماڵی بەدەمو فلچیا، ئەوە سوو خۆر بوو، پیرەمێردەکەی ژێر درەختەکەش ئیبراهیم بوو دروودو سڵاوی لیٚ بیٚ، مناڵەکانی دەوریشی منداڵانی ئەو خەڵکە بوون، واتە: ئەو منداڵانەن کە لەپێش ڕەسیدەبوون دا دەمرن ئەو پیاوەیش کە لەنزیکی درەختەکەوە ئاگرکەی خۆش دەکرد ئەوە مالیکی وەردیانی دۆزەخ بوو، خانووی یەکەمیش کە چویتە ناوی خانوی سەرتاپای تێکڕای موسوڵمانان بوو، ئەم خانووە هەرە بەرزو چاكو نایابەش ماڵی شەهیدانە! منیش جوبرائیلمو ئەمەیش کەوا لەگەڵم دا میکائیلە، ئادەی سەرت هەڵبڕە، کە سەرمم هەڵبڕی لەژوور سەرمەوە شتێکم دی وەك پارچە هەور وابوو بەحەواوە، فەرموویان:

---

[10] جوڕنە: جوڕنی حەمام عەماری ئاوە گەرمەکەیەتی.

ئەوەیش بەو بەرزەوە هەوارو بارەگای تۆیـە، گوتم: دەلێمگەڕێن با بچمەوە ناو ماڵەکەی خۆم، فەرموویان هێشتا تەمەنت بەبەریەوە ماوە، کەی تەمەنت تەواو بوو دێیتە ناو ماڵی خۆت. (بوخاری ڕەحمەت لە گۆڕی نازداری).

ئەگـەر کەسـێ بەچـاوی ئینسـاف بـە لێزانانـە بـە وردی سـەرنجێکی دڵسۆزانەی تەرجەمەو وەرگێڕاوی ئەم حەدیثە درێژانە بدا، یاخود بـەوردی وردبێتـەوە لـەو حەمکە عیبارەتـە ڕەقـەو لـەو گشت وشـەگەلە سـەختەولەو حەمکە قسە نەستەقانەی کەوان لەناو زۆربەی مەتنو بڕبڕەو مۆرەغەی ئەم فەرمایشتانەدا، کەوان لـەناو ریـاض‌والصـالحینو تـاجول ئوصـولّو تەجریـدی بوخاری دا، ڕەزای خوا لەدانەرەکانیان بـێ کە لەسایەی خـوداوە بەنـدە وەك موسوڵمانێکی دڵسۆزی دڵپاكو کوردێکی دڵسۆزی ئـاوو خـاك وەرم گێڕاونەتـە سـەر زمـانی شـیرینی کـوردی، وە بـە کوردییـەکی پـەتی ڕەوانـی ڕەسـەن دامرشتوون، کە بەدیمەن خۆشو ئاسانە، بەڵام وەکی تر هەتا بڵێی سەختو گرانە، دەڵێم: ئەگەر کەسێ سەرنجێکی وردی ئاوا بگرێ، ئەگەر تۆزێ هەستی موسوڵمانێتیو مەردایەتیو نەتەوایەتی تێدابێ، بەزمانی قاڵو بەزمانی حاڵ دەڵێ:

**ئـــایین ڕەحمەتـــە، ئیســـلام گەوهـــەرە**
**زمـــان هونـــەرە، کـــوردی شـــەکەرە!**

هەروەك هەست دەکا کە ئەم تەرجەمەیـە پرۆژەیـەکی ئـایینیو ئـەدەبی زۆر فراوانو گەورەیـە، توانیویـەتی تـا ڕادەیـێ سـەرکەوتوانە کەلـەپوری ئـایینیو کۆمەڵایـەتیو ویـژەیی سـەدەی یەکـەمو دووەمـی ئیسـلام، زۆر بەباشـی رابگوێزێتەوە بۆسـەر زمـانی شـیرینی کوردیو پێشکەشی بکا بەنامەخانـەی ئاوەدانی کوردی، خودا بەمیهری خۆی ئاوەدانتری بکا... ئامیین.

دڵنیام هەندێ لەنوسەرە نۆکارە بێکارەکانمان بەندە بـە نۆکـەر دادەنـین، چونکە هەندێ نوسەری ئـاخر زەمـان پەیـدا بـوون، دەڵێـی جندۆکـەی چیای قافن! هەرچی (بسم الله)ی پێوە بێ ئەوان سڵی لـێ دەکەنو دەڵێن: هەتاکـەی ئـەم کۆنـە پەرستییە؟ هـەتا کـەی ئـەم بێگانـە پەرسـتییە؟ هـەتا کـەی ئـەم ئەفسانەو ئـوسـطورانـە؟ هەتاکـەی ئـەم قەوانـە کۆنانـە؟ هەیانـە دەڵـێ: مـن

بەپارەش ئەم کتێبانە ناخوێنمەوە! داخەکەم ئەم نووسەرە چەواشانە گەورەترین کۆسپی سەختو ناخۆشترین بەرهەڵستن کە ناهێڵن ئەم جۆرە کتێبە مەزنانە جێگەی خۆیان بگرن لەناو نامەخانەی کوردی دا! خوا یاربێ، نەبۆ ڕیایی‌و نەبۆ خۆپەسەندی دەڵێم، بەڵکوو بۆ بەیانی حاڵو ڕووی ڕاستی دەڵێم، مەگەر هەرخۆم بزانم بە چ چنگە کرێو کوێرەوەرییەك ئەم تەرجەمانەم بەئەنجام گەیاندووە، وەچەندە ئەرك‌و زەحمەتم پێوە کێشاون، لەناو چەند چەکمەچەو سندوق‌و دۆڵاب‌و پێچ‌و پەنادا شاردومنەتەوە تا نەسوتێن‌و نەفەوتێن، لەو شوێنانەی کەمن خەریکی ئەم ئەرکە پیرۆزە دەبووم ئەگەر قاچاخچیشم بەچەکەوە بکردایە هەرئەوەندە مەترسی بۆم دەبوو! هەیش بوو بەزمانەکەی خۆیان دەیفەرموو: ئەوە چۆن کفرێکە ئەم حەدیثە پیرۆزانە تەرجەمە دەکەی بەم زمانە هیچ‌و پووچەی خۆتان؟!

وەلێ من بڕوام بەخودای خۆم هەبوو، کەمن نە قاچاغچیم‌و نەکافرم، وەنە کۆنەپەرست‌و نە بێگانە پەرستم، بەڵکوو بە خزمەتی ئیسلام خوا یاربێ خوداو پێغەمبەرو موسوڵمانان لەخۆم ڕازی دەکەم، لەهەمان کات دا خزمەتی وێژەو زمان‌و ئایینی گەلی خۆشم دەکەم! بەئومێدی ئەوەی کە چاوپۆشی لەهەڵەو کەم‌و کورتیم بکەن!

لەکۆتایی ئەم قسەیەدا، من ئەم پرسیارە ئاڕاستەی ئەو پرۆفیسۆرە کوردانە دەکەم:

ئەم حەدیثانە کەمن تەرجەمەیان دەکەم بەگشت زمانە زیندووەکانی جیهان تەرجەمە کراون، وەك: ئینگلیزی، ڕووسی، فەڕەنسی، هیندی، صینی، فارسی، تورکی‌و ئیسپانی‌و...تاد. جا گوایە ئەم حەمکە گەل‌و میللەت‌و نوسەرو وەرگێڕانە گشتیان هەر کۆنە پەرست‌و تێنەگەیشتوو بوون؟!

برا! کورد گوتەنی: من بۆتۆمە، ئەی تۆ بۆ کێتە؟ کوڕە! مەردو گوردو کورد بن، بزانن نوسین‌و خوێندن‌و خوێندنەوە نان‌و ئاوی میللەتن هەتا زۆربن کەمن!

نامەخانەی کوردی وەکوو باخ‌و بیلاخ‌و مێرگ‌و مێرغوزاری تەڕی بەهاری کوردستان وایە، دەبێ لەهەموو جۆرە گوڵێکی ڕەنگ‌و بۆنداری تێدا بێ، گوڵی موتوربە کراوی لەگوڵی سادەی نازدارتر بێ!

من لەم ڕازو گلەییەدا ڕووی دەمم لە مرۆڤی موسوڵمان نییە، چونکە لەخودا بەزیاد بێ، ئەم کارەی من لەناو کۆمەڵگای ئیمان داران دا وەك چراو پەروانە وایە![1].

لەخوا داوادەکەم کە بەکەرەمی خۆی لەهەڵەی هەموو لایەکمان خۆش بێو لەخۆباییو چەواشەمان نەکا، وە ئەم وەرگەڕاوە پیرۆزانەیش بکا بەسەر مەشقو ڕچە شکێن بۆ ئایندەمانو بیانکا بە توێشووی هەردوو جیهانمان!.
دڵنیام لەوە کە نامەخانەی ئاوەدانی کوردی ڕۆژ بەڕۆژ لەگەشەکردنایە، لەبەرئەوە گومانی تێدانییە کەلە ئایندەیەکی پڕ لە خۆشیو ئاسودەیی دا کەڵە نوسەری کوردی مەردی موسوڵمانی پاکی وا پەیدا دەبێ، بەخامەی شەکەر ڕێزی خۆی ئەم جۆرە کتێبەکەم مانەندانە دەکاتە کوردی، کە ئەم کارە نیوەچڵو کەمو کوڕەی من لەچاو هی ئەودا وەك گڕوگاڵی منداڵ وادەبێ، وەلێ ئەم گوتەیە ڕەوایە:

**پاشینان گەرچی شاکاریان جوانە**

**وەلێ بەهرەی گەورە هی پێشینانە!**

وەرگێڕ – ١٩٩١/٩/٢٢

**٢٦١- باسی درۆی ڕەوا** (**باب بيان ما يجوز من الكذب**)

ئەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: بزانن هەرچەندە درۆ لەبنەڕەت دا حەرامەو ناڕەوایە، وەلێ هەندێ جاران لەبەر هەندێ مەبەست بەم مەرجانە دروستە:

١- لەبەر ئەوەی کە قسەو ئاخاوتن ئامرازو هۆی گەیشتن بەمرازو مەبەستن، هەر مرازێکی پەسەندو هەر مەبەستێکی باش، کەبەبێ درۆ پێك بێ، ئەوە درۆ کردن تێیدا دروست نییە، وەلێ ئەو مەبەستە ڕەوایەو ئەو

---

[1] ئەمڕۆ لەمزگەوتی گەورە ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، بەڕاستی کە ئەو هەمکە لاوە خوێن گەرمو ئازاو بەجەرگو لەخودا ترسم بینی، کەئاوا بۆ ئیسلام تێدەکۆشن، لەحاڵی خۆم تەریق بوومەوە، کەوا لەم پاییزی تەمەنەدا ئەوەندە خۆپەرستو گوێ لەمشتی نەفسو ئارەزوو بازیم. (وەرگێڕ)

غەرەزە شەرعی یە، ئەگەر بەبێ درۆ پێك نەدەهات ئەوا درۆ لەم كاتەدا دروستە.

٢ - ئەنجا ئەو مەبەستەش كە گوتمان بەبێ درۆ پێك نایەت ئەگەر مەبەستێكی ڕەوا (موباح) بوو ئەوا درۆكەشی ڕەوایەو موباحە، ئەگەر واجبو پێویست بوو ئەوا درۆكەیش واجبو پێویستە، وەك ئەوەی ستەمبارێ، زۆر لێكراوێ، خۆی یاماڵو سامانی، لەستەمكارێ، لە زۆرداری بشارێتەوەو مرۆڤێ حەشاری بداو بڵێ نەدیومەو نەئاگام لە سامانیەتی، یا وەك ئەوە كەسێ سامانو سپاردەیێ لەلای كەسێ دابنێو زۆرداری بیەوێ بەزۆر بیبات ئەوە لەم كاتانەدا درۆكە پێویستەو پێویستە لەسەری كە ئەو شتە حەشار بداو حاشای لێ بكاو ڕاستی لێ نەدا.

٣ - وەلێ ئەوە بێ كێشە ترەو دوور بینی زۆرترە، كە تەورییە بكا واتە: شوێنە گومكێ بكا، شوێنە گومكێ لەشەرعا بەوە دەڵێن: كە بەزار شتێ بڵێو بەدڵ مەبەستی شتێكی تر بێ، كە بەدیمەن قسەكەی درۆ بێ، بەلاّم لەڕاستی دا قسەكەی بەپێی نیازی دڵی راستو دروست بێ، وەك ئەوەی كە لێیان پرسی: ئەو كابرایە لەماڵی تۆیە؟ بڵێ، لەماڵی من نییە پرسیاركەر وا تێدەگا كە بەمەبەستی ماڵی دنیایەتی، بەلاّم ئەو مەبەستی ماڵی قیامەتی بێ، كە گۆڕە، هەرچەندە لەكاتی وادا شوێنە گومكێش نەكا قەیدی نییە، چونكە زاناكن وا دەفەرموون بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیە كەلەم شوێنەدا ڕابوورد:

➔ بەرگی/١ ل/٢١٩ ژ/٢-٢٤٩ ز/٣١.

## ٢٦٢- دەشێ مرۆڤ زۆر باش ورد بیتەوەو بچێتە بنجو بناوانی قسە نەوسا بیكا ئینجا بیگێڕێتەوە - باب الحثّ على التثبت فيما يقوله ويحكيه

قال اللّٰه تعالى: {ولا تقف ما ليس لك به علم}. (سورة الإسراء-٣٦).

وقال تعالى: {ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد}.(سورة ق - ١٨/٥٠).

تەفسیری ئەم دوو ئایەتە لەپێشەوە لەسەرەتای زنجیرە/٢٥٤ دا رابوورد).

١/١٥٤٧/١٢– وعنْ أبي هُريْرة رضي اللّه عنْـهُ أنَّ النبـيُّ صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم قال: (كفي بالمَرءِ كَذِباً أنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ ما سمِعَ) رواه مسلم [12].

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بیٚ) دەفـەرمویٚ: بەسە بۆ ئـەوەی پیـاو کـە پیٚـی بلـیٚن درۆزن، بـەبیٚ لیٚکدانـەوەو پـاكو پـیس کردن، هەرچی دەبیستیٚ بیگیٚڕیٚتەوە. (موسلیم – (رەزای خوای لیٚ بیٚ))

٢/١٥٤٨/١٣– وعن سَمُرة رضي اللّه عنْهُ قال: قال رسُـولُ اللّـه صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (منْ حدَّث عنِّي بِحَدِيثٍ يرَى أنَّهُ كـذِبٌ، فَهُـو أحـدُ الكَـاذِبين) رواه مسلم [13].

سەموورە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) دەفەرمویٚ: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بیٚ) دەفـەرمویٚ: هەرکەسـیٚ فـەرموودەییٚ لـەدەم منـەوە بگیٚڕیٚتـەوە وەلـیٚ لەدلـەوە بزانـیٚ کـە ئــەوە درۆیــەو بــەدەم منــەوە کــراوە، ئــەوە خۆشــی درۆزنیٚکــە وەك ئــەو درۆزنانە!(م).

٣/١٥٤٩/١٤– وعنْ أسْماءَ رضي اللّه عنْها أن امْرأة قالَتْ: يا رَسُول اللّه إنَّ لي ضرَّةً فهل علَيَّ جناحٌ إنْ تَشبعْتُ من زوجي غيْرَ الذي يُعطِـيني ؟ فقـال النبــيُّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (المُتشبِّعُ بِما لـم يُعْطَ كَلابِس ثَوْبَي زُورٍ) متفقٌ عليه [14].

ئەسماء (رەزای خوای لیٚ بیٚ) فەرمووی: ئافرەتیٚ گوتی: ئەی پیٚغەمبەری خودا! من هەویٚبارم، ئایا گوناهم دەگا لەبەر چاوی هەویٚکەم وەها خۆم نیشان بدەم کـە میٚردەکـەم زیـاتر لـەوەی کـە هەیـە نـازم دەگـریٚ؟ فـەرمووی: ئـەوەی خـۆی وانیشان دەدا کە پتر لەوەی کە لەڕاستی (واقیع)دا هەیە نـازی دەگیریٚ، ئـەوە وەك ئەوکەسە وایە کە خۆی بەدکارەو بـەرگی پیاوچاك لەبـەر دەکـا وە بـەو فیٚلە خۆی لەمەردوم دەگۆڕیٚ. (شەیخان (رەزای خوایان لیٚ بیٚ)).

---

[12] موسلیم: ١/١٠ رقم/٥.

[13] موسلیم ٩/١.

[14] بوخاری (٥٢١٩) موسلیم (٢١٣٠).

**٢٦٣- شايەتی درۆ یەکجار ناهەقو نارەوایە - باب بيان غلظ تحريم شهادة الزور**

قال اللّٰه تعالى: {واجتنبوا قول الزور}. (الحج-١٨/٣٠).

**واتە: خۆتان لەقسەو گوتەی ناهەق دوور بگرن، وەك درۆو بوختانو شایەتی ناهەق.**

قال اللّٰه تعالى: {ولا تقف ما ليس لك به علم}. (سورة الإسراء-٣٦).

**لەسەرەتای زنجیرە ٢٦٠ رابووورد.**

وقال تعالى: {ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد}. (سورة ق - ٥٠/١٨).

**لەسەرەتای زنجیرە ٢٦٠ رابووورد.**

وقال تعالى: {إن ربك لبالمرصاد}. (سورة الفجر-١٤).

**بڕوانە: سەرەتای زنجیرە/٥ بەرگی یەکەم.**

وقال تعالى: {والذين لا يشهدون الزور}. (الفرقان-٢٥/٧٢).

**دەستەیەکی تر لەو بەندە نازدارانەی کە خودای گەورە بۆ تەشریفو دەستی ڕێزلێنانو حورمەت گرتن پێیان دەفەرموێ: (عباد الرحمن) واتە: بەندەیانی خوای میهرەبان، دەستەیەکی تر لەم بەهرەمەندانە ئەو کەسانەن کە شایەتی درۆ نادەن.**

١/١٥٥٠/١٥- **فەرموودەی:** (ألا أُنبِّئكُم بأكبر الكَبائِر؟....) **بڕوانە: ٣٣٦/١ ز/٤١ بەرگی/١ ل/١٥٢٧٠.**

**٢٦٤- نەفرینو لەعنەتکردن لەکەسێکی دیاری یا لە گیانلەبەرێکی دیاری دروست نییە - باب تحريم لَعْن إنسان بعَينه أو دابة**

١/١٥٥١/١٦- عن أبي زَيْدٍ ثابتِ بن الضَّحاكِ الأنصاريِّ رضي اللّٰه عنهُ، وهو من أهْلِ بيْعةِ الرِّضوان قال: قَالَ رسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (من حَلَف عَلى يمِينٍ بملّةٍ غيْرِ الإسْلامِ كاذباً مُتعَمِّداً، فهُو كما قَالَ، ومنْ قَتل نَفسهُ بشيءٍ،

---

[١٥] بوخاری (٢٦٥٤) موسلیم (٨٧).

عُذِّب بِهِ يوْم القِيامةِ، وَلَيْس على رجُلٍ نَذْرٌ فِيما لا يَملِكـهُ، ولعـنُ المُـؤْمِنِ كَقَتْلِـهِ) متفقٌ عليه[١٦].

ئـەبو زەيـدى كـوڕى ثـابيتـى كـوڕى ضـەحـاك (ڕەزاى خـواى لـێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبەر (درودى خواى لەسەر بێ) فـەرمووى: هەركەسـێ بـە درۆ، بـە ئـارەزوو، سـوێند بخوا بە ميللەتێ غەيرى ميللەتى ئيسلام، وەك ئەوە بڵێ: بەو خودايە ئەگەر ناپاكى لەگەڵ خۆم بكەم لەجێى جوولەكە بم، وە لەپاشا ناپاكى لـێ بكا، ئەوە وەك خـۆى دەڵـێ وايـە، وە بـەو قسـەيە كـافر دەبـێ، مەگـەر مەبەسـتى پێـى پێلێهەڵبڕينو موبالەغە بێ، ئەوە هەر پێى گوناهبـار دەبـێ، بـەڵام پێـى كـافر نابێ، وەكەسـێ بەشـتێ خـۆى بكوژێ، لـە ڕۆژى قيامـەت دا بـەو شـتەيە سـزا دەدرێتەوە، شتێكيش كە ماڵى پياوێ نەبێ نـەزرى لەسـەرى دانامـەزرێ، وەك ئەوە بەماڵێكى كەسێكى تر بڵێ ئەو ماڵـە يـان ئـەو مـەڕە نـەزر بـێ لەسـەرم، نـەفرينو لەعنـەتكردنيش لـە موسـوڵمان بەقـەد كوشـتنەكەى گوناهـەو، موسـوڵمان چـى لەعنـەتى لـێ بكـەيتو چـى بيكـوژى چـون يەكـە، وە ئـەو كەسەى بە موسوڵمانێ بڵێ ئەى نا موسوڵمان! ئەى كافر! ئـەوە وەك بيكـوژێ وايە (ش/تاج).

ئيمامى نەوەوى (ڕەزاى خواى لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم ئـەبو زەيـدە ئەنصارى بـوو، يـەكێ بـوو لـەو تاقمـەى كـە لەڕۆژەكـەى حودەيبيـەدا پـەيمانى خۆشـنوودى (بەيعەتولرضوان)يان، لەگەڵ حەزرەت دا بەست.

٢/١٥٥٢/١٧- وعنْ أبي هُرِيْرةَ رضي اللّٰه عنهُ أنَّ رسُول اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (لا ينْبغِي لِصِدِّيقٍ أنْ يكُونَ لَعَّاناً). رواه مسلم[١٧].

ئــەبو هــورەيرە (ڕەزاى خـواى لـێ بـێ) فــەرمووى: خۆشەويسـت (درودى خـواى لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: پياوچاكى ڕاستگۆ نابێ نەفرينكار بێ. (م).

[١٦] بوخارى (٦٠٤٤) موسليم (١١٠).
[١٧] موسليم (٢٥٩٧).

٣/١٥٥٣/١٨– وعنْ أبي الدَّردَاءِ رضي اللّه عَنْهُ قال: قالَ رسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا يكُونُ اللَّعَّانُون شُفعَاءَ، ولا شُهَدَاءَ يوْمَ القِيامَةِ) رواه مسلم[18].

ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نەفرینکەران لەڕۆژی قیامەت دا نەپایەی تکاکاران و نە پایەی شەهیدانیان نادرێتێ. (م).

٤/١٥٥٤/١٩– عن عبدالله بنِ مسعود قال: قال رسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لَيْس المؤمِنُ بِالطَّعَّانِ، ولا اللَّعَّانِ ولا الفَاحِشِ، ولا البَذِيِّ) رواه الترمذي وقال حديثٌ حسن[19].

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بۆ موسوڵمان ناشێ کە توانجدەرو نەفرینکەرو هەرزە گۆو زمان پیس بێ (ت: ح/ح – تیرمزی بەسەنەدێکی حەسەنِ بە ڕشتەیەکی جوان).

٥/١٥٥٥/٢٠– وعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ رضي اللّه عنْهُ قالَ: قالَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا تَلاعنُوا بلعنةِ اللّه، ولا بِغضبِهِ، ولا بِالنَّارِ) رواه أبو داود، والترمذي وقالا: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ[20].

لە سەموورەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەیەکتری مەڵێن: لەعنەتی خودات لێ بێ، یا مەڵێن: قارو غەزەبی خوات لێ بێ، یا مەڵێن: بەر ئاگر بکەوی. (ت: ح/ح/ص).

٦/١٥٥٦/٢١– وعنْ أبي الدَّرْداءِ رضي اللّه عنهُ قال: قال رسُولُ اللّه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: إنَّ العبْد إذا لَعنَ شَيْئاً، صعِدتِ اللَّعْنةُ إلى السَّماء، فتُغْلَقُ أبْوابُ السَّماءِ دُونَها، ثُمَّ تَهبِطُ إلى الأرضِ، فتُغلَقُ أبوابُها دُونَها، ثُمَّ تَأخُذُ يميناً وشِمالا، فإذا لَمْ تَجِدْ مساغاً رجعت إلى الذي لُعِنَ، فإنْ كان أهلاً لِذلك، وإلاَّ رجعتْ إلى قائِلِها) رواه أبو داود[21].

[18] موسلیم (٢٥٩٨).
[19] تیرمزی (١٩٧٨).
[20] أبو داوود (٤٩٠٦) تیرمزی (١٩٧٧).
[21] ئەبو درداو (٤٩٠).

ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەندەی خودا کاتێ نەفرین لەشتێ دەکا، ئەو نەفرینە بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە، بەڵام دەرگاکانی ئاسمانی لێ دادەخرێ، ئەوجا دیسان دێتەوە خوارێ بۆسەر زەوی، دەرگاکانی ئەویشی لێ دادەخرێ، ئینجا بەڕاستو چەپا دەگەڕێ، وەلێ دەربازگەی دەست ناکەوێ، ئەوسا بەرەو نەفرین لێکراوەکە دەڕوا، جا ئەگەر ئەو شایستەی ئەو نەفرینە بوو ئەوا دەنوسێ بەکوڵکیەوە، ئەگینا دەگەڕێتەوە بۆسەر نەفرینکەرەکەو دەلکێ بەووەوە (د).

٢٢/١٥٥٧/٧- وعنْ عِمْرَانَ بنِ الحُصيْنِ رضي اللَّه عنْهُما قال: بينَما رسُولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم في بعضِ أسْفَارِه، وامرأَةٌ مِنَ الأنصارِ عَلى نَاقَةٍ، فضجِرَتْ فَلَعَنَتْهَا، فَسمع ذلكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم فقالَ: (خُذوا ما عليها ودعُوها، فإنَّها ملعُونَةٌ) قالَ عِمرَانُ: فكَأَنِّي أرَاهَا الآنَ تمشي في النَّاسِ ما يعرِضُ لَهَا أحدٌ. رواه مسلم[22].

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەتی حەزرەت دا بووین، ئافرەتێکی ئەنصاری سواری وشترە مێنگەیێ بوو، بەدەستیەوە وەڕس بوو ئەوەندە لاساری دەکرد، لەبەرئەوە ژنەکە لەعنەتی لە وشترەکە کرد. حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) گوێی لێ بوو، فەرمووی: کورتانو جلو بارەکەی لێ بکەنەوەو وازی لێ بهێنن بەرەڵای بکەن، چونکە ئەو وشترە لەعنەتلێکراوە! عیمران دەیفەرموو: ئێستاکەیش دەڵێی ئەو وشترەم لەبەر چاوە کە بەناو عەشاماتەکەدا دەسوڕایەوە کەسیش لاقەی نەدەکردو هەقی بەسەریەوە نەبوو (م).

٢٣/١٥٥٨/٨- وعن أبي برْزَةَ نَضلَةَ بْنِ عُبيْدٍ الأسلمِيِّ رضي اللَّه عنْهُ قال: بينما جاريةٌ على ناقةٍ عليها بعضُ متَاعِ القَوْمِ، إذْ بَصُرَتْ بالنبيِّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم وتَضايَقَ بهِمُ الجَبلُ، فقالتْ: حَلْ، اللَّهُم العنْها فقال النبيُّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا تُصاحِبْنا نَاقَةٌ عليها لعْنةٌ) رواه مسلم[23].

---

[22] موسلیم (٢٥٩٥).

[23] موسلیم (٢٥٩٦).

ئەبو بەرزە نەضلەی کوڕی عوبەیدی ئەل-ئەسلەمی خوای لێ ڕازی بێ فەرمووی: جارێ لەو دەشتە، گەورە کچێ بەسواری وشترە مینگەیێ بوو، هەندێ شمەکی خەڵکی تریش بەسەر وشترەکەوە بوو، لەوکاتەدا لەناکاو کە چاوی بە حەزرەتو یارانی دەکەوێ، دەیەوێ لەو قەرەباڵغیە دەرچێ، وەلێ شاخەکە تەنگەبەر دەبێو ڕێگەی بەرناکەوێ،، دەڵێ: هەچچە! ئەی خودایە! لەعنەتی لێ بکە. حەزرەتیش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم وشترە لەعنەت لێکراوە نابێ لەگەڵ ئێمەدا بێ لەم سەفەرەمان دا (م).

**٢٦٥- نەفرین کردنو لەعنەتکردن لەدەستەی تاوانبارانو گوناهکاران بەگشتی دروستە، بەڵام لەعنەت لە کەسێکی دیاریکراو دروست نییە**
**باب جواز لَعْن بعض أصحاب المعاصي غير المُعَيّنين**

قال الله تعالى: {أَلاَ لَعْنَةُ اللهِ عَلَى الظَّالِمِينَ.} (سورة هود-١١/١٨).

واتە هۆشیار بن، گوێ لەم هەواڵە گرنگە بگرن، خودا دەفەرموێ: لەعنەتی خودا لەستەمکاران بێ، واتە: دەستەی زۆرداران ئەوانەی کە کردوویانە بەپیشە زوڵمو زۆرو ناهەقی لە دروستکراوانی خودا دەکەن ئەوانە دوورن لە ڕەحمەتی خوداو بێ بەشن لەکەرەمو بەخششی.

قال الله تعالى: {فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ اللهِ عَلَى الظَّالِمِينَ} (سورة الأعراف – ٧/٤٤).

واتە بانگکەرێ لە نێوانیان دا بانگەواز هەڵدەداو دەڵێ لەعنەتی خودا لەدەستەی ستەمکاران بێ.

وَثَبت في الصَّحيحِ أن رسُول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (لَعَنَ اللّه الوَاصِلَةَ والمُسْتَوصِلَةَ) وأَنَّهُ قال: (لَعَنَ اللّه آكِلَ الرِّبا) وأَنَّهُ لَعَنَ المُصَوِّرِين، وأنَّه قال: (لعنَ اللّه مَنْ غَيَّر منارَ الأَرْض) أيْ: حُدُودها، وأَنَّـهُ قال: «لَعنَ اللّـه السَّارقَ يَسرِقُ البيضَة) وأنهُ قال: «لَعنَ اللّه مَنْ لعن والِديْهِ) (وَلَعَنَ اللّه مَنْ ذبح لِغيْر اللّـه) وأنـهُ قال: (منْ أحْدَثَ فِيها حدثاً أوْ آوى محدِثاً، فَعليْهِ لَعْنَةُ اللّهِ والملائِكَةِ والنَّاسِ أجْمعِينَ) وأَنَّهُ قالَ: (اللّهُمَّ العنْ رِعْلاً، وذَكْوانَ وَعُصيَّةَ، عصَوا اللّه ورَسُولَهُ) وَهذِهِ ثلاثُ قبائِلِ مِنَ العَرَبِ وأنَّه قال: «لَعنَ اللّه اليهودَ اتَّخذُوا قُبورَ أنبيَائِهِم مسَاجِدَ) وأَنَّهُ (لَعن المُتشبهِينَ مِنَ الرِّجالِ بِالنِّساءِ، والمتشَبِّهات مِنَ النِّسَاءِ بالرِّجالِ).

وَجَميعُ هذِهِ الألفاظِ في الصحيحِ، بعْضُهَا في صحيحي البخاري ومسلم، وبعْضُها في أحدِهِمَا، وإنَّما قَصدْتُ الاختصَار بالإشارةِ إليْهَا، وسأذكرُ مُعظَمَهَا في أبوابها مِنْ هذا الكتاب، إن شاءَ اللّٰه تعالى.

لەناو حەدیثی صەحیحو فەرموودەی ساخ دا ئەم فەرمایشتانە چەسپاون، کە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی:

١. لەعنەتی خودا لەو ژنەبێ کە قژ دەداتە دەم قژی تر بۆژنێکی ترو لەو ژنەش بێ کە دەیەوێ قژی تر بداتە دەم قژی خۆی.
٢. نەفرینی خوا لە سوو خۆر.
٣. لەعنەتی خودا لەوێنەگرەکان.
٤. لەعنەتی خودا لەوکەسە بێ کە سنووری نێوانی دوو پارچە زەوی دەگۆڕێ.
٥. لەعنەتی خودا لەدز، کە ئەوەندە نەفسی سووکە دەچێ هێلکەیێ دەدزێو بۆ هێلکەیێ خۆی سووكو تڕۆ دەکا.
٦. لەعنەتی خودا لەوەی کە دەبێ بەهۆی لەعنەت کردن لەباوكو دایکی خۆی.
٧. لەعنەتی خودا لەوکەسەی شت سەر دەبڕێ بۆ بتو جندۆکەو شتی وا.
٨. لەعنەتی خوداو لەعنەتی فریشتەکانو لەعنەتی ئەو خەڵکە هەموو لەوکەسە بێ کەلە مەدینەدا کارێکی ناشایستە بەرپا دەکا، یا ئیشی نارەواو کاری ناپەسەند دادەهێنێ، یا پەنای کەسێ دەدا، کەکاری ناشایستە بەرپا دەکا.
٩. ئەی خودایە! لەعنەت بکە لەم خێڵە عەرەبانە لە ڕیعلو زەکوانو عوصەییە، کەلە خوداو پێغەمبەری خودا یاخی بوون.
١٠. لەعنەتی خودا لە میللەتی جوولەکە، کە چۆن گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بەپەرستگاو وەك مزگەوت عیبادەتی تیادا دەکەن.
١١. لەعنەتی خودا لەپیاوی سەرژنانیو لەژنی کوڕانی. خودا یاربێ زۆربەی ئەم فەرموودانە لەمەولا لەباسی خۆیان دا بەتەواوی، لەم کتێبەدا دەنوسرێن.

## ٢٦٦- دروست نییه به نارەوا جنێو به موسوڵمان بدرێ
## ٢٦٦- باب تحريم سَبِّ المسلم بغير حقّ

قال اللّٰه تعالى: {والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتسبوا فقد احتملوا بهتاناً وإثماً مبيناً}. (سورة الأحزاب ٣٣/٥٨).

بڕوانه: سەرەتای زنجیرە/٤٨ بەرگي یەکەم – بەرگی/١ ل/٣٠٣.

**١٥٥٩**– وعن ابنِ مَسعودٍ رضي اللّٰه عَنهُ قال: قال رسُولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (سِباب المُسْلِمِ فُسوقٌ، وقِتَالُهُ كُفْرٌ) متفقٌ عليه[٢٤].

**ئیبنو مەسعوود** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت دەفەرموێ: جوێندان به موسوڵمان فیسق و فجورو لەڕێ دەرچوونەو، جەنگ کردنیش لەگەڵیا کوفرو بێ دینیه (ش). واته: کەسێ جنێوی نارەوا به موسوڵمانێ بدا بەوه فاسق دەبێ، وه کەسێ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانێ بکا، بەبێ هۆیەکی ڕەوا بەوه کافر دەبێ گێڕانەوەی شەرحەکه ئاوایه:**

**سباب المسلم كقتاله: واته: موسوڵمان چی جوێنی پێ بدرێ و چی شەڕو جەنگی لەگەڵ بکەی چونیەکەو ئەم دوو شته تاوانەکەیان بەرابەرە. (وەرگێڕ).**

**٢/١٥٦٠/٢٥**– وعنْ أبي ذرّ رضي اللّٰه عنهُ أنّهُ سمِع رسُول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم يقولُ: (لا يَرمي رجُلٌ رَجُلاً بِالفِسْقِ أو الكُفْرِ، إلاّ ارتدت عليهِ، إنْ لَمْ يَكُن صاحِبُهُ كذلكَ) رواه البخاريُّ[٢٥].

**ئەبو زەڕ خۆشنوودی خوای گەورەی لێ بێ فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو: هەر پیاوێ نیسبەتی فاسقی و بەدکاری، یا گاوری و ناموسوڵمانێتی لە پیاوێکی تر بداو، بەکەسێ بڵێ کافره یا فاسقه وەکابرای برادەریشی کەوای پێ دەڵێ، وانەبێ کەوەك ئەو دەڵێ، ئەوه ئەو بوختانەیه دەگەڕێتەوه بۆ خۆی و ئەو خۆی لەجیاتی ئەو دەبێ بەبەدکار یا دەبێ به ناموسوڵمان (ب).**

---

[٢٤] بوخاری (٦٠٤٤) موسلیم (٦٤).

[٢٥] بوخاری (٦٠٤٥).

٢٦/١٥٦١/٣- وعنْ أبي هُرَيرةَ رضي اللّه عنْهُ أنَّ رسُولَ اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قالَ: (المُتَسابانِ مَا قَالا فعَلى البَادِي مِنْهُما حتَّى يَعْتَدِي المظلُومُ) رواه مسلم[٢٦].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو دوو کەسەی شەڕە جنێو دەکەن گوناهی جنێوەکانیان بەملی ئەوەیانە کەلە پێش دا جنێوەکە دەدا، بەمەرجێ ناهەقی لێ کراوە کە دەست درێژی نەکاو زیاد لەهەقی خۆی جنێو نەدا (م).

٢٧/١٥٦٢/٤- فەرموودەی: أُتيَ النبيُّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم بِرجُلٍ قَدْ شَرِب... بڕوانە: ژمارە/٢٤٣/٤ ز/٢٨)[٢٧].

٢٨/١٥٦٣/٥- وعنْهُ قالَ: سَمِعْتُ رسُول اللّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم يَقُولُ: (من قَذَف مَمْلُوكَهُ بالزِّنا يُقامُ عليهِ الحَدُّ يومَ القِيامَةِ، إلاَّ أنْ يَكُونَ كما قالَ) متفقٌ عليه[٢٨].

دیسان فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ) کەسێ بوختان بۆ بەندەو کەنیزەکی خۆی بکاو شەڵتاخی داوێن پیسی یان لێ بدا، بەڵام بەندەکەی، یا کەنیزەکەکەی بێ تاوانو پاك بێ لەو قسەو بوختانە، ئەوە ئەو کەسە بوختانکەرە لەڕۆژی قیامەتا داری حەددی لێ دەدرێ. (ش=بوخاریو موسلیم (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

**٢٦٧- بەنارەواو بەبێ بەرژەوەندی ڕەوا جنێودان بەمردوو نادروستە**

**بەرژەوەندی ڕەوا بریتییە لەوە کە مەردووم هۆشیار بکرێتەوە لەبەدکاریو بیدعەکاری ئەو مردووە، تا کەس چاوی لێ نەکات. ئایەتو فەرموودەکانی زنجیرە ٢٦٦ بۆنێرەش دەستدەدەن**

**باب تحريم سَبِّ الأموات بغير حقٍّ ومصلحة شرعية هي التحذير من الإقتداء به في بدعته وفسقه ونحو ذلك فيه الآية والأحاديث السابقة في الباب قبله.**

١/١٥٦٤/٢٩- وعن عائِشةَ رضي اللّه عنها قالتْ: قال رسُولُ اللّهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لا تَسُبُّوا الأمواتَ، فَإنَّهُمْ قد أفْضَوْا إلى ما قَدَّموا) رواه البخاري[٢٩].

---

[٢٦] موسلیم (٢٥٨٧).

[٢٧] بوخاری (٦٧٨١).

[٢٨] بوخاری (٦٨٥٨) موسلیم (١٦٦٠).

عائيشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: جنێو بەمردووان مەدەن، چونکە ئەوان ڕوو بەڕوو بونەتەوە لەگەڵ کردەوەی پێشووی خۆیان چ چاك چ خراپ وە بەپێی ئەوە پاداشتی خۆیان وەردەگرن(پ).

## ٢٦٨- جڵەوگیری لەئازاردانی خەڵك (باب النهي عن الإيذاء)

قال اللّٰه تعالى: {والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتسبوا فقد احتملوا بهتاناً وإثماً مبيناً}. (الأحزاب/٥٨). (ب/١ ز/٤٨). بڕوانە: بەرگی/١ سەرەتای زنجیرە/٤٨).

١٥٦٥/١/٣٠- فەرموودەی: (المُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ ويدِهِ....) (٢١١/٩ ز/٢٦)[30].

١٥٦٦/٢/٣١- فەرموودەی: «مَنْ أحبَّ أن يُزَحْزِحَ عن النَّارِ،...» بڕوانە: (٦٦٨/٦ ز/٨٠)[31].

## ٢٦٩- جڵەوگیری کراوە لەکینەو دەغەزکێشان لەیەکتری‌و لەقسە دابڕین‌و لە لووتەلا بوون لەیەکتری - باب النهي عن التباغض والتقاطع والتدابر

قال اللّٰه تعالى: {إنما المؤمنون إخوة}.(الحجرات/١٠). (بەرگی/١ ل/١٦٩ ز/٢٢).
وقال تعالى: {أذلة على المؤمنين أعزة على الكافرين}. (المائدة-٥٤). (ز/٤٧).
وقال تعالى: {محمد رَسُول اللّٰهِ، والذين معه أشداء على الكفار رحماء بينهم}. (الفتح-٢٩). (بەرگی/١ ل/٢٩٥ ز/٤٦).

١٥٦٧/١/٣٢- وعنْ أنسٍ رضي اللّٰه عَنهُ أنَّ النبيَّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم قال: (لا تَباغَضُوا، ولا تحاسدُوا، ولاَ تَدابَرُوا، ولا تَقَاطعُوا، وكُونُوا عِبادَ اللّٰهِ إخواناً، ولا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أنْ يهْجُرَ أخَاه فَوقَ ثلاثٍ) متفقٌ عليه[32].

---

[29] بوخاری (١٣٩٣).
[30] بوخاری (١٠) موسلیم (٤٠).
[31] موسلیم (١٨٤٤).
[32] بوخاری (٦٠٦٥) موسلیم (٢٥٥٩).

**ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درووودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کینەو دەغەزو ڕق لەیەکتری مەکێشن‌و حەسوودی‌و بەخیلی بەیەکتری مەبەن‌و پشت لەیەکتری مەکەن‌و لەیەکتری لووتەلا مەبن‌و قسە لەیەکتری دامەبڕن، وە وەك برا وابن، ئەی بەندەکانی خودا! دروست نییە کە موسوڵمان دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ پتر لە سێ ڕۆژ (ش).**

٢/١٥٦٨/٣٣- وعنْ أبي هُرَيْرَةَ رضي اللّٰهُ عَنْهُ أنَّ رَسُولَ اللّٰه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم قالَ: (تُفْتَحُ أبْوابُ الجَنَّةِ يَوْمَ الاثنَيْنِ ويَوْمَ الخَميس، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عبْدٍ لا يُشْرِكُ باللّٰهِ شَيئاً، إلاَّ رجُلاً كانَت بيْنهُ وبَيْنَ أخيهِ شَحْناءُ فيقالُ: أنْظِرُوا هـذَيْنِ حتَّى يصطَلِحا، أنْظِرُوا هـذَيْنِ حتَّى يَصطَلِحا،) رواه مسلم. وفي روايةٍ لـه: (تُعْرَضُ الأعْمالُ في كُلِّ يومِ خَميسٍ وَاثنَيْنِ) وذَكَر نَحْوَهُ[٣٣].

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درووودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەموو ڕۆژێکی دوو شەموان‌و پێنج شەموان دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو خودا لە هەموو بەندەیێ خۆش دەبێ، تەنها لەو دوو کەسە نەبێ کەلەناو خۆیان دا ناکۆکن‌و قینیان لەیەکە. خودا دەفەرموێ بەفریشتەکان: ئەم دووکەسە با بمێنن تا لەناو خۆیان دا ئاشت دەبنەوە (م).**

## ٢٧٠- بەخیلی‌و حەسوودی بەمەردووم نادروستە
## باب تحريم الحسد

قال اللّٰه تعالى: {أم يحسدون الناس على ما آتاهم اللّٰه من فضله}. (النساء-٤/٥٤).

**واتە: یا حەسوودی‌و بەخیلی بەو خەڵکە دەبەن لەسەر ئەوەی کە خوا لەبەهرەی گەورەی خۆی بەشی داون.**

١/١٥٦٩/٣٤- وعَنْ أبي هُرَيرة رضي اللّٰه عنْـهُ أنَّ النبـيَّ صَـلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم قالَ: (إيَّاكُمْ والحسدَ، فإنَّ الحسدَ يأكُلُ الحسناتِ كَما تَأْكُلُ النَّارُ الحطبَ، أوْ قال العُشْبَ) رواه أبو داود[٣٤].

---

[٣٣] موسليم (٢٥٦٥).

[٣٤] ئەبودەردا (٤٩٠٣).

له ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دووربن لە حەسودیو بەخیلی، چونکە حەسودیو کردەوەی چاکە وەك ئاگرو پوش وان! (ئەبو داود خوای لێ ڕازی بێ). بڕوانە: ز/٢٦٩ ژ/١/١٥٦٧ فەرموودەکەی ئەنەس ئەویش دەست دەدا بۆ ئێرەش.

## ٢٧١- نەهی کراوە لە سیخوڕیو جاسووسیو گوێ هەڵخستن لە نهێنی خەڵك
## باب النهي عن التجسّس والتسمّع لكَلام مَن يكره استماعَهُ

قال اللّٰه تعالى: {ولا تجسسوا}. (الحجرات-٤٩/١٢).

واتە: شوێن شورەییو نەنگی مەردووم مەکەونو لەسەر یەکتری مەبن بەجاسوسو سیخوڕیو پەردەی خودا لەسەر بەندەکانی هەڵمەدەنەوە.

وقال تعالى: {والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتسبوا فقد احتملوا بهتاناً وإثماً مبيناً}. (الأحزاب-٥٨). (بڕ: ز/٤٨).

١/١٥٧٠/٣٥- وعنْ أبي هُريْرةَ رضي اللّٰه عنهُ أنَّ رسُول اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم قال: (إيَّاكُمْ والظَّنَّ، فإن الظَّنَّ أكذبُ الحدِيثَ، ولا تَحَسَّسُوا، ولا تَجسَّسُوا ولا تنافَسُوا ولا تَحاسَدُوا، ولا تَباغَضُوا، ولا تدابَرُوا، وكُونُوا عِباد اللّٰهِ إخْواناً كَما أمركُمْ. المُسْلِمُ أخُو المُسلِمِ، لا يظلِمُهُ، ولا يخذُلُهُ ولا يحْقرُهُ، التَّقوى ههُنا، التَّقوَى ههُنا) ويُشير إلى صَدْره (بِحسْبِ امريءٍ مِن الشَّرِّ أن يحْقِر أخاهُ المسلِم، كُلُّ المُسلمِ على المُسْلِمِ حرَامٌ: دمُهُ، وعِرضُهُ، ومَالُه، إنَّ اللّٰه لا يَنْظُرُ إلى أجْسادِكُمْ، وَلا إلى صُوَرِكُمْ، وأعمالكم ولكنْ يَنْظُرُ إلى قُلُوبِكُمْ)).

وفي روايةِ: (لا تَحاسَدُوا، وَلا تَبَاغَضُوا، وَلا تَجَسَّسُوا ولا تَحَسَّسُوا ولا تَنَاجشُوا وكُونُوا عِبَادَ اللّٰهِ إخْوَاناً). وفي روايةٍ: (لا تَقَاطَعُوا، وَلا تَدَابَرُوا، وَلا تَبَاغَضُوا ولا تَحَاسدُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللّٰهِ إخْوَاناً). وفي رواية: (لا تَهَاجَروا وَلا يَبِعْ بَعْضُكُم على بيع بَعْضٍ). رواه مسلم: بكلِّ هذه الروايات، وروى البخاري أكثَرَها[35].

---

[35] موسلیم (٢٥٦٣ و ٢٥٦٤) بوخاری (٦٠٦٤ و ٦٠٦٥).

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** دووربن لەگومان، چونکە گومانی خراپ درۆی ڕووتە، هەستیش هەڵمەگرن‌و بەشوێن عەیب‌و نەنگی خەڵك دا مەگەڕێن‌و سیخوڕی‌و جاسوسی مەکەن‌و منەیی شورەیی مەردووم مەکەن، وە بەربەرەکانیێ‌و قینەبەری‌و رقەبەری مەکەن‌و بەخیلی بە یەکتری مەبەن‌و کینەو دەغەز لەیەکتری مەکێشن‌و پشت مەکەنە یەکتری‌و لەیەکتری لووتەلا مەبن، وە وەك برا بەندەی باشی خودابن‌و پشتی یەکتری بگرن‌و قۆڵی یەکتری مەبڕنەوە، ئەم ئامۆژگاریانە فەرمانی خودا خۆیەتی، ئەو ئەم فەرمانانەتان پێ دەکا، موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو ناهەقی لێ بکا، نابێ پشتی لەزەوی بدا، ئەبێ لەسەری بکاتەوە، نابێ بەچاوی سووك تەماشای بکا، تەقواو ترسی خودا لێرەدایە، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) سێ‌جار دەستی نایە سەر دڵی‌و فەرمووی: تەقوا لێرەدایە، واتە: ئەو تەقوایەی کە سەرچاوەی هەموو چاکەیەکەو هۆی دوورکەوتنەوەیە لەهەموو خراپەیێ والێرەدا لەناو دڵ دا کەوا لەناو سینگ دا، ئینجا فەرمووی: چی هەیە کەلەوە خراپترو گوناهتر بێ، کە موسوڵمان بەچاوی سوکی تەماشای برای موسوڵمانی خۆی بکا، هەموو شتێکی موسوڵمان لە موسوڵمان حەرامە، خوێنی، سامان‌و ماڵی، شەرەف‌و ئابڕوو ناموسی، مەگەر بەپێی شەریعەتی خودا، دڵنیا بن کە خودا بۆ ڕازی بوون لە ئێوە، نە سەیری گەورەیی لەشتان ئەکا، نە سەیری شێوەی شیرینتان دەکا، نە تەماشای زۆری‌و بۆری کردەوەتان دەکا، بەڵام تەماشای ناو دڵتان دەکاو نیازی دڵتان چۆن بێ بەو پێیە پاداشتان دەداتەوە (م).

لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیم دا: بەخیلی بەیەکتری مەبەن‌و کینەو دەغەز لەیەکتری مەکێشن‌و سیخوڕی‌و جاسوسی مەکەن‌و هەست لەیەکتری هەڵمەگرن‌و کۆستە کۆستەو زەمی درۆو چاوو ڕاو لەسەودادا مەکەن، بۆ تەفرەدانی کڕیار، وە وەك برای باش بەندەی باشی خودا بن!.

لەگێڕانەوەیەکی تری دا: قسە لەیەکتری دامەبڕن‌و لەگەڵ یەکا ئاشت بن‌و سەودا بەسەر سەودای یەکتری دا مەکەن.

هەموو ئەم گێڕانەوەیە هی موسلیمە، زوربەشیان بوخاری گێڕاویەتەوە، (ڕەزای خودا لەهەردووکیان بێ).

٢/١٥٧١/٣٦- وعَنْ مُعَاوِيَةَ رضي اللّٰه عنْهُ قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم يَقُولُ: (إنَّكَ إن اتَّبعْتَ عَوْراتِ المُسْلِمينَ أفسَدْتَهُمْ، أوْ كِدْتَ أنْ تُفسِدَهُم) حديثٌ صحيح. رواهُ أبو داود بإسناد صحيح[36].

موعاویە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ) دیارە ئەگەر تۆ شوێن عەیبەی موسوڵمانان بکەوی، دەبێ بەهۆی خراپ بونیان یا فەرمووی: نزیکە ببی بە هۆی خراپبونیان چونکە خاوەن نەنگو خراپە کە زانی هەموو کەس بەعەیبەکەی زانیوەو ناموسی چووەو ناوی بەبەدیو خراپی زڕاوە، ئیتر دەربەست نایەتو کۆ لەعەیبو خراپە ناکاتەوە. (د-ح/ص-س/ص).

٣/١٥٧٢/٣٧- وعنِ ابنِ مسعودٍ رضي اللّٰه عَنْهُ أنَّهُ أُتِيَ بِرَجُلٍ فَقيلَ لَهُ: هذَا فُلانٌ تَقْطُرُ لِحْيَتُهُ خَمراً، فقالَ: إنَّا قَدْ نُهينَا عنِ التَّجَسُّسِ، ولكِنْ إن يظْهَرْ لَنَا شَيءٌ، نَأخُذْ بِهِ، حَديثٌ حَسَنٌ صحيحٌ. رواه أبو داود بإسْنادٍ عَلى شَرْطِ البخاري ومسلمٍ[37].

بەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودیان گوت: قوربان! ئەم کابرایەمان هێناوە بۆلای تۆ، بۆ مەحکەمە، ئەوەتا ئارەق لەڕیشی دەتکێ، وادیارە کە ئارەقێکی زۆری خواردۆتەوە، ئەویش فەرمووی: ئێمە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) یاساغی کردووە لێمان، کە کوڵ بگرینو هەست هەڵخەینو جاسوسی بەسەر خەڵکەوە بکەین. بەڵام هەرکاتێ شتێ بەبەڵگەو شایەت ڕوون بوەوەو بۆمان ساغ بوەوە ئەوا ئەو کاتە ئەوەی پێویست بێ بەپێی ظاهیری شەرع دەیکەینو حوکمی دەدەین. (د-ح/ص).

---

[36] ئەبو داود (٤٨٨٨).
[37] ئەبوداوود (٤٨٩٠).

### ٢٧٢- بەدگومانی دەربارەی موسوڵمانان نادروستە مەگەر لەبەر ناچاری
### باب النهي عن سوء الظنّ بالمسلمين من غير ضرورة

قال اللّٰه تعالى: {يا أيها الذين آمنوا اجتنبوا كثيراً من الظن إن بعض الظن إثم}. (الحجرات-٤٩/١٢).

ئەی موسوڵمانینە دوربن لەگومانی خراپو لەبەدگومانی، دڵنیا بن لەوە کەبازێ گومان سەر دەکێشێ بۆ تاوان.

١٥٧٣/١-٣٨/١ فەرموودەی: (إيَّاكُمْ وَالظَّنَّ....) بڕوانە: (ژمارە/١٥٧٠/١ ز/٢٧١)[٣٨].

### ٢٧٣- بەسووك گرتنی موسوڵمانان نا دروستە
### باب تحريم احتقار المسلمين

قال اللّٰه تعالى: {يا أيها الذين آمنوا لا يسخر قوم من قوم عسى أن يكونوا خيراً منهم، ولا نساء من نساء عسى أن يكن خيراً منهن، ولا تلمزوا أنفسكم، ولا تَنَابَزُوا بالألقاب" بئس الاسم الفسوق بعد الإيمان، ومن لم يتب فأولئك هم الظالمون}. (الحجرات-٤٩/١١).

واتە ئەی موسوڵمانینە! سەرمەکەنە گاڵتەو گەمەو لاقرتێ، وەیەکتری مەکەن بەنیشانەی تیرو تانەو توانجی خۆتان، بۆ ئەمەیشە پیاوو ژن وەك یەکن، کێ دەڵێ ئەو پیاوەی یا ئەو ژنەی کە ئێوەی پیاوان یا ئێوەی ژنان گاڵتەی پێ دەکەن، لەلای خودا لەئێوە باشتر نییە، زۆر ناشیرینە ناوو ناتۆرەو قسەیەك کە پێچەوانەی یاسای ئیسلام بێ، دوای ئەوە کە مرۆڤ باوەڕی بەخودا کرد، زۆر ناپەسەندە بچێتەوە سەر خووی فاسقی، باوەڕ بەخواو بەدکاریان نەگوتووە، وەهەرکەس تۆبە لەم کارانە نەکا ئەوە لەستەمکاران دەژمێرێ.

وقال تعالى: {ويل لكل همزة لمزة}. (سورة الهمزة - ١٠٤/١).

[٣٨] بوخاری (٦٠٦٤) موسلیم (٢٥٦٣).

واته: یەزدانی مەزن لەسوورەتی هومەزەدا، کە سورەتی سەدو چوارە، لەئایەتی یەکەم دا دەفەرموێ: سزای سەخت بۆ هەموو نەنگرێکی بەدگۆ، کە بەزمانی پیسی خۆیان وەك دزیو سوژن ئێش بەناو دڵی مەردومی بێ ئاگای بێ تاوان دەگەیەنن، بەخوتوو خۆڕایی قاچو قولی ئەو خەڵکە دەبەن بە دەما.

**زمانی پیسی بەدگۆی بەدگوتار**

**پیسترە زەهری لە کەڵبەی پەشمار!**

١٥٧٤/١/٣٩- فەرموودەی: (بِحَسْبِ امْرِيءٍ مِنَ الشَّرِّ....) بڕوانە ژمارە (١٥٧٠/١ ز/٢٧١)[39].

١٥٧٥/٢/٤٠- فەرموودەی: (لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ مَنْ كَانَ في قَلْبِهِ....» بڕوانە ژمارە/٦١٢/١ ز/٧٢)[40].

١٥٧٦/٣/٤١- وعن جُنْدُبِ بن عبدِ اللّٰه رضي اللّٰه عنهُ قالَ: قالَ رسولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (قالَ رَجُلٌ: واللّٰهِ لا يَغْفِرُ اللّٰهُ لفُلان، فَقَالَ اللّٰه عَزَّ وَجَلَّ: مَنْ ذا الَّذي يَتَأَلَّى عليَّ أنْ لا أغفِرَ لفُلانٍ إنِّي قَد غَفَرْتُ لَهُ، وَأَحْبَطْتُ عمَلَكَ) رواه مسلم[41].

جندوبی کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ کابرایێ دەڵێ: بەخوا ئەو کابرایە ئەوەندە بێ نموودو هیچو پووچە شایانی ئەوە نییە کە خودا لێی خۆش بێ، مەغفیرەتو لێخۆشبوونی خودا بەو گەورەیی‌و مەزناهییەی خۆی چۆن دەدرێ بەکابرایەکی ئاوا بۆرە پیاو، شانی ئەم کابرا خوێڕییە ئەو بەهرەو پایە گەورەیە هەڵ ناگرێ!.

خودای خاوەن دەسەڵاتو خاوەن شکۆش دەفەرموێ: ئەوە کێیە کە ئەوەندە بەخۆی دەنازێو بەچاوی سووك تەماشای بەندەی من دەکاو سوێند

[39] موسلیم (٢٥٦٤) بڕوانە ژ:١٥٧٠.

[40] موسلیم (٩١) بڕوانە ژ/٣١٢.

[41] موسلیم (٢٦٢١).



دەخواو دەڵێ: بەخودا خودا لەو زەلامە خۆش نابێ!؟ دەی بە پێچەوانەوە ئەوا من لەو خۆش بووم‌و کردەوەی تۆم پوچ کردەوە (م).

**٢٧٤- شادەکامی‌و پێخۆش بوون بە موسوڵمان ناشایستەیە**
**باب النهي عن إظهار الشماتة بالمسلم**

➔ (ب/١ ز/٢٢ ئایەتی یەکەم).
➔ (ب/١ ز/٢٨ ئایەتی یەکەم).

١/١٥٧٧/٤٢- وعنْ وَاثِلةَ بنِ الأسْقَعِ رضي اللّه عنْهُ قالَ: قال رسُولُ اللّـهِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم: (لا تُظْهِرِ الشَّمَاتَة لأخيك فَيرْحَمْهُ اللّهُ وَيبتَلِيكَ) رواه الترمذي وقال: حديث حسنٌ[٤٢].

واثیلەی کوڕی ئەسقەع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: شادەکامی بەبرای موسوڵمانی خۆت دەرمەبڕە، دەنا خودا ڕەحم بەو دەکاو لەو چورتمە قوتاری دەکاو تۆ توش‌و گیرۆدە دەکا (ت:ح/ح).

⇨ (ب/٤ ز/٢٧١ ژ/١٥٧٠)

**٢٧٥- تانەو تەشەر دان لەبنەچەو ڕەسەنێ کە بەپێی شەرع ساغ بۆتەوە نادروستە**
**٢٧٥- باب تحريم الطَّعْن في الأنساب الثابتة في ظاهر الشرع**

قال اللّه تعالى: {والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتسبوا فقد احتملوا بهتاناً وإثماً مبيناً}. (بڕوانە: ز/٤٨).

١/١٥٧٨/٤٣- وَعَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)قالَ: قَالَ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (اثْنَتَان في النَّاسِ هُمَا بِهِم كُفْرٌ: الطَّعْنُ في النَّسَبِ، والنِّيَاحةُ على المَيِّت) رواه مسلم[٤٣].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دوو خووی ناشیرین لەناو مەردووم دا هەن، هاوتای کوفر دەکەن:

[٤٢] تیرمزی (٢٥٠٨).
[٤٣] موسلیم (٦٧).

توانجو تانەدان لەڕەچەڵەكو بنەچەی خەڵك، هەروەها شیوەن گێڕان لەسەر مردوو (م).

**٢٧٦- گزیی‌و فێڵ‌و فڕ ڕێگەی نەدراوە (باب النهي عن الغش والخِداع)**

⇦ (ب/١ ز/٤٨ ئایەتی یەكەم).

١٥٧٩/٤٤/١ - وَعَنْ أبي هُرَيرةَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: (منْ حَمَلَ عَلَيْنا السِّلاحَ، فَلَيْسَ مِنَّا، ومَنْ غَشَّنَا، فَلَيْسَ مِنَّا).

وفي روايةٍ لَه أنَّ رَسُول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مرَّ عَلى صُبْرَةِ طَعام، فَأدْخَلَ يدهُ فيها، فنالَتْ أصَابِعُهُ بَلَلاً، فَقَالَ: مَا هَذَا يا صَاحِبَ الطَّعَامِ؟) قَالَ أصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللّٰه قَالَ: (أفَلا جَعلْتَه فَوْقَ الطَّعَامِ حَتّى يَراهُ النَّاس، مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا). رواه مسلم[٤٤].

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرموی: ئەوەی چەك لە ئێمە هەڵبگرێ لەئێمە نییە، وە ئەوەی گزی لەئێمە بكا لەئێمە نییە (م). لە گێڕانەوەیەكی تری موسلیم دا: جارێ حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەلای كۆمەڵێ خۆراكەوە ڕابوورد، دەستی پیاكرد، لەناوەوە تەڕبوو فەرمووی: ئەی خاوەن خۆراك! ئەم تەڕییە چییە؟ گوتی: ئەوە باران لێی داوە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەی نەدەبوو بیخەیتە سەرەوە تا خەڵك بیبینن؟ كەسێ ساختەو گزیمان لێ بكا لەئێمە نییە.**

١٥٨٠/٤٥/٢- بڕوانە: (ژ/١٥٧٠ ز/٢٧١)[٤٥].

١٥٨١/٤٦/٣ - وَعَنْ ابنِ عُمر رضي اللّٰه عَنْهُمَا، أنَّ النبيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهَى عن النَّجَشِ. متفقٌ عليه[٤٦].

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **جڵەوگیری كردووە لە كۆستە كۆستەو زەمی درۆ بۆ تەفرەدانی كڕیار لەسەودادا (ش).**

---

[٤٤] موسلیم (١٠١ و ١٠٢).
[٤٥] بوخاری (٢١٥٠) موسلیم (١٥١٥) رقم (١١).
[٤٦] بوخاری (٢١٤٢) موسلیم (١٥١٦).

٤/١٥٨٢/٤٧- وعَنْهُ قَالَ: ذَكَرَ رَجُلٌ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي البُيُوعِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ بايَعْتَ، فَقُلْ لا خِلابَةَ). متفقٌ عليه[47].

دیسان فەرمووی: پیاوێ عەرزی پێغەمبەری کرد کە لەسەوداو مامەڵەدا دەخەڵەتێ، فەرمووی: کەسەودای شتێ دەکەی بڵێ: بەبێ فرو فێڵو قوڵ برین (ش).

٥/١٥٨٣/٤٨- وَعَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَال: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ خَبَّب زَوْجَة امْرِيءٍ، أَوْ مَمْلُوكَهُ، فَلَيْسَ مِنَّا) رواهُ أبو داود[48].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ ژنی پیاوێ هەڵخەڵەتێنێو خووی خراپ بکا، وەهەڵی بگێڕێتەوە لێی، یا خولامو کەنیزەکی کەسێ تر والێبکا ئەوە لەئێمە نییە. (ئەبوداوود – ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ).

## ٢٧٧- غەدرکردنو بێ پەیمانی نادروستە (باب تحريم الغَدر)

⇦ (ب/٢ ز/٨٦ – ئایەتی یەکەمو دووەم).

⇦ (١٥٨٤/١-٤٩) فەرموودەی «أرْبعٌ مَنْ كُنَّ فيهِ...» بڕوانە: ٢/٦٩٠ ز/٨٦)[49].

٢/١٥٨٥/٥٠- وعن ابن مسْعُودٍ، وابنِ عُمرَ، وأنسٍ رضي اللّٰه عنهُمْ قَالُوا: قَالَ النبيُّ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يومَ القِيامةِ، يُقَالُ: هذِهِ غَدْرَةُ فُلانٍ) متفقٌ عليه[50].

ئیبنو مەسعوودو ئیبنو عومەرو ئەنەس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمویان: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەت دا هەموو ستەمکەرو بێ پەیمانێ ئالایەکی تایبەتی خۆی هەیە، هەڵدەکرێ لە دیاری، پێی

[47] بوخاری (٢١١٧) موسلیم (١٥٣٣).

[48] ئەبوداوود (٥١٧٠).

[49] بوخاری (٣٤) موسلیم (٥٨).

[50] بوخاری (٣١٨٨) موسلیم (١٧٣٥، ١٧٣٦، ١٧٣٧).

دەناسرێتەوە، دەڵێن: ئەمە نیشانەی ناپاکیو پەیمانشکێنی فیسارە کەسە (ش).

٣/١٥٨٦/٥١- وَعَنْ أبي سَعِيدٍ الخُدْرِي (رضي اللّٰه عنه)أنَّ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: لِكُلِّ غَادِرٍ لِواءٌ عِندَ إسْتِه يَوْمَ القِيامةِ يُرْفَعُ لَهُ بِقدْرِ غدْرِهِ، ألا ولا غَادر أعْظمُ غَدْراً مِنْ أمير عَامَّةٍ) رواه مسلم[51].

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەموو پەیمان شکێنێ، لەڕۆژی قیامەت دا، لەلای قنگیەوە، ئالآیەکی ناو زڕانو بێپەیمانیان بۆ هەڵدەکرێ، بەقەد زۆریو کەمی بێ پەیمانییەکەی بەرزەوە دەکرێ. هۆشیار بنو ئاگاتان لەخۆتان بێ هیچ ستەمکەرو غەدداری غەدرو ستەمکەرییەکەی ناگا بەغەدرو ستەمکەری فەرمانڕەوای گشتی (م).

٤/١٥٨٧/٥٢- وعنْ أبي هُرَيرةَ (رضي اللّٰه عنه)عن النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قال: قَالَ اللّٰه تعالى ثَلاثَةٌ أنا خَصْمُهُمْ يومَ القِيَامَةِ: رَجُلٌ أعطَى بي ثُمْ غَدَرَ، وَرجُلٌ باع حُراً فأَكل ثمَنَهُ، ورجُلٌ استَأجرَ أجِيراً، فَاسْتَوْفي مِنهُ، ولَمْ يُعْطِهِ أجْرَهُ) رواه البخاري[52].

ئەبو هوڕەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەم سێ کەسەیە لەڕۆژی قیامەتا خۆم داوا چیم لەسەریان، ئەو کەسەی کە بەهۆی ناوی منەوە پەیمان دەدا بە کەسێكو بەوە هێمنی دەکاتەوە، یا تەماداری دەکا، کەچی لەپاشا دەسخەڕۆی دەکاو پەیمانەکەی ناباتە سەرو ناپاك دەردەچێ، دووەم پیاوێ ئادەمیزادێکی ئازاد بفرۆشێو بەهاکەی بخوا، سێهەم پیاوێ کە کرێکارێ بەکرێ بگرێو کاری خۆی پێ تەواو بکاو کەچی کرێکەی نەداتێ (ب).

[51] موسلیم (١٧٣٨) رقم (١٦).
[52] بوخاری (٢٢٢٧).

**٢٧٨- منەتکردن لەسەر شتی دەستەنەو خەڵاتو شتی وا ناپەسەندە**
**(باب النهي عن المنّ بالعطية ونحوها)**

قال اللّٰه تعالى: {يا أيها الذين آمنوا لا تبطلوا صدقاتكم بالمن والأذى}. (البقرة-٢/٢٦٤).

**یەزدانی مەزن دەفەرموێ: ئەی کەسانێ کەباوەڕتان بەخودا هێناوە! خێرو خێراتی خۆتان بەتاڵ مەکەنەوە، بەنازینو منەتکردن بەسەر هەژاراناو بەئازار دانیان.**

وقال تعالى: {الذين ينفقون أموالهم في سبيل اللّٰه ثم لا يتبعون ما أنفقوا مناً ولا أذى}.

**واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: کەسانێ کە ماڵی خۆیان بەخت دەکەن لەڕێگەی خودادا، وە پێوەی نانازانو نایکەن بەمایەی ئێشو ئازار بۆ دڵی نەداراو هەژار، ئەوانە بە پاداشی باشی خۆیان لەلای خودا دەگەن.**

١/١٥٨٨/٥٣- وعنْ أبي ذَرّ (رضي اللّٰه عنه)عنِ النبيُّ (صَلّي اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: (ثلاثةٌ لا يُكلّمُهُمْ اللّٰه يومَ القيامةِ، ولا يَنْظُرُ إليْهِمْ، ولا يُزكّيهمْ وَلَهُمْ عذابٌ أليمٌ) قال: فَقرأها رسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ثلاثَ مَرَّاتٍ. قَال أبو ذرّ: خَابُوا وخَسِروا منْ هُمْ يا رسولَ اللّٰه، قال المُسبِلُ، والمَنَّانُ، والمُنْفِقُ سلعتهُ بالحِلفِ الكَاذبِ) رواه مسلم[٥٣].

⇦ (ب/٢ ز/١١٩ ژ/٥/٧٩٤).

**٢٧٩- بەخۆوە نازینو ستەمکاری ناپەسەند (باب النهي عن الافتخار والبغي)**

⇦ (ب/٢ ز/٧١ ئايەتی چوارەم).

وقال تعالى: {إنما السبيل على الذين يظلمون الناس ويبغون في الأرض بغير الحق،أولئك لهم عذاب أليم}. (شورى-٤٢/٤٢).

**سزای سەختو ئێشو ئازاری خودا یەخەی ئەو ستەمکارانە دەگرێو بەرۆکیان پێ دەگرێ، کە زوڵمو زۆرو ناهەقی لەو خەڵکە بێ تاوانە دەکەنو بەخوتو خۆڕایی لەسەر ڕووی زەوی زۆرو ستەم بەرپا دەکەن.**

---

[٥٣] موسلیم (١٠٦).

⇦ ٥٤/١٥٨٩/١- فەرموودەی «إن اللّٰه تَعالی أوْحَى إليَّ....» بڕوانە: (ذ/٢/٦٠٠٢ ز/٧١)[٥٤].

٢/١٥٩٠/٥٥- وعن أبي هُريرةَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رسُول اللّٰـه (صَـلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَال: (إذا قالَ الرَّجُلُ: هلَكَ النَّاسُ، فهُو أهْلَكُهُمْ) رواه مسلم[٥٥].

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فـەرمووی: حـەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: ئەو پیاوەی کە دەڵێ خەڵك خراپ بوون خۆی لەهەموویان خراپترە (م).**

## ٢٨٠- دەنگ گۆڕین و قسە دابڕین لەناو موسوڵمانان زیاتر لەسێ ڕۆژ نادروستە، مەگەر لەبەر خراپەی ئاشکرا (باب تحريم الهجران بين المسلمين فوق ثلاثة أيام، إلا لبدعة في المهجور أو تظاهرٍ بفسقٍ أو نحو ذلك)

⇦ **(ب/١ ز/٢٢ – ئایەتی یەکەم).**

⇦ **(ب/٤ ز/٢٥٨ – ئایەتی یەکەم).**

⇦ ٥٦/١٥٩١/١- فەرموودەی: (لا تَقَاطَعُوا،...) بڕوانە: (١٥٦٧/١ ز/٢٦٩)[٥٦].

٢/١٥٩٢/٥٧- وعنْ أبي أيوبَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رسُول اللّٰـه (صَـلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَال: (لا يحِلُّ لمُسْلِمٍ أنْ يَهْجُرَ أخَاهُ فوْقَ ثلاثِ لَيالٍ: يلتَقِيـانِ، فيُعـرِضُ هذا ويُعرِضُ هذا، وخَيْرُهُما الَّذِي يبْدأ بالسَّلامِ) متفقٌ عليه[٥٧].

**ئـەبو ئـەییوب** (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) **فــەرمووی: خۆشەویسـت** (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) **دەفەرموێ: دروست نییە بـۆ پیـاوی موسوڵمان کە زیـاتر لـە سێ شـەو قسە دابڕێ لەبرای موسوڵمانی و قسەی لەگەڵ نـەکا، گریمـان ئەگـەر تووشـی یـەك بوون ئەمیان بەم لاداو ئەویان بەولادا ڕوو وەرگێڕێ! پیاو باشی ئەم دوو بـرا لەیەکتر تۆراوەیش ئەوەیان کەلـەپێش دا ئاشـت دەبێتـەوەو ڕۆژباشـی و سڵاو لەوی تریان دەکا (ش).**

---

[٥٤] موسلیم (٢٨٧٥) رقم (٦٤).

[٥٥] (٢٦٢٣).

[٥٦] بوخاری (٦٠٦٥) موسلیم (٢٥٥٩).

[٥٧] بوخاری (٦٠٧٧) موسلیم (٢٥٦٠).

٥٨/١٥٩٣/٣- فەرمووده‌ی: (تُعْرضُ الأعْمالُ في كُلِّ اثنين وخَميس،....)) بڕوانه: (١٥٦٨/٢ ز/٢٦٩)[٥٨].

لێرەدا لەسەرەتاوە ئاوایە: هەموو هەفتەیێ دووجار کردەوەکانی ئادەمیزادەکان دەور دەکرێنەوەو لەحزووری خودادا ڕادەنوێرێن، جارێ لەڕۆژی دوو شەممەداو جارێ لەڕۆژی پێنج شەممەدا تا کۆتایی فەرموودەکە بەتەواوی وەك لە پێشەوە ڕابوورد.

٥٩/١٥٩٤/٤- وعَنْ جابرٍ (رضي اللّه عنه)قَال: سمِعْتُ رسُول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقُولُ: (إنَّ الشّيْطَانَ قَدْ يئسَ أنْ يَعْبُدهُ المُصلّون في جَزيرةِ العربِ ولكِن في التَّحْرِيشِ بيْنهم) رواه مسلم[٥٩].

جابیر فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: لەڕاستی دا شەیتان نائومێد بووە لەوە کە جارێکی تر لە دوورگەی عەرەب دا موسوڵمانان بیپەرستن، چونکە نوێژ دەکەن و نوێژ کردن و شەیتان پەرستیش لەیەکەوە دوورن، وەلێ ئومێدی گەورەی بەوەیە کەلەناو خۆیان دا لەیەکتریان تێك بەربدا (موسلیم-(ڕەزای خوای لێ بێ)).

٦٠/١٥٩٥/٥- وعنْ أبي هريرة (رضي اللّه عنه)قَال: قال رسول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم) ((لا يَحِلُّ لمسْلِمٍ أنْ يهْجُرَ أخَاه فوْقَ ثَلاثٍ، فمنْ هَجر فَوْقَ ثلاثٍ فمات دخَل النَار)). رواهُ أبو داود بإسْنادٍ على شرْطِ البخاري[٦٠].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە دەفەرموێ: دروست نییە بۆ موسوڵمان کە زیاتر لەسێ شەو قسە دابڕێ لەبرای موسوڵمانی، ئەوەی لەسێ شەو زیاتر قسە دابڕێ و لەسەر ئەوحاڵە بمرێ دەچێتە دۆزەخ (د-س/ص).

---

[٥٨] موسلیم (٢٥٦٥) رقم (٣٦).

[٥٩] موسلیم (٢٨١٢).

[٦٠] ئەبو داوود(٤٩١٤).

٦١/١٥٩٦/٦- وعَنْ أبي خرَاشٍ حدْرَدِ بن أبـي حـدْرِدٍ الأسْـلمي، ويُقَـالُ السُّلمي الصَّحابِي (رضي اللّه عنه)أنَّهُ سَمِعَ النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم)يقُـولُ: (منْ هَجر أخاهُ سَنَةً فَهُو كَسفْكِ دمِهِ).رواه أبو داود بإسناد صحيح[٦١].

**ئـەبو خـيراش: حــەدرەدی کــوڕی ئەبوحــەدرەد** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فــەرمووی: ژنەوتم لەحەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: ئەوەی هەتا ماوەی ساڵێ دەنگ بگۆڕێ لەگـەڵ بـرای موسـوڵمانی خـۆیو قسـەنەکا لەگـەڵیا، ئـەوە تاوانەکـەی وەك ئەوە وایە کە بەناڕەوا بەدەستی خۆی خـوێنی ئـەو برایـەی بڕێـژێ. (د-س/ح = ئەبوداوود – سند صحيح).**

٦٢/١٥٩٧/٧- وعنْ أبي هُرَيْرة (رضي اللّه عنه)أنَّ رسُولَ اللّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (لا يَحِلُّ لمُؤْمِنٍ أنْ يهْجُرَ مُؤْمِناً فوْقَ ثَلاثٍ، فَإنْ مرَّتْ بِـهِ ثَـلاثٌ، فَلْيَلْقَهُ، ولْيُسَلّمْ عَلَيْهِ، فَإن رَدَّ عليهِ السَّلام، فقَدِ اشْـتَرَكَا في الأجْـرِ، وإنْ لَـمْ يَـرُدَّ عَلَيْهِ، فَقَدْ باءَ بالإثمِ، وخَرَجَ الُمسلّمُ مِن الهجْرةِ». رواهُ أبو داود بإسنادٍ حسن. قال أبو داود: إذا كَانَتِ الهجْرَةُ للّهِ تَعالى فَلَيْس مِنْ هذَا في شيءٍ[٦٢].

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لـە حەزرەتـەوە دەفـەرموێ: دروسـت نییـە بـۆ موسوڵمان کە پتر لەسێ ڕۆژ قسە نەکا لەگەڵ موسوڵمان دا، دەبـێ لـەدوا سـێ ڕۆژ بچێ بۆلایو سلاوی لـێ بکا، ئەگـەر ئـەویش سلاوەکەی سـەندەوە ئـەوا دەبێ بەهاوبەشی پاداشتەکە، ئەگینا هەموو گوناهەکە دەچێ بۆ ئەو، چونکە وەلامی سلاوەکەی نەداوەتەوە، وەسلاوکەرەکە لـە ئۆبـاڵی دەنـگ دا بڕینەکـە دەردەچێ (د-س/ص).**

**ئیمـامی ئـەبوداوود** (ڕەزای خوای لێ بێ) **دەفـەرموێ: بـەلام ئەگـەر قسـەنەکردنو بەین بڕینەکە لەبەر ڕەزای خودا بێ، وەك ئەوە کابرا بە ئاشکرا بێفـەرمانی خودا بکا ئەوە قەیدی نییە، بگرە پەسەندیشە.**

---

[٦١] ئەبوداود (٤٩١٥).

[٦٢] ئەبوداوود (٤٩١٢).

**٢٨١- دروست نييەكە دووكەس بەيەكەوە چپە بكەن بەدزى يەكێكى ترەوە كەلەگەڵيان بێ، مەگەر لەبەر پێداويستىو ناچارى، چپەيش بەو سرتەيە دەگوترێ كەلەبەينى خۆيان دا دەيكەنو ئەويتر بەباشى تێى نەگا، ئەوەيش كەلەناو خۆيان دا بەزمانێ قسە بكەن كەئەو تێى نەگات هەر لەم بابەتەيە**

**باب النهي عن تناجي اثنين دونَ الثالث، بغير إذنه إلا لحاجةٍ وهو أن يتحدثا بلسانٍ لا يفهمه**

قال اللّٰه تعالى: {إنما النجوى من الشيطان}. (مجادلة – ٥٨/١٠).

چپەو سرتە لەشەيتانەوەيە.

١/١٥٩٨/٦٣- وعن ابْنِ عُمَرَ رضي اللّٰه عنْهُمَا أنَّ رسُولَ اللّٰـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَال: «إذا كَانُوا ثَلاثَةً، فَلا يَتَنَاجَى اثْنَـان دُونَ الثَّالِـثِ» متفـقٌ عليـه. ورواه أبو داود وَزاد: قَالَ أَبُو صالِحٍ: قُلْتُ لابْنِ عُمرَ: فأربعة؟ قَـالَ: لا يضـرُّكَ». ورواه مالك في «الموطأ»: عنْ عبْدِ اللّٰهِ بن دِينَارٍ قَالَ: كُنْتُ أنَا وَابْنُ عُمرَ عِند دارِ خالِدِ بن عُقْبَةَ التي في السُّوق، فَجاءَ رجُلٌ يُريدُ أنْ يُنَاجِيَهُ، ولَيْس مع ابنِ عُمرٍ أحَدٌ غَيْري، فَدعا ابنُ عُمرَ رجُلاً آخر حتَّى كُنَّا أرْبَعَةً، فقال لي وللرَّجُلِ الثَّالِـثِ الَّـذي دَعا: اسْتَأخِرا شَيْئاً، فإنِّي سَمِعْتُ رسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلّم) يَقُـولُ: «لا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دونَ وَاحِدٍ»[٦٣].

ئيبنو عومەر (ڕەزاى خوايان لێ بێ) فەرمووى: حـەزرەت (دروودى خواى لەسەر بێ) فـەرمووى: ئەگەر خەڵكەكە سێ كەس بوون، نابێ دووانيان لەناو خۆيان دا چپە بكەنو قسەكانيان لەوى تريان بشارنەوە (ش).

ئەبو داووديش (ڕەزاى خواى لێ بێ) گێڕاويەتيەوەو ئەمەى لێ پتر كـردووە: ئـەبو صالح فەرمووى: بە ئيبنو عومەرم گوت: باشە ئەگـەر خەڵكەكە چوار كـەس بوون، ئەوكاتە حوكمى چپەكردنەكەيان چۆنە؟ ئايا دروسـتە دوانيـان لـەناو خۆيانا چپە بكەن يانا؟ فەرمووى: لەكاتى وادا چپە كردن قەيدى نييە.

ديسـان ئيمـامى ماليـك (ڕەزاى خـواى لـێ بـێ) لـە (موطـأ)دا ئـەم فـەرموودەى گێڕاوەتەوە لەسەر ئەم شێوەيە: عەبدوڵڵاى كوڕى دينـار فـەرمووى: خاليـدى كوڕى عوقبە خانوويەكى هەبوو، لەناو بازاڕدا بوو، منو ئيبنو عومـەر لـەوێ

---

[٦٣] بوخارى (٦٢٨٨) موسليم (٢١٨٣) الموطأ ٢/٩٨٨.

بووین، پیاوێ هات ویستی چپەی لەگەڵ دا بکات، بەس منو ئیبنو عومەر بووین، جا ئیبنو عومەر پیاوێکی تری گاز کردو بووین بەچوار کەس، ئەوجا بەمنو ئەو پیاوەی فەرموو کە گازی کرد: کەمێ دوور بکەونەوە لەئێمە هەتا منو ئەمەیش قسەی پەنهانی خۆمان بکەین، چونکە من بۆ خۆم لەدەمی پیرۆزی حەزرەتم ژنەوتووە دەیفەرموو: ئەگەر سێ کەس بوون نابێ دوانیان بەبێ ئەویتریان سرپە بکەن.

٢/١٥٩٩/٦٤- وَعن ابنِ مسْعُودٍ (رضي اللّه عنه)أنَّ رسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قال: (إذا كُنْتُمْ ثَلاثَة، فَلا يَتَنَاجى اثْنَانِ دُونَ الآخَرِ حتَّى تَخْتَلِطُوا بالنَّاسِ، مِنْ أجْلِ أنَّ ذَلكَ يُحزِنُهُ) متفقٌ عليه[٦٤].

ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ سێ کەس بوون ناشێ دووکەستان بەبێ ئەویترتان سرتە بکەن، تا تێکەڵی مەردوم نەبن، چونکە شتی وا دەبێ بەهۆی دڵتەنگی ئەویترتان (ش).

**٢٨٢- ئازاردانی بەندەو وڵاغو گیاندارو ژنو منال بەبێ هۆیەکی ڕەوا یا پتر لەئەندازەی تەمێکردن نادروستە**

**باب النهي عن تعذيب العَبْد والدابة، والمرأة والولد بغير سبب شرعي أو زائد على قدر الأدب**

⇦ (ب/١ ز/٣٩ ئایەتی یەکەم).

١/١٦٠٠/٦٥- وَعنِ ابنِ عُمر رضي اللّه عنهُما أنّ رسـول اللّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَال: (عُذِّبتِ امْرَأةٌ في هِرَّةٍ حبستها حَتَّى ماتَتْ، فَدَخلَتْ فِيهَا النَّارَ، لا هِيَ أطْعمتْهَا وسقَتْها، إذ هي حَبَسْتهَا ولا هِي تَرَكتْهَا تَأكُـلُ مِـنْ خَشَـاشِ الأرض) متفقٌ عليه[٦٥].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنێ لەسەر پشیلەیێ سزا دراوە، پشیلەکەی بەند کردبوو، هەتا لەبرسا مردبوو، لەوماوەیەدا نەخۆی ئاوو نانی دابوو پێی، وە نەبەرەڵڵای

---

[٦٤] بوخاری (٦٢٩٠) موسلیم (٢١٨٤).
[٦٥] بوخاری (٣٤٨٢) موسلیم (٢٢٤٢).

کردبوو، هەتا بۆخۆی لەجرو جانەوەری ناو زەوی بخوات لەسەر ئەوە خودا خستیە ناو ئاگری دۆزەخەوە (ش).

٢/١٦٠١/٦٦- وعنْهُ أَنَّهُ مرَّ بِفِتْيَان مِنْ قُرَيْش قَدْ نصبُوا طَيْراً وهُمْ يرْمُونَهُ وقَدْ جعلُوا لِصاحبِ الطَّيْرِ كُلَّ خَاطِئَةٍ مِنْ نَبْلِهِمْ، فَلَمَّا رأَوُا ابنَ عُمرَ تفرَّقُوا فَقَالَ ابنُ عُمَرَ: منْ فَعَلَ هذا؟ لَعنَ اللَّه مَن فَعلَ هـذا، إنَّ رسُولَ اللَّـه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)لَعَنَ من اتَّخَذَ شَيْئاً فِيهِ الرُّوحُ غَرضاً. متفقٌ عليه[٦٦].

دیسان فەرمووی: جارێ ئیبنو عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) توشی تاقمێ قورەیشی بوو،باڵندەیەکیان نابووەوە بەنیشانەو تیریان تێ دەگرت، ئەو تیرانەی کە لێی نەدەدا دەیان دا بەخاوەن باڵندەکە، کەچاویان دەکەوێ بە ئیبنو عومەر لەترسان هەڵدێن‌و بلاوەی لێ دەکەن، ئیبنو عومەر دەفەرموێ: کێ ئەمەی کردووە؟ ئەمە ئیشی چ بێویژدانێکە، دەك نەعلەتی خودای لێ بێ، من لەخۆمەوە لەعنەتی لێ ناکەم، بەڵکوو لەبەر ئەوە نەفرینی لێ‌دەکەم چونکە حەزرەت خۆی لەعنەتی کردووە لەوکەسە کە گیانلەبەر دەنێتەوە بەنیشانە (ش).

باوکم خودا لەویش‌و لەمردووی هەموو لایێ خۆش بێ فەرمووی: لە برایماوە مەلایەکمان هەبوو ناوی ماموستا مەلا یوسف بوو، پیاوێکی ڕاست‌و دروست‌و هەقانی بوو، جارێ شێخ قادری حەفید (خودا لێی خۆش بێ)، گەنج بوو، لەگەڵ برکەیێ سوار هاتبوون بۆ دێکەمان، چوار پێنج مریشکێ چینەیان دەکرد، لەناکاو شێخ تفەنگێکی کرد بەناویان دا مریشکێکی لێ گلدانەوە، بەیەکێ لەپیاوەکانی خۆی گوت: ئادەی برۆ بۆمی سەربرەو بۆمی سووربکەرەوە بۆ قاوەڵتی، فەرمووی: جا بەمەلا یوسفی گوت: مەلا ئەمە چۆن ڕاوێکە؟ ئەمە لەشەرعا چۆنە؟ مەلا فەرمووی: یاشێخ گوو بخۆی لەمە باشترە! گوتی: شێخ توورە بوولێی، گوتی: چۆن قسەی وا لەرووی من دا دەکەی؟ نابێ لەدێی من دا بی، ماموستا فەرمووی: باشە من دەڕۆم بەلام

---

[٦٦] بوخاری (٥٥١٥) موسلیم (١٩٥٨).

بابۆت رووونبکەمەوە، گوو خواردنەکە بەس حەقولای لەسەرە، بەلام ئەمە حەقولای لەسەرە، حەقی مریشکەکەشی لەسەرە، کە بەشێوەیەکی ناڕەوا دەیکوژی، حەقی خاوەن مریشکەکەشی لەسەرە. فەرمووی: مامۆستا چوو بوو بەمەلای گەڕەزیل. باوکم دەیفەرموو: مامۆستا مەلا ڕەحیمی پەرخی خودا لێی خۆش بێ فەقێی ئەو مەلا یوسفە بوو لەبرایماوە، مەلا یوسف زۆر لێی ڕازی بوو، چونکە هەم زیرەك بوو، هەم بەدین بوو، لەبەر سەعیو خوێندنیش دەربەسی جلو بەرگ نەبوو، وەك فەقێکانی تر. (وەرگێڕ)

٣/١٦٠٢/٦٧- وعَنْ أنَسٍ (رضي اللّٰه عنه)قَال: نَهَى رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أنَّ تُصْبَرَ الْبَهَائمُ. متفقٌ عليه، ومَعْنَاه: تُحْبسَ للْقَتْلِ[٦٧].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕەزای لەوە نەبوو کە گیانلەبەر ڕابگیرێ لەبەر کوشتنا (ش).

٤/١٦٠٣/٦٨- وَعَنْ أبي عَليّ سُوَيْدِ بنِ مُقَرِّن (رضي اللّٰه عنه)، قَالَ: لَقَدْ رَأيْتُني سابِعَ سبْعَةٍ مِنْ بني مُقرِّن مَالنَا خَادِمٌ إلاّ واحِدَةٌ لَطمها أصْغرُنَا فأمَرنَا رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أنْ نُعْتِقَها. رواه مسلم. وفي روايةٍ: (سابع إخْوةٍ لي))[٦٨].

ئەبو عەلی سووەیدی کوڕی موقەڕین (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەوت برا بووین تاقە کارەکەرێکمان هەبوو، برا بچکۆلەکەمان شەقازللەیەکی لێ دا، ئیتر پێغەمبەر لەتۆڵەی ئەو شەقازللەیەدا فەرمانی پێکردین ئازادمان کرد. (م- (ڕەزای خوای لێ بێ)).

٥/١٦٠٤/٦٩- وعنْ أبي مَسْعُودٍ البدْريِّ (رضي اللّٰه عنه)قَال: كُنْتُ أضْربُ غلاماً لي بالسَّوطِ، فَسمِعْتُ صوتاً مِنْ خَلفي: (اعلَمْ أبا مَسْعُودٍ) فَلَمْ أفْهَمْ الصَّوْتَ مِنَ الْغَضب، فَلَمَّا دنَا مِنِّي إذا هُو رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فإذا هُو يَقُولُ: (اعلَمْ أبا مسْعُودٍ أنَّ اللّٰه أقْدرُ علَيْكَ مِنْكَ عَلى هذا الغُلامِ) فَقُلْتُ: لا أضْربُ مملُوكاً بعْدَهُ أبداً.

---

[٦٧] بوخاری (٥٥١٣) موسلیم (١٩٥٦).

[٦٨] موسلیم (١٦٥٨) رقم (٣٢).

وفي رِوَايةٍ: فَسَقَطَ السَّوْطُ مِنْ يدِي مِنْ هيْبتِهِ.

وفي روايةٍ: فقُلْتُ: يَا رسُول اللّٰه هُو حُرٌّ لِوجْهِ اللّٰه تعالى فَقَال: (أمَا لوْ لَمْ تَفْعَلْ، لَلَفَحَتْكَ النَّارُ، أوْ لَمَسَّتكَ النَّارُ) رواه مسلم. بهذِهِ الرواياتِ[٦٩].

ئەبو مەسعوودی بەدری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ بەقەمچی غولامێکی خۆم فەلاقە دەکرد، لەپشتمەوە گوێم لەدەنگێ بوو دەیفەرموو: بزانە ئەی ئەبو مەسعوود! منیش لەبەر توڕەیی خۆم لەدەنگەکە باش تێنەدەگەیشتم، کەهاتە بەرەوە ڕوانیم حەزرەتە ڕەوانیم دەفەرموێ: هۆ ئەبو مەسعوود! باش باش ئەوەبزانە کە خودا باشتر بە تۆ ئەوێرێ، هەتا تۆ بەم غولامە! منیش گوتم: ئیتر هەتا ماوم لەغولام نادەم، (م).

لە گێڕانەوەیەکی تری (م)دا: لەبەر سامی پێغەمبەر قامچییەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە. لە گێڕانەوەیەکی تردا: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو غولامە ئازاد بێ لەبەر ڕەزای خودا. فەرمووی: دەی ئەگر ئاوات نەکردایە ئاگر چەشکەی دەکردی. یا فەرمووی: ئاگری دۆزەخ چزەی لێ هەڵدەستاندی.

٦/١٦٠٥/٧٠- وَعنِ ابْنِ عُمر رضي اللّٰه عنْهُمَا أنَّ النبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (منْ ضرب غُلاماً له حَداً لم يأتِهِ، أو لَطَمَهُ، فإن كَفَّارتَهُ أن يُعْتِقَهُ) رواه مسلم[٧٠].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ داری حەدد لەغولامی خۆی بدا، کە ئەو غولامە شایستەی ئەو داری حەددە نەبێ، یا بەبەری دەست زللەیکی لێبدا، ئەوە بەمەرجێ لەوتاوانە پاك دەبێتەوە کەلەجیاتی ئەوە ئازادی بکا. (م).

٧/١٦٠٦- وعنْ هِشَام بن حكيم بن حزامٍ رضي اللّٰهُ عنْهُما أنَّهُ مرَّ بالشَّامِ على أنَاسٍ مِنَ الأنباطِ، وقدْ أُقِيمُوا في الشَّمْس، وصُبَّ على رُؤُوسِهِم الزَّيْتُ،

---

[٦٩] موسليم (١٦٥٩).

[٧٠] موسليم (١٦٥٧).

فَقَال: ما هَذا؟ قِيل: يُعَذَّبونَ في الخَراجِ، وَفي روايةٍ: حُبِسُوا في الجِزيةِ. فَقَال هِشَامٌ: أشْهَدُ لسمِعْتُ رسُول اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يقُولُ: (إن اللّـه يُعـذِّبُ الـذِينَ يُعذِّبُونَ النَّاس في الدُّنْيا) فَدَخَل على الأمِيرِ، فحدَّثَهُ، فَأمر بِهم فخُلّوا. رواه مسـلم (الأنبَاطُ) الفلاَّحُونَ مِنَ العجَمِ[71].

هیشـامی کـوڕی حـەکیمی کـوڕی حیـزام (ڕەزای خوایـان لـێ بـێ) لەشـام چـەند وەرزێرێکـی دی، لەبـەر خـۆر بـەپێوە ڕایـان گرتبـوون، ڕۆن زەیـت کرابـوو بەسەرو گوێلاکیان دا! هیشام (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ئەمە چییە بۆوایان لـێ دەکرێ؟ گوتیـان: لەسـەر موڵکانـە وایـان لێـدەکرێو ئـەم ئازارە دەدرێـن! لـە گێڕانەوەیـەکدا: لەسـەر سـەرانە بەنـد کـراون، هیشـام فـەرمووی: گـەواهیو شایەتی دەدەمو سوێند دەخۆم بەخوا کە بۆخۆم لەحەزرەت خۆیم ژنەوتووە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: بێگومان خودا ئەوکەسانە سزا دەدا، کەلەجیهان دا بەناڕەوا سزاو ئەشکەنجەی مەردووم دەدەن، ئەوجا هیشام چوو بۆلای مـیرو لەم بارەیەوە قسەی بۆکردو فەرمایشتەکەی پێغەمەری پێ ڕاگەیاند، میریـش دەستوریدا بەرەڵایانکردنو وازیان لێهێنان (م).

١٦٠٧/٨- وعن ابنِ عبَّاسٍ رضي اللّه عَنْهُما قَال: رأى رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)حِماراً مْوسُومَ الوجْهِ، فأَنْكَر ذلكَ؟ فَقَـال: وَاللّـهِ لا أسِـمُهُ إلا أقْصـى شَيءٍ مِنَ الوجْهِ، وَأمرَ بِحِمَارِهِ، فَكُوِيَ في جاعِرتَيْهِ، فهو أوَّلُ مَنْ كوى الجَاعِرتَيْنِ. رواه مسلم[72].

ئیبنـو عـەبباس خۆشـنوود لـەخۆیو بـابی بـێ فـەرمووی: جـارێ خۆشەویسـت (دروودی خوای لەسـەر بێ) گوێدرێـژێکی بینـی ڕووی داخ کرابـوو، بێـزاری خـۆی دەربـڕی فـەرمووی: نـەفرینی خـودا لەوکەسـەبێ کـە داخـی کـردووە. ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خوایـان لـێ بێ) فـەرمووی: بـەخودا مـن هـی خـۆم داخ ناکـەم، مەگـەر ئـەو شـوێنەی کـەزۆر دوور بێ لەڕوویـەوە لەپاشا فـەرمانی کـرد کـە

---

[71] موسلیم (٢٦١٣) رقم (١١٨).
[72] موسلیم (٢١١٨).

هەردوو لاڕانی کەرەکەی خۆی داخ بکەن، فەرمووی: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) یەکەم کەس بوو کە داخکردنی لاڕانی ئاژەڵی داهێنا (م/تاج).

١٦٠٨/٩- وعَنْهُ أنَّ النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): مَرَّ عليهِ حِمَارٌ قد وُسِم في وجْهِه فقَال: لعن اللّه الّذي وسمَهُ) رواه مسلم.

وفي رواية لمسلم أيضاً:نَهى رسُولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم) عن الضَّرْبِ في الوجهِ،وعنِ الوسْمِ في الوجهِ[٧٣].

دیسان فەرمووی: گوێدرێژێ لەکن پێغەمبەرەوە ڕەت بوو، بۆنیشان ڕووی داخ کرابوو، فەرمووی: نەفرینی خودا لەوکەسەبێ کەئاوا داخی کردووە، (م). لەگێڕانەوەیەکی تری موسلیم دا فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) قەدەغەی کردووە کە بدرێ لە ڕوخساری گیاندار، یا ڕوخساری گیاندار داخ بکرێ بۆ نیشانە کردن.

**٢٨٣- هەموو گیانداری نادروستە بەئاگر سزا بدێ، تەنانەت ئەسپێو شتی وایش**
**باب تحريم التعذيب بالنار، في كل حيوان حتى النملة ونحوها**

١٦٠٩/١- عنْ أبي هُريْرة (رضي اللّه عنه)قَال: بعثنا رسُولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)في بعثٍ فَقَال: «(إن وجدْتُم فُلاناً وفُلاناً) لِرجُلَيْنِ مِنْ قُريش سَمَّاهُمَا (فأحْرِقُوهُمَا بالنَّارِ) ثُمَّ قَال رسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)حِينَ أردْنا الخُرُوج: (إنِّي كُنْتُ أمرْتُكمْ أن تُحْرِقُوا فُلاناً وفُلاناً، وإنَّ النَّار لا يُعَذبُ بِهَا إلا اللّه، فَإنْ وجَدْتُموهُما فَاقْتُلُوهُما) رواه البخاري[٧٤].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ پەلێ خەباتگێڕا ناردینی، فەرمووی: ئەگەر ئەو کابرایەو ئەو کابرایەتان بەرچنگ کەوت، کە ناویان فیسارو فیسارە بەئاگر بیانسوتێنن.بەلام کە کەوتینە ڕێ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەبوو من پێم گوتن کە فیسارو فیسار بەئاگر بسوتێنن، وەلێ لەڕاستی دا بەس خودا مافی ئەوەی

---

[٧٣] موسلیم (٢١١٧).
[٧٤] بوخاری (٣٠١٦).

هەیە کە بەئاگر سزاو ئازاری دروستکراوی خۆی بدا، ئەگە بەرهەوێڵتان کەوتن مەیانسوتێنن بەلام بیانکوژن (ب).

٢/ ١٦١٠- وعن ابنِ مسْعُودٍ (رضي اللّٰه عنه)قَال: كُنَّا مع رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في سَفَر، فَانْطَلَقَ لِحَاجتِهِ، فَرأيْنَا حُمَّرةً معَها فَرْخَان، فَأَخَذْنَا فَرْخيْها، فَجَاءتْ الحُمَّرةُ تَعْرِشُ فجاءَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقال: (منْ فَجع هذِهِ بِولَدِهَا؟ رُدُّوا وَلَدهَا إلَيْهَا) وَرأى قَرْيَةَ نَمْلٍ قَدْ حرَّقْنَاهَا، فَقال: (مَنْ حرَّقَ هذِهِ؟) قُلْنَا: نَحْنُ. قَالَ: (إنَّهُ لا ينْبَغِي أنْ يُعَذِّبَ بالنَّارِ إلاَّ ربُّ النَّارِ). رواه أبو داود بإسناد صحيح[٧٥].

ئیبنو مەسعود (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەتی حەزرەت دا بووین، پێغەمبەر چوو بۆ سەراو، هەتا هاتەوە کلاو کورەیەکمان دی دوو بەچکەی لەبەر وو، هەردوو بێچولەکەیمان گرت، دایکەکەشیان دەستی کرد بەباڵە تەپێ بەدەورماناو وەك زمانزان دەیجروکان، کە خۆشەویست هاتەوە فەرمووی: ئەوەکێ کۆستی ئەم بەستە زمانەی خستووەو بەچکەکانی لێ ئەستاندووە؟

شتی وامەکەن بەچکەکانی بدەنەوە، حەزرەت ڕوانی شارە مێرولەیەکیشمان سووتاندووە، فەرمووی: ئەی ئەمە کێ سوتاندوویەتی؟ گوتمان: ئێمە، فەرمووی: شتی وامەکەن، لەڕاستی دا بەس خودا دەتوانێ کە بەئاگر سزای شت بدا، کەخۆی خاوەنی ئاگرە. (د-س/ص).

### ٢٨٤- قەرزکوێریی دەوڵەمەند نادروستە
### باب تحريم مطل الغني بحقّ طلبه صاحبه

⇨ (ب/١ ز/٢٥ ئایەتی یەکەم).

وقال تعالى: {فإن أمن بعضكم بعضاً فليؤد الذي اؤتمن أمانته} (البقرة ٢٨٣/٢).

واتە: ئەگەر متمانەتان بەیەکتری هەبوو، وەبەبێ بارمتەو ڕەهنو شایەتگرتن قەرزتان دا بەیەکتری، با قەرزارەکە کە متمانەی پێ کراوە بەسەر

---

[٧٥] ئەبو داوود (٢٦٧٥).

ڕاستی لەکاتی ناوبراودا قەرزەکەی سەری، کە وەك ئەمانەتو سپاردە وایە لەلای، بیداتەوە بەخاوەنەکەی.

١٦١١/١ – وَعَنْ أبي هُريرَةَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (مَطْلُ الغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإذَا أُتبِعَ أحَدُكُمُ عَلى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ) متفقٌ عليه[٧٦].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: قەرز کوێریی پیاوی دەوڵەمەند گەلێ ستەمە! ئەگەر کەسێکیشتان لەلایەنی قەرزارەکەیەوە بەرەو ڕووی پیاوێکی دەوڵەمەند کرایەوە، کە ئەو دەوڵەمەندە لەباتی ئەو قەرزەکەی بداتەوە ئەوە با ئەو بەرەو ڕووکردنەوەو ئیحالەیە قەبوڵ بکاو بچێ قەرزەکەی لەو دەوڵەمەندە وەربگرێتەوە (ش).

**٢٨٥- پاشگەزبوونەوە لەدەسەنەو بەخشش ناپەسەندە**

**ئەگەر نەیدابووە دەست پێبەخشراوەکە، دەنا نادروستە، وەلێ ئەگەر شتێکی بەخشی بەنەوەی خۆی بیداتە دەستیو نەیداتە دەستی دەتوانێت لێی پەشیمان ببێتەوە، گەرچی لەهەردوو حاڵەتەکەدا پەشیمان بوونەوە باش نییەو ناپەسەندە، هەروەك ناپەسەندە شتێ لەکەسێ بکڕێتەوە کەخۆی داوێتی پێی بەخێر یان لەباتی زەکات یان لەباتی کەفارەتو برێتیو شتی وا، بەڵام قەیدی نییە ئەگەر لەدەستی خێر پێکراوەکەدا نەمابوو وە بوو بوو بەماڵی کەسێکی تر، ئەوە دروستە هەڵی بکڕێتەوە بەپارەو شتی وا.**

**باب كراهة عود الإنسان في هبة لم يسلمها إلى الموهوب له**

**وفي هبة وهبها لولده وسلمها أو يسلمها وكراهية شرائه شيئاً تصدق به من الذي تصدق عليه أو أخرجه عن زكاة أو كفارة ونحوها ولا بأس بشرائه من شخص آخر قد انتقل إليه**

١٦١٢/١ – عَن ابنِ عَبَّاسٍ رضي اللّٰه عنهُما أن رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: (الّذِي يعُودُ في هِبَتِهِ كَالكَلْبِ يرجعُ في قَيْئِهِ) متفقٌ عليه. وفي روايةٍ: (مَثَلُ الّذي يَرجِعُ في صدقَتِهِ، كَمَثَلِ الكَلْبِ يَقيءُ، ثُمَّ يعُودُ في قَيْئِهِ فيَأكُلُهُ). وفي روايةٍ: (العائِدُ في هِبَتِهِ كالعائِدِ في قَيْئِهِ)[٧٧].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوکەسەی لەدەسەنەو بەخششی خۆی پاشگەز دەبێتەوە، ئەوە

---

[٧٦] بوخاری (٢٢٨٧) موسلیم (١٥٦٤).

[٧٧] بوخاری (٢٦٢٢) موسلیم (١٦٢٢).

وەكی سەگ وایە كە دەڕشێتەوە، كە دووبارە ڕشانەوەكەی خۆی دەخواتەوە (ش). لە گێڕانەوەیەك دا، ئەوكەسە كەشتێ دەبەخشێو لەپاشا لێی پەشیمان دەبێتەوە، ئەوە وەك سەگ وایە، كە هەر دەخوات، كە تەواو تێربوو دەڕشێتەوە، لەپاشا كاتێ ویستی ڕشانەوەكەی خۆی دەخواتەوە!. لەگێڕانەوەیەك دا كەسێ لەبەخشینی خۆی پاشگەزبێتەوە وەك ئەو سەگە وایە كە ڕشانەوەی خۆی دەخواتەوە.

٢/ ١٦١٣- وَعَنْ عُمَرَ بن الخَطَّابِ (رضي الله عنه)قَالَ: حَمَلْتُ عَلى فَرَس في سبيلِ اللّه فأَضَاعَهُ الّذي كَانَ عِنْدَه، فَأردتُ أنْ أشْتَرِيَهُ، وظَنَنْتُ أنَّهُ يَبيعُهُ بِرُخْصٍ، فسَألتُ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَقَالَ: (لا تَشْتَرِهِ وَلا تَعُدْ في صدَقَتِكَ وإن أعْطَاكَهُ بِدِرْهَمٍ، فَإنَّ الْعَائد في صَدَقَتِهِ كَالْعَائِدِ في قَيْئِهِ) متفقٌ عليه[78].

عومەری كوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەسپێكم هەبوو لەڕێگەی خودادا بەخشیم بە غەزاكەرێ، بەلام خاوەنەكەی قەدری نەزانیو زۆر بێخزمەتی كرد، منیش ویستم لێی بكڕمەوە، بەزەینی خۆم گوتم بەهەرزان دەیفرۆشیتەوە، چونكە تەواو لەڕو لاوازی كردبوو، بۆئەمە پرسیارم لەحەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) كرد، فەرمووی: نەیكڕەوەو نەخێرو بەخشینی خۆت بەپارە هەڵبگرەوە، بابەدرەمێكیش بیدا پێت، چونكە ئەوەی خێرو بەخشراوی خۆی بسەنێتەوە، یا بەپارە هەڵی بگرێتەوە وەك سەگێ وایە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە! (ش).

**٢٨٦- خواردنی ماڵی هەتیو زۆر نارەوایە (باب تأكيد تحريم مال اليتيم)**

قال اللّه تعالى: {إن الذين يأكلون أموال اليتامى ظلماً إنما يأكلون في بطونهم ناراً وسيصلون سعيراً}. (نساء ٤/١٠).

وقال تعالى: {ولا تقربوا مال اليتيم إلا بالتي هي أحسن}. (أنعام ٦/١٥٢).

وقال تعالى: {ويسألونك عن اليتامى قل إصلاح لهم خير، وإن تخالطوهم فإخوانكم، والله يعلم المفسد من المصلح}. (البقرة ٢/٢٢٠).

---

[78] بوخاری (١٤٨٩) موسليم (١٦٢٠).

واتاكانيان و تەفسيريان بەشيعر واتە:

هەركەس حەزدەكا پڕ بە سكی خۆی — ئاگر بخوات و تێر ببێ لەسۆی
با بەناڕەوا ماڵی هەتیوان — بخوات و ماڵی خۆی بكا وێران
بڵێ بەوانەی لەتۆ دەپرسن — كە لەتێكەڵی هەتیو دەترسن
پێیان بفەرموو: خوا ئاگای لێیە — چاك و خراپتان بۆئەوان كێیە
گولی گەڕەك نین، برای خۆتانن — چاوەڕێی چاكەو هاموشۆتانن!
سەرپەرشتیان بكەن وەك برا — هاوكاری بكەن لەگەڵ یەكترا!
پاڵفتەی قسەو پوختەی ئەم باسە — بەبێ زیادو كەم تۆ بڵێ واسە
چاكبە بۆ هەتیو، باشبە بۆ ماڵی — دەڵێم: بەباشی لەحاڵ بووی حاڵی!

٨/ ١٦١٤- وَعن أبي هُريْرة (رضي اللّه عنه)عَنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبِقَاتِ، قَالُوا: يا رَسُولَ اللّه ومَا هُن؟ قال: الشِّرْك بِاللّهِ، وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ التي حرَّمَ اللّهُ إلاّ بِالحقِّ، وَأكْلُ الرِّبا، وَأكْلُ مال اليتِيمِ. والتَّوَلِّي يوْمَ الزَّحْفِ، وقذفُ المُحْصنَاتِ المُؤمِنَات الغافِلاتِ) متفقٌ عليه[79].

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: خۆتان دوور بگرن لەحەوت تاوانی كوشندە، یاران فەرمویان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو حەوتە چیو چین؟ فەرمووی: یەكەم: شیرك و هاوبەش بۆ خودای تاك و تەنها، دووەم: سیحرو جادوبازی، سێهەم: كوشتنی كەسێ كەخودا ڕەوای لەسەری نەبێ، چوارەم: سوود خواردن، پێنجەم: خواردنی ماڵی هەتیو، شەشەم: هەڵهاتن و پشت هەڵكردن لەدوژمنی دین لەڕۆژی هێرش هێنانی دوژمنان، حەوتەم: بوختانی داوێنپیسی هەڵبەستن بۆ ئافرەتی داوێنپاكی موسوڵمانی بێ ئاگا (ش).

[4] سۆ: واتە: ئێش و ژان و ئازار.

[79] بوخاری (٢٧٦٦) موسلیم (٨٩) بڕوانە: ژ:١٦١٤.

## ٢٨٧- سوود زۆر ناڕەوایە - باب تغليظ تحريم الربا

قال اللّٰه تعالى: {الذين يأكلون الربا لا يقومون إلا كما يقوم الذي يتخبطه الشيطان من المس" ذلك بأنهم قالوا إنما البيع مثل الربا، وأحل اللّٰه البيع وحرم الربا، فمن جاءه موعظة من ربه فانتهى فله ما سلف وأمره إلى اللّٰه، ومن عاد فأولئك أصحاب النار هم فيها خالدون، يمحق اللّٰه الربا ويربي الصدقات} إلى قوله تعالى: {يا أيها الذين آمنوا اتقوا اللّٰه وذروا ما بقي من الربا} الآية. (البقرة ٢/٢٧٥-٢٧٨).

واتە: ئەو کەسانەی کە سوود دەخۆنو سوود وەردەگرن، کاتێ لە گۆڕ ڕاست دەبنەوەو دەڕۆن بۆ مەیدانی پرسینەوە بەرەو دەشتی مەحشەر خودا لەبەرچاوی ئەو حەمکە حەشاماتە دەیانکاتە پەندو ڕیسوایان دەکاو ناوی پیسی سوود خۆرییان دەزڕێنێ، بەم ڕەنگە بەدەم ڕێگەوە کە دەڕۆن دەڵێی شێتو فێدارن، تەواو پەرێشانو سەر لێشێواون، دەکەون بەملاو بەولادا، وەك شەیتان دەستی لێوەشاندبن ئاوا، یا جندۆکە توشی فێو پەرکەمی کردبنو شێتی کردبن ئاوا، بۆیە توشی ئەم گۆبەندە دەبن چونکە هەر بەسەرە خەری خۆیان کاریان دەکردو گوێیان بەفەرمانی خودا نەدەداو لەخۆیانەوە قانوونو یاساو دەستوریان دادەنا، دەیانگوت: جیاوازی چییە لەنێوانی سوودو فرۆتن دا، سوودیش سەودایەکە وەکوو فرۆتن، کەوابێ بۆ فرۆتن ڕەوایەو سوود ناڕەوایە؟ کەواتە هەردوکیان وەك یەك حەڵاڵن، وەلێ ئەمانە نەفامن، دەنا دەبوو بیریان لەوە بکردایەتەوە کە خودا خۆی لەهەموو شتێ باشتر دەزانێ، وەحوکمو بڕیاری خودا بێ دانایی‌و حیکمەت نییە، خوداش بەدانایی خۆی کڕینو فرۆشتنی حەڵاڵ کردووەو سودی قەدەغە کردووە، ئیتر هەرکەسێ هەر قیاسێ بکا قیاسەکەی پوچو بەتاڵە. دەی ئیتر لەم مێژووە بەدواوە، ئەوەی بەمە پەندو تەمێ وەردەگرێو دەست بەرداری سود خواردن دەبێ ئەوە ئەوەی چوو ڕابردووو بەسەرچوو، وەکاری دەکەوێتە لای خودا، بەڵام هەرکەسێ لەپاش ئەم ڕوونکردنەوەیە گەڕایەوە بۆ سەر سوودخۆریو بەمەهانەکەی جارانەوە حەڵاڵی کردەوەو دەربەستی فەرمانی خودا نەبوو، ئەوە هەتا هەتایە بەئێجگاری لەناو ئاگری دۆزەخ دا دەمێنێتەوە، وەك تاپۆکرابێ لەسەری!.

ئـەی بڕوادارەکـان! ئـەی موسـوڵمانە بـەڕێزەکان! خـودا ڕووی قسـەی لەئێوەیە، دەی بزانن پیتو فەڕی ماڵ بەدەستی خودایە، خودا بڕیاری داوە کە ماڵی سوود خێر ناداتەوەو پیتی دەچێ بەحـەوادا، بـەڵام ماڵێ کـە خێـرو خێراتی لێ بکرێ، زوو پەرەدەسێنێو پیتو فەڕی تێدەکەوێو بەپشتی خودا خاوەنەکەی زوو هەڵدەگرێ، هەروەها بزانن کەخودا خۆشی نایێ لـە مرۆڤی سپڵەی پـی نـەزانی نـا سـوپاس، کـە بـەردەوام بـێ لەسـەر حـەرام بـە حـەڵاڵ زانینو سەربکاتە تاوانکاری، ئەی موسوڵمانینە! بەری ژیـان دوورە، کتێـب بـۆ ئاخری دەگێڕێتەوە، ژیانی دنیا زۆر درێژیش بێ هەر دەبڕێتەوە، دەی بـزانن گـۆی مەیـدانی مەردایـەتی ئـەو کەسـانە دەیبەنـەوە کـە بـاوەڕی سـاخیان بەخوداو دینی خودا هێناوە، کە کردەوە باشەکان دەکەنو کردەوە خراپـەکان ناکـەن، کـە نوێـژێکی رێكوپێـك بەجێـدێننو کـە زەکـات دەدەن، بـۆ ئەمانـە هەیـە پاداشـتی بـاشو ڕەزای خـوداو پـیرۆزی هـەردوو جیهـان، لـەلای خـودا خــاوەن پایــەو پلــەن، لــەڕۆژی قیامــەتا تــرسو بیمیــان نییــەو کــردەوە پەشیمانیش نینو خەمبارو دلگران نین، ئەی بڕوادارینە! ئەی موسوڵمانینە، ئەگەر ئێوە بە ڕاستی بەدەمو بەدڵ موسوڵمانن دەبێ لەخودا بترسنو خاوەن وەزعو تـەقوا بـنو حـەلاڵو حـەرام بـزاننو فـەرمانی خـودا بـەجێ بێـنن، کەواتە: دەسبەرداربن لەوەی ماوەتەوە لەسوود.

وأما الأحاديث فكثيرة في الصحيح مشهورة" منها حديث أبي هريـرة السـابق في الباب قبله (انظر الحديث رقم ١٦٠٩). ➔ (ب/٤ ز/٢٨٦ ف/١).

١/ ١٦١٥- وَعَن ابنِ مَسْعودٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: (لَعَنَ رسُولُ اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)آكِلَ الرِّباَ وموكِلهُ) رواه مسلم[٨٠].

ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: لەعنەتی خودا لەسوود خۆرو سوود وەرگر (م).

[٨٠] موسلیم (١٥٩٧) تیرمزی (١٢٠٦).

## ٢٨٨- ریاکاریو ڕەواڵەتکردن نادروستە (باب تحريم الرياء)

⇦ (ب/١ ز/١ ئایەتی یەکەم).

وقال تعالى: {لا تبطلوا صدقاتكم بالمن والأذى، كالذي ينفق ماله رئاء الناس}. (البقرة – ٢/٢٦٤).

**واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بەخودا! خێرو خێراتو چاکەی خۆتان بەتاڵ مەکەنەوە، بەنازینو منەت کردن بەسەر هەژاران دا، یا بە ئازاردانیان، وەکوو کەسانێ کەماڵی خۆیان بەخت دەکەنو دەیبەخشن بەمو بەو، بەڵام بۆدیمەنو ریابازی لەبەر ئەوە پاداشی باشی خۆیان پووچ دەکەنەوەو لەباتی پاداش توشی تۆڵەی سەخت دەبن!.**

وقال تعالى: {يراؤون الناس ولا يذكرون اللّٰه إلا قليلاً}. (نساء – ٤/١٤٢).

**واتە: نیشانەیەکی تری ئەو ناپاکانە، کە بەزمان موسوڵمانن و بەدڵ بێ بڕوان، ئەوەیە هەرچی چاکەیە دەکەن بۆ ڕیابازیو چاوەی خەڵك دەیکەنو بۆخودای ناکەن، مەگەر لەبەرچاوی خەڵك ناوی خودا بهێنن، دەنا نایهێنن!**

١/ ١٦١٦- وَعَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ: (قَالَ اللّٰه تعَالى: أنَا أغْنى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلا أشْرَكَ فيهِ مَعِي غَيْرِي، تَركْتُهُ وشِرْكَهُ) رواه مسلم[٨١].

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خودای گەورە دەفەرموێ: من لەهەموو کەسێ زیاتر بێ نیازم بەشەریكو هاوبەشیەکەیەوە لەبەر ئەوە هەرکەسێ کارێ بکاو کەسێ تر بکا بەهاوبەشی من لەو کارەدا ئەوە بە خۆیو هاوبەشەکەشیەوە توری دەدەم! (م).**

١٦١٧/٢- وَعَنْهُ قَالَ: سمِعْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ: (إنَّ أوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يوْمَ الْقِيامَةِ عَلَيْهِ رجُلٌ اسْتُشْهدَ، فَأُتِيَ بِهِ، فعرَّفَهُ نِعْمَتَهُ، فَعرفَهَا، قالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيها؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ: قالَ كَذَبْت، وَلَكِنَّكَ

[٨١] موسليم (٢٩٨٥).

قَاتلْتَ لأنْ يُقالَ جَريء، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ في النَّارِ. وَرَجُل تَعلّم الْعِلْمَ وعَلَّمَهُ، وقَرَأ الْقُرْآنَ، فأتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمهُ فَعَرَفَهَا. قَالَ: فَمَا عمِلْتَ فِيهَا؟ قالَ: تَعلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ، وَقَرَأتُ فِيكَ الْقُرآنَ، قَالَ: كَذَبْتَ، ولكِنَّك تَعَلَّمْت الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ، وقَرَأتُ الْقرآن لِيقالَ: هو قَارِىءٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أمِرَ، فَسُحِبَ عَلى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ في النَّارِ، وَرَجُلٌ وسَّعَ اللّٰه عَلَيْهِ، وَأعْطَاه مِنْ أصنَافِ المَال، فَأُتِي بِهِ فعرَّفَهُ نعمَهُ، فَعرَفَهَا. قالَ: فَمَا عَمِلْت فيها؟ قال: ما تركتُ مِن سَبيلٍ تُحبُّ أنْ يُنْفَقَ فيهَا إلاَّ أنْفَقْتُ فيها لَك. قَالَ: كَذَبْتَ، ولكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ: هو جَوَادٌ فَقَدْ قيلَ، ثُمَّ أمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وجْهِهِ ثُمَّ أُلْقِيَ في النار) رواه مسلم[٨٢].

دیسان ئەو فەرمووی: بیستم لەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: یەکەم کەس کەلە ڕۆژی قیامەتدا مەحکەمە دەکرێ‌و حوکم دەدرێ، پیاوێکە شەهید کراوە، دەیهێنن لەبەردەم خوادا رایدەوەستێنن، خودا چاکەکانی خۆیی یەکە یەکە بیر دەخاتەوە، ئەویش یەکبەیەك پێیان لێدەنێ، جا خودا دەفەرموێ: باشە لەباتی ئەو چاکانە تۆ چی کارێکی باشت کردووە بۆمن؟ دەڵێ: منیش لەپێناوی تۆدا جەنگم کردووەو لەگەڵ دوژمنی تۆدا شەڕم کردووە، هەتا لەئەنجام دا بەدەستی دوژمن شەهید کراوم! یەزدان دەفەرموێ: درۆت کرد، بەلاّم تۆ بۆیە غەزات کردووە هەتا بڵێن ئازایە، وە ئەم قسەیەشیان لەجیهان دا پێگوتویت (تۆ بەمافی خۆت گەیشتویت! جا ئەوجا خودا فەرمان دەدا لەسەر ڕوو بەکێشی دەکەن تا تۆڕی دەدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، وە دووەم کەس کە مەحکەمە دەکرێ پیاوێکە لەجیهان دا زاناو مامۆستاو قورئانخوێن بووە دەیهێنن، خودا هەرچی چاکەیەکی لەگەڵ کردووە دەیانخاتەوە بیری ئەویش، یەکبەیەك پێیان لێدەنێ، جا خودا دەفەرموێ: باشە تۆ لەباتی ئەوانە چی کارێکی باشت کردووە لەبەر خاتری من! دەڵێ: منیش عیلم‌و زانست فێربووم‌و خەڵکی ترم فێری زانین کردو لەبەر ڕەزای تۆیش قورئانم دەخوێند، دەفەرموێ: درۆ دەکەی، بەلاّم تۆ بۆیە

---

[٨٢] موسلیم (١١٠٥).

فێری زانین بووی تا بڵێن زانایه، وه بۆیه قورئانیشت خوێندووه تا بڵێن قورئانخوێنه، وه ئهم قسهیهشیان لهدنیا دا پێ گوتویت، ئهوجا بهفهرمانی خودا لهسهر سك بهكێشی دهكهنو توڕی دهدهنه ناو ئاگرهوه، سێیهم كهس كه مهحكهمه دهكرێ پیاوێكه كه خودا لهدنیادا داراو دهوڵهمهندی كردووهو لهههموو چهشنه ماڵێكی پێداوه، كه دهیهێنن خودا ههموو چاكهكانی خۆیی وهبیر دهخاتهوه ئهویش پێیان لێدهنێ، دهفهرموێ: چیت پێكردن؟ دهڵێ: ههرچی تۆپێت خۆش بێ كه ماڵی تیا بهخت بكرێ لهوهدا ماڵی خۆمم خهرجكردووه، دهفهرموێ: درۆدهكهی، بهڵام تۆ بۆیه وات دهكرد تا بڵێن سهخیو جوامێره، وه ئهو قسهیهش لهدنیادا كراوه، ئهوجا بهفهرمانی خودا لهسهر دهم ڕای دهكێشنو دهیبهن توڕی دهدهنه ناو ئاگرهوه. ٠م-(ڕهزای خوای لێ بێ)).

٣/ فهرموودهی (إنَّا نَدْخُلُ عَلى سَلاطِيننا....) بڕوانه: ٢/١٥٤١ ز/٢٥٩[٨٣].

٤/ ١٦١٩- وعنْ جُنْدُب بن عَبْدِ اللّٰه بنِ سُفْيانَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): «مَن سَمَّعَ سَمَّعَ اللّٰه بِهِ، ومَنْ يُرَائِي يرئى الله بـه» متفقٌ عليه[٨٤].

جوندوبی كوڕی عهبدوڵلای كوڕی سوفیان فهرمووی: پێغهمبهر فهرمووی: ههركهسێ بۆ ناوبانگو شۆرهت چاكهو خوداپهرستی بكا، لهڕۆژی قیامهتا خودا بهپهندی دهكا، وهههركهسێ بۆ ڕواڵهت ههركارێ بكا لهڕۆژی قیامهت دا خودا پهردهی لهڕوو ههڵدهماڵێو ڕیابازییهكهی ئاشكرا دهكا. (ش).

⇦ ٥/١٦٢٠/٨٥- فهرموودهی: (مَـنْ تَعَلَّـم عِلْمـاً مِمَّـا يُبْتَغَـى بِـهِ....) بڕوانه (ژ/١٣٩١، ٢٤١)[٨٥].

والأحاديثُ في الباب كثيرةٌ مشهورةٌ.

---

[٨٣] بڕوانه: (١٥٤١) بوخاری (٧١٧٨).

[٨٤] بوخاری (٦٤٩٩) موسلیم (٢٩٨٧، ٢٩٨٦).

[٨٥]

فەرموودەی تری ئالەم بابەتە زۆرن، شۆرەتیان وەك گەوهەر وایە!.

**٢٨٩- باسی ئەوەی گومانی چاوەو ریاکاری لێدەکرێ بەڵام ریاکاریی نییە (باب ما يتوهم أنه رياء وليس برياء)**

١/١٦٢١- عنْ أبي ذَرّ (رضي اللّه عنه)قَال: قِيل لِرسُول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): أَرأَيْتَ الرَّجُلَ الذى يعْملُ الْعملَ مِنَ الخيْرِ، ويحْمدُه النَّاسُ عليه؟ قال: (تِلْكَ عاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ)، رواه مسلم[٨٦].

ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) کرا قوربان! هەیە ئیشێکی جوانی باش دەکا، مەردووم لەسەر ئەوە وەسپو ستایشی دەکەن، ئایا ئەوە دەبێ بە ریاکاری یانا؟ فەرمووی: وەسپی واباش لەسەر ئیشی واجوان ئەوە بەرکولێ مزگێنی خۆشی مرۆی موسوڵمانەو خودا ئاماژەی بۆئەوە کردووە کە دەفەرموێ: {لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ} (١٠/٦٤) دۆستانی خودا دەگەنە مەقامو پایەیەکی وا، ترسو بیمیان نامێنێو خەمو خەفەت لەهیچ شتێ ناخۆن، ئیتر مژدەو مزگێنی خۆش لەهەموو لایەکەوە دادەبارێ بەسەریان دا، هەم لەماوەی ژیانی دنیادا، هەم لە ڕۆژی پاشەرۆژدا. (م).

**٢٩٠- بەبێ پێداویستییەکی ڕەوا تەماشاکردنی ئافرەتی بێگانەو کوڕی لوسکەی جوانکیلە نادروستە**

**باب تحريم النظر إلى المرأة الأجنبية، والأمرد الحسن لغير حاجة شرعية**

قال اللّه تعالى: {قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم}. (نور- ٢٤/٣٠).

ڕەهبەر! بەموسوڵمانان بفەرموو: کە بەچاوی ناپاك تەماشای نامووسی خەڵك نەکەنو بەپێی توانا ڕوانینی نارەوا نەکەنو لەئاستی ژنی بیانیو ڕوانینی نارەوا چاوی خۆیان بقووچێنن.

⇦ (ب/٤ ز/٢٥٤ ل/١١٠١ چاپی یەکەم-ئایەتی دووەم).

[٨٦] موسلیم (٢٦٤٢).

⇦ ب/١ ز/٥ ل/٩١ چاپی یەکەم-ئایەتی پێنجەم).

⇦ ب/١ ز/٥ ل-٩٠ چاپی یەکەم-ئایەتی چوارەم).

١/ ١٦٢٢- وَعَنْ أبي هُرَيْرةَ (رضي اللّه عنه)عن النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَال: كُتِبَ على ابْنِ آدم نَصِيبُهُ مِنَ الزِّنا مُدْرِكٌ ذلكَ لا محالَةَ: الْعَيْنَان زِنَاهُمَا النَّظَرُ، والأُذُنان زِنَاهُما الاستِماعُ، واللِّسَانُ زِنَاهُ الْكَلامُ، وَالْيدُ زِنَاهَا الْبَطْشُ، والرِّجْلُ زِنَاهَا الخُطَا، والْقَلْب يَهْوَى وَيَتمنَّى، ويُصَدِّقُ ذلكَ الْفرْجُ أوْ يُكَذِّبُهُ). متفقٌ عليه. وهذا لَفْظُ مسلمٍ، وروايةُ الْبُخاريِّ مُخْتَصَرَةٌ[87].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو ئادەمیزادێ خودا بەشی خۆی داوێنپیسی لەچارەی نوسیوە، خوا ناخوا دەشێ تووشی ئەوە ببێ، جا داوێن پیسی چاو بریتییە لەڕوانین، وە داوێن پیسی گوێ بریتییە لەگوێ گرتن لەشتی نادروست، وەداوێن پیسی زمان بریتییە لەقسەکردنی نادروست، وە داوێنپیسی دەست بریتییە لەدەست وەشاندنو شت بە ناهەق بردن، وە داوێن پیسی پێ بریتییە لەڕۆیشتن بۆ ئیشی ناڕەوا، وە داوێن پیسی دەم بریتییە لەماچو موچ، وە دڵ ئارەزووی ئەو بێ شەرعییە دەکاو دەروونو نەفسیش ئاواتی ئەوە دەخوازێ، جا ئینجا دامەن (فەرج-عەورەت-شەرمگا)یش ئەمە بەدی دەهێنێ، یا ڕەفزی دەکا. (ش/تاج).

⇦ ٢/ فەرموودەی (إيَّاكُمْ والجُلُوسِ في الطُّرُقَاتِ،) بڕوانە: (١٩٠/٧ ز-٢٣)[88].

٣/ ١٦٢٤- وعَنْ أبي طلْحةَ زَيْدِ بن سهْلٍ رَضِيَ اللّٰه عنْـهُ قَـالَ: كُنَّا قُعُوداً بالأَفْنِيةِ نَتحَدَّثُ فيها فَجَاءَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم) فَقَامَ علينا فقال: (مالكُمْ وَلَمجالِسِ الصُّعُداتِ؟) فَقُلنا: إنَّما قَعدنَا لغَير ما بَأس: قَعدْنَا نَتَذاكرُ، ونتحدَّثُ. قال: (إما لا فَأدُّوا حَقَّهَا: غَضُّ البصرِ، ورَدُّ السَّلام، وحُسْنُ الكَلام) رواه مسلم[89].

---

[87] بوخاری (٦٣٤٣) موسلیم (٢٦٥٧)(٢١).

[88] بوخاری (٢٤٦٥) موسلیم (٢١٢١).

[89] موسلیم (٢١٦١).

ئـەبو طـەلحـە: زەیـدی كـوڕی سـەهل فـەرمووی: لەبـەردەم مـاڵان دا دانیشتبووین، گفتوگۆمان دەكرد لەناو خۆمان دا، لەوكاتەدا خۆشەویست هات بۆ ناومان، بەدیارمانـەوە ڕاوەسـتاو فـەرمووی: ئەمـە كـەی شـوێنە ئێـوە لێـی دانیشتوون بۆ لەم سەرە ڕێگەیەدا دانیشتوون؟ لەشوێنی وادا كـۆڕ مەبەسـتن. عـەرزیمان كـرد: قوربـان! خـۆ خوانەخواسـتە بۆكـاری خـراپ دانەنیشـتووین، بۆخۆمـان دانیشـتووین گفتوگـۆی بـاش دەكـەینو قسـەی ئاسـایی ناوخۆمـان دەكەین!

فـەرمووی: دەی كـەوازناهێننو ئەمـە هـەر دەكـەن بیكـەن، بـەڵام مـافی ڕێگەوبان بدەن، چاو لەڕوانینی نـاڕەوا بقوچێننو وەڵامـی سلاو بدەنـەوەو قسەتان شیرین بێ (م).

٤/ ١٦٢٥– وَعَنْ جَرير (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: سألْتُ رَسُولَ اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عَنْ نَظَرِ الفجأةِ فَقَال: (اصْرِفْ بصَرَك) رواه مسلم[٩٠].

جەریر فەرمووی: پرسیارم كرد لە حەزرەت بـۆ تەماشاكردنی كتوپڕی، فەرمووی: چاوت وەرچەرخێنەو یەكسەر ڕووبكە بەولاوە (م).

٥/١٦٢٦– وَعَنْ أمِّ سَلَمةَ رضي اللّٰه عنْهَا قَالَـتْ: كُنْـتُ عِنْـدَ رَسُـول اللّٰـه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وعِنْدَهُ مَيمونهُ، فَأَقْبَلَ ابنُ أمُّ مكتـوم، وذلـكَ بعْـدَ أنْ أمِرْنـا بالحِجابِ فَقَالَ النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (احْتَجِبا مِنْهُ) فَقُلْنَا: يا رَسُـولَ اللّٰـهِ أَلَيْس هُوَ أعْمَى: لا يُبْصِرُنَا، ولا يعْرِفُنَـا؟ فقَـال النبــيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم): «أفَعَمْياوَانِ أنْتُما ألَسْتُما تُبصِرانِهِ؟) رواه أبو داود والترمذي وقَالَ: حَـدِيثٌ حسَـنٌ صَحِيحٌ[٩١].

ئومـو سـەلەمە فـەرمووی: فـەرمانمان پێكرابـوو بـەحیجاب، جـاری مـنو مەیمونە (كە هەردووكمان هاوسـەری حـەزرەت بـوین) لەخزمـەتی دا بـووین، لەوكاتـەدا ئیبنـو ئوممـو مـەكتوم هـات، كـە پیـاوێكی كـوێر بـوو، حـەزرەت

---

[٩٠] موسلیم (٢١٥٩).

[٩١] ئەبوداوود () تیرمزی (١٧٧٩).

فەرمووی: حیجاب بگرنەوە لیّی‌و چارشیوەکانتان دادەنەوە. عەرزیمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەمە کوێرە، نەدەمان بینێ‌و نەدەمان ناسێ؟ فەرمووی: خۆ ئەوە ئەو کوێرە، خۆ ئێوە کوێرنین، گوایە ئێوەش ئەو نابینن!؟ (د/تیرمیزی:ح/ح/ص).

٦/١٦٢٧- وعنْ أبي سَعيدٍ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رسُول اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسلّم)قال: (لا يَنْظُرُ الرَّجُلُ إلى عوْرةِ الرَّجُلِ، وَلا المَرْأةُ إلى عوْرَةِ المَرْأةِ، ولا يُفْضِي الرَّجُلُ إلى الرَّجُلِ في ثوبٍ واحِدٍ، ولا تُفْضِي المَرْأةُ إلى المَرْأةِ في الثَّوْبِ الواحِدِ) رواه مسلم[٩٢].

ئەبو سەعید فەرمووی: حەزرەت فەرمووی: پیاو نابێ تەماشای شەرمگای نێرینە بکا، هەروەها ژنیش نابێ تەماشای شەرمگای ژن بکا، نابێ دوو پیاو بەڕووتی لەژێر یەك نوێن دا ڕابکشێن، وە هەروەها نابێ دووژن بەڕووتی لەژێر یەك پێخەف دا ڕابکشێن (م).

## ٢٩١- بەتەنیا کۆبوونەوە لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا دروست نییە
## باب تحريم الخلوة بالإجنبية

قال اللّٰه تعالى: {وإذا سألتموهن فاسألوهن من وراء حجاب}. (الأحزاب-٥٣/٣٣)

واتە: کاتێ داوای شتێکتان لەژنەکانی حەزرەت کرد بەرەو ڕویان مەوەستن‌و لەپشتی پەردەیەکەوە وەك دیوار، یا دەرگا، یا پەردەی ناو بارەگا داوایان لێبکەن.

١/ ١٦٢٨- وَعَنْ عُقْبَةَ بْن عَامِرٍ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رَسُولَ اللّٰـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسلّم)قَال: (إيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ)، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأنْصَارِ أفَرأيْتَ الْحمْوَ؟ قالَ: (الْحمْوُ المَوْتُ،)) متفقٌ عليه[٩٣].

---

[٩٢] موسليم (٣٣٨).
[٩٣] موسليم (٣٣٨).

**عوقبەی کوڕی عامیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درووودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بەتەنیا مەچن بۆلای ژنان! پیاوێ لە یاریدەدەران گوتی: قوربان! ئەی ئەگەر خزمی مێردەکەی بوو؟ فەرمووی: خزمی مێرد مردنە ئەو لەهەمووی خراپتر، چونکە بەناوی خزمایەتییەوە دوورنیە کاری دوژمنێ بکا (ش).**

٢/ ١٦٢٩- وَعَن ابنِ عبَّاسٍ رضيِ اللّٰه عنْهُما أنَّ رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَال: (لا يَخْلُوَنَّ أحدُكُمْ بِامْرأةٍ إلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ) متفقٌ عليه[٩٤].

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست فەرمووی: کەستان لەگەڵ ژنی بێگانەدا بەتەنیا کۆمەبنەوە، مەگەر ژنەکە کەسێکی خۆیی لەگەڵ دا بێ (ش).**

٣/ ١٦٣٠- وعن بُرَيْدَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَال رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (حُرْمَةُ نِساءِ المُجاهِدِينَ علَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أمهاتِهِمْ، ما مِنْ رجُلٍ مِنْ الْقَاعِدِين يَخْلُفُ رجُلاً مِنَ المُجاهدينَ في أهلِهِ، فَيَخُونُهُ فِيهِم إلاَّ وقَف لهُ يَوْم الْقِيامةِ، فَيأخُذُ مِن حسَنَاتِهِ ما شَاءَ حَتَّى يَرضي) ثُمَّ الْتَفت إلَيْنا رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فَقَالَ: (ما ظَنُّكُمْ؟) رواهُ مسلم[٩٥].

**بورەیدە فەرمووی: خۆشەویستی خودا فەرمووی: قەدرو ڕێزی ژنەکانی تێکۆشەرانی ڕێی خودا لەسەر ئەو پیاوانەی کەلەماڵەوە دەمێننەوە، وەك قەدرو ڕێزو حورمەتی دایکی خۆیان وایە، نابێ بەهیچ شێوەیێ بەچاوی ناپاکی بۆیان بڕوانن، هەر پیاوێکی نیشتەجێی ماڵەوە سەرەوکاری کەس‌وکاری پیاوێکی تێکۆشەری ڕێی خودا بکا، بەڵام لەهەمان کاتە دا گزیو ناپاکیان لێبکاو لەگەڵ غەزاکەرەکان دا ناپاك دەرچێ، ئەوە لەڕۆژی قیامەت دا ڕایدەگرن بۆی، بەئارەزووی خۆی کێشە لەچاکەو خێرو خێراتی دەکاو دەیانبا بۆ خۆی! کەس دەستی ناگرێ تا خۆی دەست هەڵدەگرێ! ئەنجا**

---

[٩٤] بوخاری (٥٢٣٣) موسلیم (١٣٤١).

[٩٥] موسلیم (١٨٩٧).

حەزرەت ئاوڕی دایەوە بەلای ئێمەداو فەرمووی: جا لەکاتی وادا ئایا بەبیری ئێوە ئەو تێکۆشەرە هیچی بۆ دەهێڵێتەوە یا گشتی دەبا بۆخۆی؟ (م).

**٢٩٢- چاولێکەریی پیاو لەژن نادروستەن هەروەها بەپێچەوانەشەوە دروست نییە بۆ ژنیش لەجلو بەرگو جوڵانەوەو بزوتنەوەدا لاسایی پیاوبکاتەوە (باب تحريم تشبه الرجال بالنساء، والنساء بالرجال في لباس وحركة وغير ذلك)**

١/ ١٦٣١- عن ابنِ عبَّاسٍ رضي اللّٰه عنْهما قَالَ: لَعَنَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)الُمخَنَّثِين مِنَ الرِّجالِ، والُمتَرجِّلاتِ مِن النِّساءِ. وفي رواية: لَعنَ رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)الُمتَشبِّهين مِن الرِّجالِ بالنساءِ، والُمتَشبِّهَات مِن النِّسَاءِ بِالرِّجالِ. رواه البخاري[٩٦].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەعنەتو نەفرینی کردووە لەپیاوی ژنانیو لەژنی کوڕانی، وە دەیفەرمووو: مەهێڵن بێنەماڵتان.

لەگێڕانەوەیەکا فەرمووی: حەزرەت فەرمووی: نەفرینی کردووە لەوپیاوە ژنانییەی کەلاسایی ژنان دەکەنەوەو لەو ژنە کوڕانییانەی کەلاسایی پیاوان دەکەنەوە (ب).

٢/ ١٦٣٢- وعنْ أبي هُرِيْرةَ (رضي اللّٰه عنه)قال: لَعنَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)الرَّجُل يلْبسُ لِبْسةَ المرْأةِ، والمرْأةِ تَلْبِسُ لِبْسةَ الرَّجُلِ. رواه أبو داود بإسناد صحيح[٩٧].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەفرینی کردووە لەو پیاوە کە بەرگی ژنانە لەبەردەکاو لەو ژنەش کە بەرگی پیاوانە لەبەر دەکا (د-س/ص). بەڵام ئەگەر ئەمە لەبەر هۆیەکی ڕەوا بوو قەیدی نییە. وەك کاتی ناچاریو لەبیرچوونو نمایشی ڕەوا.

---

[٩٦] بوخاری (٥٨٨٦).

[٩٧] أبو داوود (٤٠٩٨).

١٦٣٣- وعنه قَال: قَال رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (صِنْفَان مِنْ أهلِ النَّارِ لَمْ أرَهُما: قَوْمٌ معهم سِياطٌ كأذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبونَ بِها النَّاس، ونِساء كَاسياتٌ عارياتٌ مُمِيلاتٌ مَائِلاتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأسْنِمةِ الْبُخْتِ المائِلَةِ لا يَدْخُلنَ الجنَّةَ، ولا يجِدْنَ رِيحَهَا، وإنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مسِيرَةِ كذَا وكَذَا) رواه مسلم[98].

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: دوو تاقم هەن دۆزەخین من نەمدیون چونکە لەپاشی من پەیدا دەبن، تاقمەکەی یەکەمیان جۆرە قەمچیەکی ریشوداریان پێیە، وەك کلکی گا وایە، پێی لە خەڵکی دەدەنو دەبن بە کورتەو داردەستی دەستی فەرماندارە ستەمکارەکان! تاقمەکەی تر ژنگەلێکن نیوەی لەشیان پۆشتەیەو ئەو نیوەکەی تری ڕووتە! هەم خۆیان لەخشتە چوونو هەم خەڵکی تر لەخشتە دەبەن، قژی سەریان بەبارۆکەو شتی وا وەك دووگی لاری وشتر ئاوا زل دەکەن، ئەم ژنانە نەرێگەیان دەکەوێتە بەهەشتو نەبۆنو بەرامە خۆشەکەی بەهەشت دێ بەسەریان دا، لەگەڵ ئەوەی کەبۆنو بەرامەی بەهەشت ئەوەندەو ئەوەندە ساڵە ڕێ دەڕوات (م).**

### ٢٩٣- لاسکایی شەیتانو ناموسوڵمانان نادروستە
### باب النهي عن التشبه بالشيطان والكفار

١/١٦٣٤- عنْ جابرٍ (رضي اللّٰه عنه)قَال: قَال رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا تأْكُلُوا بِالشِّمَالِ، فَإنَّ الشَّيْطَانَ يأكُل ويَشْرَبُ بِشِمالِهِ) رواه مسلم[99].

**جابیر فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بەدەستی چەپ شت مەخۆن چونکە شەیتان چەپەیەو بەدەستی چەپی شت دەخوات (م).**

٢/١٦٣٥- وعَن ابنِ عُمر رضي اللّٰه عنهُما أنَّ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (لا يَأْكُلَنَّ أحدُكُمْ بِشِمالِهِ، وَلا يَشْرَبَنَّ بِهَا. فَإنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمالِهِ وَيشْربُ بِهَا) رواهُ مسلم[100].

---

[98] موسليم (٢١٢٨).

[99] موسليم (٢٠١٩).

[100] موسليم (٢٠٢٠) (١٠٦).

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کە شتدەخۆن بەدەستی ڕاست بیخۆن، هەروەها شت خواردنەوەیش، وە بەدەستی چەپ نەبخۆنو نەبخۆنەوە، چونکی شەیتان بەدەستی چەپ شت دەخواتو شت دەخواتەوە (م).**

١٦٣٦/٣- وعَنْ أبي هُرَيرَةَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رَسُول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: إنَّ الْيهُود والنَّصارى لا يَصْبِغُونَ، فَخَالِفوهُمْ) متفقٌ عليه[١٠١].

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویستی خودا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: جوولەکەو گاور سەرو ڕیشی خۆیان بۆیە ناکەن، کەواتە بەپێچەوانەی ئەوانەوە ئێوە بۆیەیان بکەن (ش).**

**٢٩٤- قەدەغەیە چ بۆ پیاو چ بۆ ژن کەمووو قژی خۆیان بە ڕەنگی ڕەش بۆیاخ بکەن**
**(باب نهي الرجل والمرأة عن خضاب شعرهما بسواد)**

١٦٣٧/١- عنْ جابرٍ (رضي اللّٰه عنه)قَال: أُتِي بـابي قُحافَـةَ والِـدِ أبـي بكْـر الصِّدِّيق رضي اللّٰه عنْهُما يوم فتْحِ مكَّةَ ورأسُهُ ولِحيتُهُ كالثَّغَامَةِ بياضاً، فَقَالَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (غَيِّرُوا هَذا واجْتَنبُوا السَّوادَ) رواه مسلم[١٠٢].

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: ڕۆژی گرتنی مەککە، کە ئەبو قوحافەی باوکی ئەبو بەکری صدیقیان هێنا، سەرو ڕیشی وەك قارچك پاك سپی بوو، پێغەمبەر فەرمووی: ئەو سپێتییە بەشتێ ڕەنگ بکەن، بەلاّم بەڕەنگی ڕەش ڕەشی مەکەن. (موسلیم** (ڕەزای خوای لێ بێ)**).**

**٢٩٥- قۆچکە تاش ناپەسەندە، بەلاّم بۆ پیاو دەتوانێ سەری یاگشتی بتاشێ، یا گشتی نەتاشێ، بەلاّم بۆ ژن نابێ**
**باب النهي عن القزع وهو حلق بعض الرأس، دون بعض، وإباحة حلقه كله للرجل دون المرأة**

١٦٣٨/١- عن ابن عُمر رضي اللّٰه عنهُما قَالَ: نَهَى رسُولُ اللّٰـه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عنِ القَزعِ. متفق عليه[١٠٣].

---

[١٠١] بوخاری (٥٨٩٩) موسلیم (٢١٣٠).
[١٠٢] موسلیم (٢١٠٢) (٧٩).
[١٠٣] بوخاری (٥٩٢٠) موسلیم (٢١٢٠).

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **نەهی دەکرد لە قۆچکە تاش (ش).**

٢/١٦٣٩- وعَنْهُ قَالَ: رَأى رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)صبِياً قَدْ حُلِقَ بعْضُ شَعْرِ رأسِهِ وتُرِكَ بعْضُهُ، فَنَهَاهَمْ عَنْ ذَلِكَ وَقَالَ: (احْلِقُوهُ كُلَّهُ أو اتْرُكُوهُ كُلَّهُ). رواهُ أبو داود بإسناد صحيحِ على شَرْطِ الْبُخَارِي وَمسْلِم[104].

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر کوڕێکی منالی دی هەندێ لەسەری تاشرابوو، هەندێکیشی نەتاشرابوو، ئیتر پێغەمبەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **نەهی لێکردن لەشتی واو فەرمووی: یا هەمووی بتاشن، یا هەمووی مەتاشن (د-س/ص).**

٣/١٦٤٠- وعنْ عبْدِ الله بنِ جعْفَر رضي اللّه عَنْهُما أنَّ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أمْهَل آلَ جعْفَر (رضي اللّه عنه)ثَلاثاً، ثُمَّ أتَاهُمْ فَقَالَ: (لا تَبْكُوا على أخِي بَعْدَ الْيوم) ثُمَّ قَال: (ادْعُوا لي بَنِيَّ أخِي) فجِيءَ بِنَا كَأَنّنا أفْرُخٌ فقَال: (ادْعُوا لي الحلاّقَ) فأمرهُ، فَحَلَقَ رُؤُوسنَا. رواه أبو داود بإسنادٍ صحيح على شَرْطِ البخاري ومُسْلِمٍ[105].

**عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **تا سێ ڕۆژ مۆڵەتیماڵو منالەکەی جەعفەری دا کە بۆی بگرین، بەبێ شینو شەپۆڕ، ئەوجا ڕۆیشت بۆلایانو فەرمووی: ئیتر لەمڕۆ بەدواوە بۆ جەعفەری برام مەگرین. لەپاش دا فەرمووی: برازاکانم واتە: منالەکانی جەعفەرم بۆ بانگ کەن. جا ئێمەیان هێنا بۆ خزمەتی، ئەوەندە پەرۆشی کۆچی باوکمان بووین دەتگوت بێچووله مەلی بێ باوكو دایکین، جا فەرمووی: ئادەی سەرتاشەکەم بۆ بانگ کەن. کەهات حەزرەت پێی فەرموو سەری هەموومانی بەتەواوی تاشی (د-س/ص).**

٤/١٦٤١- وعَن عَلِيّ (رضي اللّه عنه)قَالَ: نَهَى رسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أنْ تحْلِقَ المَرأةُ رَأسَهَا. رواهُ النِّسائى[106].

---

[104] ئەبوداوود (٤١٩٥).

[105] ئەبوداوود (٤١٩٢).

[106] نسائی (١٣٠/٢).

عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدەدا بۆ ژن کەسەری خۆی بتاشێ (ن).

## ٢٩٦- قژ خستنە سەر قژو خاڵ کوتانو ددان شاشکردن نادروستە
## باب تحريم وصل الشعر والوشم والوَشر وهو تحديد الأسنان

قال اللّٰه تعالى: {إن يدعون من دونه إلا إناثاً وإن يدعون إلا شيطاناً مريداً، لعنه اللّٰه. وقال لأتخذن من عبادك نصيباً مفروضاً، ولأضلنهم ولأمنينهم ولآمرنهم فليبتكن آذان الأنعام، ولآمرنهم فليغيرن خلق اللّٰه} (النساء-٤/١١٧-١١٩).

واتە: ئەم هاوبەش پەیداکەرانە ئەوانەی کە لەغەیری خودا دەیانپەرستن، هەموو بتێ هیچ لەدەست نەهاتوون، تەنانەت ناوی مێینەیشیان لێناون، وەك: لاتو عوزاو مەنات، لەبەرئەوەی ئەم بتپەرستییەیان بەفەرمانی شەیتانە لەڕاستی دا شەیتانی دوور لە خێری لەفەرمان دەرچوو دەپەرستن، ئەو شەیتانەی کە خودا خۆی لەعنەتی لێکردووە، واتە: لەقاپی میهرەبانی خۆی قاوی داوەو لەڕەحمەتی خۆی بێبەشی کردووە، ئەو شەیتانەی کە بەئاشکرا بەدەمی خۆی هاواردەکاو جاڕدەداو دەڵێ: من دوژمنی بەرەی ئادەمیزادم، ئەی خوایە! لەبەندەکانی تۆ بەشێکی دیاریکراو بۆخۆم بڕدەدەمو گازیان دەکەم کە فەرمانبەریی من بکەنو لەفەرمانی تۆ دەرچن، وە سوێند بێ کە دەبێ لەڕێگەی ڕاست لایان دەم، دەبێ گومڕایی بکەمو بەدرۆو دەلەسەو هاشەو هوشە دەستخەڕۆو دەست شکێنیان بکەمو بەهیوای هیچو پووچو بۆخەیاڵ پلاو لەپەرستنی تۆ تەرایان بکەم، وەك ئەم قسە دڵساردەکەرەوانە، ژیان بەری دریژە، قاپی تۆبە لەسەر پشتە، پەلەمەکە لەتۆبە یا زیندووبوونەوە درۆیە، ئەگەر ڕاستیش بێ پاداشتدانەوە هەیە، بەڵام تۆڵەسەندن نییە، ئیتر بەم شیلەو بێڵەیە هەڵیان دەخەڵەتێنمو فێریان دەکەم کە بەپێچەوانەی فەرمانی خوداوە کاربکەنو شێوەو وێنەی دروستکراوانی خودا بگۆڕنو لەسەر دیمەنو شێوەی خۆیانیان نەهێڵن، وەك ئەوە شەیتان دەڵێ: من پێیان دەڵێم: گوێی ئاژەڵ شەق بکەنو بیکەن بەنیشانە لەسەر حەرام کردنیان، یا پێیان دەڵێم: بەندە بخەسێننو

خاڵ بکوتن‌و دەستوورو شێوازی دینی خوداو پێغەمبەر تێکبدەن، وەلێ هەرچی گۆڕینێ لە ئایینی ئیسلام دا دانەمەزرابێ وەك سوننەت کردن‌و نینۆك کردن‌و شتی وا ئەوە بەر ئەمە ناکەوێ.

١/ ١٦٤٢- وعَنْ أسْمَاءَ رضي اللّٰه عنْهَا أنَّ امْرأَةً سألتِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فَقَالتْ: يا رَسُولَ اللّٰه إنَّ ابْنَتِي أصَابَتْهَا الْحَصْبَةُ، فتمرَّقَ شَعْرُهَا، وإنِّي زَوَّجْتُها، أفَأَصِلُ فِيهِ؟ فقال: (لَعَنَ اللّٰه الْواصِلة والْمَوصولة) متفقٌ عليه. وفي روايةٍ: (الواصِلَةَ، والمُسْتوصِلَةَ)[107].

ئەسماء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنێ لە پێغەمبەری پرسی (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەی پێغەمبەری خودا! کچێکم هەیە، سوریژەی گرتووەو قژەکەی روتاوەتەوە، داویشمە بەشوو، جا ئایا دەبێ کە قژی تر بدەمە دەم قژەکەی بۆکاتی گواستنەوەکەی؟ فەرمووی: لەعنەت‌و نەفرینی خودا لەو ژنەبێ کە قژ دەداتە دەم قژی تر بۆژنێکی ترو لەو ژنەیش بێ کە دەیەوێ قژی تر بداتە دەم قژی خۆی (ش) لەگێڕانەوەیەکا: نەفرینی خودا لەژنی قژ بەست‌و لەو ژنەیش کە داوا دەکا قژ بدەنە دەم قژی خۆی، یا قژ بدەنە دەم قژی ژنێکی تر!.

فەرموودەکەی ئەسماءو عائیشەی خوشکیشی گێڕاویەتەوە بوخاری‌و موسلیم فەرموودەکەی عائیشەشیان گێڕاوەتەوە.

٢/ ١٦٤٣- وَعَنْ حمَيْدِ بن عَبْدِ الرَّحْمن أنَّهُ سمع مُعاوِيَةَ (رضي اللّٰه عنه)عـامَ حجَّ علَى المِنْبر وَتَناول قُصَّةً مِنْ شَعْرٍ كَانَتْ فِي يد حَرسِيّ فَقَالَ: يا أهْلَ المَدِينَةِ أيْنَ عُلَمَاؤكُمْ؟، سِمِعْتُ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَنْهَى عنْ مِثْلِ هَذِهِ ويقُولُ: (إنَّمَا هَلَكَتْ بنُو إسْرَائِيل حِينَ اتَّخذَهَا نِسَاؤُهُمْ) متفقٌ عليه[108].

حومەیدی کوڕی ئەوڕەحمان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو ساڵە کە موعاویە (ڕەزای خوای لێ بێ) حەجی کرد، لەسەر دوانگەکەی مەدینە شارەجوان‌و

[107] بوخاری (٥٩٣٥) موسلیم (٢١٢٢).
[108] بوخاری (٥٩٣٢) موسلیم (٢١٢٧).

نازدارەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) گوڵێ مووی بەدەستیەوە گرتبوو، گوێم لێی بوو وتارێکی خوێندەوەو گوتی: زاناکانتان لەکوێن؟ چۆن شتی وا نارەوا روودەداو ئەوان دەنگناکەن؟! من خۆم لەپێغەمبەرم ژنەوتووە (درودی خوای لەسەر بێ) کە رێگەی شتی وای نەداوەو دەیفەرموو: نەوەی ئیسرائیل ئەوکاتە سەریان تیاچوو کە ژنەکانیان فێری ئەم جۆرە شتانە بوون (ش).

٣/ ١٦٤٤- وعَنِ ابنِ عُمر (رضي اللّه عنه)أنَّ رسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)لَعَنَ الْواصِلَةَ وَالْمُسْتوصِلَةَ، والْوَاشِمَةَ والْمستَوشِمة. متفقٌ عليه[109].

ئیبنو عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەعنەتو نەفرینی خودا لەو ژنەبێ کە قژ دەداتە دەم قژی تر بۆ ژنێکی ترو لەوژنەش بێ کە دەیەوێ قژی تر بداتە دەم قژی خۆی وە لەو ژنەش بێ کە خاڵ دەکوتێ بۆ کەسێکی ترو لەو ژنەیش بێ کە خاڵی بۆ دەکوتن (ش).

٤/ ١٦٤٥- وعن ابنِ مَسعُودٍ رضي عنهُ قَالَ: لعنَ اللّه الْواشِماتِ والْمستَوشِمات والْمُتَنَمِّصات، والْمُتفلّجات لِلحُسْن، الْمُغَيِّراتِ خَلْقِ اللّه، فَقَالَتْ لَهُ امْرأَةٌ في ذلكَ. فَقَالَ: وما لي لا أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)وَهُو في كتاب اللّه؟، قَالَ اللّه تَعالى: {وَمَا آتاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَما نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا} ﴿ الحشر: ٧ ﴾. متفقٌ عليه[110].

ئیبنو مەسعود (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەعنەتو نەفرینی خودا لە خاڵ کوت بێو لەوژنەش بێ کە بەئارەزووی خۆی خاڵی بۆ دەکوتنو لەدەمو چاو هەلگرو لەوژنەش بێ کە دەموچاوی خۆی هەڵدەگرێو لەوژنەش بێ کە بەبڕبەندو زبرە ددانی خۆی باریكو تەنكو شاش دەكا بۆ جوانی، چونکە ئەمانە بەم دەسکارییەی خۆیان نەخشو نیگارو ڕەنگو ڕێسی خودا دەگۆڕن، جا کاتێ ئەم قسەیە گەیشتەوە بە ئوممو یەعقوب کە ژنێکی قورئان خوێن بوو، وەلە خێڵی بەنی ئەسەد بوو، چوو بۆلای عەبدوللاو لەم لایەنەوە قسەی لەگەڵ دا کرد، کەسێ کە پێغەمبەری خودا خۆی لەعنەتو نەفرینی لێبکا

[109] بوخاری (٥٩٣٧) موسلیم (٢١٢٤).
[110] بوخاری (٥٩٣١) موسلیم (٢١٢٥).

چۆن لەعنەتو نەفرینی لێناکەم! وە سەرەڕای ئەوەش ئەمە لەنامەی خوداش دا هەیە، خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا کەنامەی خۆیەتی دەفەرموێ: {وَمَا آتاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا} (حشر-٧/٥٩). واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر دەتانداتێ لەماڵو لەئەحکام وەری بگرنو ئەوەیشی کەنەهی لەکردنی دەکا مەیکەنو وازی لێبهێنن (ش).

**٢٩٧- نەهی کراوە لە بژارکردن مووی سپی بووی سەرو ریشو شوێنەکانی تری جەستە، یا هەڵکەندنی کەندەمووی کوڕی بێموو لەکاتی خەتدان دا (باب النهي عن نتف الشيب من اللحية والرأس وغيرهما، وعن نتف الأمرد شعر لحيته عند أول طلوعه)**

١/١٦٤٦- عنْ عَمْرِو بن شُعَيْبٍ، عن أبيهِ، عنْ جَدِّهِ (رضي اللّه عنه)، عنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (لاَ تَنْتِفُوا الشَّيْبَ، فَإِنَّهُ نُورُ الْمُسْلِمِ يوْمَ الْقِيامةِ) رواهُ أبو داودَ والتِّرْمِذِيُّ، والنسائِيُّ بأَسَانِيدَ حسنَةٍ، قَالَ الترمذي: هُو حديثٌ حَسَنٌ[111].

عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکیەوە لە باپیریەوە (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مووی سپی بوو کە نیشانەی پیرییە بژاری مەکەن، چونکە ئەوە نوری روخساری موسوڵمانە لەڕۆژی قیامەت دا. (د/ت/ن-ح/ح-س/ص).

➜٢/١٦٤٧-١١٢ فەرموودەی (من عمل عملا ليس عليه...) بڕوانە (١/١٦٩ ز/١٨)[112].

**٢٩٨- تاراتکردن بەدەستی ڕاست باش نییە، هەروەها گرتنی شەرمگا (پاشو پێشی ئادەمی) بەدەستی ڕاست باش نییە، مەگەر لەبەر هۆی ڕەوا باب كراهية الاستنجاء باليمين، ومس الفرج باليمين من غير عذر**

١/١٦٤٨- عنْ أبي قَتَادةَ (رضي اللّه عنه)عنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (إذَا بال أحدُكُمْ. فَلاَ يأْخُذَنَّ ذَكَرهُ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يسْتَنْجِ بِيمِينِهِ، ولاَ يتنَفَّسْ في الإنَاءِ). متفقٌ عليه[113].

---

[111] ئەبوداوود (٤٢٠٢) تیرمزی (٢٨٢٢).
[113] موسلیم (١٧١٨) (١٨).

**ئەبو قەتادە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: کە گمیز دەکەن بەدەستی ڕاستتان چووکتان مەگرن، تاراتیش بەدەستی ڕاستتان مەگرن، لەجامی ئاوخواردنەوەش دا، لەکاتی ئاو خواردنەوەدا هەناسە مەدەن (ش).**

وفي الباب أحاديث كثيرة صحيحة.

**فەرموودەی تری ئالەم بابەتە زۆرن، شۆرەتیان پڕ بە ولاتە.**

**٢٩٩- باش نییە ڕۆیشتن لەیەك تاکی پێلاودا یا لەیەك تاکی سۆڵو کالەدا، هەروەها نا پەسەندە پێلاو لەپێکردن بەپێوە مەگەر لەبەر هۆی ڕەوا**

**باب كراهة المشي في نعلٍ واحدةٍ، أو خفّ واحد لغير عذر، وكراهة لبس النعل والخف قائماً لغير عذر**

١٦٤٩/١- عنْ أبي هُريرةَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: (لا يَمْشِ أحدُكُم في نَعْلٍ واحِدَةٍ، لِينْعَلْهُما جمِيعاً، أوْ لِيخْلَعْهُمَا جمِيعاً). وفي روايةٍ (أوْ لِيُحْفِهِما جميعاً) متفقٌ عليْهِ [114].

**ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بەتاکێ پێلاوەوە مەڕۆن، یا هەردوو تاکەکەی لەپێکەن، یا هەردوو تاکەکەی داکەنن. لەگێڕانەوەیەکا یا با هەردوو پێی پێکەوە پەتی بکا (ش).**

١٦٥٠/٢- وعنه قَال: سمِعتُ رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ: (إذَا انْقَطَعَ شِسْعُ نَعْلِ أحدِكُمْ، فلا يَمْشِ فِي الأخْرى حتَّى يُصلِحَهَا) رواهُ مسلم [115].

**دیسان فەرمووی: ژنەوتم لەحەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر سەربەن واتە: چەرمی سەر پەنجەی تاکێ لە پێلاوەکانتان پچڕا، بە تاکەکەی تریانەوە مەڕۆن هەتا پچڕاوەکە چاك دەکەنەوە (م).**

[113] بوخاری (١٥٤) موسلیم (٢٦٧).

[114] بوخاری (١٥٤) موسلیم (٢٦٧).

[115] موسلیم (٢٠٩٨).

٣/١٦٥١- وعَنْ جابِرٍ (رضي اللّٰه عنه)أن رسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)نَهَى أنْ ينْتَعِلَ الرَّجُلُ قَائماً. رواهُ أَبُو داوُدَ بإسْنادٍ حَسنٍ[116].

**جابير** (رەزای خوای لیٚ بیٚ) **فەرمووی: پیٚغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بیٚ) **حەزی نەدەکرد کە پیاو بەپیٚوە پیٚلاّو لەپیٚ بکا (د-س/ح).**

**٣٠٠- ئاگرو شتی وا لەکاتی خەوتن دا، لەناو ماڵ دا باش نییە، تەنانەت ئاگری چراو ئەمانیش هەر باش نییە**

**باب النهي عن ترك النار في البيت عند النوم، ونحوه سواء كانت في سراج أو غيره**

١/١٦٥٢- عنِ ابْنِ عُمرَ رضي اللّٰه عنهُمَا عنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَال: (لا تَتْرُكُوا النَّار في بُيُوتِكُمْ حِين تَنامُونَ) متفق عليه[117].

**ئیبنو عومەر** (رەزای خوای لیٚ بیٚ) **فەرمووی: پیٚغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بیٚ) **فەرمووی: کاتیٚ دەخەون ئاگری ناوماڵ بکوژیٚننەوە (ش).**

⇦ ٢/١٦٥٣-١١٨ **فەرموودەی: (إحترق بيت بالمدينه على أهله.... ) بڕوانە: (١٦١/٦ ز/١٦)[118].**

٣/١٦٥٤- وعنْ جابِر (رضي اللّٰه عنه)عنْ رسُول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَال: (غَطُّوا الإنَاء، وأوْكِئُوا السِّقَاءَ، وَأغْلِقُوا الْباب، وَأطفِئُوا السِّراج، فإنَّ الشَّيْطَانَ لا يَحِلُّ سِقَاءً، ولاَ يفتَحُ باباً، ولاَ يكْشِفُ إنَاءً، فإنْ لَمْ يجِدْ أحَدُكُمْ إلا أنْ يَعْرُضَ على إنَائِهِ عوداً، ويذْكُر اسْمَ اللّٰهِ فَلْيفْعَلْ، فَإنَّ الفُويْسِقَةَ تُضْرِمُ على أهْلِ البيتِ بيْتَهُمْ) رواهُ مسلم[119].

**لەجابیرەوە** (رەزای خوای لیٚ بیٚ) **لە خۆشەویستەوە** (دروودی خوای لەسەر بیٚ) **دەفەرمویٚ: سەری دەفر بنیٚنەوەو بەسەرقاپو شتی وا دایپۆشنو زاری کوندەو مەشکەو هیزەو جەوەندەو جەواڵو ئەمانە بە دەمبیٚنو شتی وا ببەستنو دەرگا**

---

[116] ئەبوداوود (٤١٣٥).

[117] بوخاری (٦٢٩٣) موسلیم (٢٠١٥).

[118]

[119] موسلیم (٢٠١٢).

دابخەن‌و چرا بکوژێننەوە، چونکە شەیتان بەفەرمانی خودا دەمبێنی کوندەو ئەمانە ناکاتەوەو دەرگای داخراو ناخاتە سەرپشت‌و سەرقاپی دەفری سەرنراوە هەڵناداتەوە. جا ئەگەر هەرهیچتان دەست نەکەوت کەسەری دەفری پێ بنێنەوە، تەڵێ دار، یا هەرشتێ بووە بەسەردەمی دەفرەکەدا ڕابهێڵن‌و ناوی خودای لێبهێنن‌و بیسمیللا بکەن، چرایش بکوژێننەوە چونکی زۆر جاران وادەبێ کە مشك کەیەکێکە لە پێنج جانەوەرە زیانە خورۆکان، کەناویان زڕاوە بەپێنج جانەوەرە فاسقەکان چرا قلێپ دەکاتەوەو ماڵەکە دەسوتێنێ بەسەر خاوەنەکەی دا (م).

**٣٠١- ڕێگەی زۆر لە خۆکردن (تەکەللوف) نەدراوە، کە بریتییە لەوە کەسێ کارێ یا گوتارێ بەزۆر، بە نابەدڵی بەبێ بەرژەوەندییەکی دیاریی بکا**
**باب النهي عن التكلف، وهو فعلُ وقول ما لا مصلحة فيه بمشقة**

قال الله تعالى: {قل ما أسألكم عليه من أجر وما أنا من المتكلفين}. (ص-٨٦/٣٨).

ئەی خۆشەویست! تۆ بفەرموو: من داوای ماڵ‌و پڕوپیتی جیهان لەئێوە ناکەم لەسەر ڕاگەیاندنی ئەم پەیامە خودایییە، وە من لەوانە نیم کە زۆر لەخۆم بکەم‌و بەزۆرو بە تەفەننون قسەو گوفت‌و گۆ دروست بکەم‌و، لافی شتێ لێبدەم کە شایستەیی ئەوەم نەبێ‌و، لەخۆمەوە بەدەم خوداوە ئەم قورئانە هەڵ ببەستم.

١٦٥٥/١- وعنْ ابن عُمر، رضي اللّه عنهُما، قَالَ: نُهينا عنِ التَّكلُّفِ. رواه البُخاري[١٢٠].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ڕێگەی ئەوە نەدراوین کە بەزۆر لەخۆکردن شت بکەین.

١٦٥٦/٢- وعنْ مسْرُوق قَال: دخَلْنَا على عبْدِ اللّهِ بن مسْعُودٍ (رضي اللّه عنه)فَقَال: يا أَيُّهَا النَّاس منْ عَلِم شيْئاً فَلْيقُلْ بهِ، ومنْ لَمْ يعْلَمْ، فلْيقُلْ: اللّه أَعْلَمُ،

[١٢٠] بوخاری (٧٢٩٣).

فإنَّ مِنَ الْعِلْمِ أن تَقُولَ لِمَا لا تَعْلَمُ: اللّٰه أعْلَمُ. قَال اللّٰه تَعالى لِنَبيِّهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {قلْ ما أسألُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أجْرٍ وما أنا مِنَ المُتَكَلِّفِين} رواهُ البخاري[121].

مەسروق فەرمووی: چووین بۆلای عەبدوڵلای كوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! ئەوەی شتێ دەزانێ با بیڵێو نەترسێو بەپێی پلەی زانینی خۆی حوكمی پێ بكا، وە ئەوەی كە شتێ نازانێ بابڵێ: نازانم، خودا خۆی هەمووشتێ دەزانێ،چونكە ئەگەر كەسێ شتێ نەزانێو ئاوا بڵێ ئەو قسەیەش بەشێكە لەزانین، چونكە نەزان ئەو كەسەیە كە بەهەڵەو نەزانی فەتوابداو شتێ نەزانێ بڵێ دەیزانم، خودا لەم بارەیەوە بە پێغەمبەری خۆی دەفەرموێ: {قل ما أسألكم عليه من أجر وما أنا من المتكلفين} (٨٦/٨٣).

**٣٠٢- شینو زاریو شتی وا لەسەر مردوو نادروستە، هەروا ڕومەت ڕنینەوەو یەخە دادڕینو قژ ڕنینەوەو سەرتاشینو ڕۆڕۆ**

**باب تحريم النياحة على الميت، ولطم الخدّ وشقّ الجيب، ونتف الشعر وحلقه، والدعاء بالويل والثبور**

١٦٥٧/١- عَنْ عُمَر بْنِ الخَطَّابِ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَال النبيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (المَيِّتُ يُعذَّبُ في قَبرِهِ بِما نِيح علَيْهِ). وفي رواية: (ما نِيحَ علَيْهِ) متفقٌ عليه[122].

عومەری كوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: مردوو لەناو گۆڕدا لەسەر ئەو گریانەی كەلەسەری دەكرێ سزاو ئازار دەدرێ. لە گێڕانەوەیەكا هەتا شیوەنی لەسەر بكرێ سزا دەدرێ (ش).

١٦٥٨/٢- وعن ابْنِ مسعُودٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الخُدُودَ، وشَقَّ الجُيُوبَ، ودَعا بِدَعْوَى الجَاهِلِيَةِ) متفقٌ عليه[123].

---

[121] بوخاری (٤٨٠٩).

[122] بوخاری (١٢٩٢) موسلیم (٩٢٧) (١٧).

[123] بوخاری (١٢٩٤) موسلیم (١٠٣).

ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوەی ڕوومەت بڕنێتەوەو یەخە دابدڕێو بانگەوازی سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام هەڵبدات لەئێمە نییە. (شەیخان-(ڕەزای خوایان لێ بێ)).

١٦٥٩/٣ – وَعنْ أبي بُرْدَةَ قَالَ: وَجِعَ أبُو مُوسَى الأشعريُّ (رضي اللّه عنه)، فَغُشِيَ عليْهِ، وَرَأْسُهُ في حِجْرِ امْرأَةٍ مِنْ أَهْلِهِ، فَأَقْبلَتْ تَصِيحُ بِرنَّةٍ فَلَمْ يَسْتَطِعْ أنْ يَرُدَّ عَلَيْهَا شَيْئاً، فَلَمَّا أفَاقَ، قَال: أنَا بَرِيءٌ مِمَّنْ بَرِيءَ مِنْهُ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بَرِيءَ مِنَ الصَّالِقَةِ، والحَالَقةِ، والشَّاقَّةَ، متفقٌ عليه[124].

ئەبو بوردەی کوڕی موسای ئەشعەری (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم زۆر نەخۆش بوو، لەبەر شەکەتیو کەشەنگی بورایەوە، لەوکاتەدا سەری لەسەر ڕانی ژنەکەی بوو، جا ژنەکەی قیژاندیو کردی بە هاتو هاوار، ئەبو موسا نەیتوانی وەڵامی بداتەوە، بەڵام لەپاشا کە هۆشی هاتەوە فەرمووی: من لەو کەسە بەریو بێزارم کە پێغەمبەر لێی بەریو بێزار بووە، پێغەمبەر بەریو بێزاربوو لەوژنەی کە شینو شەپۆڕ دەکاو شیوەن دەگێڕێو سەری خۆی دەتاشێو یەخەی خۆی دادەدڕێ لەکاتی قەومانی کارەسات دا. (ش-(ڕەزای خوایان لێ بێ)).

١٦٦٠/٤ – وعَن الْمُغِيرةِ بن شُعْبَةَ (رضي اللّه عنه)قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ: (مَنْ نِيحَ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ يُعَذَّبُ بِمَا نِيحَ عليْهِ يَوْمَ الْقِيامَةِ) متفقٌ عليه[125].

موغیرەی کوڕی شوعبە فەرمووی: ژنەوتم لەزاری خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئەوکەسەی کە شیوەنی لەسەر بکرێ لەسەر ئەو شیوەنەی کەلەسەری دەکرێ لەوجیهان دا ئازارو سزا دەدرێ (ش).

مەبەست لەم فەرموودە پیرۆزانە ئەوەیە کە کەسوکاری مردوو ڕەحم بەحاڵی مردووە ئازیزەکەی خۆیان بکەنو، هەتا دەتوانن بە پاڕانەوەو بە

[124] بوخاری (١٢٩٦) موسلیم (١٠٤).
[125] بوخاری (١٢٩١) موسلیم (٩٣٣).

ئۆقره گرتنو صەبرو ئارام باری سەرشانی سووك بكەنو كۆڵی گران نەكەن، دەنا ئەگەر مەبەست ئەوەبێ كە بەگشت گريەو زارييەك كەلەسەر مردوو بكرێ ئەو مردووە لە گۆڕەكەی دا ئازار بدرێ ئەوە وانييە، بەتايبەت لەكاتی وادا كە ئەو مردووە هيچ سوچێكی نەبێ لەو شيوەنەدا، چونكی كێ هەيە كەبەقەد ئيمامی حوسەين (ڕەزای خوای لێ بێ) شينو شەپۆڕی بۆ بكرێو هەموو ساڵێ شيوەنی بۆتازە بكرێتەوەو سينەزەنیو سينگ كوتانی بۆ بكەنو لەشيوەنەكەی دا بەقەمەو زنجير لەخۆيان بدەن!

تەنانەت گەلێ لە شاعيرە گەورەكانيش شيعری لاواندنەوەيان بۆ داناوەو دەنگخۆشەكان بەئاوازی غەمگينو بەسۆز دەيانخوێننەوە. هەتا بەندەيش بەم هيچو پووچيەی خۆمەوە گوتوومە:

لەجەوری دەهرو يەزيدەكانی
ئەگەر دەبينێ حوسەينی شەهيد
لەگەڵمان دەگری تا ڕۆی قيامەت
شيعەنيم وەلێ حوسەين مەشرەبم
سەرچۆپی شيوەن بدەن بە بەندە
نای بۆ دڵگەرمێ خۆمان ناسايی
گەرمو گوڕ بكاو داوود ناسايی
يەزدان! ميهرەبان! رەحيمو رەحمان!
نوری ڕووڕەشی قاپی خودای خۆی-
خودا! هاوارە كوردت بەعادەت
پارچەی جگەری مەلای كوردستان
وەك شيعەی حوسەين، هاوار بەماڵم
بۆچی بەزەييت نايە بەحاڵم؟!

گۆرانيی شاييم بۆتە گريانی
حاڵمان، دەنێرێ ڕەحمەت بۆ يەزيد!
بۆ پەرێشانی نوممەتی حەزرەت!
شيوەنو ڕۆ ڕۆ بۆتە مەتڵەبم!
نامادەم دەيدەم شاباشی چەندە!
كۆڕی شيوەنمان وەك بەزمی شايی
تا ئەم چەند سۆزە بكا تادوايی
ليم مەگرە توخوا، دەخيلتم نامان!!
گلەيی بەندەيی دەكا لەلای تۆی
حوسەين بۆ يەزيد دەكا عيبادەت!؟
بڕژا بەپەڕەی سووتاوی قورئان!
لەتاو دەردی دڵ، گشت كات دەناڵم
تاكەی پشت لەدۆست، ڕووت وا لەزاڵم؟!

وەرگێڕ-١٨/١٠/١٩٩١

١٦٦١/٥ – وعَنْ أمِّ عَطِيَّةَ نُسيْبَةَ بِضَمِّ النُّون وَفَتحِهَا رضي اللّٰه عَنْهَـا قَالَـتْ: أخَذَ عَلَينَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عِنْدَ البَيْعة أنْ لا نَنُوح. متفقٌ عليه[١٢٦].

ئوممو عەتیە (کەناوی نوسەیبە بوو) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی پەیمان لێوەرگرتن دا پەیمانی ئەوەی لێدەسەندین کە شینو شەپۆرو گریەو زاری نەکەین، واتە: ئەوکاتەی کە بەپێی ئەم ئایەتە پەیمانمان دەدایە کە دەفەرمویّ: {يا أيها النبيُّ إذا جاءك المؤمنات يبايعنك على أن لا يشركن بالله} واتە: ئەی پێغەمبەر! کاتیّ ئافرەتە موسوڵمانەکان هاتن بۆلات کە پەیمانو بەیعەتت بدەنیّ، لەسەرئەوە پەیمانیان لێوەربگرە کە بەهیچ جۆریّ هاوبەش بۆخوا بڕیار نەدەن تادوایی (ش).

١٦٦٢/٦ – وَعَنِ النُّعْمانِ بن بشيرِ رضي اللّٰه عنهُمَا قَالَ: أُغْمِي علَى عبْدِ اللّٰه بن رَوَاحَةَ (رضي اللّٰه عنه)، فَجَعَلَتْ أُخْتُهُ تبكي، وتَقُولُ: واجبلاَهُ، واكَذَا، واكَذَا: تُعدِّدُ علَيْهِ. فقَال حِينَ أفَاقَ: ما قُلْتِ شيْئاً إلاَّ قِيلَ لي: أنْتَ كَذَلِكَ؟، رواهُ البُخَارِي[١٢٧].

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کە لالە (خاڵ)ی من بوو، لەسەر خۆی چوو، خوشکەکەی دەستی کرد بەگریانو دەیگوت: ئای ئەو کێوەم ڕۆ، ئای ئەمەم ڕۆ، ئای ئەوەم ڕۆ، ئیتر ئا بەم ڕەنگە هات بە شانیاو پیا هەڵدەدا، کە خاڵە عەبدوڵلام هۆشی هاتەوە فەرمووی: خوشکیّ چۆن بەزمێکت بۆم نایەوە، گشت جاریّ کە تۆ وات دەگوت، فریشتەییّ بەتەوسەوە بەمنی دەگوت: ئایا تۆ وەك ئەمە دەڵیّ وابووی؟! (ب).

١٢٨/١٦٦٣/٧- فەرموودەی: (اشتكى سعد بن عباده....) بڕوانە: (٩٢٥/١ ز/١٥٣)[١٢٨].

---

[١٢٦] بوخاری (١٣٠٦) موسلیم (٩٣٦).

[١٢٧] بوخاری (٤٢٦٧).

[١٢٨]

٨/ ١٦٦٤- وعَنْ أبي مالِكٍ الأشْعَرِيِّ (رضي اللّه عنه)قالَ: قَالَ رَسُولُ اللّـه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «النَّائِحَةُ إذَا لَمْ تَتُبْ قَبْل مَوْتِهَا تُقَامُ يَوْمَ الْقِيامَةِ وعَلَيْها سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ، ودَرْعٌ مِنْ جرَبٍ» رواهُ مسلم[129].

ئەبومالیکی ئەشعەری فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سەردولکەبێژ (ئەگەر لەپێش مردنیا) تەوبە نەکاو پەشیمان نەبێتەوە، لەڕۆژی قیامەت دا کە زیندوو دەبێتەوە کراسی قەتران‌و دیزداشەی گەڕیی لەبەردایە. سەردولکە بێژ ئەو ژنەیە کە سەرچۆپی شیوەن دەگێڕێ (م).

٩/ ١٦٦٥- وعنْ أُسيدِ بنِ أبي أُسِيدِ التَّابِعِيِّ عَنِ امْرَأَةٍ مِنَ المُبايعات قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أخذ علَيْنا رَسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، في المعْرُوفِ الَّذي أخذَ علَيْنا أنْ لا نَعْصِيَهُ فِيهِ: أَنْ لا نَخْمِشَ وَجْهاً، ولاَ نَدْعُوَ ويْلاً، ولا نَشُقَّ جيْباً، وأنْ لا نَنْشُر شَعْراً. رَواهُ أبو داوُدَ بإسْنادٍ حسنٍ[130].

ئوسەیدی کوڕی ئەبو ئوسەیدی تابیعی (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ئافرەتێ لەو ژنانەی کە بەیعەت‌و پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کردبوو، بەپێی ئایەتی پەیمان وەرگرتن لە ژنانی موسوڵمان فەرمووی: یەکێ لەوشتە پەسەندو باشانەی کە پەیمانمان دا بەحەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) کەبێ گوێی نەکەین لەو بارەیەوە ئەوەبوو کە ڕوو نەڕنینەوەو هات‌و هاوارو هەی ڕۆوو وەیڕۆ نەکەین‌و یەخە دانەدڕین‌و قژ نەڕنینەوە! (د-س/ح).

١٠/ ١٦٦٦- وعَنْ أبي مُوسَى (رضي اللّه عنه)أن رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (ما مِنْ ميِّتٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ باكيهِمْ، فَيَقُولُ: وَاجبلاهُ، واسَيِّداهُ أوَ نَحْو ذَلِك إلاَّ وُكِّل بِهِ مَلَكَانِ يلْهَزَانِهِ: أهَكَذَا كُنتَ؟) رَوَاهُ التِّرْمِذي وقَال: حديثٌ حَسَنٌ[131].

---

[129] موسلیم (٩٣٤).
[130] ئەبوداوود (٣١٣١).
[131] تیرمزی (١٠٠٣).

**ئەبو موسا** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی:** کاتێ کەسێ دەمرێ ئەگەر یەکێ لەوەدوا هەڵسێتەوەو بەگریانەوە بیلاوێنێتەوەو بڵێ کێوم ڕۆ شێرم ڕۆ، یاشتی وا بڵێ، بێگومان کە ئەو مردووە دەدەنە دەست دوو فریشتە، خۆش خۆش دەماڵن بەهەردوو بناگوێی داو بەتەوسەوە پێی دەڵێن: جا ئایا تۆ وەك ئەمە دەڵێ وابووی؟! (ت-ح/ح).

١٦٦٧/١١- فەرمودەی: (إثنتان في الناس هما بهم كفر.... ) بڕوانە (١٥٧٨/١-٢٧٥)[١٣٢].

## ٣٠٣- هاموشۆکردنی کوڵەنانیو نەستێرە شوناسو فاڵگرەوەو نەمانە باش نییە کە هەندێکیان بەچەوو لمو دەنکە جۆو شتی وا دانەدەکرنەوە

## باب النهي عن إتيان الكهّان والمنجّمين، والعرَّاف وأصحاب الرمل، والطوارق بالحصى وبالشعير ونحو ذلك

١/ ١٦٦٨- عنْ عائِشَةَ رضي اللَّه عَنْهَا قَالَتْ: سَأَلَ رسُولَ اللَّـه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أُنَاسٌ عنِ الْكُهَّان، فَقَالَ: (لَيْسُوا بِشَيءٍ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّـه إِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَنَا أحْيَاناً بشْيءٍ فيكُونُ حقّاً؟ فَقالَ رَسُول اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (تِلْكَ الْكَلمةُ مِنَ الْحَقِّ يخْطَفُهَا الجِنِّيُّ. فَيَقُرُّهَا في أذُن ولِيِّهِ، فَيخْلِطُونَ معهَا مِائَةَ كِذْبَةٍ) مُتَّفَقٌ عليْهِ[١٣٣].

**عائیشە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی:** چەند کەسێ لەبارەی کوڵەنانیو کاهینانەوە لە پێغەمبەریان پرسی، فەرمووی: هیچ نین، گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا! جاروبار قسەکەیان ڕاست دەردەچێ، ئەی ئەوە چییە؟ فەرمووی: ئەو قسە ڕاستە ئەوەیە کە جنۆکە گوێ هەڵئەخەن بۆ گفتوگۆی فریشتەکانو لەدەمی ئەوانی دەڕفێنن، ئەنجا وەك مریشکێ بڵێ: قرت ئاوا دەیچێنن بەگوێی برادەرەکەیان دا، ئەوانیش لە گیرفانی خۆیانەوە سەد درۆی تری پێوە دەنێن! (ش=ب+م = بوخاریو موسلیم (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

---

١٣٢

١٣٣ بوخاری (٢٢١٠) موسلیم (٢٢٢٨).

وفي روايةٍ للبُخَارِيِّ عنْ عائِشَةَ رضي اللّه عنْهَا أَنَّهَا سَمِعَت رَسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ: (إنَّ الملائكَةَ تَنْزِلُ في العَنان وهو السَّحابُ فَتَذْكُرُ الأمْرَ قُضِيَ في السَّمَاءِ، فيسْتَرِقُ الشَّيْطَانُ السَّمْع، فَيسْمعُهُ، فَيُوحِيهِ إلى الْكُهَّان، فيكْذِبُونَ معَهَا مائَةَ كَذْبةٍ مِنْ عِنْدِ أنفُسِهِمْ).

لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاری دا پڕگۆڕی پیرۆزی لەنووری خودای گەورە بێو خودا بەبەرەکەتی عیلمی ئەو ڕەحم بەحاڵی شرِی ئێمەش بکا دەفەرموێ: لە حەزرەتم ژنەوت (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: فریشتە گەل، لەناو گەواڵەدا دێنە خوارەوە، واتە: لەناو پەڵە هەوردا، وەباسی ئەو کاروبارانە بۆ یەکتری دەکەن کەلەئاسمان بڕیاری لەسەر دەرچووە، دێوو شەیتانیش بە دز کە گوێ هەڵدەخەنو ئەو پەیامە دەژنەونو دوایی دەیچێنن بەگوێی کوڵە نانییەکان دا، ئیتر ئەوانیش لەگیرفانی خۆیانەوە سەد درۆی تری پێوە دەنین!

٢/١٦٦٩- وعنْ صفيَّةَ بنْتِ أبي عُبيدٍ، عَنْ بَعْضِ أزْواجِ النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)ورضي اللّه عنهَا عَنِ النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (مَنْ أَتَى عَرَّافاً فَسأَلَهُ عنْ شَيْءٍ، فَصدَّقَهُ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صلاةٌ أَرْبَعِينَ يوْماً» رواهُ مسلم[١٣٤].

صەفییەی کچی ئەبو عوبەید، کە هاوسەری ئیبنو عومەرە (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەیەکێ لەهاوسەرەکانی حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: حەزرەت فەرمووی: ئەوەی بڕوا بۆلای فاڵچیو لەبارەی شتێکەوە پرسیاری لێبکاو بەختی لەلابگرێتەوەو باوەڕی پێبکا. ئەوە نوێژی چل شەوی گیرانابێ! (م).

٣/١٦٧٠- وعنْ قَبِيصَةَ بن الْمُخَارِق (رضي اللّه عنه)قَالَ: سمِعْتُ رسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقُولُ: الْعِيَافَةُ، والطِّيرَةُ، والطَّرْقُ، مِنَ الجِبْتِ). رواهُ أبو داود بإسناد حسن[١٣٥].

[١٣٤] موسلیم (٢٢٣٠).

[١٣٥] ئەبوداوود (٣٩٠٧).

قەبیصەی کوڕی موخاریق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لەخۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) سەرو ماڵو منداڵو دایکو باوك بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ دەیفەرموو: بەخت گرتنەوەو نوقلانە لێدانو ڕەملگرتنەوە لە بتپەرستین (د-س/ح).

١٦٧١/٤- وعنْ ابْنِ عبَّاسٍ رضي اللّٰه عنْهُما قَالَ: قَال رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (من اقْتَبَسَ عِلْماً مِنَ النُّجُومِ، اقْتَبسَ شُعْبَةً مِنَ السِّحْرِ زَادَ ما زَاد) رَوَاهُ أبو داود بإسناد صحيح[136].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی کە بابەتێ لەزانستی ئەستێرە شوناسی فێردەبێ ئەوە بابەتێ لەزانستی جادوبازیی فێردەبێ، ئیتر چەند بابەت لەئەستێرە شوناسی فێربێ مەعنای وایە کە ئەوەندە بابەت لەجادوبازی فێربووە، زۆر بێ زۆرو کەم بێ کەم. (د-س/ص).

١٦٧٢/٥- وعَنْ معاويَةَ بنِ الحَكَم (رضي اللّٰه عنه)قَال: قُلْتُ يا رسُول اللّٰه إنِّي حَدِيثٌ عهْدٍ بِجاهِلِيَّةٍ، وقدْ جَاءَ اللّٰه تعالى بالإِسْلام، وإنَّ مِنَّا رجالاً يأتُونَ الْكُهَّانَ؟ قَال: (فَلا تَأْتِهم) قُلْتُ: وَمِنَّا رجالٌ يتَطَيَّرُونَ؟ قال: (ذلكَ شَيْءٌ يجِدُونَه في صُدُورِهِمْ، فَلاَ يَصُدُّهُمْ) قُلْتُ: وَمِنَّا رِجَالٌ يَخُطُّونَ؟ قَالَ: (كَانَ نبِيٌّ مِنَ الأنْبِيَاءِ يَخُط، فَمَنْ وَافَقَ خَطَّهُ، فَذاكَ) رواه مسلم[137].

موعاوییەی کوڕی حەکەمی سولەمی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من نۆ موسوڵمانمو تازە لەسەردەمی نەزانی دابڕاوم، ئێستایش لەسایەی خوداوە ئەم ئاینی ئیسلامی پیرۆزە هاتووە، لەبەرئەوە پرسیارم هەیە: لەسەردەمی نەزانی دا هەندێ شت هەبوون دەمانکردن، وەك ئەوەی دەچوین بۆلای کاهینەکانو کوڵەنانیەکانو بۆ هەندێ شت پرسو ڕامان پێدەکردن، فەرمووی: ئیتر هاموشۆیان مەکەن. گوتم: نوقلانەیشمان

---

[136] ئەبوداوود (٣٩٠٥).

[137] موسلیم (٥٣٧).

لێدەدا، فەرمووی: ئەوە شتێکە دێ بە دڵتاناو خوو عادەتتان پێوە گرتووە بەڵام بایەخی نییەو دەربەستی مەیەنو لەبڕیاری خۆتان ساردتان نەکاتەوە. گوتم: ئەی پیاوی وامان هەیە بەڕەمڵ دانە دەگرنەوە؟ فەرمووی: پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانیش بە ڕەمڵ دانەی دەگرتەوە، جا ئەوەی دروستە ئەگینا دروست نییە ئێستایش کەس نازانێ کە ئەو پێغەمبەرە دانەو ڕەمڵی چۆن گرتۆتەوە، کەوابێ بۆ کەس دروست نییە لافی ئەوە لێبدا. (م/تاج). ← (ب/٢ ز/٩١ ژ/٣/٧٠١).

٦/ ١٦٧٣ – وعَنْ أبي مسعُودٍ الْبدرِي (رضي اللّه عنه)أنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، ومهْرِ الْبَغِيِّ وحُلْوانِ الْكاهِنِ) متفقٌ عليهِ[١٣٨].

ئەبو مەسعودی بەدری فەرمووی: پێغەمبەر بەهای سەگو کرێی حێزو وەلیفەتو سەرقەڵەمانەی کوڵەنانی (کاهن)ی قەدەغە کردووە (ش).

**ڕوونکردنەوەیەکی زمانەوانی:**

بەپێی دەستورەکانی زانستی دەرون شوناسیو شەوگوزارە یا کەلیمەو مەعنای لەهەموو زمانێکا هاوکارو تەواوکەری یەکترین، بەسەلبو ئیجاب لەنرخو ڕێزی یەکتری کەمو زیاد دەکەن، واتە: هەروەك چۆن ناسكو نازداریو سووكو سۆڵیو خۆشی ووشە لەسەر زمانو لەناو گوی دا لەنرخو ڕێزی واتا باشەکەی پتر دەکا، بەڵام ئەگەر زەقو ڕەقبێ لەنرخو قەدری کەم دەکاتەوە، ئاوهایش بەهەمان یاسا مەعناو گوزارەیش کار لەبەهاو سەنگی ووشەو ناو دەکەن، زوربەی ووشە گەلی عەرەبی بەتایبەت لەسایەی ئیسلامەوە ڕێزیان چەسپاوەو بوون بەخاوەن قەوارەو کییانو، بگرە کەم ووشەی عەرەبی هەیە کە کەسبی پیرۆزی لەقورئانو کتێبە پیرۆزەکانی تر نەکردبێو بەهۆی عولومی عەرەبی مودەوونەوە وەك نەحوو صەرفو

[١٣٨] بوخاری (٢٢٣٧) موسلیم (١٥٦٧).

بەلاغەو عەروزو عەقائیدو تەجویدو لۆغەتو وەزعو بەحسو مونازەرە سەرەنجام هەوییەو شەخسیەتێکی بۆ خۆی دروست نەکردبێ!

ئەو وشەی کە لەقورئانا، یا لە حەدیسا یا لەشیعری شاعیرێکی گەورەدا، یا لە کتێبە گەورەکان دا، یا لەمەحافیلی سیاسیو عەسکەریو کۆمەلایەتی دا، یا لە سەرزاری پادشایێ، یا لەخیتابی عەرش دا، یا لەمانە لەهەموویان دا، وارید دەبێ، ئەوە بەوە ڕۆژ بە ڕۆژ نرخو ڕێزی پتر دەبێو هەوییەو شەخسیەتەکەی ناسراوتر دەبێ، بەلام وشەی هەتیو ئەوەیە کە ئەم شتانەی بەخۆیەوە نەدیبێ، بەلکوو بەپێچەوانەوە مەگەر بەسەردەمی شوانو گاوانو بازاڕیو ڕەشەخەلکەوە مابێو سەرەنجام بێ پایەیی گوتەرەکانی کاری لە پایەی ئەویش کردبێو لەباتی کەسبی پیرۆزیی کەسبی بێ ڕێزی لەوەسەتەکەی کردبێ! جا برالە! ئەمەیە حالی خاوەن کەسو حالی بێ کەس! گەلێ لەوشەگەلی زمانی عەرەبی خوێنەر هەر لەناو کتێبو نوسراودا فێری بووەو بەپێی شوێنی پیرۆزیی یا بەرێزی، قەدرو ڕێزی بۆداناوەو ڕەنگ بێ واتە ڕاستییەکەی هەر نەزانێ!

مەلام دیوە کەدەلێ (غائط) لووتی خۆی دەگرێ، چونکە لەو وایە (غائط) پیسایی ئادەمیزادە، نازانێ کەلەسەرەتاوە وەك حەزرەتی عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئاودەست لەناو عەرەبان دا نەبووە، کە یەکێ دەچوو بۆ سەراو دەچوو بۆ پێچو پەنایێ لەو دەشتە، وەبەو پێچو پەنایە دەگوترێ (غائط)!.

مەلایشمان هەیە لە ژێر لێوەوە بەشەرمەوە لەکاتی دەور کردنەوەی قورئان دا ئەو ڕستەیە دەخوێنێ: والتی أحسنت فرجها (٩١/٢١)!.

نەیسا هەرچۆنێ بێ، لەمەبەستی سەرەکی زۆر دوور نەکەوینەوە باشە، لەگەل ئەوەیشا کە لێم ڕوونە زوربەی خوێنەری ئەم جۆرە کتێبە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا بەداخەوە لەم جۆرە باسەی بەردەستمان باش حالی نابن، بەلام درێژە بەباسەکەم دەدەم، چونکە شتێکی نوێیەو زوو یا درەنگ پەرە بەم جۆرە توێژینەوەیە دەدرێ. کەواتە بۆ نمونەی مەغدوریی کەلیمەی کوردیو مەحزوزیو بەختیاشیی وشەی عەرەبی ئەم نموونەیە دەهێنینەوە.

وشەی (كاهن)ی عەرەبیو وشەی (كوڵەنان)ی كوردی بەرابەری وەردەگرین، تابزانین چیمان بۆ دەردەكەوێ، وە ئایا لەڕاستی دا كوڵەنانیو كاهین هیچ جیاوازییەكییان لەمەعنادا هەیە یانا؟!

١ - لەڕاستی دا، لەواقیعو زەمینەی ڕووت دا، دوور لە ئیعتیباراتی موكتەسەبە (كاهن)و (كوڵەنان) بەیەك كەس دەگوترێ، بەس ئەوەندە هەیە ئەمیان عەرەبییەو ئەویان كوردییە!

٢ - ئەی بۆ (كاهن) تامو چێژێكو سامو شكۆیەكی تری هەیە كە (كوڵەنان) هێشتا بەخۆیەوە نەدیوە، ئەوە بۆ وایە؟ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆو هاوكارو تەواوكەرانەی ئاغای (كاهن)و بۆ بێ كەسیو بێ خاوەنیو بێ گیانی مام (كوڵەنان)!.

یەكەم: خوێنەر كۆمەڵێ زانیاریو زاراوەی زۆرو قەبەو زل زل لەبابەت وشەی (كاهن)ەوە دەزانێ وەك: ئیسمی فاعیل بووە لە بنەڕەت دا، لەسەر وەزنو كێشی فاعیلونە، حروفو پیتە ئەصلییەكانی كافو هێو نوونەو ئەلفەكەی زائیدە، هەروا مازیو موزاریعو صیغەكانی تری دەزانێو لەهەموو ڕستەیەكا مەوقیعی لە ئیعراب دا دەزانێ.. تاد.

دووەم: عیلمی كەهانەی ژنەوتووەو ڕاست یا درۆ ناوی چەند كاهنی گەورە گەورەی كۆنی لەبەر كردووەو زۆر شتی تر لە سوودی وشەی (كاهن) فێربووەو لەسەدان كتێب دا وشەی (كاهن)ی بەرچاو كەوتووە كە ئەوەندە بەجوانی نوسراوە وەك گڵۆپی سەدی درەوشاوەتەوە!

لەبەرئەوە واهەست دەكا ئەو كەسەی ناوی (كاهن)ە بەخۆڕایی ئەم هەموو زانیارییەی لەسەر نەنوسراوە، دیارە كەسایەتیەكی شایەنی هەیەو جیایە لەم خۆریو مۆرییەی كە بەچاوی خۆی دەیانبینێ لەپێچو پەناكان دا، نەخوێنەوارو ژنانی ساویلكەو دڵسافی خۆش باوەڕ، بۆ پارەو پوول تەفرە دەدەنو بەزمانی لووسو بەدرۆو دەلەسە چەن پولێكیان لێدەكێشنەوە!

بەڵام كوردەكەی خۆمان كە بەبێ پێشەكیو موقەددیمەكە لووتی دەتەقێ بەلووتی مام دێوانەدا بەخۆیو تەزبیحو كەشكۆڵی سواڵییەوە كەدەق دەڵێی عەلامەتی ئیستیفهامو نیشانەی سەر سوڕمانە، یا كە چاوی دەكەوێ بەكابرای جووكی گێلی لاژگی بێكارە، كە هەموو تڕو تیفاقی هونەرەكەی هەنێ

دمزووی ڕەنگاو ڕەنگ‌و گوڵە مووو بنێشت‌و بۆن‌و بوخوردو ئەمانەیە، یا کەتووشی فالگرەوەو فاڵچییە دەستبڕەکانی خۆمان دەبێ، کە ئەوەندە دوکەڵ چووە بەسەرو چاویان دا دەڵێی مەشکەی قانگدراون، چونکە هەر خەریکی فڕو فێڵی ژنانەو هەزارو یەك پایەی مەوهوم‌و خەیاڵییان بۆ خۆیان بڕیارداوە، جارێ دەڵێن: بەخت دەگرینەوە، ڕۆژێ دەڵێن: لە ئەستێران تێدەڕوانین‌و هەواڵی زەمینی پێ دەزانین، یا دەڵێن نەزۆك سك پڕدەکەین‌و زاوای بەسراو دەکەینەوە یا لافی ئەوە لێدەدەن کە لەگەڵ ئەوانگەڵ گفتوگۆو قسەگەل دەکەن، هەیانە بەشاقەلی گواوییەوە دەم لە حەوت تەبەقەی ئاسمان دەکوتی، ئەمە لەلایێ لەلایەکی تریشەوە چەن ناوێکی قۆڕ قۆڕو چەن نازناوێکی عەنتیکەی ئەم هونەرمەندە بێ هونەرانەی لەبەر کردووە، وەك: عاسە بیجەڕێنەو فایەقی مۆتێ‌و مەلای چاوەڕەش‌و فاتە کوڵەنانی‌و حەمید چکچکانی‌و خلە سەرژنانی‌و خاتە کوڕانی‌و شێخ لۆقنتەو شێخەکەی یالانقۆزو سەدانی تری وەك ئەم ناوو ناتۆرە ناشیرینانە.

بەڵێ کوردەکەی خۆمان بەبێ پێشەکی ناوکتێبان لەسەر ئەم حاڵە شڕەو لەم بارودۆخەناموبارەکەدا، بەچاوی سەر بەر لەچاوی دڵ‌و هۆش، کوڵەنانی دەناسێ، ئیتر لەمێشکی دا یەك سەر ناوو خاوەن ناوی لەبەرچاوی دەکەوێ، واتە: بەپێچەوانەی وشەی (کاهن)ەوە وشەی (کوڵەنان)ی کەسبی بێڕێزی لە موسەمماکەیەوە دەکاو، ناوو خاوەن ناو ڕووی مەجلیسیان نامێنێ، ئاوا مام دێوانەی دانەگرەوە بە تەزبێ‌و عەسای دەستی‌و بە کەشکۆڵی سوالێی لاشانی مۆرێکی بێ دەگەڕێ‌و بی قەدری وادەنی بەناوچاوانی وشەی کوڵەنانییەوە، کە هەتا ڕۆژی قیامەت شوێنەواری دەمێنێ! وەك کۆنە زامی شوێن قەپی گورگی گەڕ بەلاقە برغەی ئاسکی جوانەوە! ئیتر هەتا ئیوارێ من‌و تۆی کورد خوا هاواربکەین‌و بڵێین‌و سوێندی مەحکەمەی لەسەر بخۆین کە (کاهن) یانی (کوڵەنان)ی کێ بڕوادەکا؟ مەگەر هەژارێکی کوردی تری وەکوو خۆم‌و خۆت!

لەولایشەوە (کاهن) دەبێ بە (فصیح)و دم ڕاست‌و دەبێ بە شەکری سەرزاری شێخ‌و مەلاو بەگ‌و بەگزادەکان‌و وەك ئاغا هەزاران مسکێنی وەکوو من‌و تۆ بە شانازییەوە خزمەتی دەکەن‌و ئەم‌و ئەو بۆ پاداشی باشی هەردوو جیهان بە تەجویدو قیرائەتەوە دەیخوێنن!

(کوڵەنان)ی قوڕبەسەریش لەمن خراپتر، کە بەدەست پرۆفیسۆرەکانی ئاخر زەمانەوە داماوم دەبێ بە بنێشتە خۆشەی سەردەمی ڕەشە خەڵك‌و منداڵ‌و مەزم!.

ئەم باسەی نووسرا، گاڵتەی منداڵان نییە، بۆکەسی خۆی چراوگێکی جوانە بۆ توێژینەوەیەکی خەست‌و چڕو قوڵ‌و بەرفراوان، لەم بارەیەوە لە ئاییندەدا بەنیازی تەکاندنی تەپو تۆزی جەورو ستەمی ڕۆژگار لەڕووی ناسك‌و نازداری وشەی کوردی، کەلەبەر بێکەسی‌و بێ خاوەنی دەڵێی گوڵاڵە سورەیەو لەبەربێ بارانی سیس هەڵگەڕاوەو زەرد بۆتەوە، بەڵام زەردێکی جوان وەك زەردی نێرگز! مەبەستی نوری ئەمەیە نەك شۆخی کردن! باکۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەم چوارینە عەرەبییە بێ، کەئەم باسەی تیادا ڕەنگ دەداتەوە، کە دەڵێم:

تقييمنا لجوهر المعاني   يلقى ظلآلها على المباني

تزيننا لبنية المباني يُضْفي   جمالها على المعاني

وەرگێڕ/ نوری فارس

## ٣٠٤- نوقڵانەی خراپو قڕاندنی ناپەسەند (باب النهي عن التطير)

فيه الأحاديث السابقة في الباب قبله:

واتە: تەماشای ئەم شوێنە بکە:➔(ب/٤ ز/٣٠٣ ل/١٢٢٢ ف/٣ + ب/٢ ز/٩١/ ل/٦١٢ ف/٣).

١/ ١٦٧٤- وعنْ أَنَسٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم): (لا عَدْوَى ولا طِيَرَةَ ويُعْجِبُنى الفألُ) قالوا: ومَا الْفَألُ؟ قَالَ: (كَلِمةٌ طَيِّبَةٌ) متفقٌ عليه[١٣٩].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نە نەخۆشی تەنینەوە لەخۆیەوە بەبێ ڕەزابوونی خودا لەسەری هەیەو نە قڕاندن‌و نوقڵانەی خراپ بۆی هەیەو نە پێ ڕەشی‌و بەد قدومی بۆی هەیە،

---

[١٣٩] بوخاری (٥٧٥٦) موسلیم (٢٢٢٤).

بەڵام نوخشە لێدانم پێ خۆشە. یاران فەرموویان: قوربان! نوخشە لێدان وەکوو چی؟ فەرمووی: وەك ئەوە کارێکتان بەدەستەوەیە دەتانەوێ بیکەن، لەکاتی نیازی کردنەکەی دا وشەیەکی باش بەر گوێتان بکەوێ (ش).

٢/ ١٦٧٥- وعَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي اللّٰه عَنْهُما قَالَ: قَالَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): لا عَدْوى وَلا طِيرَةَ، وإنْ كَان الشُّؤمُ في شَيْءٍ، فَفي الـدَّارِ، والمَـرْأةِ وَالفَرَسِ) متفقٌ عليه[140].

ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خوایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (درودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: نـە نەخۆشـی تەنینـەوە هەیـەو، نـە نوقلانـەی خـراپو قڕانـدن بایەخی هەیـە، شـومیو بـەدبوومیش گریمـان ئەگـەر هـەبێ لـەم سـێ شـتەدا هەیە: یەکەم: خانوو، دووەم: ژن، سێیەم: ماینو ئەسپ (ش).

٣/ ١٦٧٦- وعَنْ بُرَيْدَةَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)كَانَ لا يتطَيَّرُ. رَواهُ أبُو داود بإسنادٍ صحيحٍ[141].

بورەیدە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) قـەت نـەیدەقڕانـد بۆشتو هیچ کات نوقلانەی خراپی لێنەدەدا (د-س/ص).

٤/ ١٦٧٧- وَعنْ عُرْوَةَ بْنِ عامِرٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: ذُكِرتِ الطِّيـرَةُ عِنْـد رَسُولِ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقَالَ: أحْسَنُهَا الْفَألُ، وَلا تَرُدُّ مُسْلِماً، فَـإذا رأى أحَدُكُمْ ما يَكْرَه، فَلْيقُلْ: اللّٰهُمَّ لا يَأتي بالحَسَناتِ إلاَّ أنتَ، وَلا يَدْفَعُ السَّيِّئاتِ إلاَّ أنْتَ، وَلا حوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بك) حديثٌ صَحيحٌ رَوَاهُ أبو داودُ بإسنادٍ صَحيحٍ[142].

عوروەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبـەردا (درودی خوای لەسەر بێ) باسی نوقلانە کرا، فـەرمووی: نوخشەو نوقلانـەی بـاش فـرە باشـە، نوقلانەی خراپیش کۆڵ بـە موسوڵمانان نـادا پـەکی کـاری ناخـا، جـا ئەگـەر توشی شتێ بوون لەم بابەتەوە، نوخشەی باش نەبوو بەلاتانەوە، ئـەوە گوێی

---

[140] بوخاری (٥٧٥٣) موسلیم (٢٢٢٥).

[141] ئەبو داوود (٣٩٢٠).

[142] ئەبو داوود (٣٩١٩).

پـی مـەدەنو بـەوە لـەنیازی بـاشو لـەکاری خێـر پەشـیمان مەبنـەوەو بـۆ دڵنیـاییش ئـەم دوعایـە بخوێننو بڵێن: (اللهم لايأتى بالحسنات إلا أنـت، ولا يدفع السيئات إلا أنـت، ولا حـولَ ولا قـوه إلا بـك). پـەروەردگارا، ئـەی خـودای من! چاکەو خراپە هەمووی بەدەستی خۆتە، هەر خێـرێ تـۆ نـەیـدەی نابـێو هەر شەڕێ تۆ لەكۆڵی نەخەی لەکۆڵ ناکەوێ! وە ئەوەی حـەزی تـۆی لەسـەر نەبێ نابێ، هێزو تەوانایی هەر بەدەستی تۆیە. (د-ح/ص/س/ص).

**٣٠٥- وێنەکێشانی گیانلەبەر نادروستە چ لە ڕووی ڕایەخو بەردو پۆشاكو پولو پارەو درەمو دینارو پشتیو سەرین بێ، وە چ لە ڕووی شتی تری لەم بابەتە بێ، هەورەها نادروستە وێنە دروستکردن لەدیوارو بنمیچو پەردەو مێزەرو جلو بەرگو وێنەی ئەمانە، وەفەرمانکراوە بە کوێرکردنەوەی وێنە**

**باب تحريم تصوير الحيوان في بساط أوحجر أو ثوب أو درهم أو مخدَّة أو دينار أو وسادة وغير ذلك وتحريم اتخاذ الصورة في حائط وستر وعمامة وثوب ونحوها والأمر بإتلاف الصور**

١/ ١٦٧٨- عَن ابْنِ عُمَرَ رضي اللّٰه عَنْهُما أنَّ رَسُولَ اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)قَالَ: (إنَّ الّذِين يَصْنَعونَ هذِهِ الصُّورَ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيامَةِ، يُقَالُ لَهُمْ: أحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ) متفقٌ عليه[١٤٣].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) حـەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: دڵنیـا بـن ئەوانـەی کـە ئـەم وێنانـە دروسـت دەکـەن، کـە هـی گیانـدارانن، لـەڕۆژی هەستانەوەدا، لەقیامەت دا ئێشو ئازار دەدرێـنو زەبریـان لێـدەکرێو پێیـان دەگوترێ: ئادەی ئەمانە کە دروستان کردوون زیندویان بکەنەوە (ش).

⇦ ١٦٧٩/٢- فـەرموودەی: (قـدم رسـول الله سـفر وقـد سـرت...) بڕوانـە: ٦٥٠/٢ (ز/٧٧)[١٤٤].

٣/١٦٨٠- وَعَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي اللّٰه عنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (كُلُّ مُصَوِّرٍ فِي النَّارِ يُجْعَلُ لَـهُ بِكُـلِّ صُـورَةٍ صَـوَّرَهَا نَفْـسٌ

---

[١٤٣] بوخاری (٤٩٥١) موسلیم (٢١٠٨).

[١٤٤] بوخاری (٥٩٥٤) موسلیم (١٦٦٨/٣) (رقم/٩٢).

فَيُعَذِّبُهُ في جهَنَّم) قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَإنْ كُنْتَ لا بُدَّ فَاعِلاً، فَاصْنَعِ الشَّجَرَ وَما لا رُوح فِيهِ. متفقٌ عليه[145].

جارێ پیاوێ هاته خزمەتی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) گوتی: قوربان! من ئەم وێنانە دەکێشم، ئایا ڕەوایان دەبینی یانا؟ ئەویش پێی گوت: لێم وەرە پێشەوە پیاوەکەش چووە پێشەوە بۆلای، فەرمووی: وەرە پێشتریش، پیاوەکەش چووە پێشتر، ئینجا دەستی دانا لەسەر سەری و فەرمووی: چیم بیستووە ئەوەت پێ دەڵێم، بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: هەموو وێنەگرێ وا لە ئاگری دۆزەخ دا، هەریەکێ لەو وێنانەی کە لەجیهان دا دروستی کردوون دەیکەن بەکەسێ و دەیکەن بە کوڵکیەوە، لەناو دۆزەخ دا ئەشکەنجەو ئازاری دەدا، ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی بەکابرا: خۆ ئەگەر هەر چارت نییەو ئەم ئیشەت کردووە بەپیشەو هەردەیکەیت، ئەوا وێنەی دارو درەختو ئەم بابەتانە دروست بکە، کەبێ گیانن و گیانلەبەر نین (ش/تاج).

٤/ ١٦٨١- وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ:(مَنْ صَوَّرَ صُورة في الدُّنْيَا، كُلِّفَ أنْ يَنْفُخَ فيها الرُّوحَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَيْسَ بِنَافِخٍ) متفقٌ عليه.[146]

دیسان فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەجیهان دا وێنەیێ بکێشێ، لەڕۆژی قیامەت دا زەبری لێ دەکرێ، کە گیان بکا بەبەری دا، وە بۆشی ناکرێ بەبەری دا (ش).

٥/ ١٦٨٢- وعَن ابن مَسْعُودٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (إنَّ أشَدَّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُصَوِّرُونَ) متفقٌ عليه[147].

---

[145] بوخاری (٢٢٢٥) موسلیم (٢١١٠).

[146] بوخاری (٥٩٦٣) موسلیم (٢١١٠).

[147] بوخاری (٥٩٥٠) موسلیم (٢١٠٩).

ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: لەڕۆژی قیامەت دا کە هەموو کەس دەچێتەوە بەردەستی خودا خۆی، وێنەگرەکان لەهەموو کەسێکی تر سزایان سەختترە (ش).

٦/ ١٦٨٣- وَعَنْ أبي هُرَيْرَة (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ: (قَالَ اللّٰه تَعَالى: ومَنْ أظْلَمُ مِمَّنْ ذهَب يَخْلُقُ كَخَلْقِي، فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً أوْ لِيَخْلُقوا حَبَّةً، أوْ لِيَخْلُقوا شَعِيرَةً) متفقٌ عليه[148].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: خوای گەورەو مەزن دەفەرموێ: دەبێ کێ لەو کەسە ستەمکارتر بێ، کە دەچێ دروستکراوێ دروست دەکا، وەك دروستکراوانی من ئەگەر ئەوان ڕاست دەکەن و درۆ ناکەن فەرموو با مێروچەیێ دروست بکەن، یا گەردیلەیێ دروست بکەن، یا تۆمەتێ دروست بکەن یا دەنکە جۆیێ دروست بکەن (ش).

٧/ ١٦٨٤- وَعَنْ أبي طَلْحَةَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (لا تَدْخُلُ المَلائِكَةُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ وَلا صُورَةٌ) متفقٌ عليه[149].

ئەبو طەلحە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر ماڵێ سەگو وێنەی تیابێ فریشتە تێی ناچن (ش).

٨/ ١٦٨٥- وعن ابن عُمرَ رضي اللّٰه عَنْهُمَا قالَ: وَعَدَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)جِبْرِيلُ أنْ يأتِيَهُ، فَرَاثَ عَلَيْهِ حتَّى اشْتَدَّ عَلى رَسُول اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فَخرَجَ فَلَقِيهُ جبْرِيلُ فَشَكَا إلَيْهِ. فقَالَ: إنَّا لا نَدْخُلُ بيْتاً فيهِ كَلْبٌ وَلا صُورَةٌ. رواه البخاري[150].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جوبرائیل (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڵێن بە حەزرەت دەدا کە بێت بۆ خزمەتی، بەڵام کاتی بەڵێنەکە دێ، کەچی جوبرائیل نایێ تا درەنگ دەکا، تەنانەت پێغەمبەر پەرۆشی ئەوە بوو، جا

---

[148] بوخاری (٥٩٥٣) موسلیم (٢١٠٦).
[149] بوخاری (٥٩٥٨) موسلیم (٢١١١).
[150] بوخاری (٥٩٦٠).

حەزرەت دەردەچێتە دەرەوە، جوبرەئیلی تـوش دەبێ گلەیی ئەوەی لێدەکا، جوبرائیل دەفەرموێ: ئێمە کە کۆمەڵی فریشتەین ناچینە ناو ماڵێ کە سەگی تیابێ یا وێنەی تیابێ.

٩/ ١٦٨٦- وَعَنْ عَائِشَةَ رضي اللّٰه عَنْهَا قَالَتْ: وَاعَدَ رَسُولَ اللّه (صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسَلّم)جبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ في سَاعَةٍ أنْ يأتِيَهُ، فَجَاءَتْ تِلْكَ السَّاعةُ ولم يأتِهِ، قَالَتْ: وَكَانَ بيَدِهِ عصاً، فَطَرَحَهَا مِنْ يَدِهِ وَهُوَ يَقُولُ: (مَا يُخْلِفُ اللّه وَعْدَهُ وَلا رُسُلُهُ) ثُمَّ الْتَفَتَ، فَإذا جِرْوُ كَلْبٍ تَحْتَ سَرِيره. فَقالَ: (مَتى دَخَلَ هذا الْكَلْبُ؟) فَقُلْتُ: وَاللّٰه مَا دَرَيْتُ بِهِ، فأمر به فَأُخْرِجَ، فَجَاءَهُ جبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ: فَقَال رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (وَعَدْتَني، فَجَلَسْتُ لَكَ ولَم تَأتِني» فقال: مَنعني الْكَلْبُ الذى كَانَ في بيْتِكَ و إنَّا لا نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلا صورَةٌ) رواه مسلم[151].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جوبرائیل سلاوی لێ بێ بەڵێن دەدا بەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەلەکاتێکی ناوبراودا بچێ بۆلای، کاتێ بەڵێنەکە دێت کەچی جوبرائیل نایێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داردەستێکی بەدەستەوە بوو داردەستەکەی هەڵداو فەرمووی: نەخوداو نە فروستادەکانی خودا لەبەڵێنو گفتی خۆیان پاشگەز نابنەوە، کەواتە دەبێ هۆی چی بێ کەوا جوبرائیل لەکاتی بەڵێنەکەی دا نەهات؟ لەپاش دا هەرکە ئاوڕی دایەوە توتەڵە سەگێکی دی کەوا لەژێر تەختی نوستنەکەی خۆی دا بوو، فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەم سەگە کەی هاتۆتە ئێرەوە؟ گوتم: بەخوا نازانم، پێغەمبەر دەستووری دا سەگەکە کرایە دەرەوە، ئیتر جوبرائیل سلاوی خوای لێ بێت هات پێغەمبەر پێی فەرموو: تۆ گفتت دا پێم کە بێیتو من لەکاتی دیاریکراودا چاوەنواڕیم کردی کەچی نەهاتیت، جوبرائیل درودی لێبێ فەرمووی: ئەو سەگە نەیهێشت بێم کە لەماڵەکەتا بوو، چونکە سەگو وێنە لەهەر ماڵێکدا ببن ئێمە تێی ناچین (م).

---

[151] موسلیم (٢١٠٤).

١٠/ ١٦٨٧– وعَنْ أبي الهيَّاجِ حَيَّانَ بنِ حُصَينِ قَالَ: قال لي عَليٌّ بن أبي طَالِبٍ (رضي اللّه عنه): ألا أَبعَثُكَ عَلى ما بَعَثَني عَلَيْهِ رَسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)؟ أنْ لا تَدَعَ صُورَةً إلاّ طَمَسْتَهَا، ولا قَبْراً مُشْرِفاً إلاّ سَوَّيْتَهُ. رواه

ئەبولهەیاج حەیانی کوڕی حوصەین (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبوتالب (رەزای خوای لێ بێ) پێی فەرمووم: بزانە! لەسەر ئەو ڕێبازە ڕاستە دەتنێرم کە کاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) منی لەسەر نارد، کە ئەمەیە: کە هەرچی پەیکەرێکت دی کوێری بکەرەوە، وەهەرچی گۆڕێکی قنجو قیتت دی تەختی بکەو متی بکە بە زەوییەکەوە (م).

## سەگی ڕاوو سەگی پاسی ئاژەڵو کشتوکاڵی لێدەرچێ سەگ ڕاگرتن نادروستە
## باب تحريم اتخاذ الكلب إلا لصيد أو ماشية أو زرع

١٦٨٨/١– عنِ ابْنِ عُمَر رضي اللّه عَنْهُما: قَالَ سَمِعْتُ رسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (من اقْتنى كَلْباً إلا كَلْب صَيْدٍ أوْ مَاشِيةٍ فإنَّهُ يَنقُصُ مِنْ أجْرِهِ كُلَّ يومٍ قِيراطَانِ) متفقٌ عليه[١٥٣].

ئیبنو عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم ژنەوتم لە زاری پیرۆزی خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: کەسێ سەگێ ڕابگرێ، کە سەگی ڕاوو پاسی ئاژەڵو پاسی زەویو مەزرا نەبێ، هەموو ڕۆژێ دوو پارچە لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە. (ش=ب+م=بوخاریو موسلیم (رەزای خوایان لێ بێ)).

٢/ ١٦٨٩– وعَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)قَالَ: قَالَ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَنْ أمْسَكَ كَلْباً، فَإنَّهُ ينْقُصُ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عملِهِ قِيرَاطٌ إلاّ كَلْب حَرْثٍ أوْ مَاشِيَة) متفقٌ عليه[١٥٤].

---

[١٥٢] موسليم (٩٦٩).
[١٥٣] بوخاری (٥٤٨٠) موسليم (١٥٧٤).
[١٥٤] بوخاری (٢٣٢٢) موسليم (١٥٧٥، ٥٩).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کەسێ سەگێ ڕابگرێ، کە سەگی پاسی زەوی‌و زارو مەزراو پاسی ئاژەڵێ نەبێ، هەموو ڕۆژێ پارچەیێ لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە. (ش=شەیخان (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

وفي رواية لمسلم: (مَنِ اقْتَنى كَلْباً لَيْسَ بِكَلْبِ صَيْدٍ، ولا مَاشِيةٍ ولا أرْضٍ فَإنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أجْرِهِ قِيراطَانِ كُلَّ يَومٍ).

له گێڕانەوەیەکی تری ئەبو هورەیرەدا (ڕەزای خوای لێ بێ) کە ئیمامی موسلیم (ڕەزای خوای لێ بێ‌و چاوو دڵی نوری‌و خوێنەر بە نووری گۆڕی پیرۆزی ڕۆشن‌و مونەوەر بێ) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: هەرکەسێ سەگێ ڕابگرێ، کە سەگی ڕاوو پاسی ئاژەڵ‌و پاسی زەوی‌و زارو مەزرا نەبێ هەموو ڕۆژێ دوو پارچە لەپاداشتی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە.

### ٣٠٧- زەنگ‌و زەنگۆڵە هەڵواسین بە وشترو ئاژەڵ‌و وڵاخی تردا باش نییە، هەروەها سەگ‌و زەنگ لەگەڵ خۆدا بردن بۆ سەفەر باش نییە
### باب كراهية تعليق الجرس في البعير وغيره من الدواب وكراهية استصحاب الكلب والجرس في السفر

١/ ١٦٩٠- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قال رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا تَصْحَبُ المَلائِكَةُ رُفْقَةً فيهَا كَلْبٌ أوْ جَرَسٌ) رواه مسلم[١٥٥].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: فریشتەکان بەتایبەتی فریشتەی ڕەحمەت‌و میهرەبانی هاوڕێیەتی ئەو کاروانی‌و دەستە ڕێبوارانە ناکەن، کە زەنگ یا سەگیان پێ بێ بەبێ مەهانەی ڕەوا (موسلم-(ڕەزای خوای لێ بێ)).

٢/ ١٦٩١- وعَنْهُ أنَّ النبيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَال: (الجرسُ من مَزَامِير الشَّيْطَانِ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ. رواه أبو داود بإسناد صحيح على شرط مسلم[١٥٦].

---

[١٥٥] موسلیم (٢١١٣).
[١٥٦] موسلیم (٢١١٤).

دیسانەوە لەوەوە لەحەزرەتەوە دەفەرموێ: زەنگو زەنگۆڵە بلوێرێکە لە بلوێرەکانی شەیتان، ئیمامی ئەبوداوود (ڕەزای خوای لێ بێ)و خودا پەنامان بدا لەخاكو پاییدا ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە بە ڕشتەیەکی ساخ، بەپێی مەرجی ئیمامی موسلیم، ئیمامی موسلیم خۆشی گێڕاویەتەوە.

**٣٠٨- سواربوونی ئەو وشترەی کە پیسخۆرەو خوی گرتووە بەخواردنی پیسایی‌و شتی واوە باش نییە، تا ئالفی پاك دەخواتو بەرە بەرە گۆشتەکەی پاك دەبێتەوەو بۆگەنەکەی نامێنێ**

**باب كراهية ركوب الجلالة وهي البعير أو الناقة التي تأكل العذرة، فإن أكلت علفا طاهرا فطاب لحمها زالت الكراهة**

١/ ١٦٩٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضِيَ اللَّهُ عنْهُما قَال: نَهى رسُولُ اللَّـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم)عـنِ الجَلاَّلَـةِ في الإبـلِ أنْ يُرْكَـب عَلَيْهَـا. رواهُ أبـو داود بإسـناد صحيحٍ[١٥٧].

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **بەباشی دانەدەنا کە کەسێ سواری وشتری پیسایی خۆر بێ. (د/س/ص).**

**٣٠٩- نەهی کراوە لەتف ڕۆکردن لەناو مزگەوتا وە فەرماندراوە بەلابردنی ئەگەر تیابوو، هەروەها فەرمانکراوە بەپاكو خاوێنی مزگەوتو پاراستنی لەپیس‌و پلۆخی (باب النهي عن البصاق في المسجد والأمر بإزالته منه إذا وجد فيه والأمر بتنزيه المسجد عن الأقذار)**

١/ ١٦٩٣- عَـنْ أنـسٍ (رضـي اللَّـه عنـه)أنَّ رَسُـولَ اللَّـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَال: (البُصَاقُ في المسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا) متفق عليه[١٥٨].

**ئەنەس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لەحەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: تف ڕۆکردن لەناو مزگەوتا گوناهە، کەفارەتەکەی ئەوەیە کە دایپۆشی (ش).**

---

[١٥٧] ئەبو داوود (٢٥٥٨).

[١٥٨] بوخاری (٤١٥) موسلیم (٥٥٢).

ئیمامی نـەوەوی دانـەری ئـەم ریـاض صـالحینە پیرۆزەیـە، دەفـەرموێ: مەبەست لـە داپۆشـینەکەی ئەوەیـە ئەگـەر زەمینـی مزگەوتەکـە خـۆڵو لمو شتی وابوو، بەوە دادەپۆشرێ، ئەبولمەحاسینی ڕەویـانی لـەکتێبی ئەلبـەحری خۆی دا دەفەرموێ: مەبەست لە داپۆشینەکەی دەرهێنانیەتی لەمزگەوتەکە، بەڵام ئەگەر زەوی مزگەوتەکە فەرش کرابوو، یا چەو ڕێژو گەچکاری کرابوو ئـەوە دەبـێ ئـەو تفـە لابـبرێ، نـەوەك وەك زۆر لەنـەفامانو نـەدانان دەچـن بەبنی پێڵاوەکانیان دەیسوونەوە بەسەر زەمینەکەدا، چونکە ئەوە گوناهەکـە دەکا بەدوو گوناهو مزگەوتەکەش پـتر چـەپەڵ دەکـا، جـا ئـەگـەر کەسـێ ئـەم هەڵەیەی کرد دەبـێ بەجلەکـەی یـا بەدەسـتی یـا بەشـتێ تـر بیسـڕێتەوە، یـا بیشۆرێ.

٢/ ١٦٩٤- وعَنْ عائِشَةَ رضي اللّٰه عنْهَـا أنَّ رسُـولَ اللّٰـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)رَأى في جِدَارِ الْقِبْلَةِ مُخَاطاً، أوْ بُزَاقاً، أوْ نُخَامةً، فَحكَّه. متفقٌ عليه[١٥٩].

عائیشـە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لـەناو مزگـەوتا بەدیواری ڕووی ڕووگەوە چڵمێ یاتفێ یا بەڵغەمێکی دی، چوو کراندی (ش).

٣/ ١٦٩٥- وعَنْ أنَسٍ (رضـي اللّٰـه عنـه)أنَّ رَسُـولَ اللّٰـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) قَالَ: (إنَّ هذِهِ المسَاجِدَ لا تَصْلُحُ لِشْيءٍ مِنْ هذا الْبوْلِ ولا الْقَذَرِ، إنَّمَا هِـيَ لِذِكْرِ اللّٰه تَعَالى، وقَراءَةِ الْقُرْآنِ) أوْ كَمَا قالَ رسُولُ اللّٰه (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم). رواه مسلم[١٦٠].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: ئـەم مزگەوتانە کە ماڵی خودان، بەکەڵکی ئەوەنایەن کە بکرێن بەجێگەی گمێـزو چەپەڵی، مزگەوت بۆئەوە دروستکراوە کە خواپەرستی تیا بکرێ، یادی خوای گەورەی تیا بکرێ، دەوری قورئانی تیا بکرێتەوە، قورئانی تیـا بخوێنرێتـەوە، پێغەمبەر یا دەق ئاوای فەرموو یا شتێکی لەم بابەتەی فەرموو (م).

---

[١٥٩] بوخاری (٤٠٧) موسلیم (٥٤٩).
[١٦٠] موسلیم (٢٨٥).

**٣١٠- دەمە قرێو دەمە دەمێو دەنگ بەرزەوەکردن لەناو مزگەوتا ناپەسەندە، هەروەها بانگەواز هەڵدان بۆ ونبوونو مامەڵەو سەوداکردنو بەکرێدانو شتی وا**

**باب كراهة الخصومة في المسجد ورفع الصوت فيه ونشد الضالة والبيع والشراء والإجارة ونحوها من المعاملات**

١/ ١٦٩٦- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّٰـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقُولُ: مِنْ سمِعَ رَجُلاً ينْشُدُ ضَالَّةً في المسْجِدِ فَلْيَقُلْ: لا رَدهَا اللّٰه علَيْكَ، فإنَّ المساجدَ لَمْ تُبْنَ لهذا) رَواهُ مُسْلِم[١٦١].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخۆشەویستم بیست (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئەگەر بەرگوێتان کەوت کە یەکێ لەناو مزگەوتا بانگەواز هەڵدات بۆ دۆزینەوەی شتی گومبوو، بڵێن یاخوا نەیدۆزێتەوە، چونکە مزگەوت بۆئەمە دروست نەکراوە.

٢/ ١٩٦٧- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّي اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (إذا رأَيتم مَـنْ يَبِيعُ أَو يبتَاعُ في المسجدِ، فَقُولُوا: لا أَرْبَحَ اللّٰه تِجَارَتَكَ، وَإذا رأَيْتُمْ مِنْ ينْشُدُ ضَالَّةً فَقُولُوا: لا ردَّهَا اللّٰه عَلَيكَ». رواه الترمذي وقال: حديث حسن[١٦٢].

دیسان لەوەوە لەحەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر دیتان واکەسێ لەناو مزگەوتا شت دەفرۆشێ یا شت دەکڕێ پێی بڵێن: یاخوا ئەم بازرگانییەت قازانج نەکا، ئێرە مزگەوتە جێگەی ئەم جۆرە شتانە نییە، خۆ بازاڕ نییە، ئەگەر کەسێکیشتان بینی لەناو مزگەوتا بۆ گومبوو دەگەڕا پێی بڵێن: یاخوا نەیدۆزیتەوە (ت: ح/ح).

٣/ ١٦٩٨- وعَنْ بُرَيْدَةَ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رَجُلاً نَشَدَ في المَسْجِدِ فَقَالَ: منْ دَعَا إلي الجَملَ الأَحْمرَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)(لا وَجَـدْتَ إِنَّمَـا بُنِيَتِ المَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَهُ) رواه مسلم[١٦٣].

---

[١٦١] موسليم (٥٦٨).

[١٦٢] تيرمزى (١٣٢١).

[١٦٣] موسليم (٥٦٩).

**بورەیدە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پیاوێ لەناو ژووری مزگەوتا گومبووی دەپرسیو دەیگوت: کێ وشترێکی نێری سوری دیوەتەوە پێم بڵێ؟ پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: دەك نەیدۆزیتەوە مزگەوت ماڵی خوایە بۆ خواپەرستی دروستکراوە، نەك بۆ ئەم جۆرە شتانە (م-**(رەزای خوای لێ بێ)**).**

٤/ ١٦٩٩- وَعَنْ عَمْرو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رضي اللّه عنه)أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)نَهَى عَنِ الشِّرَاءِ وَالبَيْعِ فِي المسْجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فيهِ ضَالّةٌ، أَوْ يُنْشَدَ فِيهِ شِعْرٌ. رواهُ أَبُــو دَاودَ، والتِّرمذي وقال: حَديثٌ حَسَنٌ[١٦٤].

**عەمری کوڕی شوعەیب لەباوکییەوە، لە باپیری شوعەیبەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصە** (رەزای خوایان لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ئەمشتانەی لەناو مزگەوتا یاساخ کردووە: کڕینو فرۆشتنو بانگەواز هەڵدان بۆ گومبووو شەڕە شیعرو خوێندنەوەی هۆنراوە، مەگەر شیعری دینی وەك پەسن (مەدح)ی پێغەمبەر (د/ت-ح/ح).**

٥/ ١٧٠٠- وَعَنِ السَّائِبِ بْنِ يزيدَ الصَّحَابِي (رضي اللّه عنه)قالَ: كُنْتُ فِي المَسْجِدِ فَحَصَبَنِي رَجُلٌ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ بنُ الخَطّابِ (رضي اللّه عنه)فَقَالَ: اذهَبْ فأْتِنِي بِهَذَيْنِ فَجِئْتُهُ بِهِمَا، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ أَنْتُمَا؟ فَقَالا: مِنْ أَهْلِ الطَّائِفِ، فَقَالَ: لَوْ كُنْتُمَا مِنْ أَهْلِ الْبَلَدِ، لأَوْجَعْتُكُمَا، تَرْفَعَانِ أَصْوَاتَكُمَا فِي مسْجِدِ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)؟ رَوَاهُ الْبُخَارِي[١٦٥].

**سائیبی کوڕی یەزید، کە صەحابەیە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لەناو مزگەوتا وەستا بووم، پیاوێ چەوێکی تێ گرتم تەماشام کرد عومەری کوڕی خەتاب بوو** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: بڕۆ ئەو دوو کەسەم بۆ بهێنە، منیش چووم بۆم هێنان پێی گوتن ئێوە کوێندەرین؟ گوتیان: خەڵکی تایفیین فەرمووی: ئەگەر نابەڵەد نەبونایەو خەڵکی ئەم شارەبوونایە ئێشم پێ دەگەیاندن، چۆن لەناو مزگەوتی پێغەمبەردا** (درووی خوای لەسەر بێ) **دەنگە دەنگ دەکەن؟ (بوخاری – ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).**

---

[١٦٤] ئەبو داوود (١٠٧٩) تیرمزی (٣٢٢).

[١٦٥] بوخاری (٤٧٠).

**٣١١- باش نييه بۆكەسێ كە سير يا پياز يا كەوەر ياشتێ كە بۆنى دەم ناخۆش بكا بخوا، بچێتە ناو ژورى مزگەوتەوە مەگەر لەبەر ناچارى تا بۆنى دەمى دەڕوات**
**باب النهي من أكل ثوما او بصلا أو كراثا أو غيرها مما له رائحة كريهة عن دخول المسجد قبل زوال رائحته الا لضرورة**

١/ ١٧٠١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰه عَنْهُمَا أَنَّ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ يَعْنِي الثُّومَ فلا يقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا) متفقٌ عليه.
وفي روايةٍ لمسلم: (مَسَاجِدَنَا)[١٦٦].

**ئيبنو عومەر** (رەزاى خوايان لێ بێ) **لەحەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەركەسێ لەم گيايەى خوارد واتە لە سير با توخنى مزگەوتمان نەكەوێ، تا بۆنەكەى دەڕوا (ش). لە گێڕانەوەيەكى موسليم دا هەركەسێ بەكاڵى ئەم گيايەى خوارد با توخنى مزگەوتەكانمان نەكەوێ.**

٢/ ١٧٠٢- وَعَنْ أَنَسٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَنْ أَكَلَ مِنْ هذهِ الشَّجَرَةِ فَلا يَقْرَبنَّا، وَلا يُصَلِّيَنَّ مَعنَا) متفقٌ عليه[١٦٧].

**لەئەنەسەوە** (رەزاى خوای لێ بێ) **خۆشەويست** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەركەسێ لەم گيايەى خوارد با نزيكى ئێمە نەكەوێو نوێژمان لەگەڵ نەكا (ش).**

٣/ ١٧٠٣- وَعَنْ جَابِرٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَنْ أَكَلَ ثُوماً أَوْ بَصَلاً، فَلْيَعْتَزِلْنَا، أَوْ فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجدَنَا) متفقٌ عليه.
وفي رواية لُمسْلِم: مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ، وَالثُّوم، وَالْكُرَاث، فَلا يَقْرَبَنَّ مسْجِدَنَا، فَإِنَّ المَلائِكَةَ تَتَأَذى مِمَّا يتأَذى مِنْهُ بَنُو آدمَ»[١٦٨].

**لە جابيرەوە** (رەزاى خوای لێ بێ) **حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەوەى سيرى كاڵ يا پيازى كاڵ دەخوا با خۆ دوور بگرێ لە ئێمە يا گوتى: فەرمووى: با دوور بگرێ لە مزگەوتمانو لەماڵى خۆى دابنيشێ (ش). لەگێڕانەوەيكى ترى**

---

[١٦٦] بوخارى (٨٥٣) موسليم (٥٦١).
[١٦٧] بوخارى (٨٥٦) موسليم (٥٦٢).
[١٦٨] بوخارى (٨٥٤) موسليم (٥٤٦).

ئیمامی موسلم دا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەرکەسێ سیر یا پیاز یا کەوەری خوارد با هەتا بۆنەکەی دەڕوا بەهیچ جۆرێ توخنی مزگەوتمان نەکەوێ، چونکە هەرچی ئازاری ئادەمیزاد بدات ئازاری فریشتەش دەدا.

٤/ ١٧٠٤- وَعَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطّابِ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّهُ خطَبَ يَوْمَ الجُمُعَةِ فَقَالَ فِي خُطْبَتِهِ: ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّها النَّاسُ تَأْكُلُونَ شَجَرَتَيْنِ ما أُرَاهُمَا إلاَّ خَبِيثَتَيْنِ: الْبَصَلَ، وَالثُّومَ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)إذَا وَجَدَ رِيحَهُمَا مِنَ الرَّجُلِ فِي المَسْجِدِ أَمَرَ بِهِ، فَأُخْرِجَ إِلى الْبَقِيعِ، فَمَنْ أَكَلَهُمَا، فَلْيُمِتْهُمَا طَبْخاً. رواه مسلم[169].

جاری عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێ بێ) لەدوای ڕۆژی هەینی دا فەرمووی: لەپاش ئەمە، ئەی خەڵکینە ئێوە دووگیا هەیە دەیانخۆن من بەناپەسەندیان ئەزانم، کە بریتین لە پیازو سیر، بەچاوی خۆم دیومە ئەوکەسەی لەمزگەوتا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بۆنی ئەم دووەی لێبکردایە، فەرمانی دەدا لەمزگەوت دەریان دەکردو دەیان برد بۆ بەقیع جا ئەوەی دەیانخوات با لەپێشا بیانکوڵێنێ تا بۆنەکەی بمرێ (م).

**٣١٢- لەڕۆژی هەینی دا، لەو حەلەدا کە خوتبە خوێن خوتبە دەخوێنێتەوە خۆشەتەکدان بەچیچکانەوە ناپەسەندە، چونکە خەو لەنادەمیزاد دەخاتو خوتبەکەی لەکیس دەچێ مەترسی نەوەیشی هەیە کە دەستنوێژەکەی بشکێ**

**باب كراهية الإحتباء يوم الجمعة والإمام يخطب لأنه يجلب النوم فيفوت استماع الخطبة ويخاف انتقاض الوضوء**

١/ ١٧٠٥- عنْ مُعَاذِ بْنِ أَنسِ الجُهَنِيِّ، (رضي اللّٰه عنه)أَنَّه النبيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهَى عَنِ الحِبْوَةِ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ. رواهُ أبو داود، والترمذي وَقَالا: حديثٌ حَسَنٌ[170].

---

[169] موسلیم (٥٦٨).

[170] ئەبوداوود (١١١٠) تیرمیزی (٥١٤).

موعازى كوڕى ئەنەسى جوهەنى (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر (دروودى خوای لەسەر بێ) لەوكاتەدا كە پێشنوێژ وتارى هەينى دەدا، ياساخى كردووە كە كەسێ بەشەتەكێ بەچيچكانەوە هەردوو لاقى خۆى شەتەك بدا بە سكيەوە (د/ت-ح/ح).

**٣١٣- باش نييە بۆكەسێ كە بيەوێ قوربانى بكا، لە دەرۆژى سەرەتاى مانگى قوربانەوە، مووى خۆى ببڕێ، نينۆكى بكا، تا قوربانييەكەى دەكا**
**باب نهي من دخل عليه عشر ذي الحجة واراد ان يضحى عن اخذ شيئ من شعره وأظفاره حتى يضحى**

٢/ ١٧٠٦- عَنْ أُمِّ سَلَمةَ رضِيَ اللَّه عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رسُولُ اللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ كَانَ لَهُ ذِبْحٌ يَذْبَحُهُ، فَإذا أُهِلَّ هِلالُ ذِي الحِجَّة، فَلا يَأْخُذَنَّ مِنْ شَعْرِه وَلا منْ أَظْفَارِهِ شَيْئاً حتى يُضَحِّيَ) رَواهُ مُسْلِم[171].

لە ئوممو سەلەمەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووى: حەزرەت (دروودى خواى لەسەر بێ) فەرمووى: كەسێ دەيەوێ قوربانى بكا كە مانگى نوێى قوربان هەڵهات، ئيتر با نەموو لەخۆى بكاتەوەو نە ناخونى خۆى بكا، تا قوربانييەكەى دەكات (م).

**٣١٤- سوێند خواردن بەغەيرى خودا ناپەسەندە، وەك سوێند خواردن بە پێغەمبەرو كابەو فريشتەو ئاسمانو باو باپيرانو ژيانو گيانو سەرو نيعمەتى سوڵتانو خەڵاتى شاو گڵكۆى فيسارو ئەمانە بەئەمانەت لەهەموويان خراپترە**
**باب النهي عن الحلف بمخلوق كالنبيُّ والكعبة والملائكة والسماء والآباء والروح والرأس وحياة السلطان ونعمة السلطان وتربة فلان والأمانة وهي من أشدها نهيا**

١/ ١٧٠٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ، رضِيَ اللَّه عنْهُمَا، عَنِ النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، قَالَ: (إنَّ اللَّهَ تَعالَى ينْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بابائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً، فلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ) متفقٌ عليه[172].

---

[171] موسليم (١٩٧٧، ٤٢).

وفي رواية في الصحيح: (فمنْ كَانَ حَالِفاً، فَلا يَحْلِفْ إلاّ باللّهِ، أَوْ لِيسْكُتْ)

**ئيبنو عومەر** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هۆشیاربن کە خودای گەورەو مەزن قەدەغەی کردووە لەئێوە کە سوێند بە باوباپیرانتان بخۆن جا ئەو کەسەی کە دەیەوێ سوێند بخوا با یا سوێند بەخوا بخوا یا بێ دەنگ بێو بەشتی تر سوێند نەخوات.. (ش/تاج).**

٢/ ١٧٠٨- وعنْ عَبْدِ الرحْمنِ بْن سَمُرَةَ، (رضي اللّه عنه)قَالَ: قَالَ رسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): «لا تَحْلِفوا بِالطّواغِي، ولا بابائِكُمْ» رواه مسلم.

(الطّوَاغي): جَمْعُ طاغية، وهِي الأَصْنَامُ، وَمِنْهُ الحديثُ: (هذِهِ طاغِيةُ دوْس): أَيْ: صنمُهُم ومعْبُودُهُم. ورُوِيَ في غَيرِ مُسْلِم: (بالطّواغِيتِ) جمْع طاغُوت، وهُو الشَّيطانُ وَالصَّنمُ[١٧٣].

**ئەوڕەحمانی کوڕی سەموورە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: سوێند بە بتەسەرکەشەکانو باوو باپیرتان مەخۆن (م).**

٣/ ١٧٠٩-وعنْ بُرِيْدة (رضي اللّه عنه)أَنَّ رسُول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال:«من حلَف بالأَمانَةِ فلَيْس مِنا». حدِيثٌ صحيحٌ، رواهُ أَبو داود بإِسنادٍ صحِيحٍ[١٧٤].

**بورەیدە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوەی بەئەمانەت سوێند بخوات لەسەر ڕەوشتی ئێمە نییە. (د-ح/ص-س/ص).**

٤/ ١٧١٠- وعنْهُ قال: قال رسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (منْ حلَفَ، فقال: إِني بريءٌ مِنَ الإِسلامِ فإِن كانَ كاذِباً، فَهُو كما قَالَ، وإِنْ كَان صادِقاً، فلَنْ يرْجِع إِلَى الإِسلامِ سالِماً». رواه أبو داود[١٧٥].

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەر کەسێ سوێند لەسەر شتێ بخواتو بڵێ: بەشم لە ئایینی ئیسلام بڕابێ ئەمە وایە، وە واش نەبێ، ئەوە وەك خۆی دەڵێ وایەو فڕی بەسەر ئیسلامییەوە نامێنێ، گریمان**

---

[١٧٢] بوخاری (٦٦٤٦، ٤٦٢) موسلیم (١٦٤٦).

[١٧٣] موسلیم (١٦٤٨).

[١٧٤] ئەبوداوود (٣٢٥٣).

[١٧٥] ئەبوداوود (٣٢٥٨).

قسەکەشی راست بێ ئەم جۆرە سوێندە هەرباش نییە، چونکە سوێند خۆر لەم حاڵەتەدا بەسەلامەتی ناگەڕێتەوە سەر ئیسلامەتی (د).

١٧١١/٥ – وَعن ابْن عمر رضِي اللّٰه عنْهُمَا أَنَّهُ سمِعَ رَجُلاً يقُولُ: لاَ والْكعْبةِ، فقالَ ابْنُ عُمر: لا تَحْلِفْ بِغَيْرِ اللّٰهِ، فإني سَمِعْتُ رسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقُولُ: (منْ حلفَ بِغَيْرِ اللّٰهِ، فَقدْ كفَر أَوْ أَشرْكَ) رواه الترمذي وقال: حدِيثٌ حسَنٌ[176].

وفسَّر بعْضُ الْعلماءِ قوْلهُ: (كَفر أَوْ أشركَ) علَى التَّغلِيظِ كما رُوِي أَنَّ النبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (الرِّيَاءُ شِرْكٌ).

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) بەر گوێی کەوت پیاوێ سوێندی دەخوارد دەیگوت: نا، بەکابە، ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست فەرمووی: هەرکەسێ سوێند بخوا بەشتێکی تر، جگە لەخودا ئەوە کفر دەکا، یا گوتی: فەرمووی: ئەوە هاوبەش بۆخودا بڕیار دەدا (ت-ح/ح).

### ٣١٥- سوێندی درۆ بەئارەزوو زۆر نارەوایە
### باب تغليظ تحريم اليمين الكاذبة عمداً

١٧١٢/١ – عَنِ ابْنِ مسْعُودٍ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ النبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (منْ حلفَ علَى مَال امْرِيءٍ مُسْلِم بغيْرِ حقِّه، لقِي اللّٰه وهُو علَيْهِ غَضْبانُ) قَالَ: ثُمَّ قرأَ علَيْنا رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)مِصَداقَه منْ كتاب اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ: {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعهْدِ اللّٰهِ وأَيْمانِهِمْ ثَمناً قَلِيلاً} ﴿آل عمران: ٧٧﴾ إلى آخرِ الآيةِ: مُتَّفَقٌ عليْه[177].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ بەدرۆ سوێندی ناهەق بخوا تا بەو سوێندە ناهەقە ماڵی پیاوێکی موسوڵمان بۆخۆی ببچڕێ بۆ خۆی، ئەوە کاتێ کە دەگاتەوە بەدیداری خودا، خودا لێی توڕەیە. ئیبنو مەسعود فەرمووی: جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە، ئەم ئایەتەی لەنامەی خوای

[176] تیرمیزی (١٥٣٥).
[177] بوخاری (٦٦٧٦) موسلیم (١٣٨).

گەورەو سەرومر بەسەرمان دا خوێندەوە کە دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ.... الآية} (آل عمران ٧٧/٣).

واتە: ئەو کەسانەی کە پەیمانی خوداو سوێندی خۆیان دەفرۆشن‌و بەبەهایەکی کەمی دنیایی دەیگۆڕنەوە، ئەوانە لە ڕۆژی پاشەڕۆژدا بێبەش‌و بارن، وە خودای گەورە قسەی خۆشیان لەگەڵا ناکا، وە بەچاوی میهریشەوە تەماشایان ناکات‌و ڕووی خۆشیان ناداتێ، وەپاکیان ناکاتەوەو بە هیچ جۆرێ نە نازیان دەگرێ‌و نە تاریفیان دەکا، وە سزایەکی سەختی بەسوێشیان بۆهەیە لەقیامەتا (ش).

١٧١٣/٢- فەرموودەی: (مَنِ أقتَطَعَ حَقَّ امرِئٍ مُسلِمٍ...) بڕوانە: (٢١٤/١٢ ز/٣٦)[178].

١٧١٤/٣- فەرموودەی: (الكبائر: الإشراك باللّٰه....) بڕوانە: (٣٣٧/٢ ز/٤١)[179].

لەم شوێنەدا ئەم پترییەی هەیە: لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاری دا دەفەرموێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! گوناهە هەرە گەورەکان کامانەن‌و چی‌و چین؟ فەرمووی: یەکەمیان هاوبەشی پەیدا کردنە بۆ خودای تاک‌و تەنها، گوتی: ئەی چی تریش؟ فەرمووی: سوێندی ماڵوێرانکەر، منیش گوتم: سوێندی ماڵوێرانکەر کامەیە؟ خۆشەویست فەرمووی: سوێندی ناهەقی ئەو کەسەیە کە بەناهەق ماڵی پیاوێکی موسوڵمانی پێ دەپچڕێ بۆ خۆی، واتە: سوێندی ناهەقی وا بابەدیمەنیش لەڕاست بکات، بەڵام هەر بەدرۆ دادەنرێ.

### ٢١٦- سوێندخۆر ئەگەر زانی شکاندنی سوێندەکەی خێری پێوەیە، با بیشکێنێ‌و کەفارەتەکەی بدا - باب من حلف على اليمين فرأى غيرها خيرا منها أن يفعل ذلك المحلوف عليه ثم يكفر عن يمينه

١/١٧١٥ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ سَمُرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ لي رسُولُ اللّٰه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «... وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ، فَرَأَيْت غَيْرَها خَيْراً مِنهَا، فأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وكفِّرْ عن يَمِينك» متفقٌ عليه[180].

---

[178] موسليم (١٣٧).

[179] بوخاری (٦٦٧٥).

ئەوڕەحمانی کوڕی سەمورە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ئەگەر لەسەر شتێ سوێندت خوارد، بەلام تەماشات کرد کە پێچەوانەی سوێندەکەی تۆ باشترە، ئەوە سوێندەکەت بخەو شتە باشەکە بکەو برێتیو کەفارەتی سوێندەکەت بدە! (ش).

١٧١٦/٢- وعَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالَ: (منْ حلَف عَلَى يَمِينٍ فَرأَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا، فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ، ولْيَفْعَلْ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ) رواهُ مسلمٌ[181].

لە ئەبو هوریەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کەسێ لەسەر شتێ سوێندی خوارد وەلێ ڕوانی کە بەبارێکی تردا باشترە، با برێتیی سوێندەکەی بداتو بەبارەباشەکەدا بیکات! (م).

١٧١٧/٣- وَعَنْ أَبي مُوسَي (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالَ: (إِنِّي واللّٰهِ إنْ شَاءَ اللّٰه لاَ أَحلِفُ عَلَى يَمِينٍ، ثُمَّ أَرَى خَيْراً مِنهَا إلاَّ كَفَّرْتُ عَنْ يَمِيني، وأَتيْتُ الَّذِي هُوَ خَيرٌ) متفقٌ عليه[182].

ئەبو مووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: من بەش بەحاڵی خۆم خوایاربێ سوێند ناکەم بەبیانوو، ئەگەر ڕێکەوت لەسەر شتێ سوێندم خوارد، لەدواییدا ڕوانیم بەبارەکەی تردا باشترە ئەوا برێتی (کەفارەت)ی سوێندەکەم دەدەمو بەبارە باشەکەدا کارەکە ئەنجام دەدەم. (ش=ب+م — (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

١٧١٨/٤- وَعَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لأَنْ يَلَجَّ أَحدُكُمْ في يَمِينِهِ في أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللّٰهِ تَعَالى مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتي فَرَض اللّٰه عَلَيْهِ) متفقٌ عليه[183].

---

[180] بوخاری (٦٦٢٢) موسلیم (١٦٥٢).
[181] موسلیم (١٦٥٠، ١٢)
[182] بوخاری (٦٦٢٣) موسلیم (١٦٤٩).
[183] بوخاری (٦٦٢٥) موسلیم (١٦٥٥).

قولُهُ: (يلَجَّ) بِفَتْحِ اللّامِ، وَتَشْدِيدِ الجِيمِ: أَيْ يتمادَى فِيها، وَلاَ يُكَفِّرُ، وقولُه: «آثَمُ» بالثاءِ المثلثة، أَيْ: أَكْثَرُ إِثْماً.

**له ئەبو هورەیرەوە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: بەخوا ئەگەر كەسێكتان لەسەر شتێ سوێند لەكەس و كاری بخواو لەپاشا وركی لێ بگرێ و لێی پەشیمان نەبێتەوە، وەلحالْ پەشیمانبوونەوە لەوشتە باشتر بێ، ئەوە بەو پێلێداگرتنە گوناهی زۆرتر دەگا، لەلای خودا هەتا ئەوە كە سوێندەكەی بشكێنێ و ئەو برێتیو كەفارەتە بدا كە خودا دایناوە بۆ سوێند كەوتن (ش).**

**٣١٧- سوێندی بێبایەخ چاوپۆشی لێكراوەو (كەفارەت) برێتی نییە، برێتییە لەو سوێندانەی كە بەبێ قەستی سوێندی ڕاستی لەدڵەوە، لەكاتی گفتوگۆدا دێ بەسەر زمانی سوێندخۆردا، وەك باوە ناو بەناو بەدەم قسەوە دەڵێن نەری بەخوا، نە بەخوا (باب العفو عن لغو اليمين وأنه لاكفارة فيه، وهو مايجري لى اللسان بغير قصد اليمين كقوله على العادة لا والله وبلى والله ونحو ذلك)**

قال الله تعالى: {لا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ} (مائدة- ٥/٨٩).

**واتە: یەزدانی مەزن لەقورئانی پیرۆزدا كەنامەی خۆیەتی لە سورەتی مائیدەدا، كە سورەی ژمارە پێنجە لەناو قورئان دا، لەئایەتی ژمارە هەشتاو نۆی ئەم سورەتەدا لەبابەت سوێندی بی بایەخەوەو سوێندی دامەزراوەو كەفارەتی سوێندەوە دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانینە! بزانن! لەناو سوێندەكانتانا خودا ناتانگرێ و سزاتان نادا بەو سوێندانە كەدێن بەدەمتانا، بەبی ئەوەی كە نیازی دڵی لەگەڵ دا بێ، بەلام لەسەر ئەو سوێندانەتان دەتانگرێ كە بەقەستی دڵ داتان مەزراندون، جا كەفارەت (برێتی)ی ئەو سوێندە دامەزراوانە، لەكاتی شكانیان دا ئەوەیە كە سوێند شكاوەكان**

خواردەمەنی دەهەژار بدەن، دەژەم خۆراك بدەن به دەهەژار، لەمیانـەی ئـەو خواردەمەنییـه کـه دەیـدەن بـەژن‌و منـداڵی خۆتـان، یـا بـەرگ‌و پۆشـاکی دە هەژار بدەن لەمیانەی ئەو بەرگ‌و پۆشاکەی دەیکەن بـۆ خێزانـی خۆتـان، وە یاخود بەندەیێ ئازاد بکەن، جا ئەگەر یەکێ لـەو سـوێند کەوتوانـه ئەوانـەی دەسـت نەکـەوت ئـەوە پێویسـتە ڕۆژووی سـێ ڕۆژ بگـرێ بـەنیازی بـرێتی سوێندی کەوتوو، ئەوەی ڕوونمان کردەوە بۆتان کەفارەتی سوێندی کـەوتووی ئێوەیه لەپاش سـوێند خـواردن، وە سـوێندی خۆتـان ئاگـاداری بکـەن، لەشـتی گرنگ‌و بەنرخ دا نـەبێ سـوێند مـەخۆن‌و کەسوێندتان خـوارد لەسـەر شـتێ مەیشـکێنن مەگـەر بۆناچـاری، ئـاوا خـودای مـەزن ئایەتـەکانی خـۆی ڕوون دەکاتــەوە بۆتـان، کەلـەبارەی فەرمانـەکانی شـەریعەت‌و ئـەحکامی‌و دینـی خوداوەن، هیوا وایه کە ئێوەش سوپاسی ئەم نیعمەته گەورەیه بکەن‌و فێـری ئەم ئایەتانه ببن‌و ڕەفتاریان پێ بکەن.

١/١٧١٩- وَعَنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللّـه عَنْهَـا قَالَـتْ: أُنْزِلَـتْ هَـذِهِ الآيَـةُ: {لا يُؤَاخِذُكُمْ اللّه بِاللّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ} فِي قَـوْلِ الرَّجُـلِ: لا واللّـهِ، وَبَلـى واللّـهِ. رواه البخاري[١٨٤].

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم ئایەتە لەشـانی ئـەو کەسـەدا هاتۆتـە خـوارەوە کەلـەکاتی گفتوگـۆدا بەسـەر دەمیانـا دێـت‌و سـەر زارەکـی دەڵـێن: نەبەخوا وانیه، بەرێ بەخوا وایه (ب).

**٣١٨- سوێند خواردن لەسەوادا باش نییه، با بەڕاستیش بێ**
**باب كراهية الحلف في البيع وإن كان صادقا**

١/١٧٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقُولُ: «الحَلِفُ منْفَقَةٌ للسِّلْعَةِ، مَمْحَقَةٌ للْكَسْبِ» متفقٌ عليه[١٨٥].

---

[١٨٤] بوخاری (٦٦٦٣).

[١٨٥] بوخاری (٢٠٨٧) موسلیم (١٦٠٦).

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: سوێند لەسەرەتاوە برەو بە فرۆشتنی کاڵا دەدا، بەڵام لەئەنجاما پیتو بەرەکەتی کەسابەتەکە دەبا (ش).**

١٧٢١/٢ – وَعَنْ أَبي قَتَادَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الحلِفِ في الْبَيْعِ، فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ ثُمَّ يَمْحَقُ) رواه مسلم[186].

**ئەبو قەتادە** (رەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوت، دەیفەرموو: لەسەوداو مامەڵەدا، دووربن لە سوێند خواردنی زۆر، چونکە سوێند خواردن لەپێشا برەوو فرۆختو ڕەواج بەکاڵا دەدا، بەڵام لەپاش دا پیتو فەڕی دەبا بەحەوادا (موسلیم** (رەزای خوای لێ بێ)**).**

## ٣١٩- باش نییە داوای هیچ شتی بکرێ، بێجگە لە بەهەشت، بەهۆی ناوی خوداوە، بەڵام ئەگەر کەسێ بەهۆی ناوی خوداوە داوای شتێکی ڕەوای کرد باش وایە کە بێ بەش نەکرێ

## باب كراهية أن يسأل الإنسان بوجه الله عز وجل غير الجنة، وكراهة منع من سأل بالله تعالى وتشفع به

١٧٢٢/١ – عَنْ جابرٍ (رضي اللّٰه عنه)قَال: قالَ رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا يُسْأَلُ بوَجْهِ اللّٰهِ إِلاّ الجَنَّةُ) رواه أبو داود[187].

**جابیر** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بەخاتری خوا داوای هیچ شتی ناکرێ بێجگە لە بەهەشت (د=أبو داود –** (رەزای خوای لێ بێ)**).**

١٧٢٣/٢ – وَعَن ابْن عُمَرَ رضِيَ اللّٰه عنْهُما قَالَ: قَال رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللّٰهِ، فأَعِيذُوهُ، ومنْ سَأَل باللّٰهِ، فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ دَعَاكُمْ، فَأَجِيبُوه، ومَنْ صنَع إِلَيْكُمْ معْرُوفاً فكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ به، فَادَعُوا لَهُ

---

[186] موسلیم (١٦٠٧).

[187] ئەبوداوود (١٦٧١).

حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُموهُ) حديثٌ صَحِيحٌ، رواهُ أَبُـو داود، والنسـائي بأسـانيد الصحيحين[١٨٨].

ئیبنــو عومــەر (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فــەرمووی: خۆشەویســت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: هەرکەسێ پەنای بردە بەرخودا وەك ئەوە گوتی توخودا ئەوەم بدەرێ، یا توخوا وامەکە ئەوە دەبێ پەنای بدەنو دڵی مەشکێنن، وەهەرکەسێ بەخاتری خودای گەورە داوای شتێکی ڕەوای کرد، بەپێی توانا بەشی بدەن وە هەرکەسێ بانگهێشتی لێکردن، خوڵکەکەی قەبوڵ بکەن، بەمەرجێ توشی ناڕەوایی نەبن، وەهەرکەسێ پیاوەتی لەگەڵ کردن تۆڵەی چاکەی بدەنەوەو هەقی بۆ بکەنەوە، تەنانەت ئەگەر نەتان بوو پاداشتی بدەنەوە نزای باشی زۆری بۆبکەن، هەتا دڵنیا دەبن کە تۆڵەتان بۆ کردۆتەوە (د/ن-س/ص).

**٣٢٠- وشەی شاهەنشا بۆ قراڵو پاتشاو ئەم کەسانە ناهەقە، چونکە هەر خودا بۆخۆی شای هەمووو شایەکانە**

١/١٧٢٤ – عَنْ أَبي هُرَيْـرَةَ (رضـي اللّـه عنـه)عـن النبــيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قال: (إِنَّ أَخْنَعَ اسمٍ عندَ اللّهِ عزَّ وجَلَّ رَجُلٌ تَسَـمَّى مَلِـكَ الأَمـلاكِ) متفـق عَلَيه[١٨٩].

لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) سەروماڵو مناڵو هەستو نەست هەمووی بە قوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بێو (دروودی خوای لەسەر بێ)و دەفەرموێ: خوێڕیترین ناو لای خوای شکۆدارو خاوەن شکۆ ناوی ئەو کابرایەیە کە خۆی ناوبنێ شای شایان (شاهەنشا) پاتشای پاتشایان مەلیکولمولوك (ش).

[١٨٨] ئەبوداوود (١٦٧٢) نسائی (٥/٨٢).
[١٨٩] بوخاری (٦٢٠٥) موسلیم (٢١٤٣).

### ٣٢١- ناپەسەندە لەناو گفتوگۆدا بەبەدكارو لەرێ دەرچووی نایین بگوترێ گەورە، یا ئاغا، یا خان، یا بەگ
### باب النهي عن مخاطبة الفاسق والمبتدع ونحوهما بسيد ونحوه

١/١٧٢٥– عن بُرَيْدَةَ (رضي اللّه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لا تَقُولُوا للْمُنَافِقِ سَيِّدٌ، فَإنَّهُ إنْ يكُ سَيِّداً، فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ عزَّ وَجَلَّ) رواه أبو داود بِإسنادٍ صحيحٍ[190].

**بورەیدە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بەمرۆی ناپاك (مونافیق) مەڵێن ئاغا، یاخود گەورە، چونکە ئەگەر ئێوە ئەو لە خودا یاخی بووە بەگەورەو ئاغا دابنێن، ئەوە مەعنای وایە کە ڕێزی دوژمنی خودا دەگرن‌و بەوە خودا لەخۆتان دەرەنجێنن. (د-س/ص). بەڵام ئەگەر مەترسی بۆی هەبوو قەیناکا (وەرگێڕ).**

### ٣٢٢- جنێودان بە (تا) باش نییە (باب كراهة سب الحمى)

١/١٧٢٦– عنْ جَابرٍ (رضي اللّه عنه)أَنَّ رسُول اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)دخَلَ على أُمِّ السَّائبِ، أَوْ أُمِّ المُسَيَّبِ فقَالَ: (مَالَكِ يا أُمَّ السَّائبِ أَوْ يَا أُمِّ المُسيَّبِ تُزَفْزِفينَ؟) قَالَتْ: الحُمَّى لا بارَكَ اللّه فِيهَا، فَقَالَ: (لا تَسُبِّي الحُمَّى، فَإنَّهَا تُذْهِبُ خَطَايا بَنِي آدم، كَما يُذْهِبُ الْكِيرُ خَبثَ الحدِيدِ) رواه مسلم[191].

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **چوو بۆ سەردانی ژنێ، ناوی ئومو سائیب بوو، یا ناوی ئومو موسەیب بوو نەخۆش بوو، فەرمووی: ئەی ئومو سائیب! ئەوە چیتە واهەڵدەچۆقێیت؟ گوتی: تام لێهاتووە، خودا لێی هەڵپێچێ‌و پیتی بەرێ بەحەوادا، فەرمووی: جنێو بە تا مەدە، چونکە تا گوناهی ئادەمیزاد لادەبات، وەك چۆن موشە دەمە چڵك‌و ژەنگی ئاسنی ناو کوورە لادەبات. (م-**(ڕەزای خوای لێ بێ)**).**

---

[190] ئەبوداوود (٤٩٧٧).

[191] موسلیم (٢٥٧٥).

**٢٢٣- جنێودان بە (با) ناپەسەندە لەدەمی هەڵکردنی (با)دا مرۆڤی چی بڵێ باشە**
**باب النهي عن سب الريح وما يقال عند هبوبها**

١٧٢٧/١- عَنْ أَبي المُنْذِرِ أَبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا تَسُبُّوا الرِّيحَ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ما تَكْرَهُونَ، فَقُولُوا: اللّٰهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هذِهِ الرِّيحِ وخَيْرِ مَا فِيهَا وخَيْرِ ما أُمرَتْ بِهِ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هَذِهِ الرِّيحِ وَشَرِّ ما فيها وشرِّ ما أُمِرَتْ بِهِ) رواه الترمذي وقَالَ: حَديثٌ حسنٌ صحيح[١٩٢].

ئەبو مونزیری کوڕی کەعب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: جنێو بەبا مەدەن، ئەگەر لەبا شتێکتان دی کە بەدڵتان نەبوو، وەك گەردەلوول‌و تەپوتۆزێ، بڵێن: خودایە! لەخێری ئەم بایەت لێداوا دەکەین‌و لەوخێرەی کەوا لەناوی دا، وەك هێنان‌و بردنی هەورو گەمێ‌و شتی وا، هەروەها لەو خێرەش کە ئەم بایەی بۆ ئامادەکراوە، وە پەنا دەگرم بەپەنای تۆ لە شەڕی ئەم بایەو لەو شەڕەی کەوا لەناوی داو لەو شەڕەی کە بۆی ئامادەکراوە. (ت:ح/ح/ص).

١٧٢٨/٢- وعنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: الرِّيحُ مِنْ رَوْحِ اللّٰهِ تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ، وَتَأْتِي بالعَذَابِ، فَإِذا رَأَيْتُمُوهَا فَلا تَسُبُّوهَا، وَسَلُوا اللّٰه خَيْرَهَا، واسْتَعِيذُوا باللّٰهِ مِنْ شَرِّهَا) رواه أبو داود بإسناد حسن.

قوله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مِنْ رَوْحِ اللّٰهِ) هو بفتح الراءِ: أَيْ رَحْمَتِهِ بِعِبَادِهِ[١٩٣].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: با لەڕەحمەتی خودایە، جاری واهەیە ڕەحمەت دەهێنێ‌و جاری واهەیە سزاو زەحمەت کە دیتان وا با هەڵی کرد جمێنی پێ مەدەن، وەلە خوا داوای خێری ئەو بایە بکەن، وەپەنا بگرن بەخودا لەشەڕی (د-س/ح).

---

[١٩٢] تیرمیزی (٢٢٥٣).
[١٩٣] ئەبوداوود (٥٠٩٧).

٣/١٧٢٩- وعنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰه عنْهَا قَالَتْ: كَانَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)إذا عَصِفَتِ الرِّيح قال: «اللّٰهُمَّ إني أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا، وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وخَيْر ما أُرسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بك مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ ما فِيها، وَشَرِّ ما أُرسِلَت بِهِ» رواه مسلم[194].

**عائیشه** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: جاران کە بای سەخت هەڵی دەکرد، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو:**

**خودایە! داوای خێری ئەم بایەت لێدەکەم‌و داوای ئەو خێرەشت لێدەکەم کەوا لەناوی دایەو داوای ئەو خێرەشت لێدەکەم کە ئەمبایەی بۆ هەڵکراوە، وەپەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی ئەوەی تیایەتی‌و لەو شەڕەیش کە ئەم بایەی بۆ هەڵکراوە (م).**

**٣٢٤- جمێندان بەکەڵەباب نا پەسەندە (باب كراهة سب الديك)**

١/١٧٣٠- عنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا تَسُبوا الدِّيكَ، فَإِنَّهُ يُوقِظُ للصلاةِ) رواه أبو داود بِإسنادٍ صحيح[195].

**زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: جنێو مەدەن بە کەڵەشێر، چونکە خەڵك خەبەر دەکاتەوە بۆ نوێژ (د-س/ص).**

**٣٢٥- ناپەسەندە گوتەی لەفیسارە بورج دا بارانمان بۆ باری**
**باب النهي عن قول الإنسان مطرنا بنوْءِ كذا**

١/١٧٣١- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: صَلّى بِنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)صَلاةَ الصُّبْحِ بالحُدَيْبِيَةِ على إثْرِ سَمَاءٍ كَانتْ مِنَ اللّيْلة، فَلَمَّا انْصرَفَ أَقْبَلَ عَلى النَّاس، فَقَال: هَلْ تَدْرُون مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا: اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَعلَمُ. قَالَ: (قَالَ: أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤمِنٌ بي، وَكَافِرٌ، فأَمَّا مَنْ قالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ

---

[194] موسلیم (٨٩٩، ١٥).
[195] ئەبوداوود (٥١٠١).

اللّٰهِ وَرَحْمتِهِ، فَذلِكَ مُؤمِنٌ بي كَافِرٌ بالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قالَ: مُطِرْنا بِنَوْءِ كَذا وَكذا، فَذلكَ كَافِرٌ بي مُؤمِنٌ بالْكَوْكَبِ» متفقٌ عليه. والسَّماءُ هُنَا: المَطَرُ[196].

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە حودەیبییە بووین، شەو باران باریبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) نوێژی بەیانی بۆکردین، کە سلاوی دایەوە ڕووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئایا دەزانن کە پەروەردگارتان چی دەفەرموێ: ئەم بەیانیە بەهۆی ئەم بارانەوە بەندەکانم بوون بەدوو تاقم تاقمێکیان باوەڕیان بەمن هەبووە، وە تاقمێکیان باوەڕیان بەمن نەبوو، ئەوەی بڵێ لەسایەی خوداو ڕەحمەتی خوداوە، ئەو بارانەمان بۆباریوە، ئەوە باوەڕی تەواوی بەمن هەیەو باوەڕی بەبورجو ئەستێرەو شتی وانییە بەڵام ئەو کەسەی بڵێ لەفیسارە بورجا بارانمان بۆ باریوە، ئەوە باوەڕی بەمن نییەو بەڵکوو باوەڕی بە بورجو ئەستێران هەیە (ش).

## ٣٢٦- نادروستە بەموسوڵمان بگوترێ ئەی ناموسوڵمان
## باب تحريم قوله لمسلم يا كافر

١/١٧٣٢ - عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰه عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إذا قَالَ الرَّجُلُ لأَخِيهِ: يَا كَافِر، فقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُما، فَإنْ كَانَ كَمَا قَالَ وَإِلاَّ رَجَعَتْ عَلَيْهِ) متفقٌ عليه[197].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو موسوڵمانەی بەبرای ئاینی خۆی بڵێ: ئەی نا موسوڵمان! ئەو جنێوە بەریەکێکیان دەکەوێ، ئەگەر برادەرەکەی وەك ئەو دەڵێ وابێو نا موسوڵمان بێ، ئەوە بەرئەو نا موسوڵمانەتییە دەکەوێ، دەنا قسەکەیو تەکفیرو بەناموسڵمان کردنەکەی دەچێتەوە بۆخۆی (ش).

---

[196] بوخاری (٨٤٦) موسلیم (٧١).
[197] بوخاری (٦٠٤٥) موسلیم (٦١).

٢/١٧٣٣ – وعَنْ أَبي ذَر (رضي اللّٰه عنه)أَنَّهُ سمِعَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (منْ دَعَا رَجُلاً بالْكُفْرِ، أَوْ قَالَ: عَدُوَّ اللّٰهِ، ولَيْس كَذلكَ إلاَّ حَارَ علَيْهِ) متفقٌ عليه. (حَارَ) :رَجَع[198].

ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو کەسێ بانگی موسوڵمان بکا بڵێ نا موسڵمان! یا پێی بڵێ ئەی دوژمنی خودا! وەکابرای موسوڵمان وەك ئەو دەڵێ وانەبێ، وە لەڕاستی دا بەدەمو بەدڵ موسوڵمان بێ، ئەوە خۆی بەر حوکمەکەی خۆی دەکەوێ (ش).

**٣٢٧- هەرزەگۆییو زمان پیسی خراپە (باب النهي عن الفحش وبذاء اللسان)**

⇦ ١/١٧٣٤- فەرموودەی: (ليس المؤمن بالطَّعَّان) بروانە: (٥/١٥٥٥ ز/٢٦٤)[199].

١/١٧٣٥ – وعِنْ أَنَسٍ (رضي اللّٰه عنه)قَال: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَا كَانَ الْفُحْشُ في شَيْءٍ إلاَّ شانَهُ، ومَا كَانَ الحَيَاءُ في شَيْءٍ إلاَّ زَانَهُ) رواه الترمذي، وقال: حديثٌ حسن[200].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرزەیی لەهەر شتێکا هەبێ ناشیرینی دەکا، شەرمو شکۆش لەهەر شتێکا هەبێ جوانی دەکا (ت-ح/ح).

**٣٢٨- قسە قوڵکردنەوەو هاشەو هوشەو دەم هەراشیو قسەی زلکردنو بەکارهێنانی وشەی نامۆو وردەکاری لەکاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ ڕەشە خەڵكو ئەمانەدا ناپەسەندە - باب كراهية التقعير في الكلام والتشدق فيه وتكلف الفصاحة واستعمال وحشي اللغة ودقائق الأعراب في مخاطبة العوام ونحوهم**

⇦ ١/١٧٣٦- فەرمودەی: (أهلك المتنظفون...) بڕوانە: (٣/١٤٤ ز/١٤)[201].

---

[198] تیرمیزی (١٩٧٨).

[199] تیرمیزی (١٩٧٨).

[200] تیرمیزی (١٩٧٥).

[201] موسلیم (١٦٤٨).

٢/ ١٧٣٧ – وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ رَضِيَ اللَّه عنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: ((إنَّ اللَّه يُبْغِضُ الْبَلِيغَ مِنَ الرِّجَالِ الَّذي يَتَخَلَّلُ بِلِسَانِهِ كَمَا تَتَخَلَّلُ الْبَقَرَةُ)). رَواه أَبو داودَ، والترمذي، وقال: حديثٌ حسن[٢٠٢].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا ڕقی لەو پیاوە دەمهەراشەیە کە لەکاتی قسەکردن دا زمانی بەکون‌و قوژبنی دەمیا دەگێڕێ بۆ قسەی زل، وەك چۆن مانگا لەکاتی لەوەڕدا بەزمانی ئاڵف‌و شت دەماشێتەوە ئاوا (د/ت-ح/ح).

⇦ ١٧٣٨/٣- فەرموودەی: (أن من أحبكم اليَّ وأقربكم منى مجلسا) بڕوانە: (٦٣١/١١ ز/٧٣)[٢٠٣].

## ٣٢٩- باش نییە بڵێی (خبثت نفسي – گەدەم گەنیوە)
## باب كراهية قوله خبثت نفسي

١/ ١٧٣٩ – عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْهَا عَن النبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: (لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ خَبُثَتْ نَفْسي، وَلكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي) متفقٌ عليه[٢٠٤].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەڵێن (خبثت نفسي)، دڵم تێك دەچێ، گەدەم گەنیوە، بەڵام بڵێن (لقست نفسي)، دڵم تێك هەڵدێ، دڵم دێ بەیەکا، دڵم هەڵدەشێوێ (ش).

حەزرەت مەبەستی ئەوەیە کە موسوڵمانان فێری قسەی شیرین‌و جوان بن‌و قسەی ناشیرین تەرك بكەن، لەگفتوگۆدا ناسك‌و بەنەزاکەت بن، دەنا (خبثت نفسي) دەق بەمانا (لقست نفسي)یە، بەڵام وشەی (خبث) وشەیەکی قێزەونە، بۆنمونە: بەپێی ئەم فەرمودەیە ئەم ڕستانەی دواوە لەکوردی دا گەرچی ڕستەی یەکەم دەق بەواتای ڕستەی دوەمە، بەڵام یەکەمیان ناسکترە

---

[٢٠٢] ئەبوداوود (٥٠٠٥) تیرمیزی (٢٨٥٧).
[٢٠٣] تیرمزی (٢٠١٩).
[٢٠٤] بوخاری (٦١٧٩) موسلیم (٢٢٥٠).

له دووەم سەراودەكا پیسایی دەكا، لوتت بسره، چڵمەكەت بسڕه، ئینتەلا، ترخه (وەرگێڕ).

### ٣٣٠- باش نییه، به عینەب (مێو) بگوترێ (الكرم - داری مێو)
### باب كراهة تسمية العنب كرما

١/١٧٤٠- عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لا تُسَمُّوا الْعِنَبَ الْكَرْمَ، فِإنَّ الْكَرْمَ الْمُسْلِمُ) متفقٌ عليه. وهذا لفظ مسلمٍ.

وفي رِوَايةٍ: (فَإِنَّمَا الْكَرْمُ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ) وفي رواية للبخاري ومسلِم: (يَقُولُونَ الْكرْمُ إِنَّمَا الْكَرْمُ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ)[٢٠٥].

ئەبو هورەیره (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەترێو داری مێو مەڵێن (كەرم) چونكه كەرم كه بەمانای مەردایەتییە، سیفەتو ناونیشانی پیاوی موسوڵمانه (ش). ئەمە گفتەی موسلیم بوو.

له گێڕانەوەیەكی تری موسلیم دا: چونكه (كەرم: ئازایی، جوامێریی، مەردایەتی) سیفەتی دڵی موسوڵمانه. لەگێڕانەوەیەكی تری بوخاریو موسلیم دا (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەو خەڵكه بەداری مێو دەڵێن: كەرم، ئەمە ڕاست نییه، كه گوایه مەی نۆش كه مەی دەنۆشێ كه لەترێ دروست دەكرێ، ئازاو مەردو جوامێر دەبێ، مەی خۆی دەردە قەت نابێ بەدەرمان، وەلێ لەڕاستی دا كەرم كه بەمەعنا ئازایەتیو مەردایەتییە، سروشتو خووی دڵی موسوڵمانه.

٢/١٧٤١- وَعَنْ وَائِلِ بْنِ حَجرٍ (رضي اللّٰه عنه)عَنِ النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (لا تَقُولُوا: الْكَرْمُ، وَلَكِنْ قُولُوا: الْعِنَبُ، وَالحَبَلَةُ) رواه مسلم[٢٠٦].

وائیلی كوڕی حوجر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەداری مێو بەعەرەبی مەڵێن كەرم، بەڵام بڵێن عینەب یا حوبله واته ترێو مێو (م).

---

[٢٠٥] بوخاری (٦١٨٢) موسلیم (٢٤٧).

[٢٠٦] موسلیم (٢٢٤٨).

**٣٣١- وەسفی جوانیی ژن بۆ پیاوی ناخۆیی دروست نییە، مەگەر لەبەر بەهانەی ڕەوا، وەك كاتی خواستنو شتی وا**
**باب النهي عن وصف محاسن المرأة لرجل إلا أن يحتاج الى ذلك لغرض شرعي كنكاحها ونحوه**

١/١٧٤٢- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رضي اللّه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا تُبَاشِرِ المَرْأَةُ المَرْأَةَ، فَتَصِفَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا) متفقٌ عليه[207].

**ئیبنو مەسعود** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درووودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی:** نابێ ژن سەرنجی ژنێكی تر بدا لەپاشا ورد ورد باسی ناسكیو نازداریو لەشو لاری ئەو ژنە بكا بۆ مێردەكەی خۆی، بەشێوەیەكی وا وەك مێردەكەی بەچاوی خۆی تەماشای كردبێ وابێ (ش).

**٣٣٢- باش نییە مرۆڤ بڵێ: خوداسە ئەگەر ئارەزوو دەكەی لێم خۆشبە، وەڵێ با یەكسەر بڵێ (بەبێ ئەگەرو مەگەر) خودایە لێم خۆش بە**
**باب كراهة قول الإنسان في الدعاء: اللهم اغفرلي إن شئت، بل يجزم الطلب**

١/١٧٤٣- عنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: اللّهُمَّ اغْفِرْ لي إِنْ شِئْتَ: اللّهُمَّ ارْحَمْني إِنْ شِئْتَ، لِيَعْزِمِ المَسْأَلَةَ، فإِنَّهُ لا مُكْرِهَ لَهُ) متفقٌ عليه.

وفي روايةٍ لُمسْلِمٍ: (وَلَكِنْ، لِيَعْزِمْ وَلْيُعْظِّمِ الرَّغْبَةَ، فَإِنَّ اللّه تَعَالى لا يَتَعَاظَمُهُ شَيْءٌ أَعْطَاهُ))[208].

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لەخۆشەویستەوە** (درووودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** مەڵێن: خودایە ئەگەر خۆت ئارەزوو دەكەی لێم خۆشبە، خودایە خۆت حەز دەكەی ڕەحمم پی بكە، داواكەتان یەك لایی بكەنەوەو سوور بن لەسەریو بەجەختو بەگەرمی شت لە خودا داوا بكەنو ئەگەرو مەگەر لەپاڕانەوەدا مەكەن چونكە كەس زۆری لەسەر خودانییە (تۆ بڵێیتو نەڵێیت خودا ئەگەر مەیلی لەسەر شتێ نەبێ نایكا (ش)).

[207] بوخاری (٥٢٤٠) وە لە موسلیم دا نەبوو.
[208] بوخاری (٦٣٣٩) موسلیم (٢٦٧٩).

لە گێڕانەوەیەکی موسلیم دا: بەڵام با بەیەکجاری و یەکلایی بکاتەوەو زۆر بەگەرمی و شکۆمەندی مرازەکەی عەرزی بارەگای خواوەندی بکاو داوای بەشی باشی گەورەی لێبکا، چونکە خودای گەورە کام خەڵاتی زۆر گەورەیە، کە دەیدا بەکەسێ، بۆ ئەو هیچی تێ ناچێ، لەبەر ئەوە لەبەر شانی گران نییە.

٢/١٧٤٤- وَعَنْ أَنَسٍ (رضي اللّه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إذا دعا أَحَدُكُمْ، فَلْيَعْزِمِ المَسْأَلَةَ، وَلا يَقُولَنَّ: اللّهُمَّ إنْ شِئْتَ، فَأَعْطِنِي، فَإِنَّهُ لا مُسْتَكْرِهَ لَهُ) متفقٌ عليه[209].

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ نزا دەکەن داواکەتان یەك لایی بکەنەوە، بەنیاز پتەوی داواتان عەرزی بارەگای خودا بکەن، مەڵێن: خودایە! ئەگەر خۆت ئارەزوو دەفەرمووی بەشم بدە، چونکە کەس زۆری لەسەر خودا نییە، کەواتە تەعلیق بەمەشیئەتەوە سوودی نییە (ش).

### ٣٣٣- باش نییە بڵێی ئەگەر خودا حەزکاو فیسارەکەس حەزکا ئەو شتەوا دەبێ
### باب كراهة قول ماشاء اللّه وشاء فلان

١/١٧٤٥- عنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ (رضي اللّه عنه)عَنِ النبـيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالَ: (لا تَقُولوا: ماشاءَ اللّه وشاءَ فُلانٌ، ولكِنْ قُولوا: مَا شَاءَ اللّه، ثُمَّ شَاءَ فُلانٌ) رواه أبو داود بإسنادٍ صحيح[210].

حوزەیفەی کوڕی یەمان (رەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: مەڵێن: ئەگەر خودا حەزکاو فیسارە کەس حەزکا ئەوکارە وادەبێ، بەڵام بڵێن: ئەگەر ویستی خودای لەسەر بێ لەئەزەلداو ئێستایش فیسارەکەس مەیل بکا ئەو شتە وا دەبێ (د-س/ص).

---

[209] بوخاری (٦٣٣٨) موسلیم (٢٦٧٨).
[210] ئەبوداوود (٤٩٨٠).

**٣٣٤- قسەو گفتوگۆکردن لەپاش نوێژی خەوتنان باش نییە، مەبەست ئەو قسەیەیە کەلەزاتی خۆی دا ڕەوا بێ بەلام قسەی ناڕەوا لەم حەلەدا زۆر ناڕەوا ترە، وەلێ قسەی خێر، وەك دەورکردنەوەو گێڕانەوەی داستانو هەقایەتی پیاوچاکانو باسو خواسی مەردایەتیو خوی شیرینو ڕەفتاری بەرزو دەمەتەقێ لەگەڵ میوانداو لەگەڵ خاوەن کارێ، یا لەگەڵ کەسێ پرسیارێکی ڕەوای هەبێ، یا وێنەی ئەمانە، ئەوە قەیدی نییە، بەڵکوو پەسەندو جوانە، هەروا هەر قسەیێ بەهانەیەکی ڕەوای هەبێ، یا لەبەر ڕوداوێ بێ، ئەوەیش ناپەسەندیی نییە، لەبارەی ئەم بابەتانەوە کە باسم کردن، لەبارەی هەموویانەوە فەرموودەی ساخی ڕاستو دروست ساخ بۆتەوە**

المراد به الحديث الذي يكون مباحاً في غير هذا الوقت وفعله وتركه سواء. فأما الحديث المحرم أو المكروه في غير هذا الوقت أشد تحريماً وكراهة، وأما الحديث في الخير كمذاكرة العلم وحكايات الصالحين ومكارم الأخلاق والحديث مع الضيف ومع طالب حاجة ونحو ذلك فلا كراهة فيه، بل هو مستحب، وكذا الحديث لعذر وعارض لا كراهة فيه. وقد تظاهرت الأحاديث الصحيحة على كل ما ذكرته.

١/١٧٤٦- عَنْ أَبي بَرْزَةَ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)كَانَ يَكرَهُ النومَ قَبْلَ العِشاءِ وَالحَدِيثَ بعْدَهَا. متفقٌ عليه[٢١١].

**ئەبو بەرزە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: دەستوری حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **وابوو: لەپێش کردنی نوێژی خەوتنان دا حەزی لەنوستن نەبوو، لەپاش کردنی نوێژی خەوتنانیش حەزی لە قسەکردن نەبوو. (ش=بوخاریو موسلیم** (ڕەزای خوایان لێ بێ)**).**

٢/١٧٤٧- وعَنِ ابْنِ عُمرَ رَضِيَ اللّٰه عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)صَلَّى العِشَاءَ في آخِرِ حَيَاتِهِ، فَلمَّا سَلَّم، قَالَ: (أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ؟ فَإِنَّ على رَأْسِ مِئَةِ سَنَةٍ لا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ اليَوْمَ أَحدٌ) متفقٌ عليه[٢١٢].

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەدوایی ژیانی دا، شەوێ کە نوێژی خەوتنانی کردو سلاوی دایەوە فەرمووی: با پێتان**

---

[٢١١] بوخاری (٥٦٨) موسلیم (٦٤٧، ٢٣٧).

[٢١٢] بوخاری (١١٦) موسلیم (٢٥٣٧).

بڵێم لەم شەوەوە بیگرن تا سەد ساڵی تر کەس لەوانەی کە ئەمڕۆ لەسەر زەوی دەژین نامێنن (ش).

⇦ ١٧٤٨/٣- بڕوانە (ژ/٣/١٠٦٣ ز/١٩٠)[٢١٣].

**٣٣٥- دروست نییە کە ژن بەبێ هۆیەکی ڕەوا خۆی نەدا بەدەست مێردەکەیەوە بۆ سەرجێیی و شتی وا**

**باب تحريم امتناع المرأة من فراش زوجها إذا دعاها ولم يكن لها عذر شرعي**

⇦ ١٧٤٩/١- فەرموودەی: (إذا دعا الرجل امرأته الى فراشه...) بڕوانە: (٢٨٤/٤ ز/٣٥)[٢١٤].

**٣٣٦- نادروستە کە ژن ڕۆژوی سوننەت بگرێ، ئەگەر مێردەکەی لەماڵ بێ، مەگەر بەڕەزامەندی مێردەکەی**

**باب تحريم صوم المرأة تطوعا وزوجها حاضر إلا بإذنه**

⇦ ١٧٥٠/١- فەرموودەی: (لا يحل لأمرأته أن تصوم وزوجها شاهد...) بڕوانە: (٢٨٣/٣ ز/٣٥)[٢١٥].

**٣٣٧- نادروستە پاش نوێژ (مەئموم) لەپێش پێشنوێژەوە لە چەمینەوەو کڕنوش دا سەر هەڵبڕێ**

**باب تحريم رفع المأموم رأسه من الركوع والسجود قبل الإمام**

١/١٧٥١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)أَنَّ النبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ إذا رفَعَ رأْسَهُ قَبْلَ الإمَامِ أَنْ يَجْعلَ اللّه رأْسَهُ رأْسَ حِمارٍ، أَوْ يَجْعلَ اللّه صُورتَهُ صُورَةَ حِمارٍ) متفقٌ عليه[٢١٦].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی:

---

[٢١٣] بوخاری (٣٢٣٧) موسلیم (١٤٣٦، ١٢٢).

[٢١٤] بوخاری (٥١٥٩) موسلیم (١٠٢٦).

[٢١٥] بوخاری (٦٩١) مسلم (١٠٢٦).

[٢١٦]

ئەوكەسەی کەلەپێش بەرنوێژ (إمام)دا، سەربەرز دەکاتەوە لەچەمینەوەو کڕنوش، ئەدی ئەوە چۆن ناترسێ کەخودا لەسەر ئەوە سەری بکا بەسەری کەر، یاخودا شکڵی بکا بە شکڵی کەر (ش).

### ٣٣٨- لەناو نوێژدا دەستگرتن بەکەلەکەوە ناباشە
### باب كراهة وضع اليد على الخاصرة في الصلاة

١٧٥٢/١- عَنْ أَبي هُرَيْرةَ (رضـي اللّٰـه عنـه)أن رسـول الله صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم: نهي عنِ الخَصْرِ في الصَّلاةِ. متفقٌ عليهِ[٢١٧].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەوە کەنوێژکەر هەردوو دەستی لەسەر کورتە کەلەکەی بگرێ (ش).

### ٣٣٩- لەکاتی ئامادەبوونی نان دا نوێژ دابەستن ناباشە، ئەگەر حەزی لەو نانە هەبوو، هەروا بە دەستنوێژی قورسەوە

١٧٥٣/١- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰه عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُول اللّٰهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم)يَقُـولُ: (لا صَـلاةَ بحضـرَةِ طَعَـامٍ، وَلا وَهُـوَ يُدَافِعُـهُ الأَخْبَثَـانِ) رواه مسلم[٢١٨].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لەحەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: کەنان دانرا نوێژکردن باش نییە کە سەراویش تەنگەتاوی کردن هەروا (م).

### ٣٤٠- لەنوێژدا سەیرکردنی ئاسمان ناباشە
### باب النهي عن رفع البصر الي السماء في الصلاة

١٧٥٤/١- عَنْ أَنس بْنِ مَالكٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَا بالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلى السَّماءِ في صَـلاتِهِمْ)، فَاشْـتَدَّ قَوْلُـهُ في ذلـك حَتَّـى قَـالَ: (لَيَنْـتَهُنَّ عَـنْ ذلـكَ، أَوْ لَـتُخْطَفَنَّ أَبْصـارُهُمْ) رواه البخاري[٢١٩].

---

[٢١٧] بوخاری (١٢١٩) موسلیم (٥٤٥).

[٢١٨] موسلیم (٥٦٠).

[٢١٩] بوخاری (٧٥٠).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموی: لەبەرچی هەندێ کەس لەنوێژدا چاو هەڵدەبڕن بۆ ئاسمان، بۆ وادەکەن بۆ! ئیتر حەزرەت لەم بارەیەوە گەلێ بەتوندی هەڕەشەی کرد تەنانەت فەرمووی: دەبێ واز لەم کارە ناشیرینە بێنن، ئەگینا بێ گومانبن کوێردەبن! (ب-خ).

**٣٤١- بەبێ بەهانە ئاوڕدانەوە لەناو نوێژداناباشە**
**باب كراهة الإلتفات في الصلاة لغير عذر**

١٧٥٥/١- عَنْ عَائِشَةَ رضِيَ اللَّه عَنْهَا قَالَتْ: سأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عَنِ الالْتِفَاتِ فِي الصَّلاةِ فَقَالَ: (هُوَ اخْتِلاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلاةِ الْعَبْدِ) رواهُ البُخَاري[٢٢٠].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆ ئاوڕدانەوە لەناو نوێژدا لە پێغەمبەرم پرسی، فەرمووی: ئەوە لێدزینەوەیە شەیتان دەیفڕێنێ لە نوێژی بەندە (بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ)).

١٧٥٦/٢- وَعَنْ أَنَسٍ (رضي اللَّه عنه)قَالَ: قَالَ لي رسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إِيَّاكَ وَالالْتِفَاتَ فِي الصَّلاةِ، فَإِنَّ الالْتِفَاتَ فِي الصَّلاةِ هَلَكَةٌ، فإِنْ كَان لابُدَّ، فَفِي التَّطَوُّعِ لا فِي الْفَرِيضَةِ). رواه التِّرمذي وقال: حديثٌ حسنٌ صَحِيحٌ[٢٢١].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرمووم کوڕی شیرینم! نەکەی لەناو نوێژدا لابکەیتەوە، چونکە شتی وا سەرتیاچونەو ماڵوێرانی، ئەگەر هەر چارت نەبوو لەنوێژی سونەتا بێ سووچترە تا نوێژی فەرز (ت-ح/ح/ص).

[٢٢٠] بوخاری (٧٥١).
[٢٢١] تیرمیزی (٥٨٩).

## ٣٤٢- نوێژکردن ڕوبەڕوی گۆڕ ناباشە - باب النهي عن الصلاة الى القبور

١٧٥٧/١- عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ كَنَّازِ بْنِ الحُصَيْنِ (رضي الله عنه)قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ: (لا تُصَلُّوا إِلَى القُبُورِ، وَلا تَجْلِسُوا عَلَيْهَا) رواه مُسْلِم[٢٢٢].

ئەبو مەرثد کەننازی کوڕی حوصەین (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەزرەتم بیست دەیفەرمو: بەرەو ڕووی گۆڕ نوێژ مەکەن‌و لەسەر گۆڕیش دامەنیشن(م).

## ٣٤٣- هاموشۆکردن بەبەردەم نوێژدا نادروستە
## باب تحريم المرور بين يدي المصلي

١٧٥٨/١- عَنْ أَبِي الجُهَيْمِ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الأَنْصَارِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لَوْ يَعْلَمُ المَارُّ بَيْنَ يدي المُصَلِّي مَاذا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْراً لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ) قَالَ الرَّاوي: لا أَدْرِي: قَالَ أَرْبَعِين يوماً، أَو أَرْبَعِينَ شَهْراً، أَوْ أَرْبَعِينَ سَنَةً.. متفقٌ عليه[٢٢٣].

ئەبو جوهەیم عەبدوڵلای کوڕی حاریس کوڕی صیممەی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئاموشۆکەر کەلەبەردەم نوێژەکەوە ڕەت دەبێ ئەگەر بزانێ بەوە چەنێ گوناهی تووش دەبێ حەزی دەکرد کە چل...... ڕابوەستایە. وەلەبەر دەمیەوە ڕەت نەبوایە، ئەبو نەضر کە یەکێکە لە ڕاویەکانی ئەم فەرموودەیە دەڵێ: نازانم بوسری کوڕی سەعید کە ئەمەی بۆ من گێڕاوەتەوە گوتی: چل ڕۆژ یا چل مانگ، یا چل ساڵ. (ش).

---

[٢٢٢] موسلیم (٩٧٢، ٩٨).

[٢٢٣] بوخاری (٥١٠) موسلیم (٥٠٧).

**٣٤٤- كه دەست كرا بەقامەت كردن، باش نييه بۆ پاشنويژ نوێژى سوننەت دابيەستىٚ - باب كراهة شروع المأموم في نافلة بعد شروع المؤذن في إقامة الصلاة، سواء كانت النافلة سنة تلك الصلاة أو غيرها**

١٧٥٩/١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)عَنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (إِذا أُقِيمتِ الصلاةُ، فَلاَ صَلاَةَ إلا المكتوبَةَ) رواه مسلم[٢٢٤].

**ئەبو هورەيرە** (ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ) **لە حەزرەتەوە** (دروودى خواى لەسەر بىٚ) **فەرمووى: كاتىٚ دەست كرا بەقامەت كردن بۆ نوێژى فەرز ئيتر دەبىٚ نوێژى تر نەكەن جگە لەو فەرزە (م).**

**٣٤٥- بەتايبەتى ڕۆژوگرتنى ڕۆژى هەينى بەتەنيا يا شەونوێژكردنى شەوەكەى بەتەنيا باش نييه - باب كراهة تخصيص يوم الجمعة بصيام أو ليلته بصلاة**

١٧٦٠/١- عَنْ أَبِي هُرَيْرة (رضي اللّه عنه)عَنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (لا تَخُصُّوا لَيْلَةَ الجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اللَّيَالي، وَلا تَخُصُّوا يَوْمَ الجُمُعَةِ بِصيَامٍ مِنْ بيْنِ الأَيَّامِ إلاَّ أَنْ يَكُونَ فِي صَوْمٍ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ) رواه مسلم[٢٢٥].

**ئەبو هورەيرە** (ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ) **لەحەزرەتەوە دەفەرمویٚ: لەناو هەموو شەوەكان دا بەتايبەتى لەشەوى هەينى دا شەونوێژ مەكەن، هەروەها لەناو هەموو ڕۆژەكانى هەفتەدا ڕۆژى هەينى بەڕۆژو مەبن، مەگەر وا ڕێبكەوىٚ كە ڕۆژى هەينى ڕێكەوتى ڕۆژى ڕۆژوى ترى خۆى بىٚ، وەك ئەوە بڵىٚ: هەر ڕۆژىٚ نەخۆشەكەم چاك بوەوە ئەبىٚ بەڕۆژووبم، وە لەڕۆژى هەينى دا نەخۆشەكەى چاك بێتەوە (م).**

٢/ ١٧٦١- وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (لا يَصُومَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الجُمُعَةِ إلاَّ يَوْماً قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ) متفقٌ عليه[٢٢٦].

**ديسان فەرمووى: لەخۆشەويستم بيست دەيفەرموو: كەس لە ئێوە بەتايبەتى ڕۆژوى ڕۆژى هەينى نەگرىٚ، مەگەر لەپێشيەوە يا لە پاشيەوە ڕۆژێكى ترى لەگەڵ دا بگرىٚ (ش).**

---

[٢٢٤] موسليم (٧١٠).

[٢٢٥] موسليم (١١٤٤، ١٤٨).

[٢٢٦] بوخارى (١٩٨٥) موسليم (١١٤٤).

٣/١٧٦٢- وَعَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبَّادٍ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِراً (رضي اللّٰه عنه): أَنَهَى النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عَنْ صَوْمِ الجُمُعَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ. متفقٌ عليه[٢٢٧].

**موحەممەدی کوڕی عەبباد فەرمووی: لەجابیرم پرسی ئایا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەکرد لەگرتنی ڕۆژوی ڕۆژی هەینی؟ فەرمووی: بەڵێ. (ش).**

٤/ ١٧٦٣- وَعَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الحَارِثِ رَضِيَ اللّٰه عَنهَا أَنَّ النبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)دَخَلَ عَلَيْهَا يوْمَ الجُمُعَةَ وَهِيَ صَائمَةٌ، فَقَالَ: (أَصُمْتِ أَمْس؟) قَالَتْ: لا، قَالَ: (تُرِيدينَ أَنْ تَصُومِي غداً؟) قَالَتْ: لا، قَالَ: (فَأَفْطِري) رَوَاهُ البُخاري[٢٢٨].

**دایکی موسوڵمانان جوەیرییەی کچی حاریس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلام، منیش بەڕۆژوبووم، ڕۆژەکەشی ڕۆژی هەینی بوو، فەرمووی: دوێنێ بەڕۆژوو بووی؟ گوتم: نەء، فەرمووی: باشە دەتەوێ سبەی لەگەڵ ئەمڕۆدا بەرۆژوو بێ؟ گوتم: نەء، فەرمووی: کەواتە ڕۆژووەکەت بشکێنە. (بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ)).**

## ٣٤٦- ڕۆژوودانە دەم یەك نادروستە كە بریتییە لەوە دوو ڕۆژ یا پتر شەوو ڕۆژ بەڕۆژو بێ و لەو ماوەیەدا نەیشكێنێ و نەشت بخواو نەشت بخواتەوە
## باب تحريم الوصال في الصوم، وهو أن يصوم يومين أو أكثر ولا يأكل ولا يشرب بينهما

١/ ١٧٦٤- عَنْ أَبِي هُرِيْرَةَ وَعَائِشَةَ رَضِي اللّٰه عنْهُمَا أَنَّ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهَى عَنِ الْوِصالِ. متفقٌ عليه[٢٢٩].

**لە ئەبوهورەیرەوە، هەروا لە عائیشەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویان: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدا كە یەكێ دوو ڕۆژ یا پتر شەوو ڕۆژ بەڕۆژو بێ و لەو ماوەیەدا بەهیچ جۆرێ ڕۆژووەكەی نەشكێنێ. (ش).**

[٢٢٧] بوخاری (١٩٨٤) موسلیم (١١٤٣).

[٢٢٨] بوخاری (١٩٨٦).

[٢٢٩] بوخاری (١٩٦٤، ١٩٦٦) موسلیم (١١٠٣، ١١٠٥).

٢/١٧٦٥– وَعَن ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّه عَنْهُما قالَ: نَهَى رسُولُ اللّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم)عَنِ الْوِصال. قَالُوا: إنَّكَ تُواصِلُ؟ قَالَ: (إنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إنـي أُطْعَمُ وَأُسْقَى) متفقٌ عليه، وهَذا لَفْظُ الْبُخاري[230].

**ئیبنو عومەر** (رەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **ڕێگەی نەدا کە یەکێ دوو ڕۆژ یا پتر شەوو ڕۆژ بە ڕۆژوو بێو لەو ماوەیەدا بەهیچ جۆرێ ڕۆژووەکەی نەشکێنێ یاران فەرمویان: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ خۆت وادەکەی؟ فەرمووی: جا ئێوە وەك من وان، من جیام لەئێوە، من خودا فرسەتم دەداو بەشەو نانو ئاوم دەداتێ (ش).**

## ٣٤٧- دانیشتن لەسەر گۆڕ نادروستە - باب تحريم الجلوس على قبر

١/١٧٦٦– عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)قَال: قَال رسُولُ اللّـهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم): لأَنْ يجْلِسَ أَحدُكُمْ على جَمْرَةٍ، فَتُحْرِقَ ثِيَابَه، فَتَخْلُصَ إلى جِلْدِهِ خَيرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يجْلِسَ على قَبْرٍ» رواه مسلم[231].

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر لەسەر پشکۆی ئاگری سوور دابنیشنو جلەکانتان بسوتێنێو بگاتە پێستتانو جزەی لێهەڵبستێنێ، هێشتا ئەمەتان باشترە لەوە کە لەسەر گۆڕێ دابنیشن (م).**

## ٣٤٨- جڵەوگیری کراوە لەگەچکاری گۆڕو خانوو کردن لەسەری
## باب النهي عن تجصيص القبر والبناء عليه

١/١٧٦٧– عَنْ جَابِرٍ (رضي اللّه عنه)قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وسَلّم)أَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ، وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيهِ، وأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ. رواه مسلم[232].

**جابیر** (رەزای خوای لێ بێ) **گوتی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەهی کردووە لە گەچکاری کردنی گۆڕو لەدانیشتن لەسەریو لەدروستکردنی خانوو لەسەری (مسلم-**(رەزای خوای لێ بێ)**).**

---

[230] بوخاری (١٩٦٢) موسلیم (١١٠٢).
[231] موسلیم (٩٧١).
[232] موسلیم (٩٧٠).

**٣٤٩- نارەوایەکی گەورەیە کە بەندە بەخۆڕایی لەدەست ئاغاکەی ڕابکات** (**باب تغليظ تحريم إباق العبد من سيده**)

١٧٦٨/١- عَنْ جَرِيرٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أَيُّمَا عَبْدٍ أَبَقَ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ رواه مسلم[٢٣٣].

**جەریر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەر بەندەیێ لەدەست خاوەنی، بەختو خۆڕایی، هەڵبێ، ئەوە لەپەناو ئامانی خوداو پێغەمبەر دەردەچێ (موسلیم** (ڕەزای خوای لێ بێ)**).**

١٧٦٩/٢- وَعَنْهُ عَنِ النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إِذا أَبَقَ الْعَبْدُ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةٌ) رواه مسلم. وفي رِوَايةٍ: (فَقَدْ كَفَر)[٢٣٤].

**دیسان جەریر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەگەر بەندە هەڵبێو ڕابکا لەدەست ئاغاکانی نوێژی قبوڵنابێ (م). لەگێڕانەوەیەکا ئەوە کفرە.**

**٣٥٠- تکاکردن لەحەددی شەرعی دا نادروستە - باب تحريم الشفاعة في الحدود**

قال اللّٰه تعالى: {الزانية والزاني فاجلدوا كل واحد منهما مائة جلدة، ولا تأخذكم بهما رأفة في دين اللّٰه إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر} (النور- ٢/٢٤).

**واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ژنی داوێنپیسو پیاوی شەڕواڵ پیس، یەکی سەرو سەد داریان لێ بدەن، بەلێدانێکی ئاسایی، بە تووڵێ (تووڵ = عود، تولّ = توولەی ڕاوکردن) نەزۆر گەورەو نە زۆر بچوك، بەڵام لەجێگەی بەڕێزو کوشندەیان مەدەن، میهرەبانیو بەزەییش نەتانگرێ بەرامبەر بەمانە، تا فەرمانی خودا زایە نەبێ، ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خوداو بە ڕۆژی پاشە ڕۆژ.**

⇦١٧٧٠/١-فەرموودەی: (أن قريشا اهمهم شأن المرأه..)بڕوانە: (٦٥١/٣ ز/٧٧)[٢٣٥].

---

[٢٣٣] موسلیم (٦٩).

[٢٣٤] موسلیم (٧٠).

حەدیثی باسی ژنە مەخزومییەکە. لێرەدا ئەم پترییەی هەیە: لە گێڕانەوەیەکا: جا ڕووی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ڕقا ڕەنگی گۆڕاو بە ئوسامەی فەرموو: چۆن تکا دەکەی کە حەددێ خودا داینابێ جێ بەجێ نەکرێ؟ ئوسامەش کەدی حەزرەت بەقسەکەی ئەوەندە قەڵس بوو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخودا داوا بکە بۆم کە لەم گوناهەم خۆش ببێ، فەرمووی: لەپاشا لەسەر فەرمانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی ژنەکەیان بڕی.

**٣٥١- سەراوکردن لەم شوێنانەداناباشە لەسەر چەقی ڕێگەداو لەسێبەری دانیشتنی خەڵکاو لەسەر سەرچاوەو ناو خۆرگەو ئەمانەدا**
**باب النهي عن التغوط في طريق الناس وظلهم وموارد الماء ونحوها**

قال الله تعالى: {والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتسبوا فقد احتملوا بهتاناً وإثماً مبيناً}.

ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزە لەم شوێنەدا ڕابوورد: ⇦ (ب/١ ز/٤٨ ئایەتی یەکەم = ل/٣٠٣ چاپی دووەم).

١/ ١٧٧١- وَعَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)أَنَّ رَسُول اللَّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قَالَ: (اتَّقُوا اللَّاعِنَيْن) قَالُوا ومَا اللَّاعِنَانِ؟ قَالَ: (الَّذِي يَتَخَلَّى في طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ في ظِلِّهِمْ) رواه مسلم[٢٣٦].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دوو شت دەبن بەهۆی نەفرینو لەعنەت لەو کەسە کە دەیانکات لەو دووشتە خۆتان بپارێزن. گوتیان! قوربان! ئەو دوو شتە چیو چین؟ فەرمووی: یەکێکیان ئەوەیە کە کەسێ لەسەرە ڕێی مەردوم دا پێشاوو سەراو بکا، ئەوەکەی تریشیان ئەوەیە کە کەسێ لە سێبەری حەوانەوەی خەڵکا سەراو بکا (م).

---

[٢٣٥] موسلیم (١٣٧).
[٢٣٦] موسلیم (٢٦٩).

### ٣٥٢- میزکردنە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە ناباشە
### باب النهي عن البول في الماء الراكد

١/١٧٧٢- عَنْ جَابِرٍ (رضي اللّه عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهَى أَنْ يُبَال في المَاءِ الرَّاكدِ. رواهُ مسلم[٢٣٧].

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **ڕێگەی نەدەدا کە کەسێ لەناو ئاوی ڕاوەستاودا گمێز بکا (م).**

### ٣٥٣- باش نییە کە دایکو باوک بێهۆیەکی ڕەوا، جیاوازی بکەن لەنێوان منداڵەکانیان دا لە بەخشش دا
### باب كراهة تفضيل الوالد بعض أولاده على بعض في الهبة

١/١٧٧٣- عَنِ النُّعْمَان بْنِ بَشِيرٍ رضِيَ اللّه عنْهُمَا أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ رَسول اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فقَالَ: إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هذا غُلاماً كَانَ لي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحلْتَهُ مِثْلَ هَذا؟» فَقَال: لا، فقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (فأَرْجِعْهُ). وفي روايَةٍ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أَفَعَلْتَ هَذا بِولَدِكَ كُلِّهِمْ؟) قَالَ: لا، قَالَ: (اتَّقُوا اللَّه واعْدِلُوا فِي أَوْلادِكُمْ) فَرَجَعَ أَبِي، فَردَّ تلْكَ الصَّدَقَةَ. وفي روَايَةٍ: فَقَال رسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (يَا بَشِيرُ أَلَكَ وَلَدٌ سِوَى هَذا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَال: (أَكُلَّهُمْ وَهَبْتَ لَهُ مِثْلَ هَذا؟) قَالَ: لا، قالَ: (فَلا تُشْهِدْني إِذاً فَإِنِّي لا أَشْهَدُ عَلى جَوْرٍ). وَفي روَايَةٍ: (لا تُشْهِدْني عَلى جَوْرٍ). وفي روايَةٍ: (أَشْهِدْ عَلى هذا غَيْري،) ثُمَّ قَالَ: (أَيَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا إِلَيْكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً؟) قَالَ: بلى، قَالَ: (فَلا إِذاً) متفقٌ عليه[٢٣٨].

**نوعمانی کوڕی بەشیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: باوکم هەڵی گرتمو بردمی بۆلای پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ بەشایەت بە کەوا بەندەیەکم هەیە دەیبەخشم بە نوعمانی کوڕم، حەزرەت فەرمووی: ئایا هەموو منداڵەکانی تریشت بەقەد ئەمت پێ بەخشیون؟ باوکم گوتی: نەخەیر، حەزرەت فەرمووی: دەڵێی بسەنەوە.**

---

[٢٣٧] موسلیم (٢٨١).

[٢٣٨] بوخاری (٢٥٨٦) موسلیم (١٦٢٣).

لەگێڕانەوەیەکا حەزرەت فەرمووی: دەی باشە هەموو منداڵەکانت ئەمەندەت داونەتێ؟ گوتی: نەء، فەرمووی: دەی لەخودا بترسن و بەیەك چاو تەماشای هەموو منداڵەکانتان بکەن ئیتر باوکم لە خێرەکەی پەشیمان بوەوەو کردیەوە بەماڵی خۆی.

لەگێڕانەوەیەکا: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی بەشیر! گوتی: ئەرێ. فەرمووی: هەرکەسەی بەقەد ئەمت پێ بەخشیون؟ گوتی: نەء، فەرمووی: دەی کەواتە من مەکە بەشایەت چونکە نابم بەشایەتی ناهەق و شایەتی لەسەر زۆرو ستەم نادەم. لەگێڕانەوەیەکا: شایەتی ناهەق بەمن مەدە. لەگێڕانەوەیەکا: دە کەسێکی تر بکە بە شایەتی ئەمە، من شایەتی وا نادەم لەپاشا فەرمووی: ئەی حەزیش دەکەی کە هەموویان وەك یەك بۆت باش بن؟ گوتی بەڵێ، فەرمووی: کەواتە نابێ (ش).

### ٣٥٤- نادروستە کەژن لەسێ رۆژ زیاتر ماتەم بۆ مردوو بگرێ، مەگەر بۆ مێرد، کە بۆ مێرد دەبێ چوار مانگ و دەشەو تازیباری بێ - باب تحريم احداد المراة على ميت فوق ثلاثة أيام إلا على زوجها أربعة أشهر وعشرة أيام

١٧٧٤/١ – عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْهُمَا قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْهَا زَوْجِ النبيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)حِينَ تُوُفِّي أَبُوها أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ (رضي اللّه عنه)، فدَعَتْ بِطِيبٍ فِيهِ صُفْرَةُ خَلُوق أَوْ غَيْرِهِ، فدَهَنَتْ مِنْهُ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْها. ثُمَّ قَالَتْ: وَاللّهِ مَالي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يقُولُ عَلى المِنْبَرِ: (لا يَحِلُّ لامْرأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاثِ لَيَال، إلاَّ عَلى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُر وَعَشْراً) قَالَتْ زَيْنَبُ: ثُمَّ دَخَلْتُ عَلى زَيْنَبَ بنْتِ جَحْشٍ رَضِيَ اللّهُ عَنْهَا حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا، فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ مِنْه، ثُمَّ قَالَتْ: أَمَا وَاللّهِ مَالي بِالطِّيبِ مِنْ حاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ عَلى المِنْبَرِ: (لا يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاثٍ إلاَّ عَلى زوجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً)). متفقٌ عليه[٢٣٩].

[٢٣٩] بوخاری (١٢٨٠) موسلیم (١٤٨٦، ١٤٨٧، ١٤٨٨، ١٤٨٩).

زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەبو سوفیان مرد، کە باوکی ئوممو حەبیبە بوو (ڕەزای خوایان لێ بێ) کە ئوم حەبیبە هاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خوای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە چوم بۆ لای ئوم حەبیبە، ڕوانیم ئوم حەبیبە داوای بۆنێکی گیراوەی کرد، کەمێ زەعفەرانی تیادا بوو، جا هەردوو دەستی کرد بەناویاو ئینجا دەستەکانی هێنا بەسەری کەنیزەکەکەدا، تا دەستی بۆنی کەمی پێوە بمێنێ، ئینجا دەستی سووی بەهەردوو لای ڕوومەتی خۆیاو بۆنی دا لەخۆیو تازێی شکاندو گوتی: بەو خودایەی کەهەر خۆی خودایە هیچ کارێکم بە بۆنی خۆش نییە، بەلام لەبەر ئەوە بەکاری دەهێنم چونکە لەپێغەمبەرم ژنەوت لەسەر دوانگە دەیفەرموو: ئەو ژنەی کە باوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە دروست نییە بۆی کە لەسێ ڕۆژ پتر ماتەم بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کە دەبێ بۆ ئەو چوار مانگو دەشەو تازێبار بێ.

زەینەب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای زەینەبی کچی جەحشیش بەبۆنەی مردنی براکەیەوە، دیم کە ئەویش داوای گولاوی کردو دای لەخۆیو گوتی: بەخوا هیچ کارێکم بەبۆنی خۆش نییە، بەلام لەبەر ئەوە بەکاری دەهێنم چونکە بۆ خۆم لەپێغەمبەرم بیست لەسەر مینبەر دەیفەرموو: ئەو ژنەی کە ئیمانو باوەڕی بەخوداو بەحسێبو لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی هەیە دروست نییە بۆی کە لەسێ ڕۆژ زیاتر تازێ بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کە دەبێ بۆ ئەو چوار مانگو دەشەو تازێبار بێ (ش).

**٣٥٥- نادروستە کەشاریی شت بۆ لادێی بفرۆشێو فێری گرانجانیی بکا، هەروەها چوون بەپیری کاروانییەوە، تا پێش ئەوەی کە بگەنە بازاڕ کالاکەیان بەهەرزان لێبکڕن، هەروەها سەودا لەسەر سەودای برای ئاینی خۆی، یا خوازبێنی لەسەر خوازبێنیی ئەو، مەگەر خۆی ڕێگەی بدا، یا وەلام درابێ**

١/١٧٧٥- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه)قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللّٰـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ وَإِنْ كَانَ أَخَاهُ لأَبِيه وَأُمِّهِ. متفق عليه[٢٤٠].

[٢٤٠] بوخاری (٢١٦١) موسلیم (١٥٢٣).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەوە کەشاری ببێ بەدەڵاڵی لادێییو شتی بۆ بفرۆشێ، باببرای دایکو باوکیشی بێ! (ش).

١٧٧٦/٢- وَعَنِ ابْنِ عَمَرَ قال: قالَ رَسول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا تَتلَقّوُا السلَع حَتَّى يُهْبَطَ بِهَا إلى الأَسْوَاقِ) متفقٌ عليه[٢٤١].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەچن بەپیری کاروانییەوە، تا پێشئەوەی کە بگەنە ناو بازاڕ کاڵاکەیان بەهەرزان لێبکرنو خۆتان بەگران بیفرۆشنەوە، بەڵام کە گەیشتە ناو بازاڕو نرخی ڕۆژی زانی ئیتر قەیناکا (ش).

١٧٧٧/٣- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰه عَنهُما قَالَ: (قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا تَتَلَقّوُا الرُّكْبَانَ، وَلا يبِعْ حَاضِرٍ لِبَادٍ)، فَقَالَ لَهُ طَاووسُ: ما (لا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبادٍ؟) قال: لا يكُونُ لَهُ سَمْسَاراً. متفقٌ عليه[٢٤٢].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەچن بەپیری کاروانییەوەو شاری شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ، تاووس بە ئیبنو عەبباسی فەرموو: شاریی شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ یانی چی؟ فەرمووی: مەبەست ئەوەیە کە نەبێ بەچاو ساغو دەڵاڵیو نەیهێڵێ کە شمەکەکەی بەنرخی ڕۆژ بفرۆشێ (ش).

١٧٧٨/٤- وَعَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ وَلا تَنَاجَشُوا ولا يبع الرَّجُلُ عَلى بَيْعِ أَخيهِ، ولا يخطبْ عَلى خِطْبَةِ أَخِيهِ، ولا تسْأل المرأةُ طلاقَ أختِهَا لِتَكْفَأَ مَا في إنَائِهَا.

وفي رِوَايَةٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)عَنِ التَّلقّي وأن يَبْتَاعَ المُهَاجِرُ لأَعْرابيٍّ، وأنْ تشْتَرِطَ المرْأةُ طَلاقَ أُختِهَا، وَأنْ يَسْتَام الرَّجُلُ عَلى سَوْمِ أخيهِ، ونَهَى عَنِ النَّجَشِ والتَّصْريةِ. متفقٌ عليه[٢٤٣].

---

[٢٤١] بوخاری (٢١٦٥) موسلیم (١٥١٨).
[٢٤٢] بوخاری (٢١٥٨) موسلیم (١٥٢١).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: نابێ شاریی شت بۆ لادێیی بفرۆشێ، کۆستە کۆستەو زەمی درۆ بۆ تەفرەدانی کڕیار مەکەنو سەودا لەسەر سەودای برای ئاپینی خۆتان مەکەن، وە دروست نییە بۆژن کەداوای تەڵاق دانی خوشکی ئاپینی خۆی بکا، تا ئەو بەتەڵاقدان بداو خۆی بەشوێنەکەی شادبێ! لە گێڕانەوەیەکا فەرمووی: حەزرەت ڕێگەی ئەمشتانەی نەدەدا، کەشاریی تا قەراغ شار بچێ بەپیری کاروانییەوە، یا شاریی ببێ بەدەڵاڵی لادێییو فێری گرانجانی بکا، یا ئافرەت مەرجی ئەوە دابنێ کەداوای تەڵاقی خوشکی ئاپینی خۆی بکا ئەوجا خۆی بەشوێنەکەی شادبێ، یا لەسەودادا زەم بکا بەسەر سەودای برای ئاپینی خۆی دا، یا کۆستە کۆستە بکا، یا چەند ژەمێ ئاژەڵ نەدۆشرێ، تا کڕیار وابزانێ کە ئاژەڵێکی بەشیرە (ش).

١٧٧٩/٥ - وَعنِ ابْنِ عُمَرَ رضي اللّه عَنهُمَا، أنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (لا يبعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بعْضٍ، ولا يَخْطُبْ على خِطْبةِ أخِيهِ إلاَّ أنْ يَأْذَنَ لَهُ) متفقٌ عليه، وهذا لَفظُ مسلم[244].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: سەودا بەسەر سەودای یەکتری دا مەکەن نابێ موسوڵمان خوازبێنی بەسەر خوازبێنیی برای ئاپینی خۆی بکا، مەگەر خوازبێنیکەری پێشوو وازبێنێ، یا ئەو ڕێگەی بدا (ش/تاج).

١٧٨٠/٦ - وَعَنْ عُقْبةَ بن عَامِرٍ (رضي اللّه عنه)أنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (المُؤْمِنُ أخُو المُؤمِن، فَلاَ يحِلُّ لِمُؤمِنٍ أنْ يبْتَاعَ عَلَى بَيْعِ أخِيهِ وَلاَ يَخْطِبْ علَى خِطْبَةِ أخِيه حتَّى يَذَر) رواهُ مسلم[245].

---

[243] بوخاری (٢١٤١) موسلیم (١٥١٥، ١١، ١٢).

[244] بوخاری (٢١٣٩) موسلیم (١٤١٢، ٥٠).

[245] موسلیم (١٤١٤).

عوقبەی كوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: موسوڵمان برای موسوڵمانە، کەواتە ڕەوانییە بۆ موسوڵمان کە سەودا بەسەر خوازبێنی برای ئایینی خۆی دا بکا، هەتا ئەو دەست هەڵدەگرێ (م).

**٣٥٦- ماڵدانان بەفیڕۆ، کە بەخت نەکرێ لەڕێگەڕەواکانا ڕێگە نەدراوە (باب النهي عن اضاعة المال في غير وجوهه التي أذن الشرع فيها)**

١/١٧٨١- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه) قَالَ: قَال رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إنَّ اللّٰه تَعَالَى يَرضي لَكُمْ ثلاثاً، وَيَكْرَه لَكُمْ ثَلاثاً: فَيَرضي لَكُمْ أنْ تَعْبُدوه، وَلا تُشركُوا بِهِ شَيْئاً، وَأنْ تَعْتَصِموا بِحَبْلِ اللّٰهِ جَمِيعاً وَلا تَفَرَّقُوا، ويَكْرهُ لَكُمْ: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤالِ، وإضَاعَةَ المَالِ) رواه مسلم، وتقدَّم شرحه[٢٤٦].

ئەم فەرموودەیە ریوایەتێکی تری لەپێشەوە لەم شوێنەدا رابورد:

⇨ (ب/١ ز/٤١ ژ/٥/٣٤٠) = ل/٢٧٢ چاپی دووەم.

وەلێ لێرەدا سەرەتاکەی ئاوایە، کۆتاییەکەشی دەق وەك پێشەوەیە، ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خودای گەورە لەم سێ شتەتان زۆر ڕازییە، یەکەم: ئەوەیە کە بەس تەنها خوای گەورە خۆتان بپەرستن، دووەم: ئەوەیە کە بەهیچ جۆرێ هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن، سێیەم: ئەوەیە کە بەکۆمەڵی دەست بەکەمەندی پتەوی خوای گەورە بگرن و هەموو بەبێ دوو بەرەکی پشتی ئایینی خودا بگرن.. مەندەی فەرموودەکە لەپێشەوە لەو شوێنەدا ڕابوورد.

٢/١٧٨٢- وَعَنْ وَرَّادٍ كَاتِبِ المُغِيرَةِ بن شُعْبَة قالَ: أمْلَى عَلَيَّ المُغِيرَةُ بنُ شُعبة في كتاب إلى مُعَاوِيَةَ (رضي اللّٰه عنه)، أنَّ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) كَانَ يَقُول في دُبُرِ كُلِّ صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ: (لاَ إلَهَ إلاّ اللّٰه وَحدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَله الْحَمْد وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ، اللّٰهُمَّ لاَ مانِعَ لِمَا أعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ) وَكَتَبَ إلَيْهِ أنَّهُ (كَانَ يَنْهَى عَنْ قِيل وقَالَ، وإضَاعَةِ المَالِ،

[٢٤٦] موسلیم (١٧١٥).

وَكَثْرةِ السُّؤَالِ، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقُوقِ الأمهَّاتِ، ووأْدِ الْبَنَاتِ، وَمَنْعٍ وهَاتِ) متفقٌ عَلَيْهِ، وسبق شرحه[٢٤٧].

⇦ (ب/١ ز/٤١ ژ/٣٤٠/٥) = ل/٢٧٢ چاپی دووەم.

لێرەدا لەپێشەوە ئاوایە:

وەڕاد کە میرزای موغیرە بوو فەرمووی: موغیرەی کوڕی نامەیەکی نوسی بۆ موعاوییە من بۆیم نوسی، ئەمەی پێم نوسی بۆی: یاسای حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) وابوو، لەدوا هەموو نوێژێکی فەرزەوە دەیفەرموو:

بێجگە لەخودا هیچ خودایەکی تر نییە، خودایەکی تاكو تەنهایە، هیچ هاوبەشێکی نییە، موڵكو دارایی‌و پاشایەتی‌و سەڵتەنەتو سوپاسو ستایش هەمووی بۆئەوە، وە ئەو خودایەکی وایە دەستی دەڕوا بەسەر هەموو شتێکاو تەواناى هەموو شتێکی هەیە پەروەردگارا! هەرچی تۆ بیدەیت بەکەسی تر نابڕێت، هەرچیش تۆ نەیدەیت بەکەسی تر نادرێت، دارایی داراو دەستداریی دەستدار هیچ دادێکیان نادا لەلای تۆ... مەندەی فەرموودەکە لەپێشەوە ڕابوورد.

**٢٥٧- ڕێگەنەدراوە کە چەكو شتی وا ناڕاستەی موسوڵمان بکرێ، نیتر بەڕاستبێ یا بە سوعبەت، یاخود شمشێر بەدەمی ڕووت بەدەستەوە بگیرێ**

**باب النهي عن الإشارة الى المسلم بسلاح ونحوه سواء كان جادا او مازحا والنهي عن تعاطي السيف مسلولا**

١٧٨٣/١ – عَن أبي هُرَيْرَة (رضي اللّٰه عنه)عَنْ رَسُول اللّٰـه (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قَال: «لاَ يشِرْ أحَدُكُم إلَى أخِيهِ بِالسِّلاَحِ، فَإنَّهُ لاَ يَدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْـزِعُ في يَدِهِ، فَيقَعَ في حُفْرَةٍ من النَّار) متفقٌ عليهِ.

وفي روَايةٍ لِمُسْلِمٍ قَالَ: قَالَ أبُو الْقَاسِمِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ أشارَ إلَى أخيهِ بِحَدِيدَةٍ، فَإنَّ المَلاَئكةَ تَلْعَنُهُ حتَّى يَنْزِعَ، وإنْ كَان أخَاهُ لأبِيهِ وأُمِّهِ)[٢٤٨].

---

[٢٤٧] بوخاری (٦٤٧٣) موسلیم (١٣٤١/٣ رقم/١٢).

[٢٤٨] بوخاری (٧٠٧٢) موسلیم (٢٦١٧).

قَوْلُهُ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (يَنْزِع) ضُبِطَ بالْعَيْنِ الْمُهْمَلَةِ مَعَ كَسْرِ الزَّاي، وبالْغَيْنِ الْمُعْجَمَةِ مع فتحِها ومعناهما مُتَقَارِبٌ، مَعْنَاهُ بِالْمَهْمَلَةِ يَرْمِي، وبالمُعجمَةِ أيْضاً يَرْمِي وَيُفْسِدُ، وَأَصْلُ النَّزْعِ: الطَّعنُ وَالْفَسَادُ.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەی موسڵمانینە! نە بەڕاستو نە بەدرۆ كەستان ڕووی چەك مەكەنە برای ئایینی خۆتان چونكە ڕێی تێ دەچێ كە شەیتان هەڵەیەكی پێ بكاو لەدەستی دەرچێو براكەی بپێكێو بەهۆی ئەوەوە، ڕەهەنەی ناو ئاگردانی دۆزەخ ببێ! (ش). لە گێڕانەوەیەكی موسلم دا گوتی: حەزرەت كە نازناوی پیرۆزی ئەبولقاسمە** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوەی بۆ تۆقاندنو ترساندن بەپارچە ئاسنێ هەڕەشە لەبرای ئایینی خۆی بكا، هەتا واز لەو كارە دێنێ، لەو ماوەیەدا خۆش خۆش فریشتەكان نەحلەتو نەفرینی لێدەكەن، گریمان ئەو هەڕەشە لێكراوە برای باوكو دایكیشی بێ كە گومانی خراپی لێ ناكرێ هەروەها.**

١٧٨٤/٢ –وَعَنْ جابر (رضي اللّه عنه)قَالَ:((نَهَى رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أنْ يُتَعَاطَى السَّيْفُ مَسْلُولاً)). رواهُ أبو داود، والترمذي وقال: حديثٌ حسَنٌ[٢٤٩].

**جابیر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **ڕێگەی نەداوە شمشێر بەدەمی ڕووت بگیرێ بەدەستەوە، یاخود هەڵگیرێ (د/ت: ح/ح).**

**٣٥٨- لەپاش بانگدان باش نییە كەس لە مزگەوت دەربچێ، تا نوێژەفەرزەكەی دەكا، مەگەر لەبەر بەهانەی ڕەوا**

**باب كراهة الخروج من المسجد بعد الأذان إلا لعذر حتى يصلي المكتوبة**

١٧٨٥/١ – عَنْ أبي الشَّعْثاءِ قال: كُنَّا قُعُوداً مع أبي هُرَيْرة (رضي اللّه عنه)في المسْجِدِ، فَأَذَّنَ المؤَذِّنُ، فقام رَجُلٌ مِنَ المسْجِدِ يَمْشِي، فَأَتْبعهُ أبُو هُريْرة بصَرهُ حتَّى خَرجَ مِنَ المسْجِدِ، فقَالَ أبُو هُريْرَةَ: أمَّا هَذَا فَقَدْ عصَى أبَا الْقَاسِمِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم). رواه مسلم[٢٥٠].

---

[٢٤٩] ئەبوداوود (٢٥٨٨) تیرمیزی (٢١٦٤).

[٢٥٠] موسلیم (٦٥٥).

ئەبو شەعثاء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژێ لە مزگەوت لەلای ئەبو هورەیرە دانیشتبوین، لەوکاتەدا کە بانگدەر بانگی دەدا بۆ نوێژی عەصر، پیاوێ لەناو مزگەوتەکە هەڵساو ڕۆیشت، ئەبو هورەیرە چاوی تێبڕی هەتا لە مزگەوتەکە دەرچووە دەرەوە ئەوجا فەرمووی: بەڵێ ئەم پیاوە بەم دەرچوونی ناوەختە، بەم کردەوە ناشیرینە، لەفەرمانی پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەرچوو (م).

**٣٥٩- دواوەدانی ڕێحانەو بۆنی خۆش خراپە، مەگەر لەبەر بەهانە**

١/١٧٨٦- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ رَيْحَانٌ، فَلا يَرُدَّهُ، فَإنَّهُ خَفيفُ المَحْمِلِ، طَيِّبُ الرِّيحِ) رواهُ مسلم[٢٥١].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر کەسێ ڕێحانەی پێ درا بانەی داتە دواوەو وەری بگرێ، چونکە هەڵگرتنی بارێکی گران نییەو شتێکی سووکەڵەو بۆن خۆشە! (م).

٢/١٧٨٧- وَعَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ (رضي اللّه عنه)أنَّ النبـيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ لا يَرُدُّ الطِّيبَ. رواهُ البُخاري[٢٥٢].

ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو بۆنی خۆشی نەدەدایە دواوە! (ب).

لەدەلیلولفالیحین دا شاریح دەفەرموێ: ئەو حەوت شتەی کە سوننەتە قبوڵ بکرێن ئەمانەن کە لەم شیعرەدا هۆنیومانەتەوەو دەڵێم:

والـرد يكـره يـا أخـا العرفـان
لـبن وحلـوى، طيـب، دهـن، وسـادة•
رزق لمحتـاج مـع الريحـان

---

[٢٥١] موسلیم (٢٢٥٣).

[٢٥٢] بوخاری (٢٥٨٢).

• لەبەحری کامیلە، لەبەر ناچاری کێش حەزفی حەرفی عەطف کراوە لە (طيب)و (دهن)و (وسادە) وە (طيب) و (دهن)یش مەنعی صەرفی لێکراوە لەبەرهەمان هۆ. (وەرگێڕ).

واته:

ماســـتو شـــیرینیو ڕۆن و ڕەیحانـــە
پشـــتیو بـــۆنی خـــۆش، نـــەو ڕزق و نانـــە
کـــە بـۆ ناتـاج بـێ، نـەم حـەو دیاریانـە
بەنـــەمری حـــەزرەت جێـــی قبوڵمانـــە

**٣٦٠- پەسنو تاریفی لەڕوو بۆکەسێ کە پێی بایی ببێ خراپە، بەڵام بۆکەسێ مەترسی خۆبایی بوونی لێنەکرێ دروستە - باب كراهة المدح في الوجه لمن خيف عليه مفسدة من اعجاب ونحوه، وجوازه لمن أمن ذلك في حقه**

١٧٨٨/١ – عَنْ أبي مُوسى الأشْعريِّ (رضي اللّه عنه)قَالَ: سَمِعَ النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)رَجُلاً يُثْني عَلَى رَجُلٍ وَيُطْرِيهِ فِي المدْحَةِ، فَقَالَ: (أهْلَكْتُمْ، أوْ قَطعْتُمْ ظَهرَ الرَّجُلِ) متفقٌ عليهِ. (وَالإطْرَاءُ): المُبالَغَةُ فِي المَدْحِ[٢٥٣].

ئەبو موسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەرگوێی کەوت وا پیاوێ وەسپی پیاوێ دەکاو هات بەتانو پۆیان، فەرمووی: ملی پیاوەکەتان شکاند یا فەرمووی: پشتی پیاوەکەتان شکاند! (ش).

١٧٨٩/٢ – وَعَنْ أبي بَكْرَة (رضي اللّه عنه)أنَّ رجُلاً ذُكِرَ عِنْدَ النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، فَأَثْنَى عَلَيْهِ رَجُلٌ خَيْراً، فَقَالَ النبيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (ويْحَكَ قَطَعْت عُنُقَ صَاحِبِكَ) يقُولُهُ مِرَاراً (إنْ كَانَ أحَدُكُمْ مَادِحاً لا مَحَالَةَ، فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ كَذَا وكَذَا إنْ كَانَ يَرَى أنَّهُ كَذَلِكَ، وَحَسِيبُهُ اللّه، ولاَ يُزَكِّي علَى اللّهِ أحَدٌ) متفق عليه[٢٥٤].

ئەبو بەکرە فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەر دا (دروودی خوای لەسەر بێ) باسی پیاوێ کرا، پیاوێکی تریش باسی وەسپو چاکیو باشی ئەوی کرد، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هاوار لەخۆم بۆتۆ، خۆت توشی چی کێشەیەكو بەرەیەك کرد، ئەستۆی هاوڕێکەتت شکاند چەند جارێ لەسەر

[٢٥٣] بوخاری (٢٦٦٣) موسلیم (٣٠٠١).

[٢٥٤] بوخاری (٢٦٦٢) موسلیم (٣٠٠٠).

یەك حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم وشەیەی دوبارەکردەوە، ئەوجا فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان هەرچاری نەبوو هەر ویستی وەسپی کەسێ بکا با بڵێ: وا دەزانم ئەو پیاوە، واوایەو ئەم چاکەو ئەو چاکەیەی تیادایە، ئەمەیش بەمەرجێ کە ئەو کابرایە ڕێی تێبچێ کە وەك دەڵێ وابێ ئیتر خودا بۆ خۆی ئاگای لە دڵیەتی‌و بەپێی نیازی دڵی پاداشی داوەتەوە بەڵام بەهیچ جۆرێ نابێ بڕیار بداو بڵێ فیسارەکەس لەلای خودا پاکە، چونکە شتی واتەنها خودا خۆی دەیزانێ (ش).

١٧٩٠/٣- وَعَنْ هَمَّامِ بنِ الْحَارِثِ، عن المِقْدَادِ (رضـي اللّـه عنـه)أنَّ رَجُـلاً جعَل يَمْدَحُ عُثْمَانَ (رضي اللّه عنه)، فَعَمِدَ المِقْدادُ، فَجَثَا عَلَى رُكْبَتَيْهِ، فَجَعَلَ يَحْثُو في وَجْهِهِ الْحَصْبَاءَ، فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَـالَ: إنَّ رَسُـولَ اللّـهِ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (إذَا رَأَيْتُمُ المَدَّاحِينَ، فَـاحْثُوا في وَجُـوهِهِمُ التُّـرابَ) رَوَاهُ مسـلم. فَهَذِهِ الأحَادِيثُ في النَّهْيِ، وَجَاءَ في الإبَاحَةِ أحَادِيثُ كثِيرَةٌ صَحِيحَةٌ[٢٥٥].

قَالَ العُلَمَاءُ: وَطَرِيقُ الجَمْعِ بَيْنَ الأحَادِيثِ أنْ يُقَالَ: إنْ كَانَ المَمْـدُوحُ عِنْـدَهُ كَمَالُ إيْمَانٍ وَيَقِينٍ، وَرِيَاضَةُ نَفْسٍ، وَمَعْرِفَة تَامَّةٌ بِحَيْثُ لا يَفْتَتِنُ، وَلا يَغْتَـرُّ بِـذَلِكَ، وَلا تَلْعَبُ بِهِ نَفْسُهُ، فَلَيْسَ بِحَرَامٍ وَلا مَكْرُوهٍ، وإنْ خِيفَ عَلَيْهِ شَيءٌ منْ هَذِهِ الأمُورِ كُرِهَ مَدْحُهُ في وَجْهِهِ كَرَاهَةً شَدِيدَةً، وعَلَى هَذَا التَّفْصِيلِ تُنزَّلُ الأحاديثُ المُختَلفَـة في ذَلِكَ. وَمِمَّا جَاءَ في الإبَاحَةِ قَوْلُهُ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)لأبي بَكْـرٍ (رضـي اللّـه عنه): (أرْجُو أنْ تَكُونَ مِنْهُمْ) أيْ: مِـنَ الَّـذِينَ يُـدْعَوْنَ مِـنْ جَمِيـعِ أبْـوابِ الْجَنَّـةِ لِدُخُولِهَا، وفي الحَدِيثِ الآخَرِ: (لَسْتَ مِنْهُمْ) أيْ: لَسْتَ مِنَ الَّذِينَ يُسْـبِلُونَ أُزُرَهُـمْ خُيَلاءَ. وَقَالَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)لِعُمَرَ (رضـي اللّـه عنـه): (مَـا رَآكَ الشَّـيْطَانُ سَالِكاً فَجّا إلاّ سلك فَجّا غَيْرَ فَجِّك)، وَالأحَادِيثُ في الإبَاحَةِ كَثِيرَةٌ، وَقَدْ ذَكَـرْتُ جُمْلَةً مِنْ أطْرَافِهَا في كتاب: (الأذْكَار).

هەممانی کوڕی حاریس فەرمووی: مقداد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە ڕوو، دەستی کرد بەمەتحی عوسمان (ڕەزای خوای لێ بێ) منیش چووم بۆلای‌و هاتم

[٢٥٥] موسلیم (٣٠٠٢، ٦٩).

بەسەر چۆك داو تۆزێ لەو خۆڵەم هەلگرتو وەشاندم بەڕووی کابرای مەتحکەردا عوسمان فەرمووی: ئەوە چیتە بۆ وادەکەی؟ میقداد فەرمووی: گوتم: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر ستایشخوێنان (مەدداحین)تان دی خۆڵ بکەن بەدەمو چاویان دا! (م).

نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم فەرمودانە لەبارەی قەدەغەکردنی مەتحی لەڕوو بوو فەرموودەی تر زۆرە، کە فەرموودەی راستو ساخنو ئەوە دەگەیەنن کە وەسپو مەتحی لەڕوو دروستە لەسەر ئەوە زاناکان (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەفەرموون: ڕێبازی ڕێکخستنو پێکەوە سازانیان ئاوایە: کە بگوترێ ئەوکەسەی کە لەڕوو وەسپی دەکرێ ئەگەر خاوەن باوەڕێکی پتەوی تەواو بوو، بەکۆششی زۆر دەرونی خۆیی دامراندبوو، نەفسی دنیایی مردبوو وە گەیبووە پایەی دڵنیاییو خوداناسی تەواو، لەبەر ئەوە مەترسی ئەوەی لێنەدەکرا کە بەو ستایشو تاریفە لەخۆی بایی ببێو کەیفی پێی ببێ ئەوە وەسپی جوانی ئاوا کەسێ لەڕوو دروستەو نە نادروستەو نە ناباشە، وەلێ ئەگەر مەترسی شتی وای لێدەکراو، لەوانەبوو کە بەو مەتحە گیرۆدە ببێ، یا بایی ببێ، یا نەفسی پێی خۆش بێ ئەوە مەتحی لەڕووی زۆر خراپو ناباشو ناپەسەندە.

ئیتر بەپێی ئەم درێژە پێدانە ئەو فەرمووده جیاجیایانە کەلەم بارەوە هاتون پیادە دەکرێن!

فەرموودەی وا کە ڕەوایی ستایشو تاریفکردنی لەڕوو دەگەیەنن زۆرن لەکتێبی (الأذکار)دا کۆمەڵەیەکی هەمە جۆرم لێیان باس کردووە. لێرانەش دا پەنجە بۆ ئەم چەند فەرموودەیە درێژ دەکەم، کە نیشانەی ڕەواییین.

وەك ئەوە حەزرەت ڕوو بەڕوو بە ئەبوبەکری فەرمووی: (أرجو أن تكون منهم): ئەم فەرموودەیە لەم شوێنەدا ڕابوورد (ب/٣ ژ/٢١٧ ژ/١٢١٦/٢/٢). یاوەك لەفەرموودەیەکی تردا پێی دەفەرموێ (لَستَ) واتە: تۆ ئەگەرچی چاکەکانت درێژو شۆڕن بەڵام بۆ فیزو دەعیە وایان لێناکەیتو دووریت لەوکەسانەی کە

**بۆ دەعیەو دەمار زلی خۆیان بەسەر زەوی دا بەکێش دەکەن. لەم جێگەیەدا ڕابوورد: (بەرگی/٢ ز/١١٩ ژ/٧١٩/٢/٢ ل/٢٧٩ چاپی دووەم).**

**لەفەرموودەیەکی تردا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەڕوو بە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (مارآك الشيطان سالكا فجا إلا سلك فجا غير فجك): واتە: ئەی عومەر! لەسایەی خوداوە تۆ بەهەر ڕێگەیەکا بڕۆیت شەیتان بەو ڕێگەیەدا ناڕواتو لەڕێگەیەکی ترەوە دەڕوا). فەرمایشتەکەی دانەر ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) تەواو بوو.**

### ٣٦١- لەکاتی داکەوتنی پەتا لەوڵاتێك دا، هەڵهاتن لەبەری ناباشە، هەروەها بەپیرەوە چوونیشی ناباشە
### باب كراهة الخروج من بلد وقع فيه الوباء فرارا منه، وكراهة القدوم عليه

قال اللّه تعالى: {أينما تكونوا يدرككم الموت ولو كنتم في بروج مشيدة} (النساء/٧٨).

**واتە: خوای گەورە دەفەرموێ: کەستان لەچنگی مەرگ قوتارتان نابێ، مردن دەردی بێدەرمانە، لەهەرکوێ بن دەتاندۆزێتۆ، گریمان لەناو چەند قەڵایەکی قایمی سەختی بڵنددا خۆتان حەشار بدەن لەوێش دەگاتە سەرتانو قورتمتان دەگرێو بەرەو جیهانێکی تر ڕاپێچتان دەکا.**

وقال تعالى: {ولا تلقوا بأيديكم إلى التهلكة} (البقرة/١٩٥).

**واتە: خۆتان بەدەستی خۆتان توشی تالووکەو سەرتیاچوون مەکەن.**

١٧٩١/١- وَعَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي اللّه عَنْهُمَا أنَّ عُمَر بْن الْخطّابِ (رضي اللّه عنه) خَرَجَ إلَى الشَّام حَتَّى إذَا كَانَ بِسَرْغَ لَقِيَهُ أُمَراءُ الأَجْنَادِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ وَأَصْحَابُهُ فَأَخْبَرُوهُ أنَّ الْوبَاءَ قَدْ وَقَعَ بالشَّامِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاس: فَقَالَ لي عُمَرُ: ادْعُ لي الْمُهاجرين الأَوَّلِينَ فَدعَوتُهم، فَاسْتَشَارهم، وَأَخبرَهُم أنَّ الْوبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّام، فَاختَلَفوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: خَرَجْتَ لأَمْرٍ، ولا نَرَى أنْ تَرْجِعَ عَنْهُ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ وَأصْحَابُ رسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، وَلا نَرَى أنْ تُقْدِمَهُم عَلَى هذا الْوبَاءِ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لي الأَنْصَارَ، فَدعَوتُهم، فَاسْتَشَارهمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ الْمُهاجرِين، وَاختَلَفوا كَاخْتلافهم، فَقَال: ارْتَفِعُوا عَنِّي،

ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لي مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَلَمْ يَخْتَلِفْ عليه مِنْهُمْ رَجُلانِ، فَقَالُوا: نَرَى أنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ وَلاَ تُقْدِمَهُم عَلَى هَذَا الْوَبَاءِ، فَنَادى عُمَرُ (رضي اللّٰه عنه) في النَّاسِ: إنِّي مُصْبِحٌ عَلَى ظَهْرٍ، فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ: فَقَال أَبُو عُبَيْدَةَ ابْنُ الجَرَّاحِ (رضي اللّٰه عنه): أَفِراراً مِنْ قَدَرِ اللّٰه؟ فَقَالَ عُمَرُ (رضي اللّٰه عنه): لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ، وكَانَ عُمَرُ يَكْرَهُ خِلافَهُ، نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللّٰه إلى قَدَرِ اللّٰه، أرأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ إبلٌ، فَهَبَطَتْ وَادِياً لَهُ عُدْوَتَانِ، إحْدَاهُمَا خَصْبَةٌ، والأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إنْ رَعَيْتَ الخَصْبَةَ رعَيْتَهَا بقَدَرِ اللّٰه، وإنْ رَعَيْتَ الجَدْبَةَ رعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللّٰه، قَالَ: فجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ (رضي اللّٰه عنه)، وَكَانَ مُتَغَيِّباً في بَعْضِ حَاجَتِهِ، فَقَال: إنَّ عِنْدِي مِنْ هَذَا عِلْماً، سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: (إذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ، فلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وإذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا، فَلا تَخْرُجُوا فِرَاراً مِنْهُ) فَحَمِدَ اللّٰهَ تَعَالَى عُمَرُ (رضي اللّٰه عنه) وَانْصَرَفَ، متفقٌ عليه. والْعُدْوَةُ: جانِبُ الْوادِي[٢٥٦].

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: عومەر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **کەوتە ڕێو چوو بۆشام، کە گەیشتە سەرغ لەوێ هەموو فەرماندارەکانی سەر گەورە شارەکانی شام هاتن بەپیریەوە کە بریتی بوون لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحو هاوڕێکانی، عەرزیان کرد کەوا تاعوون لەشام بڵاو بووەتەوە، جا عومەر فەرمووی بەمن: کۆچکارە پێشینەکانم بۆ بانگ بکە، منیش بانگم کردن، جا عومەر بۆ ئەم باسە ڕاوێژی پێکردن بەڵام قسەیان یەك نەبوو، هەندێکیان دەیان گوت: تۆ هاتووی بۆ کارێکی وا، لەبەر ئەوە بەباشی نازانین کە نەچیو بگەڕێیتەوە، هەندێکی تریان دەیان گوت: تۆ هاوڕێیانی پێغەمبەرو خەڵکی تریشت لەگەڵ دایە، لەبەرئەوە ئێمە بەباشی نازانین کە بیان بەیت بۆ ناو ئەم پەتایە، عومەریش فەرمووی: دەورم چۆڵکەن، ئینجا بەمنی فەرموو: (یاریدەدەران=أنصار)ەکانم بۆ بانگ کە، منیش بانگیانم کرد بۆی، ڕاوێژی بەوانیش کرد، ئەوانیش وەك کۆچکاران ڕایان یەك نەبوو، جا**

---

[٢٥٦] بوخاری (٥٧٢٩) موسلیم (٢٢١٩).

بەوانیشی فەرموو: دەورم چۆڵ کەن، ئینجا فەرمووی: کێ لێرەیە لە پیرەمێردانی قورەیش ئەوانەی کەلەکاتی ئازادکردنی مەککەدا کۆچیان کردووە، ئەوانەم بۆ بانگ کە، جا کە بانگم کردن سەرجەم گوتیان: ئێمە ڕامان وایە کە خەڵکەکە بگێڕێتەوە بۆ دواوەو نەیان بەیت بۆناو ئەم پەتایە، ئیتر عومەر جاڕی دا بەناو عەشاماتەکەدا کە سبەینێ سەر لەبەیانی سواردەبین‌و دەگەڕێینەوە بۆ مەدینە، ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: ئایا لەدەست چارەنووسی خودا هەڵدێین؟ عومەریش فەرمووی: ئەی ئەبو عوبەیدە! کاشکی کەسێکی تر ئەم قسەیەی بکردایە، عومەر حەزی نەدەکرد کە بێدڵی ئەبو عوبەیدە بکا، ئینجا فەرمووی: بەڵێ لەدەست چارەنووسی خودا ڕادەکەین بۆلای چارەنووسی خودا خۆی! ئەدی پێم بڵێ: ئەگەر تۆ ڕانێ وشترت هەبێ‌و بچێتە ناو دۆڵێکەوە کە دوو لاپاڵی هەبێ، لاپاڵێکیان بژوێن‌و ئەوەکەی تریان چەقەن‌و ڕەقەن بێ، جا ئەگەر ئەو ڕانە لەلاپاڵە بژوێنەکەدا بلەوەڕێنێت هەر بەچارەنووسی خودا نییە؟ فەرمووی: جا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف هات بەسەر ئەم مشت‌و مڕەدا کەلەوەپێش لەوێ نەبوو، چوو بوو بۆ هەندێ ئیشی خۆی ئەو هات فەرمووی: من شارەزاییم لەم باسە هەیە، لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: کاتێ بیستان کەوا تاعوون لەجێگەیێ بلاوبۆتەوە مەچن بۆ لای بۆ ئەوێ‌و بەپێی خۆتان مەچن بەپیریەوە، کاتێ لەو جێگەیەش بلاو بووەوە کە ئێوە لەوێن دەرمەچن لەوێ‌و لەدەستی ڕامەکەن، فەرمووی: ئیتر عومەر سوپاس‌و ستایشی خودای کردو گەڕایەوە بۆ مەدینەو سەفەرەکەی بڕی‌و نەچوو بۆ شام (ش).

٢/ ١٧٩٢ - وَعَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي اللّٰه عنه)عن النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (إِذَا سمِعْتُمْ الطَّاعُونَ بِأَرْضٍ، فَلاَ تَدْخُلُوهَا، وَإِذَا وقعَ بِأَرْضٍ، وَأَنْتُمْ فِيهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا مِنْهَا» متفقٌ عليهِ[٢٥٧].

[٢٥٧] بوخاری (٥٧٢٨) موسلیم (٢٢١٨).

**ئوسامە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کاتێ زانیتان کەوا تاعوون لەشوێنێ پەیدا بووە مەچن بۆ ئەوێ، کاتێ لەجێگەیێ تاعوون داکەوتو ئێوە لەوێ بوون لەو جێگەیە مەچنە دەرەوە (ش).**

**٣٦٢- جادووبازی زۆر نارەوایە** (**باب التغليظ في تحريم السحر**)

قال اللّٰه تعالى: {وما كفر سليمان ولكن الشياطين كفروا يعلمون الناس السحر} الآية.

**واتە: سولەیمان پێغەمبەری خودا بوو، پێغەمبەرانیش لەخوداوە مەعصومن‌و دوورە تاوانن، لەبەر ئەوە ئەوزاتە دوورە لەسیحرو جادوو، کە سیحر دەڤاودەق کوفری ڕووتە، بەڵام ئەوەی کە دەڵێن: سولەیمان جادووگەر بووەو لەجادوگەری دا مامۆستا بووە ئەوە درۆیە، شەیاتینی ئەوەیان دەکردو بەدرۆ دەیاندایە پاڵ سولەیمان‌و خۆیان بەوە کافر دەکرد.**

⇦ ١/١٧٩٣-٢٥٨ فەرموودەی: (واجتنبوا السبع الموبقات) بڕوانە: (بەرگی/٣ ز/٢٨٦ ژ/١/١٦١٤)[٢٥٨].

**٣٦٣- بردنی قورئان بۆ وڵاتی گاورستانی باش نییە ئەگەر مەترسی ئەوەی لێدەکرا کە بکەوێتە دەست دوژمنێکی وا کە ڕێزی بشکێنێ** (**باب النهي عن المسافرة بالمصحف الى البلاد الكفار إذا خيف وقوعه بأيدي العدو**)

١/١٧٩٤ – عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي اللّٰه عَنْهُمَا قَالَ: (نَهَى رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسَلّم)أنْ يُسَافَرَ بالقرآن إلَى أرْضِ الْعَدُوّ) متفقٌ عليه[٢٥٩].

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **نەهی کردوە کە قورئان ببرێ بۆ خاکی دوژمن (ش).**

---

[٢٥٨] بوخاری (٢٧٦٦) موسلیم (٨٩).

[٢٥٩] بوخاری (٢٩٩٠) موسلیم (١٨٦٩).

## ٣٦٤- بەكارهێنانی حاجەتی زێڕو زیو نادروستە
## باب تحريم استعمال اناء الذهب وإناء الفضة في الأكل والشرب والطهارة وسائر وجوه الإستعمال

⇦ ١٧٩٥/١- فەرموودەی: (الذي يشرب في آنية الفضة) ژ/٧٧٨/٥ = بەرگی/٢ ل/٢٧٢ ز/١١٦[٢٦٠].

⇦ ١٧٩٦/٢- فەرموودەی: (نهانا عن الحرير والديباج) بڕوانە: ژ/٧٧٧/٤ ز/١١٦ = بەرگی/٢ ل/٢٧٢)[٢٦١].

١٧٩٧/٣- وعَنْ أنس بن سِيرِينَ قال: كنْتُ مَع أنَسِ بن مالك (رضي اللّه عنه)عِنْد نَفَرٍ مِنَ المجُوسِ، فَجِيءَ بفَالُودَجٍ عَلى إنَاءٍ مِنْ فِضَّةٍ، فَلَمْ يأكُلْهُ، فَقِيلَ لَهُ حوِّلْهُ فحوَّلَه عَلى إنَاءٍ مِنْ خَلَنْج، وجِيءَ بِهِ فأَكَلَهُ. رواه البيهقي بإسْنادٍ حَسنٍ. (الخَلَنْجُ): الجَفْنَة[٢٦٢].

ئەنەسی كوڕی سيرين فەرمووی: لەلای ئەنەسی كوڕی ماليك دا بووم، لەگن تاقمێ مەجوسی دا بووين، لەحاجەتی زيودا فالۆزەيان هێنا، ئەنەس نەيخوارد، گوترا بەكابرا: بيكەرە شتێكی ترەوە. ئەويش چوو كرديە گلێنەيەكەوەو هێنايەوە ئينجا ئەنەس خواردی.

## ٣٦٥- بۆ پياو لەبەركردنی جلی زەعفەراناوی نادروستە
## باب تحريم لبس الرجل ثوبا مزعفرا

١٧٩٨/١- عَنْ أنسٍ (رضي اللّه عنه)قالَ: نَهَى النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أنْ يَتزَعْفَر الرَّجُلُ. متفقٌ عليه[٢٦٣].

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدا كە پياو بەزەعفەران خۆی بۆنخۆش بكا، يا جلو لەشی خۆی پێ ڕەنگ بكا. (ش).

---

[٢٦٠] بوخاری (٥٦٣٤) موسليم (٢٠٦٥).

[٢٦١] بوخاری (٥٦٣٣) موسليم (٢٠٦٧).

[٢٦٢] سنن البيهقی (٢٨/١).

[٢٦٣] بوخاری (٥٨٤٦) موسليم (٢١٠١).

١٧٩٩/٢- وعنْ عبدِ اللّٰه بنِ عَمْرو بن العاص رضي اللّٰه عَنْهُمَا قالَ: رأى النبيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)عَلَيَّ ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرين فَقَال: (أُمُّكَ أمَرَتْكَ بهذا؟) قلتُ: أغْسِلُهُمَا؟ قال: (بلْ أحْرِقْهُما». وفي روايةٍ، فقال: (إنَّ هذا منْ ثِيَابِ الكُفَّار فَلا تَلْبَسْهَا) رواه مسلم[٢٦٤].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ دوو جلکم لەبەردابوو، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) کەبینی فەرمووی: ئەم جلە ژنانەیە چییە لەبەرتا؟ دیارە ئەمە دایکت پێی گوتویت کە ئەمە بپۆشی؟ گوتم: دەیان شۆم، فەرمووی: بەڵکوو بیان سوتێنە. لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی: ئەمە بەرگی ناموسوڵمانەکانە لەبەری مەکە (م).

### ٣٦٦- مانگرتن لەقسەکردن بەڕۆژ هەتا شەو ناباشە
### باب النهي عن صمت يوم الى الليل

١٨٠٠/١- عَنْ عليّ (رضي اللّٰه عنه)قالَ: حَفِظْتُ عَنْ رَسُول اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (لا يُتْمَ بَعْدَ احْتِلامٍ، وَلا صُمَاتَ يَوْمٍ إلى اللَّيْلِ) رواه أبو داود بإسناد حسن.

قالَ الخَطّابي في تفسيرِ هذا الحديثِ: كَانَ مِنْ نُسُكِ الجاهِلِيَّة الصّمَاتُ، فَنُهُوا في الإسْلامِ عَنْ ذلكَ، وأُمِرُوا بِالذِّكْرِ وَالحَدِيثِ بالخَيْرِ[٢٦٥].

عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەزرەت خۆیەوە ئەم فەرموودەیەم لەبەر کردووە: لەپاش باڵقبون هەتیوی نامێنیٚ و منداڵ کە لەخەودا شەیتانی بوو لەهەتیوی دەردەچیٚ، مانگرتنیش لەقسەکردن، بەڕۆژ هەتا ئێوارێ وەك لەسەردەمی نەزانی دا ئەمەیان بەڕۆژو دادەنا، شتی وا لە ئیسلام دا نییە. (د-س/ح).

---

[٢٦٤] موسلیم (٢٠٧٧، ٢٨).

[٢٦٥] ئەبوداوود (٢٨٧٣).

٢/ ١٨٠١- وعَنْ قيس بن أبي حازِمٍ قالَ: (دَخَلَ أَبُو بكـرٍ الصِّـدِّيقُ (رضـي اللّٰه عنه)على امْرَأَةٍ مِنَ أَحْمَسَ يُقَالُ لَهَا: زَيْنَبُ، فَرَآهَا لا تَـتَكَلَّمُ. فقـالَ: (مَالَهَـا لا تَتَكَلَّمُ)؟ فقالُوا: حَجَّتْ مُصْمِتَةً، فقالَ لَهَا: (تَكَلَّمِي فَإِنَّ هذا لا يَحِلُّ، هذا منْ عَمَلِ الجَاهِلِيةِ))، فَتَكَلَّمَت. رواه البخاري[٢٦٦].

قەیسی کوڕی ئەبو حازیم فەرمووی: ئەبو بەکری صدیق کە خەلیفە بوو، چوو بۆ دێنی ئافرەتێکی ئەحمەسی، ناوی زەینەب بوو، سەیری کرد قسەناکا، فەرمووی: ئەوە چیەتی بۆچی قسەناکا؟ گوتیان: حەجی دابەستووەو ئاهی کردووە تا حەجەکەی تەواو دەبێ قسەنەکا، ئیتر پێی فەرموو: قسە بکە، چونکە ئەم قسەنەکردنە دروست نییە، ئەمە ڕەفتاری سەردەمی نەزانییە، ئیتر ژنەکە قسەی کرد (ب).

**٣٦٧- دروست نییە کە مرۆڤ بنەچەو ڕەچەڵەکی خۆی بگۆڕێ‌و خۆی بکا بە ڕۆڵەی کەسێکی تر، یا بەندەو کەنیز حاشا لەئاغای خۆیان بکەن‌و کەسێکی تر بکەن بەسەروەری خۆیان**

**باب تحريم انتساب الإنسان الى غير ابيه وتوليه غير مواليه**

١٨٠٢/١- عَنْ سَعْدِ بن أبي وقَّاصٍ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ النبـيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالَ: مَن ادَّعَى إلى غَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ فَالجَنَّةُ عَلَيهِ حَرامٌ). متفـقٌ عليهِ[٢٦٧].

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ بنەچەی خۆی بگۆڕێ‌و خۆی بکا بە ڕۆڵەی غەیری باوکی خۆی، وە سوور بشزانێ کە ئەوە باوکی ئەو نییە، ئەوە بەهەشتی لێقەدەغەیە (ش).

١٨٠٣/٢- وعن أبي هُرِيْرَة (رضي اللّٰـه عنـه)عَـن النبــيِّ (صَـلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قَالَ: (لا تَرْغَبُوا عَنْ آبائِكُمْ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ أبيهِ فَهُوَ كُفْرٌ) متفقٌ عليه[٢٦٨].

---

[٢٦٦] بوخاری (٣٨٣٤).

[٢٦٧] بوخاری (٦٧٦٦) موسلیم (٦٣).

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لەحەزرەتـەوە دەفـەرموێ** (دروودی خوای لەسەر بێ)**: بێـز لەباوك و باپیری خۆتان مەكەنەوە، حاشایان لێمەكەن، ئەوەی حاشا لـەباوك و باوانی خۆی بكا ئەوە كفرە (ش).**

٤/٣ ١٨٠ –وَعَنْ يزيدَ شريك بن طارق قالَ:رَأَيْتُ عَلِيًّا (رضي اللّٰه عنه)عَلى المِنْبَرِ يَخْطُبُ،فَسَمِعْتهُ يَقُولُ:لا واللّٰهِ مَا عِنْدَنَا مِنْ كتاب نَقْرؤهُ إلاّ كتاب اللّٰه، وَمَا في هذِهِ الصَّحِيفَةِ، فَنَشَرَهَا فَإذا فِيهَا أَسْنَانُ الإبلِ، وَأَشْيَاءُ مِنَ الجِرَاحات، وَفيهَا: قَالَ رَسولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): المدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إلى ثَوْر، فَمَنْ أحْدَثَ فيهَا حَدَثاً، أوْ آوَى مُحْدِثاً، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللّٰهِ والمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أجْمَعِينَ، لا يَقْبَلُ اللّٰه مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَة صَرْفاً وَلا عَدْلاً، ذِمَّةُ المُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ، يَسْعَى بِهَا أدْنَاهُمْ، فَمَنْ أخْفَرَ مُسْلِماً، فعليْهِ لَعْنَةُ اللّٰه والمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أجْمَعِينَ، لا يَقْبَلُ اللّٰه مِنْهُ يَوْم الْقِيامَةِ صَرفاً ولا عدْلاً. وَمَنِ ادَّعَى إلى غَيْرِ أبيهِ، أو انتمَى إلى غَيْرِ مَوَاليهِ، فعلَيْهِ لَعْنَةُ اللّٰه وَالملائِكَةِ وَالنَّاسِ أجْمَعِينَ، لا يقْبَلُ اللّٰه مِنْهُ يَوْمَ الْقِيامةِ صَرْفاً وَلا عَدْلاً). متفقٌ عليه.

**یەزیدی كوڕی شەریكی كوڕی تاریق فەرمووی: عەلیم بینی لەسەر دوانگە دوانی دەدا، بەگوێی خۆم گوێم لێی بوو دەیفەرموو: نەبەخودا شتی وانییە، كە گوایە ئێمە كە كەسوكاری پێغەمبەرین نامەیەكی تایبەتیمان لەلاهەیە كە بۆخۆمان دەیخوێنین، هەركەسێ گومانی وابێ درۆ دەكا، ئەوەی كەلەلای ئێمەشە وەك تێكڕای موسوڵمانان بەس قورئانی پیرۆزە كە نامەی خودایە، تەنها ئەمە نەبێ كە لەم تۆمارەدایە، جا كە تۆمارەكەی بڵاوكردەوە ئەمانەی تیا نوسرابوو: باسی تەمەنی ئەو وشترانەی كە دەدرێن بە تۆڵەی خوێن دا، وەهەروەها باسی چەند بابەتێكی تری زام و زامكاریی (جراحات)ی تیا بوو، وە ئەمەشی تیا بوو: كە خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: مەدینە لەنێوانی كێوی عەیرەوە هەتا كێوی ثەور بەست و حەرەمە، جا هەركەسێ كارێكی ناڕەوای تیا بەرپا بكا، یا پیاو خراپێكی تیا پەنا بدا،**

---

[٢٦٨] بوخاری (٦٧٦٨) موسلیم (٦٢).

نەحلەتو نەفرینی خوداو فریشتەکانو ئەو خەڵکەی هەموو لەسەربێ، لەڕۆژی قیامەتیش دا خودا نەفەرزو نە سوننەتی لێ قبوڵ ناکا، موسوڵمانان بۆ پەیمانی ئاماندان بەکافران، هەموویان چونیەکنو گەورەو بچوکیان تەنانەت هەرە خوارینەکەشیان مافی ئاماندانیان هەیە، بەمەرجی خۆی بەهەر کافرێ دەیانەوێ، جا هەرکەسێ پەیمانی ئامانی موسوڵمانێ تێك بدا نەحلەتو نەفرینی خوداو فریشتەو خەڵکەکەی هەموو لەسەربێ، لەڕۆژی قیامەت دا خودا نەفەرزو نە سوننەتی لێگیرا ناکا، وە نەفرینو نەحلەتی خوداو فریشتەو ئادەمیزاد هەموو لەسەر ئەوکەسەبێ کە حاشا لەباوکی خۆی دەکاو خۆی دەکا بە نەتەوەی پیاوێکی تر، وە یابەندەو کەنیزبووبێو ئاغای ئازادی کردبێو کەچی حاشا لەئاغای سەروەری خۆی بکاو یەکێکی تر بکا بەئاغای سەروەری خۆی، ئەم جۆرە کەسە لە رۆژی قیامەت دا خودا نەفەرزو نەسونەتییان لێگیرا ناکا (ش=ب+م = بوخاریو موسلیم (رەزای خوایان لێ بێ)).

٤/ ١٨٠٥- وَعَنْ أبي ذَرّ (رضي اللّٰه عنه)أنَّهُ سَمِعَ رسولَ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (لَيْسَ منْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أبيهِ وَهُوَ يَعْلَمُهُ إلاَّ كَفَرَ، وَمَن ادَّعَى مَا لَيْسَ لهُ، فَلَيْسَ مِنَّا، وَلْيَتَبوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّار، وَمَنْ دَعَا رَجُلاً بِالْكُفْر، أوْ قَالَ: عدُوَّ اللّٰه، وَلَيْسَ كَذلكَ إلاَّ حَارَ عَلَيْهِ) متفقٌ عليهِ، وَهَذَا لفْظُ روايةِ مُسْلِمٍ[٢٦٩].

ئەبو زەڕ (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: هەرپیاوێ حاشا لەباوکی خۆی بکاو خۆی بکا بە نەتەوەی پیاوێکی تر، سوریش بزانێ کە ئەوە باوکی ئەو نییە، ئەوە کفرە، وە هەرکەسێ بەلافو گەزاف شتێ بکا بەهی خۆیو هی ئەویش نەبێ لەئێمە نییەو شتی وا لەموسوڵمان ناوەشێتەوە، وە باجێ قنگی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخ دا ئامادە بکا، وەکەسێ بەپیاوێ بڵێ: ئەی کافر یا پێی بڵێ: ئەی دوژمنی خودا وەك ئەو دەڵێ وانەبێ، ئەوە ئەو قسەیە دەچێتەوە بۆخۆی (ش).

[٢٦٩] بوخاری (٦٧٥٥) موسلیم (١٣٧٠).

**٣٦٨- هەڕەشەکردن لەکردنی ئەوەی خودای گەورە پێغەمبەری خودا کردنیان قەدەغە کردووە - باب التحذير من ارتكاب ماهي الله عزوجل أو رسوله (صلى الله عليه وسلم) عنه**

قال اللّٰه تعالى: {فليحذرِ الذين يخالفون عن أمره أن تصيبهم فتنة أو يصيبهم عذاب أليم}.

واتە: ئەوکەسانە کە سەرپێچی لەفەرمانی حەزرەت دەکەن با چاو بکەنەوە هۆشیار ببنەوەو خۆیان بپارێزن لەوە کەلەدنیا دا، بەهۆی ئەو سەرپێچییەوە، توشی ئاشوبێ ببن، یا لەرۆژی قیامەتا بەرەنگاری سزای سەخت ببنەوە.

⇨(ب/١ ز/٥٠ = بەرگی/١ زنجیرە/٥٠ ل/٣٠٩).

⇨١٨٠٦/١- فەرموودەی: (أن الله يغار...) بڕوانە: ز/٦٤/٥ ب/١ ل/٧٨ ز/٥)[٢٧٠].

**٣٦٩- کەسێ شتێکی نارەوای قەومان چی بلێ باشە**
**باب مايقوله ويفعله من ارتكب منهيا عنه**

قال اللّٰه تعالى: {وإما ينزغنك من الشيطان نزغ فاستعذ بالله} (الأعراف/٢٠٠).

واتە: ئەی خۆشەویست تۆ ڕەهبەرو پێشەواو سەرمەشقی گەلی ئیسلامی لەم ڕوانگەوە گەلێ جار خودا ڕووی فەرمایشت لەتۆ دەکا، بەڵام مەبەست پێی ئوممەتەکەتە، دەی چ خۆت چ پەیڕەوانت هەرکاتێ شەیتان فرسەتی زانیو تێوەی ژەندنو توشی دالغەو خەیالاتی نابەجێی کردنو دنەی دان لەسەر خراپە گورج پەنا بگرن بەخوداو بەدەمو بەدڵ بڵێن: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پەنا دەگرم بەخودا لەشەڕی شەیتانی بەشبڕاو لەڕەحمەتی خودا.

وقال تعالى: {إن الذين إذا مسهم طائف من الشيطان تذكروا فإذا هم مبصرون} (الأعراف/٢٠١).

---

[٢٧٠] بوخاری (٣٥٠٨) موسلیم (٦١).

واتـه: بەڕاستی ئەوکەسانەی کە تـرس‌و تـەقوای خـودای گـەورە بـووە بەپیشەی هەمیشەیان، هەرکاتێ بەدنەو هانەی شەیتان خـەیاڵێ لـە دەوریـان گـڕی خـوارد، گـورج بـیری بـەڵێن‌و هەڕەشـەکانی خـودای گـەورەو خۆیـان دەکەنەوەو پەنای بۆدەبەن‌و خـوداش زوو بـەزوو حاڵیـان لـە پەرێشانییەوە دەگۆڕێ بۆ شادمانی‌و چاوو دڵو دەرونیان ڕۆشن دەبێتەوەو هەق‌و ناهەقیان بۆ دەردەکەوێ!

وقـال تعـالی: {والـذين إذا فعلـوا فاحشـة أو ظلمـوا أنفسـهم ذكـروا اللّـه فاستغفروا لذنوبهم، ومن يغفر الذنوب إلا اللّه، ولم يصـروا علـى مـا فعلـوا وهـم يعلمون، أولئك جزاؤهم مغفرة من ربهم وجنات تجري من تحتها الأنهـار خالـدين فيها ونعم أجر العاملين} (آل عمران/١٣٥-١٣٦).

واتـه: ئـەو خـاوەن تەقوایانـە کـە حاڵیـان وایـە هـەرکاتێ کـارێکی شـەرم ئاوەری ناشیرینیان کرد، وەك زیناو داوێنپیسی‌و شتی وا کـە ناشایستەبێ، یـا ستەمیان لـەخودی خۆیـان کـرد، وەکـو گوناهـێ نەگاتـە ڕادەی فەحشـکاری‌و شـەرم ئـاوەری، بـیری قـاری خـودای گـەورە دەکەنـەوەو لـەخودا دەپاڕێنـەوەو داوای لێخۆشبوونی لێدەکەن‌و لەسەر کردەوە نابارەکەی خۆیان دەوام ناکـەن، بەڵکوو بەهیچ کلۆجێ توخنی ناکەونەوە، لەبەر ئەوە کە دەزانن ئەوە تاوان‌و گوناهـەو خـودا پێـی ناخۆشـە، وە لـە ڕاسـتی دا کـارێکی زۆر پیاوانـە دەکـەن کەداوای بەخشین لـەخودا دەکـەن، چونکە کـێ هەیـە کـەتاوان پـۆش بـێ بـۆ بەندەکان جگە لەیەزدانی میهرەبـان، ئـەو کەسانە کـە ئەمـە حاڵیانـە خـوای گـەورە خـەڵاتی لێبوردنیـان دەداتـێ‌و پاداشـتی چـاکیان دەداتـەوە بەچـەن بەهەشتێ کە جۆباری ئـاوی سـازگاری شـیرین بـەناو هۆدەکانیانـاو بـەبن دارو درەختـەکانیان دا ڕەوان دەبـێ، هـەتا هەتایـە بـەئێجگاری لـەو بەهەشـتانەدا بەخۆشی دەژین، بەڕاسـتی پاداشـتی جوانی خاوەن کـردەوە باشـەکان هـەروا دەبێ.

١٨٠٧/١- وعَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضيِ اللّـه عنـه)عَـن النبـيُّ (صَـلّي اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قال: (مَنْ حَلَف فَقَالَ في حلفِهِ: بِاللّاتِ والْعُزَّى، فَلْيقُلْ: لا إلَهَ إلاَّ اللّه ومَـنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ، تَعَالَ أقَامِرْكَ فَليتَصَدَّق)). متفقٌ عليه.

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **لەحەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەگەر کەسێکتان سوێندی خواردو لەسوێندەکەی دا گوتی: بەلاتو عوززا، بابڵێ: لا إله إلا الله. ئەو کەسەشی بەهاوڕێکەی بڵێ: وەرە با قومار بکەین، با خێری بکا لەکەفارەتی ئەو قسە پیسەدا. (ش).**

**٣٧٠- باسی پەخشانە جوانەکان قسە نەستەقەکان (كتاب المنثورات والملح)**

١٨٠٨/١- عَنِ النَّواس بنِ سَمْعانَ (رضي اللّٰه عنه)قـالَ: ذَكَـرَ رَسُولُ اللّٰـهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ، فَخفَّض فِيهِ، وَرَفَع حَتَّى ظَنَناه في طَائِفَـةِ النَّخلِ، فَلَمَّا رُحْنَا إِلَيْهِ، عَرَفَ ذلكَ فِينَا فقالَ: (مـا شـأنكم؟) قُلْنـا: يَارَسُولَ اللّٰـهِ ذَكَرْتَ الدَّجَّال الْغَدَاةَ، فَخفَّضْتَ فِيهِ وَرَفَعْتَ، حَتَّى ظَنَنَّاه في طَائِفةِ النَّخـلِ فقـالَ: (غَيْرُ الدَّجَال أخْوفَني عَلَيْكُمْ، إنْ يخْـرجْ وأنـآ فِـيكُمْ، فَأنَـا حَجِيجُـه دونَكُـمْ، وَإنْ يَخرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ، فكلُّ امريءٍ حَجيجُ نَفْسِهِ، واللّٰه خَليفَتِي عَلى كُلِّ مُسْلِم. إنَّه شَابٌّ قَطَطٌ عَيْنُهُ طَافِيَةٌ، كأنِّي أشَبِّهُه بعَبْدِ الْعُزَّى بن قَطَن، فَمَنْ أدْرَكَه مِنْكُمْ، فَلْيَقْرأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورةِ الْكَهْفِ، إنَّه خَارِجٌ خَلَّةً بَينَ الشَّامِ وَالْعِرَاق، فَعَاثَ يميناً وعَـاثَ شمالاً، يَا عِبَادَ اللّٰه فَاثْبُتُوا). قُلْنَا يا رسول اللّٰه ومَالُبْثُـه في الأَرْضِ؟ قـالَ: (أرْبَعُـون يَوْماً: يَوْمٌ كَسَنَةٍ، وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ، ويومٌ كجُمُعَةٍ، وَسَـائِرُ أَيَّامِـهِ كأَيَّـامِكُم). قُلْنـا: يـا رَسُول اللّٰه، فَذلكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَسَنَةٍ أتكْفِينا فِيهِ صلاةُ يَوْم؟ قال: (لا، اقْـدُرُوا لَـهُ قَدْرَهُ). قُلْنَا: يَارَسُولَ اللّٰهِ وَمَا إسْراعُهُ فِي الأَرْضِ؟ قالَ: (كالْغَيْث استَدبَرَتْه الـرِّيحُ، فَيأْتي على الْقَوْمِ، فَيَدْعُوهم، فيُؤْمنُونَ بِهِ، ويَسْتجيبون لَـهُ فَيـأمُرُ السَّـماءَ فَتُمْطِـرُ، والأرْضَ فَتُنْبِتُ، فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سارحتُهُم أطْوَلَ مَا كَانَتْ ذُرى، وَأسْـبَغَه ضُـرُوعاً، وأَمَدَّهُ خَواصِرَ، ثُمَّ يَأْتي الْقَوْمَ فَيدْعُوهم، فَيـرُدُّون عَلَيـهِ قَوْلـهُ، فَيَنصَـرِف عَـنهُمْ، فَيُصْبحُون مُمْحِلِينَ لَيْسَ بأيْدِيهم شَيءٌ مـنْ أمْـوالِهم، وَيَمُـرُّ بِالخرِبَـةِ فَيقـول لَهَـا: أخْرجي كُنُوزَكِ، فَتتْبَعُه، كُنُوزُهَا كَيعَاسِيب النَّحل، ثُمَّ يـدْعُو رَجُـلاً مُمْتلِئـاً شَـباباً فَيضْرِبُهُ بالسَّيْفِ، فَيَقْطَعهُ، جِزْلَتَيْن رَمْيَةَ الْغَرضِ، ثُمَّ يَدْعُوهُ، فُيُقْبِلُ، وَيَتهلَّلُ وجْهُـهُ يَضْحَكُ. فَبَينَما هُو كَذلكَ إذْ بَعَثَ اللّٰه تَعَالى المَسِيحَ ابْـنَ مَـريم (صَـلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)، فَيَنْزِلُ عِنْد المَنَارةِ الْبَيْضَـآءِ شَرْقيَّ دِمَشْقَ بَيْنَ مَهْرُودتَيْنِ، وَاضعاً كَفَّيْهِ عَلى

أجْنحةِ مَلَكَيْنِ، إذا طَأْطَأَ رَأسهُ، قَطرَ وإذا رَفعَهُ تَحدَّر مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤلُؤ، فَلا يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُّ ريحَ نَفَسِهِ إلاَّ مات، ونَفَسُهُ يَنْتَهِي إلى حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ، فَيَطْلُبُه حَتَّى يُدْرِكَهُ بَباب لُدّ فَيَقْتُلُه. ثُمَّ يأتي عِيسَى (عَلَيْهِ السلام) قَوْماً قَدْ عَصَمَهُمُ اللَّه مِنْهُ، فَيَمْسَحُ عَنْ وُجوهِهِمْ، ويحَدِّثُهُم بِدرَجاتِهم في الجنَّةِ. فَبينَما هُوَ كَذلِكَ إذْ أوْحَى اللَّه تَعَالى إلى عِيسى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أنِّي قَدْ أخرجتُ عِبَاداً لي لا يدان لأحَدٍ بقِتَالهِمْ، فَحَرِّزْ عِبادي إلى الطُّور، وَيَبْعَثُ اللَّه يَأْجُوجَ ومَأجوجَ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدبٍ يَنْسلُون، فيَمُرُّ أوائلُهُم عَلى بُحَيْرةِ طَبريَّةَ فَيَشْرَبون مَا فيهَا، وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فيقولُونَ: لَقَدْ كَانَ بهَذِهِ مرَّةً ماءٌ. وَيُحْصَرُ نبي اللَّهِ عِيسَى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وأصْحَابُهُ حَتَّى يكُونَ رأْسُ الثَّوْر لأحدِهِمْ خيْراً منْ مائةِ دِينَارٍ لأحَدِكُمُ الْيوْمَ، فيَرْغَبُ نبي اللَّه عِيسَى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وأَصْحَابُه، رضي اللَّه عَنهُمْ، إلى اللَّهِ تَعَالى، فَيُرْسِلُ اللَّه تَعَالى عَلَيْهِمْ النَّغَفَ في رِقَابِهِم، فَيُصبحُون فَرْسى كَموْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ، ثُمَّ يهْبِطُ نبي اللَّه عيسى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَأصْحابهُ رضي اللَّه عَنهُمْ، إلى الأرْضِ، فَلاَ يَجِدُون في الأرْضِ مَوْضِعَ شِبْرٍ إلاَّ مَلأهُ زَهَمُهُمْ وَنَتَنُهُمْ، فَيَرْغَبُ نبي اللَّه عِيسَى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَأصْحابُهُ رضي اللَّه عَنهُمْ إلى اللَّه تَعَالَى، فَيُرْسِلُ اللَّه تَعَالى طيْراً كَأعْنَاقِ الْبُخْتِ، فَتحْمِلُهُمْ، فَتطرَحُهم حَيْثُ شَاءَ اللَّه، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّه عَزَّ وجَلَّ مطَراً لا يَكِنُّ مِنْهُ بَيْتُ مَدَرٍ ولا وَبَرٍ، فَيَغْسِلُ الأرْضَ حَتَّى يَتْرُكَهَا كَالزَّلَقَةِ. ثُمَّ يُقَالُ لِلأرْضِ: أنْبِتي ثَمرَتَكِ، وَرُدِّي بركَتَكِ، فَيَوْمئِذٍ تأكُلُ الْعِصَابَةُ مِن الرُّمَّانَةِ، وَيستَظِلون بِقِحْفِهَا، وَيُبارَكُ في الرِّسْلِ حَتَّى إنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الإبلِ لَتَكْفي الفِئَامَ مِنَ النَّاس، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْبَقَرِ لَتكْفي الْقَبِيلَةَ مِنَ النَّاس، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْغَنمِ لَتكْفي الفَخِذَ مِنَ النَّاس.فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إذْ بَعثَ اللَّه تعالَى رِيحاً طَيِّبَةً، فتأْخُذُهم تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤمِنٍ وكُلِّ مُسْلِمٍ، وَيبْقَى شِرَارُ النَّاسِ يَتهَارجُون فِيهَا تَهَارُجَ الْحُمُرِ فَعَلَيْهِم تَقُومُ السَّاعَةُ» رواهُ مسلم[٢٧١].

---

[٢٧١] بوخاري (٤٨٦٠) موسليم (١٦٤٧).

نەواسی کوڕی سەمعان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سەر لەبەیانییەك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەدوورو درێژی باسی جەجاڵی بۆکردین، بە ڕەنگێکی وا وامان زانی کە ئێستا وا لەناو باخە خورماکان دا، جا سەر لەئێوارێ کە چوینەوە بۆ خزمەتی، هەستی کرد کە پەستی ئەو باسەین، لەبەر ئەوە فەرمووی: ئەوە چیتانە کەوا پەستو خەمبارن؟ عەرزیمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا تۆ سەرلەبەیانی بە دوورودرێژی باسی جەجاڵت بۆ کردین، تەنانەت لەئێمە وابوو کە هاتووەو والەناو باخە خورماکان دا، فەرمووی: من لە شتێکی تر پتر دەترسم کەزیانی هەبێ بۆ ئێوە هەتا لەجەجاڵ، ئەگەر جەجاڵ هەڵسا، وەخۆم مابووم لەناوتانا ئەوا من لەجیاتی ئێوە چاری دەکەم، ئەگەر لەپاش منیش هەڵسا ئەوا هەر کەسە چارەسەری خۆی بکا، سەرەڕای ئەمەیش خودا بۆ خۆی لەپاش من سەرەوکاری هەموو موسوڵمانێ دەکا لەجیاتی من، بزانن کە جەجاڵ لاوێکی قژ کرژی سەر ئاڵۆزکاوییە، چاوی تروسکە ناکا، بەلامەوە لەعەبدولعوززای کوڕی قەتەن دەچێ، جا هەرکەسێ لەئێوە توشی ئەوەبوو با دەئایەتەکەی سەرەتای سورەتی کەهفی بەسەردابخوێنێ، بەوە خودا دەیپارێزێ، جەجاڵ لەرێگەیەکەوە کە دەکەوێتە میانی عێراقو شامەوە پەیدا دەبێو دێ بۆگیانی ئێوە، وە بەڕاستو بەچەپا ئاژاوە دەنێتەوەو خراپە بەرپا دەکا، ئەی بەندەکانی خودا! خۆڕاگربن لەبەر باری خودادا گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا چەندێ لەجیهان دا دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: چل ڕۆژ ڕۆژێکیان بەقەد ساڵێکەو ڕۆژێکیان ئەوەندەی مانگێکەو ڕۆژێکی تریان ئەوەندەی هەفتەیەکەو ڕۆژەکانی تریشی وەك ئەم ڕۆژانەی ئێستای ئێوە وان ئاوا ڕۆژێکی ئاسایین، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو ڕۆژەی کە ئەوەندەی ساڵێکە، یا ئەو ڕۆژەی کە بەقەی مانگێکە، یا بەقەد هەفتەیەکە، ئایا نوێژی یەك ڕۆژی ئاسایی بەسی دەکا یانا؟ فەرمووی: نەء، بەڵکوو دەبێ بەئەندازەی خۆی ئەندازەی بگرنو هەموو بیستو چوار سەعاتێ پێنج نوێژی تیابکەنو هەر نوێژەی لەکاتی دیاریکراوی خۆی دا! گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا

خێرایی‌و سستی چۆنه لەکاتی گەڕانی دا بەناو وڵات دا؟ فەرمووی: زۆر خێرایە وەك بارانی دەم با وایە، وەك بارانێ لەپشتەوە با بیفڕێنێ ئاوا، دەچێتە سەر هەندێ هۆزو بانگیان لێدەکا، کە ئیمانی پێبهێنن، ئەوانیش باوەڕی پێدەکەن‌و بە گوێی دەکەن، جا ئەویش فەرمان دەکا بەئاسمان، ئاسمان باران دەبارێنێ، وە بەزەوی دەڵێ: زەوی شینایی دەڕوێنێ، ئیتر ئاژەڵ‌و ماڵاتیان هەتا بڵێی بەشەوق‌و بەشیرو تێرو تەسەل دەبێ، بەڵام دەچێتە سەر هەندێ هۆزی تر، وە داوایان لێدەکا کە باوەڕی پێبکەن، ئەوانیش بەپەرچی دەدەنەوە، ئەویش بەجێیان دەهێڵێ، کەچی لەپاش ئەو دەکەونە سەختڵەتی‌و قات‌و قڕی‌و گرانییەکی واوە کە هیچ ماڵ‌و سامانیان بەدەستەوە نامێنێ، جەجاڵ لەلای کەلاوەو کاولەوە ڕەت دەبێ‌و پێی دەڵێ: کەهەرچی گەنج‌و خەزنەیەك وا لەناوتا یەقی کەرەوەو فڕێیدە دەرەوە، جا ئەویش وا دەکاو ئیتر هەرچی خەزنەو گەنجی ناو ئەو کەلاوەیە هەیە وەك پوورەی هەنگ چۆن شوێنی شاکەیان دەکەون ئەویش ئاوا شوێنی ئەو دەکەوێ، لەپاشا پیاوێ کە لە هەرەتی لاوی دا دەبێ، گازی دەکاو بەشمشێر دوولەتی دەکاو بەقەد تیراوێژێ دوکەرتەکەی دەپەڕێ‌و لەیەکتری دوور دەکەونەوە!

ئینجا بانگی دەکا بۆلای خۆی‌و پیاوەکە زیندوو دەبێتەوەو بەڕوویەکی گەش‌و دەم بەزەردەخەنەوە دێتەوە بۆلای، ئیتر جەجاڵ خەریکی ئەم کەین‌و بەینە دەبێ‌و سەرقاڵ‌و سەر جەنجاڵی فێڵ‌و فەرەجی خۆی دەبێ، لەناکاو خودا عیسای کوڕی مەریەم (دروودی خوای لەسەر بێ) دەنێرێ، جا عیسا (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکن منارە سپییەکە دادەبەزێ، کە دەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی دیمەشقەوە، دوو دەست جلی ڕەنگ زەعفەرانیی لەبەردا دەبێ، هەردوو لەپی لەسەر باڵی دوو فریشتە دادەنێ، کە سەردادەنەوێنێ ئاوی لێدەتکێ،کە سەرهەڵدەبڕێ وەك گوێ مروار ئارەقی لەڕوو هەڵدەنیشێ، هەر ناموسوڵمان (کافر)ێ بۆنی هەناسەی عیسا بکا کتوپڕ دەمرێ، تا چاویشی بڕبکا هەناسەیشی دەڕوا، جا عیسا (دروودی خوای لەسەر بێ) منەیی جەجاڵ دەکاو دەگەڕێ بەدوایا، تا لەدەرگای شاری لوددپێی دەگاو لەوێ دەیکوژێ، ئینجا گرۆیەك دێنە لای عیسای کوڕی

مەریەم (درودی خوای لەسەر بێ) ئەوانە خودا لەشەڕی جەجاڵ پاراستوونی، عیسا دەیانحەوێنێتەوەو خەمیان دەڕەوێنێتەوەو پایەو پلەی خۆیان لەبەهەشت دا پێ دەفەرموێ: ئیتر ئەوا عیسا (درودی خوای لەسەر بێ) سەرگەرمی ئەم کارو بارەی خۆیەتی لەناکاودا خودا نیگای بۆ دەنێرێ ئەی عیسا ئەوا من چینێکم لەبەندەکانی خۆم بەرەڵا کردووە، کەس بەشەڕ دەرەقەتیان نایەت، کەواتە تۆ بەندە موسوڵمانەکانم دەرکەو بیانبە بۆ کێوی توور لەوێ قایمیان بکە، ئەوجا خودا یەئجوجو مەئجوج بەرەڵا دەکا، ئیتر لەهەموو قوتکەو لاپاڵو بەرزاییەکەوە بەتەکان دێنو جم دەدەن!

کاتێ بەراییان دەگەنە سەر دەریاچەی تەبەرییە، هەمووی دەخۆنەوەو چۆڕی لێدەبڕن، کە دوایەکیان دێن دەڵێن: جارێ لەجاران لەم شوێنەدا ئاو هەبووە، جا عیسای پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) خۆیو هاوڕێکانی واگیر دەخۆنو وا تەنگە تاو دەبن دەستیان بەهیچ لایەکا ناگا، لەهەموو لایەکەوە تەنگیان پێهەڵدەچنن تەنانەت سەرەگایەك بۆ یەکێکیان لەسەد لیرەی زەردی یەکی یەکی ئەمڕۆی ئێوە باشترە بۆی، جا ئەوجا عیسای پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ هاوڕێکانی دا (ڕەزای خوایان لێ بێ) بەکوڵو بەدڵ لەخودای گەورە دەخوازنو دەپاڕێنەوە کەلەناویان بەرێو بیان فەوتێنێ ئیتر خودا مافەتەیان تێدەخاو کرمێ وەك چۆن هەنگ لە پێستی ڕەشە وڵاخ دەدا، ئاوا دەداتە گەردنیانو سەرجەم بەیەك دەم، هەموو بەیەکجار دەتۆپن، لەوەولاترچن! لەپاشا عیساو هاوڕێکانی درودو سڵاوی خودا لەسەر خۆیو ڕەزای خودا لەیارانی بێ دادەبەزنە خوارەوە بۆ ناو وڵاتو دەڕژێنە ناو گوندو شارەکانەوە دەڕوانن شوێنی بستێ نەماوە کە پڕی نەبووبێ لەبۆدڕنو بۆگەنی ئەوان، جا عیسای پێغەمبەری خوداو هاوڕێکانی درودو سڵاوی خودا لەسەر عیسابێو ڕەزای خودا لەهاوڕێکانی بەدڵێکی پاك داوا لەخودا دەکەنو دەپاڕێنەوە کەئەم حاڵەیان لەکۆڵ بخات، ئیتر خوداش پاڕانەوەکەیان گیرا دەکاو باڵندەیەکی گەورە دەنێرێ، وەك گەردنی وشتری مل درێژ، جا ئەو مەلانە کە لاکەکەیان هەڵدەگرنو لەکوێ خودا ئارەزووی لەسەر بێ لەوێ توڕیان دەدەن،

ئەوجا خوای گەورە بارانێکی سەقامگیر دەنێرێ چ خانوو بەرەو ماڵ دەوارو ڕەشماڵ گشتی دەگرێتەوەو هیچی گلی ناداتەوە، هەتا دەرو ژوور سەر ڕووی گۆی زەوی گشتی وەك ئاوێنەی ساف پاك پاك دەشواتەوە، ئەوسا دەگوترێ بەزەوی، بێرەوە بەرو دەست بکەرەوە بەبەرهەمدانو پیتو فەڕ بخەرەوە وەك جاری جارانت، جا لەو ڕۆژەدایە کە دەستەیێ لەیەك هەنار تێردەخۆنو لەبن سێبەری قاوغەکەشی دا وچان دەگرنو دەحەسێنەوە، ئاژەڵی لەوەڕ خۆریش پیتو فەڕێکی وای تێدەکەوێ شیری ژەمی وشترێکی تازەزاو بەشی عەشاماتێ دەکا، وەژەمێ ژەکی مانگایێ کەدەکرێ بەفرۆ، بەشی خێڵێ دەکا، وە ژەمێ شیری مەڕێ، یا بزنێکی دۆشەنی، بەشی تیرەیێ لە ئێڵێ دەکا، ئیتر ماوەیێ بەم چەشنەیە دەمێننەوە، تا ناگا خودا بایەکی خۆش هەڵدەکاو دەدا لەبنباخەڵیانو گیانی هەموو خاوەن باوەڕو گشت موسوڵمانەکان دەکێشێ، وە دەمێنێتەوە خراپو گەندو بەدکارەکانی مەردومەکە ئیتر وەك کەر گەلو ماکەر بەفالو دێڵە بەبا بەبەرچاوی یەکترییەوە لەیەك هەڵدێنو لەیەك دەپەڕن، ئیتر لەسەر ئەوانە قیامەت هەڵدەستێ! (موسلیم (ڕەزای خوای لێ بێ)).

٢/١٨٠٩- وَعَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي مسْعُودٍ الأنْصارِيِّ إلى حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ رضي اللّٰه عنهم فَقَالَ لَهُ أبو مسعودٍ، حَدِّثْنِي مَا سمِعْت مِنْ رَسُول اللّٰه (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، فِي الدَّجَّال قَالَ: (إنَّ الدَّجَّالَ يَخْرُجُ وَإنَّ مَعَهُ مَاءً وَنَاراً، فَأَمَّا الَّذِي يَرَاهُ النَّاسُ ماءً فَنَارٌ تُحْرِقُ، وَأمَّا الَّذِي يَرَاهُ النَّاسُ نَاراً، فَمَاءٌ بَارِدٌ عذْبٌ، فَمَنْ أدْرَكَهُ مِنْكُمْ، فَلْيَقَعْ فِي الذي يَراهُ نَاراً، فَإنَّهُ ماءٌ عَذْبٌ طَيِّبٌ) فَقَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: وَأَنَا قَدْ سَمِعْتُهُ. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ[٢٧٢].

ڕیبعی کوڕی حیراش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ ئەبو مەسعوودی ئەنصاری دا چووین بۆ خزمەتی حوزەیفەی کوڕی یەمان (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەبو مەسعود پێی فەرموو: لەبارەی جەجاڵەوە چیت لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بیستووە پێم بفەرموو: حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەزرەتم ژنەوت

[٢٧٢] موسلیم (٢٢٥٠/٤-٢٢٥٥ رقم/١١٠).

دەیفەرموو: جەجاڵ کە هەڵدەسێ ئاوو ئاگری لەگەڵ دایە، وەلێ ئەوەی کە خەڵکەکە بەئاگری دەزانن ئەوە ئاوێکی ساردی فێنکی شیرینی زوڵاڵە، جا هەرکامێ لەئێوە فریای ئەو رۆژە کەوت باخۆی بخاتە ئەوەیانەوە کە ئەو بەئاگری ئەزانێ، چونکە ئەوەیان ئاوێکی شیرین و زوڵاڵ و خۆشە! ئەبو مەسعودیش فەرمووی: منیش ئەمەم بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) ژنەوتووە (ش).

٣/ ١٨١٠- وعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عَمْرو بن العاص رضي اللَّه عَنْهُما قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (يَخْرُجُ الدَّجَّالُ في أمَّتِي فَيَمْكُثُ أربَعِينَ، لا أدْري أرْبَعِينَ يَوْماً، أو أرْبَعِينَ شَهْراً، أوْ أرْبَعِينَ عَاماً، فَيبْعثُ اللَّه تَعالى عِيسَى ابْنَ مَرْيمَ (صَلّي اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فَيطْلُبُهُ فَيُهْلِكُه، ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ سبْعَ سِنِينَ لَيْسَ بَيْنَ اثْنيْنِ عداوَةٌ.

ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّه، عزَّ وجَلَّ، رِيحاً باردَةً مِنْ قِبلِ الشَّام، فَلا يبْقَى على وَجْهِ الأَرْضِ أحَدٌ في قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ أوْ إيمَان إلاَّ قَبضَتْهُ، حتَّى لَوْ أنَّ أحَدَكُمْ دخَلَ في كَبِدِ جَبلٍ، لَدَخَلَتْهُ عَلَيْهِ حَتَّى تَقْبِضَهُ. فَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ في خِفَّةِ الطَّيْرِ، وأحْلام السِّباعِ لا يَعْرِفُون مَعْرُوفاً، وَلا يُنْكِرُونَ مُنْكَراً، فَيَتَمَثَّلَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ، فَيقُولُ: ألا تسْتَجِيبُون؟ فَيَقُولُونَ: فَما تأمُرُنَا؟ فَيأمرُهُم بِعِبَادةِ الأوْثَان، وهُمْ في ذلكَ دارٌّ رِزْقُهُمْ، حسنٌ عَيْشُهُمْ. ثُمَّ يُنْفَخُ في الصَّور، فَلا يَسْمعُهُ أحَدٌ إلاَّ أصْغى لِيتاً ورفع لِيتاً، وَأوَّلُ منْ يسْمعُهُ رَجُلٌ يلُوطُ حَوْضَ إبِله، فَيُصْعَقُ ويصعق النَّاسُ حوله، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّه أوْ قالَ: يُنْزِلُ اللَّه مَطَراً كأنَّهُ الطَّلُّ أو الظِّلُّ، فَتَنْبُتُ مِنْهُ أجْسَادُ النَّاس ثُمَّ ينفخ فِيهِ أخْرَى فإذا هُمْ قِيامٌ يَنْظُرُون. ثمَّ يُقَالُ يا أيها النَّاسُ هَلُمَّ إلى رَبِّكُم، وَقِفُوهُمْ إنَّهُمْ مَسْؤولونَ، ثُمَّ يُقَالُ: أخْرجُوا بَعْثَ النَّار فَيُقَالُ: مِنْ كَمْ؟ فَيُقَالُ: مِنْ كُلِّ ألْفٍ تِسْعَمِائة وتِسْعةَ وتسْعِينَ، فذلكَ يَوم يجْعَلُ الْوِلْدانَ شِيباً، وذلكَ يَوْمَ يُكْشَفُ عنْ ساقٍ) رواه مسلم.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ڕەزای خودا لەخۆی و بابی بێ فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەئاخر زەمان دا جەجاڵ پەیدا دەبێ و دێ بۆ ناو ئۆمەتم گوتی: نازانم حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چل رۆژ یا فەرمووی: چل مانگ یا فەرمووی: چل ساڵ

دەمێنێتـەوە، جا خـودا عیسـای کـوڕی مەریـەم دەنێـرێ (دروودی خوای لەسەر بێ) عیسـا بەشێوەی شیرینو ئێسکی سووكو لەشولاری پاكو تەمیزی لە عوروەی کوڕی مەسعود دەکـا، کـە نمونـەی شـێوە شـیرینیو پـاكو خـاوێنی بـووە، جـا عیسـا دەگـەڕێ بەشـوێن جـەجاڵ دا تـا پەیـدای دەکـاو دەیکوژێ، ئـیتر حـەوت سـاڵ خەڵك بەشادیو خۆشیو ئاشتی دەمێننەوە، لەو ماوەیەدا هـیچ شـەڕو شـۆڕو دوژمنایەتی نامێنێو کەس لەکەس ناکەوێ ئەوجا خودای بالآدەستو خـاوەن شکۆ، لەلای شامەوە شەماڵێکی فێنك دەنێرێ، ئیتر ئەو کەسەی لەسـەر ڕووی زەوی بەقـەد تۆزقاڵـێ خێـرو چـاکە، یـان بـاوەڕو ئیمـان لـەدڵیابێ، ئـەم بایـە گیانی دەسەنێ، هەتا ئەگەر بێتو یەکێ خۆی بکا بەناو جەرگەی کێوێکا باکە دوای دەکەوێ بـۆ ئـەوێو لـەوێ گیـانی دەکێشـێ. ئەوسـا دەمێنێتـەوە خەڵکـە بــەدڕەفتارو بــەدکردارەکان، وا بــەخێرایی پــەلاماری خراپــە دەدەنو دەم دەژەندنە ئارەزوو بازی دەڵێی مەلی سووك فڕن، خوو و ڕەفتاریشیان لـەخوو ڕەفتاری دڕندە دەکا، نەچاکە بەچاکە دەزانن، نە پیاوەتی بەپیاوەتی دەزانـن، نە خراپە بەخراپە دەزانن، نە بێشەرعی بە بێشەرعی دادەنـێن، جا شـەیتان دەچێتە شـکڵی زەلامێکـەوەو دێتـە بەرچـاویانو لـەڕوو پێیـان دەڵـێ: ئـەرێ بەگوێم دەکەن یانا؟ دەڵێن: ئادەی بفەرموو: فەرمانت بەچییە پێمان؟ ئـیتر ئەویش فەرمانیان پێدەکا بەپەرستنی بوتانو دەسـت دەکـەن بـە بتپەرستی، ئـیتر لەگـەڵ ئـەم حاڵەشـیانا ڕزقو ڕۆزیـان تـا بڵێـی زۆرو مشـە دەبـێ وە ڕابواردنو ژێواریان تا بڵێی خۆشە، ئیتر فووی یەکەم دەکـرێ بـە صـوردا، جا ئەوەی کە گوێی لـێ بێ دەست بەجێ ملی لاردەبێتەوەو دەمرێ، یەکەم کەس پیاوێ گوێی لێدەبێ لەوکاتەدا خەریك دەبـێ کـە ئەسـتێڵی وشـترەکانی سـواخ دەدا، جا کە ئەو دەمرێ خەڵکیش بەدوا ئەودا دەست دەکەن بەمردن، پاشـان خـوا بارانـێ دەبارێنـێ یـا فـەرمووی: بارانـێ دەبارێنـێ وەك ڕنـە بـاران یـا فەرمووی: وەك سێبەر، جا بەو بارانە جەستەی مەردووم سەرلەنوێ، لەبێخی جوجکەی سمتەوە کەبەقەی تۆزقاڵێکە لەکۆتایی زنجیرەی پشتی ئادەمیزاد دا، هەموو دەڕوێتەوە، ئیتر بەفـەرمانی خـودا تامـاوەی چـل سـاڵ جیهـان چۆڵو هـۆڵ دەبـێ، لەپاشـا جـارێکی تـر فـووی دووەم دەکرێتـەوە بەصـوڕداو کتـوپڕ هەموو مـردووەکان زینـدوو دەبنـەوەو لەگـۆڕ ڕاسـت دەبنـەوەو تەماشـای دەورو

بەری خۆیان دەکەن، ئینجا دەگوترێ: ئەی بەرەی ئادەمیزاد وەرن کۆببنەوە لەخزمەتی پەروەردگارتان دا بۆ مەیدانی لێپرسینەوە، وەك خودای گەورەو مەزن لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {وَقِفُوهُم إِنَّهُم مسئولون} (٢٤/٣٧) واتە: ڕایانبگرن لە ئێستگای لێپرسینەوەدا، چونکە بەڕاستی ئەوانە بەرپرسیارن‌و پرسیاریان لێدەکرێ لەکردەوەو بیروباوەڕیان. پاشان دەگوترێ ئادەی نێردەی دۆزەخ جیاوەکەن، با بڕۆن بۆ ناو ئاگر! دەگوترێ: چەند لە چەند؟ دەفەرموێ: لە هەموو هەزارێ نۆسەدو نەوەدو نۆی. فەرمووی: ئەمەیە ئەو ڕۆژەی کەلاوو منالْ سەریان سپی دەبێ، وەك خودا لەقورئان دا دەفەرموێ: {فكيف إن كفرتم يوماً يجعل الولدان شيبا} (١٧/٧٣) واتە: جا ئەگەر ئێوە کافر ببن‌و لێی پەشیمان نەبنەوە تا لەسەر بێبڕوایی دەمرن چۆن خۆتان دەپارێزن لەسزای ڕۆژێکی درێژی ناباری وا کەبەسام‌و زەبرو زەنگی مندالان پیر دەکاو لەحەیبەتا سەریان سپی دەبێ، هەروەها ئەو ڕۆژە سەخت‌و دژوارو سامناکەیە، کە خودا دەربارەی دەفەرموێ: {يوم يكشف عن ساق} (٤١/٦٨) واتە: ئەی پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست! بۆ پەندو عیبرەت، بۆ هۆشیار کردنەوە، باسی حاڵی سەختی سامناکی ئەو ڕۆژەیان بۆ بکە، کە بەڕاستی ڕۆژی ڕەشی تاوانبارانە، کە داوێنی تیا دەکرێ بەلاداو لەبەر پەرێشانی خەڵك، قاچ‌و قوڵ هەڵدەکرێ‌و لەمەیدان دا قوڵی ڕەش‌و سپی دەردەکەوێ. (م-خ = موسلیم (ڕەزای خوای لێ بێ)).

٤/١٨١١- وَعَنْ أَنَسٍ رضي اللّٰه عَنْهُ قَالَ: قَال رَسُولُ اللّٰـه صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم: (لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ إلاَّ مَكَّةَ والمَدينة، ولَيْسَ نَقْبٌ مِنْ أَنْقَابِهما إلاَّ عَلَيْهِ المَلائِكَةُ صَافِّينَ تَحْرُسُهُما، فَيَنْزِلُ بالسَّبَخَةِ، فَتَرْجُفُ المدينةُ ثلاثَ رَجَفَـاتٍ، يُخْرِجُ اللّٰه مِنْهَا كُلَّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ) رواه مسلم [٢٧٣].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو وڵاتێ، مەککەو مەدینەی لێدەرچێ، هەموو ڕێ‌و بان‌و کەلەبەرەکانی ئەم دوو شارە پیرۆزە فریشتە لەسەریان ڕیزبوون

[٢٧٣] بوخاری (٣٤٥٠) موسلیم (٢٩٣٤، ٢٩٣٥).

ئێشكیان دەگرن، وەلێ دێ كە بچێ بۆ مەدینە، فریشتەش رێگەی نادەن، جا لەلای شۆرەكاتەكەی دەرەوەی مەدینە كە پێی دەگوترێ: سیبخەتولجورف بارگەو بنەی لێدەخا، ئیتر شاری مەدینە سێ جار دەهەژێو دانیشتووەكانی رادەوەشێنێو سێ لەرزە دەكا، جا لەسەری لەرزەی سێهەما ئیتر هەرچی كافرو مونافیقە خودا لە مەدینە دەیانكاتە دەرەوەو دەردەچنو دەچن بۆلای جەجالْ! (م).

١٨١٢/٥- وعَنْهُ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (يَتْبعُ الدَّجَّال مِنْ يهُودِ أصْبهَانَ سَبْعُونَ ألْفاً علَيْهم الطَّيَالِسة) رواهُ مسلِمٌ[٢٧٤].

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: حەفتا هەزار كەس لە جولەكەی ئەسپەهان دوای جەجالْ دەكەون، هەموو تەیلەسانیان لەبەردایە (م).

١٨١٣/٦- وعَنْ أمِّ شَريكٍ رضي اللّٰه عَنْهَا أنَّها سمِعتِ النبيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (لَيَنْفِرَن النَّاسُ مِنَ الدَّجَّالِ في الجِبَالِ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ[٢٧٥].

ئوممو شەریك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەحەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو: مەردوم لەتاو جەجالْ هەڵدێن، تەنانەت لەتاوانا پەنا دەبەنە بەركێوەكان (م).

١٨١٤/٧- وعَن عِمْرَانَ بن حُصَيْنٍ رضي اللّٰه عنْهُما قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يَقُولُ: (مَا بَيْنَ خَلْقِ آدَم إلى قِيَامِ السَّاعةِ أمْرٌ أكْبرُ مِنَ الدَّجَّالِ) رواه مسلم[٢٧٦].

عیمرانی كوڕی حوصەین (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: لەو حەلەوە كە خودا ئادەمی دروست

---

[٢٧٤] موسلیم (٢٩٤٠)

[٢٧٥] موسلیم (٢٩٤٣).

[٢٧٦] موسلیم (٢٩٤٤).

کردووه تا ئەو دەمەی کە قیامەت هەڵدەستێ فەرتەنەو ئاژاوەی گەورەی وەك جەجاڵ نەبووەو نەدەبێ! (موسلیم (ڕەزای خوای لێ بێ)).

٨/١٨١٥- وعنْ أبي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ (رضي اللّٰه عنه)عَنِ النبـيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: (يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فَيتَوَجَّه قِبَلَه رَجُلٌ من المُؤمِنِين فَيَتَلَقَّاهُ المَسالحُ: مسالحُ الدَّجَّالِ، فَيقُولُونَ له: إلى أيْنَ تَعمِدُ؟ فيَقُول: أعْمِدُ إلى هذا الَّذي خَرَجَ، فيقولون له: أو ما تُؤْمِن بِرَبِّنَا؟ فيقول: ما بِرَبِنَا خفَاء، فيقولُون: اقْتُلوه، فيقُول بعْضهُمْ لبعض: ألَيْس قَدْ نَهاكُمْ رَبُّكُمْ أنْ تقتلوا أحداً دونَه، فَينْطَلِقُونَ بِهِ إلى الدَّجَّال، فإذا رآه المُؤْمِنُ قال: يَا أيُّهَا النَّاسُ إنَّ هذا الدَّجَّالُ الَّذي ذَكَر رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فيأمُرُ الدَّجَّالُ بِهِ فَيُشْبَحُ، فَيقولُ: خُذُوهُ وَشُجُّوهُ، فَيُوسَعُ ظَهْرُهُ وبَطْنُهُ ضَرْباً، فيقولُ: أوما تُؤمِنُ بي؟ فَيَقُولُ: أنْتَ المَسِيحُ الْكَذَّابُ، فَيُؤمرُ بِهِ، فَيُؤْشَرُ بالمِنْشَارِ مِنْ مَفْرقِهِ حتَّى يُفرقَ بَيْنَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ يَمْشِي الدَّجَّالُ بَيْنَ الْقِطْعَتَيْنِ، ثُمَّ يقولُ لَهُ: قُمْ، فَيَسْتَوي قَائماً. ثُمَّ يقولُ لَهُ: أتُؤمِنُ بي؟ فيقولُ: مَا ازْددتُ فِيكَ إلاَّ بصِيرةً، ثُمَّ يَقُولُ: يَا أيُّهَا النَّاسُ إنَّهُ لا يفْعَلُ بعْدِي بأحَدٍ مِنَ النَّاس، فَيأخُذُهُ الدَّجَّالُ لِيَذْبَحَهُ، فَيَجْعَلُ اللّٰه مَا بيْنَ رقَبَتِهِ إلى تَرْقُوَتِهِ نُحَاساً، فَلا يَسْتَطِيعُ إلَيْهِ سَبيلاً، فَيأخُذُ بيَدَيْهِ ورجْلَيْهِ فَيَقْذِفُ بِهِ، فَيحْسَبُ الناسُ أنَّما قَذَفَهُ إلى النَّار، وإنَّما أُلْقِيَ في الجَنَّةِ) فقالَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (هذا أعْظَمُ النَّاسِ شَهَادَةً عِنْد رَبِّ الْعالَمِينَ) رواه مسلم. وروى البخاريُّ بَعْضَهُ بمَعْنَاهُ[٢٧٧].

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ جەجاڵ هەڵدەستێ پیاوێ لە ئیماندارەکان ڕووەولای ئەو دەکەوێتە ڕێ، چەتەو پێکوڕەو چەکدارەکانی جەجاڵ بەری لێدەبڕنەوەو پێی دەڵێن: بۆکوێ دەچی؟ دەڵێ: دەچم بۆ لای ئەم کابرایەی کەوا پەیدا بووە، دەڵێن: کەوا دەڵێی باشە باوەڕ دەهێنی بەم خوایەی ئێمە؟ ئەویش دەڵێ: خودای ئێمە ئاشکراو نومایانەو شاراوە نییە، جا دەڵێن ئادەی بیکوژن، بەلاَم لەناو خۆیان دا دەڵێن: نابێ، چونکە خوداکەمان ڕێگەی نەداوین کە

[٢٧٧] موسلیم (٢٩٤٥).

کەسێ بەبێ فەرمانی خوای بکوژین! ئینجا دەیبەن بۆلای جەجاڵ، کە موسوڵمانەکە چاوی پێی دەکەوێ دەڵێ: ئەی مەردومینە! ئەمە ئەو جەجاڵەیە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) باسی ئەوی بۆ کردوین، جا جەجاڵ دەستور دەدا پیاوە موسوڵمانەکە لەسەردەم ڕاخەن و چوار مێخەی دەکێشن و ئینجا دەڵێ: ئادەی دارکاریەکی باشی بکەن! جا دارکارییەکی زۆرچاکی بەروپشتی دەکەن ئەوجا دەڵێ: ها دەڵێی چی ئێستا باوەڕم پێ دەکەی یا نا؟ ئەویش دەفەرموێ: تۆ جەجاڵە کوێری هەلاتبازی، جا جەجاڵ دەستور دەدا لە تەوقەسەریەوە تا نافەکی بەمشار دایدەهێنن، ئەوجا جەجاڵ خۆی بەناو هەردوو کەرتەکەی دا دەڕوا، لەپاشا پێی دەڵێ: ئادەی هەڵسە ئەویش زیندو دەبێتەوەو ڕاست دەبێتەوە سەرپا، ئەوسا پێی دەڵێ: ها باوەڕم پێدەهێنی؟ دەڵێ: ئەوەندەی تر بۆم ڕوون بۆوە کە تۆچیت و چی نیت، تۆ جەجالی، خودا نیت! ئەوجا دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! ئیتر لەپاش من ناتوانێ کەسی تر والێبکا، جا جەجاڵ دەیگرێ تا سەری ببڕێ، بەڵام بەفەرمانی خودا بەربینی لەغەو غەوەیەوە هەتا چەڵەمەی سینگی دەبێ بەیەك پارچە مس! ئیتر ڕێگەی ئەوەی نابێ کە بیکوژێ، جا هەر چوار پەلی دەگرێ و فڕەی دەدا، لەخەڵك وایە کە فڕەی داوەتە ناو دۆزەخەوە، بەڵام لەڕستی دا دەبرێ بۆناو بەهەشت، چونکە ئاگرەکەی بەهەشتەو ئاوەکەی ئاگرە. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەلای خودای پەروەردگار هەردوو جیهان گەورەترین شەهید ئەم پیاوەیە! (موسلیم ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، بوخاریش بەهەمان مەعنا، نەك بەهەمان لەفظ، هەندێکی لێگێڕاوەتەوە).

١٨١٦/٩- وعَنِ المُغِيرَةِ بنِ شُعْبَةَ (رضي اللّه عنه)قَالَ: ما سَألَ أحَدٌ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم)عَنِ الدَّجَّالِ أكْثَرَ مِمَّا سألْتُهُ، وإنَّهُ قالَ لي: (ما يَضُرُّكَ؟) قلتُ: إنَّهُمْ يقُولُونَ: إنَّ معَهُ جَبَلَ خُبْزٍ وَنَهْرَ مَاءٍ، قالَ: (هُوَ أهْوَنُ عَلى اللّهِ مِنْ ذلِكَ) متفقٌ عليه[٢٧٨].

[٢٧٨] موسلیم (٢٩٤٦).

موغيرەی كوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: كەس ئەوەندەی من لەبارەی جەجاڵەوە پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نەدەكرد، جارێ پێی فەرمووم: زیانی بۆ تۆ نابێ. عەرزیم كرد بۆیە ئەوەندە زۆر لەم بارەیەوە لەتۆ دەپرسم چونكە دەڵێن گوایە كێوێ نان و چەمێ ئاوی لەگەڵ دایە، فەرمووی: ڕاستەو وایە، وەلێ ئەو لەلای خودا سوك و تڕۆیەو ڕادەی ئەوەی ناكەوێ كە بەهۆی ئەم جۆرە چاوبەست و چاوو ڕاوەوە سەر لە موسوڵمانی پاك بشێوێنێ، بەڵكوو ئەوە دەبێ بەهۆی بەهێزبوونی باوەڕی باوەڕدارو دەبێ بەهۆی ڕاست كردنەوەی بەڵگەی ڕۆشن لەسەر ناموسوڵمان و ناپاكان. (ش=ب+م= بوخاری و موسلیم (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

١٨١٧/١٠- وعَنْ أَنَسٍ (رضي اللَّه عنه)قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): مَا مِنْ نَبِيٍ إلاَّ وَقَدْ أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الأَعْوَرَ الْكَذَّاب،ألا إنَّهُ أعْوَرُ،وإنَّ ربَّكُمْ عَزَّ وجلَّ لَيْسَ بأعْورَ،مكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ ك ف ر»متفق عليه[٢٧٩].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو پێغەمبەرەكانی تریش گەلەكانی خۆیانیان ئاگادار كردۆتەوە لەمەڕ فەرتەنەی جەجاڵی هەلاتبازی كوێرەوە هۆشیاربن كە جەجاڵ یەكلە چاوەو چاوەكەی تریشی زەدەدارە! لەناوچاوانی جەجاڵ نوسراوە (ك ف ر) واتە: كافر، هەموو موسوڵمانێ، خوێنەوارو نەخوێنەوار دەیخوێنێتەوە! (ش-(ڕەزای خوای لێ بێ)).

١٨١٨/١١- وَعَنْ أبي هُرَيْرَة (رضي اللَّه عنه)قالَ: قالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (ألا أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثاً عنِ الدَّجَّال مَا حَدَّثَ بِهِ نَبِيٌّ قَوْمَهُ، إنَّهُ أعْوَرُ وَإنَّهُ يجِئُ مَعَهُ بِمثَالِ الجَنَّةِ والنَّار، فالتي يَقُولُ إنَّهَا الجَنَّةُ هِيَ النَّارُ. متفقٌ عليه[٢٨٠].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بێدارەوەبن! مـن قسەیەكتان بۆدەكەم لەبابەت جەجاڵەوە كە هیچ

---

[٢٧٩] موسلیم (٢٩٣٨، ١١٣) بوخاری (٧١٣٢).

[٢٨٠] بوخاری (٧١٢٢) موسلیم (٢٩٣٩، ١١٥).

پێغەمبەرێ ئەو قسەیەی نەکردووە بۆ گەلی خۆی، ئەویش ئەوەیە کە ئەو لەعنەتییە یەکلەچاوە، دیارە کە خودای گەورە یەکلەچاو نییە، ئەو نەعلەتییە مانەندی بەهەشتو دۆزەخ لەگەڵ خۆی دێنێ، وەلێ ئەوەی کە دەڵێ: ئەمە بەهەشتە ئەوە دۆزەخە، وە بەپێچەوانەیشەوە ئەوەی کە دەڵێ: ئەمە دۆزەخە ئەوە بەهەشتە! (ش).

١٨١٩/١٢- وعَنْ ابنِ عُمَرَ رضي اللّٰهُ عَنْهُما أنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)ذَكَرَ الدَّجَّالَ بَيْنَ ظَهْرَاني النَّاس فَقَالَ: «إنَّ اللّٰه لَيْسَ بأَعْوَرَ، ألا إنَّ المَسِيحَ الدَّجَّالَ أعْوَرُ الْعيْنِ الْيُمْنى، كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنبةٌ طَافِيَةٌ» متفقٌ عليه[281].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) بەئاشکرا لەناو جەرگەی عەشاماتەکەدا باسی جەجاڵی فەرمو، فەرمووی: دیارە کە خودا کوێر نییە، وەلێ هۆشیار بن! جەجاڵە کوێرەی ساختەچی هەلاتباز چاوی ڕاستی کوێرە، چاوێکی دەرپۆقیوە، دەڵێی دەنکە ترێی زەقی ناو بۆڵە، کەوەك شتی سەر ئاوکەوتوو زەق ببێتەوەو سەر بۆڵەکە بکەوێ! (ش).

١٨٢٠/١٣- وعَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالَ: (لا تَقُومُ الساعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ المُسْلِمُونَ الْيَهُودَ حتَّى يَخْتَبِيءَ الْيَهُوديُّ مِنْ وَراءِ الحَجَرِ والشَّجَرِ، فَيَقُولُ الحَجَرُ والشَّجَرُ: يَا مُسْلِمُ هذا يَهُودِيٌّ خَلْفي تَعَالَ فَاقْتُلْهُ، إلاَّ الْغَرْقَدَ فَإنَّهُ منْ شَجَرِ الْيَهُودِ) متفقٌ عليه[282].

ئەبو هورەیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ هەتا موسوڵمانان دەچن بەگژ جولەکەدا جا کاتێ موسوڵمانەکان دەست دەکەن بە کوشتاریانو شەڕگەرم دەبێ موسوڵمانەکان خودا زاڵیان دەکا بەسەریان داو سەرئەنجام جولەکەکان شکانێکی وا دەشکێن لەبن بەردو دارو بنچك دا خۆیان پەنا دەدەنو خۆیان دەشارنەوە، جا بەردو

[281] بوخاری (٧١٣١) موسلیم (٢٩٣٣).

[282] بوخاری (٣٢٣٨) موسلیم (٢٩٣٦).

دارەکە بە زمانێکی ڕەوان دێنە قسەو دەڵێن: ئەی کاکەی موسوڵمان! ئەی بەندەی خودا! ئەی عەبدی خودا! ئەمە جولەکەیەکە لەپشت منەوە خۆی حەشار داوە وەرە بیکوژە تەنیا داری دڕکەزی واناڵێ، کە لەخاکی بەیتول موقەدیس لەم دارە زۆرە، لەبەر ئەوە دادەنرێ بە درەختی جولەکە. (ش = (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

١٨٢١/١٤- وعَنْهُ (رضي اللّٰه عنه)قالَ: قال رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَـلَّم): (والذِي نَفْسِي بِيَدِه لا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بالْقَبْرِ، فيتمَرَّغ عَلَيْهِ، ويقولُ: يَالَيْتَني مَكَانَ صَاحِبِ هذا الْقَبْرِ، وَلَيْس بِهِ الدَّين وما به إلاَّ الْبَلاَءُ). متفقٌ عليه[283].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەوکەسە کە گیانی منی وا لەدەسا، کە خودای تاکو تەنیایە، ئەم جیهانە تەواو نابێ تاوای لێدێ پیاو دەدا بەلای گۆڕدا تەپاوتلی لەسەر دەکاو دەڵێ: خۆزگەم بەخۆی، خۆزگە من دەبوم لەشوێنی خاوەنی ئەم گۆڕە! کەواش دەڵێ ئەوەنەبێ لەبەر بێ دینی خۆی وابڵێ، نەء، بەلام لەتاو دەردو بەلای زۆر وادەڵێ، کە پەیتا پەیتا دەرژێ بەسەری دا. (ش).

١٨٢٢/١٥- وعَنْهُ (رضي اللّٰه عنه)قالَ: قالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَـلَّم): (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جبَلٍ منْ ذَهَبٍ يُقْتَتَلُ علَيْهِ، فيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وتِسْعُونَ، فَيَقُولُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ: لَعَلِّي أنْ أكُونَ أنَا أنْجُو)).

وفِي روايةٍ (يوُشِكُ أنْ يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَن كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلا يأخُذْ منْهُ شَيْئاً) متفقٌ عليه[284].

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ هەتا چۆمی فوڕات وشك دەکاو کێوێ زێڕ لەبنیەوە دەردەکەوێ، جا خەڵکان لەسەری دەبێ بەشەڕیان، لەهەموو سەد کەسێ نەوەدو نۆی دەکوژرێ، هەموو پیاوێکیان دەڵێ سا بەشکو من ئەو کەسەبم کە قورتارم دەبێ لەم شەڕەو شاد دەبم بەم گەنجو خەزنەیە (ش).

---

[283] بوخاری (٧١٢٧) موسلیم (٢٢٤٧/٤ رقم/١٠٠).

[284] بوخاری (٢٩٢٦) موسلیم (٢٩٢٢).

١٨٢٣/١٦- وعَنْهُ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يقُولُ: (يَتْرُكُونَ المَدِينَةَ عَلى خَيْرِ مَا كَانَتْ، لا يَغْشَاهَا إلاّ الْعوَافِي يُرِيدُ: عَوَافِي السِّباعِ وَالطَّيْرِ وَآخِرِ مَنْ يُحْشَرُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ يُرِيدَان المَدِينَةَ ينْعِقَان بِغَنَمهما فَيَجدَانها وُحُوشاً. حتَّى إذا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْودَاعِ خرَّا على وَجوهِهِمَا) متفقٌ عَليه[٢٨٥].

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: مەدینـە لەوپـەڕی خۆشـیو باشـی دا دەبـێ، کـە دانیشـتووەکانی بەجێی دەهێڵن، وا چۆڵو هۆڵ دەبێ کەس سەری پیا ناکا، مەگەر مەلو جانەوەری موشەکەر کە بۆ ملۆموشو موشەکردن دەچن بۆ هەوارە کۆنو شوێنی چۆڵ بوو! وە دواترین کەسیش کەلە وڵات دەردەکرێنو دەبرێن بۆ حەشر دوو شوانی موزەینەیی دەبن، دەیانەوێ بچن بۆ مەدینە، دەنگ لە ڕانەکەیان دەکەنو پیرکە دەکەن بەناویاو بەرەو مەدینە دەڕۆن، جا کە دەچن تەماشا دەکەن مەدینە چۆڵو هۆڵو سامناك، چۆلەکە بکوژی تیا نییە، ئیتر لەمەدینە دەردەچنو دەڕۆن تا دەگەنە سەنیەتولویداع لەوێ بەسەر دەما دەکەونو خرپ دەمرن! (ش).

هەربەدەم خۆشە ڕەو لەشار کردن
مەخسوس بۆ کەسێ منداڵی وردن
ئەمەیە پەنا بۆ مردن بردن
مرۆڤ بەپێی خوای لەترسی مردن!

١٨٢٤/١٧- وعَنْ أبي سَعيدٍ الخُدْرِيِّ (رضي اللّٰه عنه)أنَّ النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (يَكُونُ خَلِيفَةٌ مِنْ خُلَفَائِكُمْ في آخِرِ الزَّمَان يَحْثُو المَالَ وَلا يَعُدُّهُ) رواه مسلم[٢٨٦].

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: لـەئاخر زەمانـا واتـە: لـەدواکاتی جیهانـا جێنشـینێ لـە

[٢٨٥] بوخاری (١٨٧٤) موسلیم (١٣٨٩، ٤٩٩).

[٢٨٦] بوخاری (٧١١٥) موسلیم (٢٢٣١/٤ رقم/٥٤).

جێنشینەکانتان، واتە: خەلیفەیەك لە خەلیفەکانتان، ماڵ بەچنگو مشت بەبێ شومار دەبەخشێتەوە (م-(ڕەزای خوای لێ بێ)).

١٨٢٥/١٨- وعَنْ أبي مُوسى الأشْعَرِيِّ (رضي اللّه عنه)أنَّ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قال: (ليأتينَّ عَلى النَّاسِ زَمَانٌ يَطُوفُ الرَّجُلُ فِيهِ بِالصَّدَقَة مِنَ الذَّهَبِ، فَلا يَجِدُ أحَداً يَأْخُذُهَا مِنْهُ، وَيُرَى الرَّجُلُ الْوَاحِدُ يَتْبَعُهُ أرْبَعُونَ امْرأةً يَلُذْنَ بِهِ مِنْ قِلَّةِ الرِّجالِ وَكَثْرَةِ النِّسَاءِ) رواه مسلم[287].

ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەردوم دەکەونە چەرخێکەوە پیاو بەزێڕی خێرەوە ماڵەو ماڵو شارەو شار دەسوڕێتەوە تا بیکا بەخێر، بەڵام کەسی دەست ناکەوێ لێی وەربگرێ لەبەر زۆری ماڵ کەس نایەوێ، وە دەبینرێ چل ژن شوێنی تاقە پیاوێ دەکەونو پەنای بۆ دەبەن تا سەرەوکاریان بکاو کەس دەستدرێژیان لێنەکا، ئەمەش لەبەر کەمی پیاوو زۆری ژن (م).

١٨٢٦/١٩- وعَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)عَن النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: (اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عقَاراً، فَوَجَد الذي اشْتَرَى الْعَقَارَ في عَقَاره جَرَّةً فِيهَا ذَهَبٌ، فقالَ لهُ الذي اشْتَرَى الْعَقَارُ: خُذْ ذَهَبَكَ، إنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الأرْضَ، وَلَمْ أشْتَرِ الذَّهَبَ، وقالَ الَّذي لَهُ الأرْضُ: إنَّمَا بعْتُكَ الأرض وَمَا فِيهَا، فَتحاكَما إلى رَجُلٍ، فقالَ الَّذي تَحَاكَمَا إلَيْهِ: ألَكُمَا وَلَدٌ؟ قَالَ أحدُهُمَا: لي غُلامٌ. وقالَ الآخرُ: لي جَاريةٌ، قالَ أنْكِحَا الْغُلامَ الجَاريَةَ، وَأنْفِقَا عَلى أنْفُسهمَا مِنْهُ وتصَدَّقَا) متفقٌ عليه[288].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوێ خانویەکی لەپیاوێکی تر کڕی، کڕیارەکە کوپەڵەیەك زێڕی تیا دەدۆزێتەوە، جا بە فرۆشیارەکەی گوت: زێڕەکە هی تۆیە، لێم وەربگرەوە، چونکە من تەنها زەویەکەم لەتۆ کڕیوە، خۆ زێڕەکەم لێنەکڕیوی،

---

[287] موسلیم (٢١١٤).
[288] موسلیم (١٠١٢).

ئەویش گوتی: من زەوییەکە خۆیو هەرچی تیادایە فرۆشتومە بەتۆ، زێڕەکە هی خۆتە من وەری ناگرمەوە، فەرمووی: جا بۆ دادخواییو ناوبژی کردن چوونە لای پیاوێو کردیان بە فەرمانڕەوا (حەکەم=ناوبژیکەر) پیاوەکە گوتی: ئایا منداڵتان هەیە؟ یەکێکیان گوتی من کوڕێکم هەیە، ئەوی تریشیان گوتی من کچێکم هەیە، ئەویش گوتی: دە کەواتە کچەکە لە کوڕەکە مارەبکەنو زێڕەکەش بۆ ئەوان خەرج بکەن بۆ مەسرەفی شاییو خێریشی لێبکەن، ئیتر ئەوانیش وایان کرد (ش (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

٢٠/١٨٢٧- وعنْـهُ (رضـي اللّـه عنـه)أنَّـهُ سَـمِعَ رَسُـولَ اللّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)يَقُولُ: (كانَتْ امْرَأتَان مَعهُمَا ابْناهُما، جَاءَ الـذِّئْبُ فَـذَهَبَ بـابنِ إحْـداهُما، فقالت لصاحِبتهَا: إنَّمَا ذهَبَ بابنِكِ، وقالت الأخْرى: إنَّمَا ذَهَبَ بابنِك، فَتَحَاكَمـا إلى داوُودَ (عليه السلام)، فَقَضِي بِهِ للْكُبْرَى، فَخرَجتَا على سُلَيْمانَ بن داودَ (عليه السلام)، فأخبرتَاه، فقالَ: ائْتُوني بِالسِّكِّينَ أشقُّهُ بَيْنَهُمَا. فقالت الصُّغْرى: لا تَفْعَلْ، رَحِمكَ اللّه، هُو ابْنُهَا فَقَضَى بِهِ للصُّغْرَى) متفقٌ عليه[٢٨٩].

دیسان فەرمووی: خۆشەویست دروودو صەڵاتو سڵاوی خوای گەورەی لەسەر بێو سەروماڵو منداڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ فەرمووی: جارێ دوو ژن دوو کوڕی خۆیان پێ دەبێ، گورگێ دێ لەولاوە کوڕی ژنێکیان دەبا، ژنەکە بە هاوڕێکەی دەڵێ: گورگەکە کوڕەکەی تۆی بردووە، ئەویش دەڵێ: نەء، کوڕەکەی تۆی بردووە! جا بۆ مەحکەمە دەچنە لای داوود پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داوودیش بڕیار دەدا کە ئەو کوڕەی ماوە بۆ ژنە گەورەکە بێ، جا کەدێنە دەرەوە دەگەن بە سولەیمانی کوڕی داوود درودو صەڵاتو سەلامی خوای گەورەی لەسەربێ وە باسەکەی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش دەفەرموێ: ئادەی چەقۆیەکم بۆ بێنن دەیکەم بە دوولەتەوە بۆتان! جا ژنە بچکۆلەکە دەڵێ: نا ڕەحمەتی خوای گەورەت لێبێ وای لێمەکە، کوڕی ئەوە، ئەویش کە ڕوانی ژنە بچکۆلەکە سکی

---

[٢٨٩] بوخاری (٣٤٧٣) موسلیم (١٧٢١).

به منداڵەکە دەسوتێ زانی کە منالّی خۆیەتی جا لەبەر ئەوە دایەوە بەژنە بچکۆلەکە. (ش-(رەزای خوایان لێ بێ)).

١٨٢٨/٢١- وعَنْ مِرْداسٍ الأسْلَمِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قالَ قالَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (يَذْهَبُ الصَّالحونَ الأوَّلُ فالأولُ، وتَبْقَى حُثَالَةٌ كحُثَالَةِ الشَّعِيرِ أوْ التَّمْرِ، لا يُبالِي اللّٰه بهم شيئاً))، رواه البخاري[٢٩٠].

میرداسی ئەسلەمی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوچاکان بەرودوا، یەك لە شوێنی یەك لەدنیا دەردەچن و دەمێنێتەوە گەندو خوێڕیو سەرسەرییەکان کەوەك سوّس و سەرگوّزەری جوّ وان یا فەرمووی: کەوەك بنبێژنگو بنبۆلّی خورما وان، یەك توّسقالّ چییە خودا دەربەستیان نایەتو بەقەد توّزقالّێ قەدریان نازانێ! (بوخاری- ڕەحمەت لەخۆیو کەس و کاری).

١٨٢٩/٢٢- وعنْ رِفَاعَةَ بنِ رافعٍ الزُرقيِّ (رضي اللّٰه عنه)قالَ: جاء جِبْريلُ إلى النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالَ: مَا تَعُدُّونَ أهْلَ بَدْرٍ فيكُمْ؟ قالَ: (مِنْ أفْضَلِ المُسْلِمِين) أوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا قالَ: «وَكَذَلكَ مَنْ شَهِدَ بَدْراً مِنَ المَلائِكَةِ).رواه البخاري[٢٩١].

ڕیفاعەی کوڕی ڕافعی زورەقی کە خۆی یەکێك بوو لەوانەی کە بەشداری غەزای بەدریان کردبوو فەرمووی: جوبرائیل (دروودی خوای لەسەر بێ) دێ بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: ئێوە لەناو خۆتان دا ئەوانەی کە ئامادەی غەزای بەدر بوون و لەم غەزا پیرۆزەدا بەشداریان کردووە، چی پایەیەکیان بۆ دادەنێن؟ حەزرەت دەفەرموێ: لەڕیزی هەرەباشی موسوڵمانەکان حلێبیان دەکەین یا قسەیەکی ئاوای فەرموو، جوبرائیلیش دەفەرموێ: هەروەها ئێمەش لەناو خۆمان دا ئەو فریشتەیەی کە بەشداری

---

[٢٩٠] بوخاری (٣٤٢٧) موسلیم (١٧٢٠).

[٢٩١] بوخاری (٦٤٣٤).

كردبێ لەم جەنگەدا لە ڕیزی فریشتە هەرە باشەکانی دادەنێین! (ب-خ=بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ)).

۱۸۳۰/۲۳- وعن ابنِ عُمَر رضي اللّه عنهُما قال: قال رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إذا أنْزل اللّه تَعالى بِقَوْمٍ عَذاباً أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ. ثُمَّ بُعِثُوا على أعمَالِهِمْ) متفقٌ عليه[۲۹۲].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ خوای گەورە سزایەکی ناردە سەر هۆزی، ئەو سزایە هەموانی دەبێو چاكو خراپیان دەگرێتەوە، بەڵام لەقیامەتا هەرکەسەیان بەپێی کردەوەی خۆیان زیندو دەکرێنەوە ئەوەی باش بووبێ پاداشتی باشی خۆی وەردەگرێو ئەوەی خراپ بووبێ تۆڵەی لێدەستێنرێ (شەیخان – (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

۱۸۳۱/۲۴- وعَنْ جابرٍ (رضي اللّه عنه)قال: كانَ جِذْعٌ يقُومُ إلَيْهِ النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، يعْنِي فِي الخُطْبَةِ، فَلَما وُضِعَ المِنْبرُ، سَمِعْنَا لِلْجِذْعِ مثْل صوْتِ العِشَارِ حَتَّى نَزَلَ النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)فوضَع يدَه عليْهِ فسَكَنَ.

وفي روايةٍ: فَلَمَّا كَانَ يَومُ الجمُعة قَعَدَ النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)على المِنْبَرِ، فصاحتِ النَّخْلَةُ التي كَانَ يخْطُبُ عِنْدَهَا حَتَّى كَادَتْ أنْ تَنْشَقَّ.

وفي روايةٍ: فَصَاحَتْ صياح الصَّبِيِّ. فَنَزَلَ النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، حتَّى أخذَهَا فَضَمَّهَا إلَيْهِ، فَجَعلَتْ تَئِنُّ أنِينَ الصَّبِيِّ الّذي يُسكَّتُ حَتَّى اسْتَقرَّتْ، قال: (بكت عَلى ما كَانَتْ تسمعُ مِنَ الذِّكْرِ) رواه البخاريُّ[۲۹۳].

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێش دا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە خوتبەو دووانی دەدا لەپاڵ کۆڵەکەیەکی دارخورما دا ڕادەوەستاو لەکاتی خوتبەدانەکەدا شانی پێوە دەدا، بەڵام لەپاش دا کاتێ دوانگەکە دروست کراو لە ڕۆژی هەینی دا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) چوو لەسەر مینبەرەکە دانیشتو

---

[۲۹۲] بوخاری (۳۹۹۲).

[۲۹۳] بوخاری (۷۱۰۸) موسلیم (۲۸۷۸).

كۆڵەکەکەی بەجێهێشت، ئیتر کۆڵەکەکە دڵی بەخۆی سوتاو دەستی کرد بەکوڵی گریان وەك منداڵێ لەدایکی دابڕابێ ئاوا، کەیەکێ بیەوێ ژێری بکاتەوە، بەگوێی خۆمان گوێمان لێبوو ئەو بنکە دارخورمایە وەك وشترێ لەسەر گوان بێ یا وشترێ تازە زابێ ئاوا لەشوێنی حەزرەت دەگریا تەنانەت لەبەر هاتو هاواری خۆی خەریك بوو شەقبەرێ، هەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەمیمبەرەکە دابەزیو چوو بۆلایو دەستی کردە ملی ئەوجا داسەکناو کوڵی گریانی نیشتەوەو بێدەنگ بوو. حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو زیکرو یادی خوایە دەگری کەمن لەپاڵی دا دەمگوت! (بوخاری (ڕەحمەت لە گۆڕی نازداری)).

١٨٣٢/٢٥- وعنْ أبي ثَعْلَبَةَ الخُشَنيِّ جَرْثوم بن نَاشِرٍ (رضي اللّه عنه)عـنْ رَسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قال: إن اللّه تعالى فَرَضَ فَرائِضَ فلا تُضَيِّعُوهَا، وحـدَّ حُدُوداً فَلا تَعْتَدُوهَا، وحَرَّم أشْياءَ فَلا تَنْتَهكُوها، وَسكَتَ عَنْ أشْياءَ رَحْمةً لَكُمْ غيْرَ نِسْيانٍ فَلا تَبْحثُوا عنها) حديثٌ حسن، رواه الدَّارقُطْني وَغَيْرُهُ[٢٩٤].

ئەبو ثەعلەبی خوشەنی کەناوی جورثومی کوڕی ناشیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی وا لەبەرچاو ئەوەیە کە یەزدانی مەزن چەن فەرزێکی داناوە لەسەرتان، وەکوو نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەجو غوسڵو دەست نوێژ، دەی نابێ بە فیڕۆو زایەیان بکەن بە نەکردنیان زیا بە زەدەگەیاندن بەمەرجەکانی دروست بونیان، وە بۆ ئەم فەرزانەش چەند سنورێکی داناوە نابێ لەو سنورانە دەربچن، وەك ئەوەی نوێژی بەیانی دوو ڕکاتە نابێ بکرێ بەیەك ڕکات یا بکرێ بەسێ ڕکات، وەگەلێ شتیشی قەدەغە کردووە نابێ ڕێزیان بشکێننو بەناڕەوا بیان کەن، لەلایەکی تریشەوە زۆرشت هەن بە بوونو نەبوون باسی نەکردوون، بۆیەش لەوانە بێدەنگ بووە چونکە ڕەحمی بەحاڵی ئێوە کردووە، دەنا خودا هیچی لەبیر ناچێ، کەواتە ئێوەش بەپرسیاری زۆرلێیان مەکۆڵنەوە (دارە قوطنی – ح/ح).

---

[٢٩٤] بوخاری (٣٥٨٤).

١٨٣٣/٢٦- وعنْ عَبدِ اللّٰهِ بن أبي أوْفي رضي اللّٰه، عَنْهُمَا قال: غَزَوْنا مع رَسُولِ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)سَبْعَ غَزَوَاتٍ نَأكُلُ الجرادَ.وفي روايةٍ: نَأْكُلُ معهُ الجَراد، متفقٌ عليه[٢٩٥].

**عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **حەوت غەزامان کرد لەوحەوت غەزایەدا لەگەڵ پێغەمبەری خۆی دا** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کوللەمان دەخوارد (ش).**

١٨٣٤/٢٧- وعَـنْ أبـي هُريْـرةَ (رضـي اللّٰـه عنـه)أنَّ النبـيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)قَال: (لا يُلْدغُ المُؤمِنُ مِنْ جُحْرٍ مرَّتَيْنِ) متفقٌ عليه[٢٩٦].

**ئـەبو هـورەیرە** (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) **لەحەزرەتـەوە** (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) **دەفـەرموێ: موسوڵمان دووجار لەیـەك كونـەوە شـت پێـوەی نـادا، واتـە: دەبـێ موسـوڵمان زرنگو هۆشیار بێ بەشتێ دووجار نەخەڵەتێ. (ش-بوخاری موسلیم،** (ڕەزای خوایان لێ بێ)**).**

١٨٣٥/٢٨- وَعنْهُ قَال: قَال رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (ثَلاثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّٰه يَوْمَ الْقِيامةِ وَلاَ ينْظُرُ إلَيْهِمْ وَلا يُزَكِّيهِمْ ولَهُمْ عذابٌ أَلِيمٌ: رجُلٌ علَى فَضْلِ ماءٍ بِالْفَلاةِ يَمْنَعُهُ مِن ابْنِ السَّبِيلِ، ورَجُلٌ بَايَع رجُلاً سِـلْعَةً بعْـد الْعَصْـرِ، فَحَلَـفَ بِاللّٰـهِ لأخَذَهَا بكَذَا وَكَذا، فَصَدَّقَهُ وَهُوَ عَلَى غيْرِ ذَلِكَ، ورَجُلٌ بَـايع إمَامـاً لا يُبايِعُـهُ إلاَّ لِدُنيَا، فَإنْ أعْطَاهُ مِنْهَا وفَي، وإنْ لَم يُعْطِهِ مِنْهَا لَمْ يَفِ) متفقٌ عليه[٢٩٧].

**دیسان لەوەوە فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: لـەڕۆژی قیامـەت دا ئـەم سـێ کەسـە خـودا نـە قسـەی خۆشـیان لەگـەڵ دا دەکـاو نـە بەچـاوی میهرەبـانی تەماشـایان دەکـاو نـەپاكو خاوێنییـان دەکاتـەوەو نـە تاریفیـان دەکـا، واتـا لـەهیچ ڕوویەکـەوە ڕوویـان ناداتـێ، سـەرەڕای ئـەوەش سزایەکی سەختیان بۆهەیە:**

---

[٢٩٥] داره قوطني ص/٥٠٢، حاكم له مستدركا ١١٥/٤، أربعينەی نەوەوەی ژمارە/٣٠.

[٢٩٦] بوخاری (٥٤٩٥) موسلیم (١٩٥٢).

[٢٩٧] بوخاری (٦١٣٣) موسلیم (٢٩٩٨).

١ - پیاوێ کە لەچۆڵێ، زیادە ئاوی هەبێو لە ڕێبواری قەدەغە بکا،

٢ - پیاوێ کە لەپاش عەصر، کە کاتی بەرزبوونەوەی فریشتەکانە لەگەڵ کردەوەی ڕۆژی بەندەدا، ئەو لەوکاتە ناسکەدا لەسەر مامەڵەو سەودا سوێندی درۆ بخواو بەپیاوێ بڵێ بەخوا ئەم کاڵایە ئەمەندەو ئەوەندەم پێ داوە، کابرایش باوەڕی پێبکا، خۆشی درۆبکا،

٣ - پیاوێ پەیمان بدا بە پێشەوا مەبەستی دنیا بێو سەیری بەرژەوەندی خۆی بکا، جا ئەگەر پێشەوا بەشی دا ئەویش بەگوێی دەکا، بەڵام ئەگەر ئەو بەشی نەدا ئەویش بەگوێی ناکا (ش).

١٨٣٦/٢٩- وَعَنْهُ عن النبـيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أرْبَعُـونَ) قَالُوا يا أَبَا هُرَيْرةَ، أرْبَعُونَ يَوْماً؟ قَالَ: أبَيْتُ، قالُوا: أرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَال: أَبَيْتُ. قَالُوا: أرْبَعُونَ شَهْراً؟ قَال: أَبَيْتُ (وَيَبْلَى كُلُّ شَيءٍ مِنَ الإنْسَـان إلاَّ عَجْـبَ الـذَّنَبِ، فِيـهِ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ، ثُمَّ يُنَزِّلُ اللّٰه مِنَ السَّمَآءِ مَـاءً، فَيَنْبُتُـونَ كَمَـا يَنْبُـتُ الْبَقْـلُ) متفـقٌ عليه[٢٩٨].

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەم فو تا ئەو فو چلە، گوتیان: ئەی ئەبو هورەیرە! مەبەست چل ڕۆژە؟ فەرمووی: نازانم، گوتیان: ئەی مەبەست چل ساڵە؟ فەرمووی: نازانم، گوتیان: ئەی مەبەست چل مانگە؟ فەرمووی: نازانمو لەخۆمەوە ناتوانم بڕیار بدەم ساڵە، ڕۆژە، مانگە، حەفتەیە، چییە، وە حەزرەت فەرموشی: لەشی ئادەمیزادیش گشتی دەڕزێ، تەنها بێخی جوچکەی سمتی نەبێ، کە پێشی دەگوترێ گرێی قنگ، کە بەقەی زەڕەیەك دەبێ، وا لەکۆتایی زنجیرەی پشتی ئادەمیزاد دا، لەوەوە خودا سەر لەنوێ ئادەمیزاد لە ڕۆژی قیامەتا زیندو دەکاتەوە، جا لەوێدا خودا لەئاسمانەوە بارانێ دەبارێنێ، لەسەر شێوەی تۆماوی پیاو، ئیتر چۆن شینایی کاتێ دەڕوێ بەرە بەرە گەورە دەبێ لەشی هەموو ئادەمیزادێ لەو زەڕەیەوە ئاوا دەڕوێتەوە. (ش-(ڕەزای خوای لێ بێ)).

---

[٢٩٨] بوخاری (٢٣٦٩) موسلیم (١٠٨).

١٨٣٧/٣٠- وَعَنْهُ قَالَ بيْنَمَا النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) في مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ، جاءَهُ أعْرابِيٌّ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضَى رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)يُحَدِّثُ، فقَال بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ، فكَره ما قَالَ، وقَالَ بَعْضُهمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ، حَتَّى إذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَالَ: (أيْنَ السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ؟) قَال: ها أنَا يَا رسُولَ اللّه، قَالَ: (إذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانةُ فانْتَظِرِ السَّاعةَ) قَالَ: كَيْفَ إضَاعَتُها؟ قَالَ: إذَا وُسِّدَ الأمْرُ إلى غَيْرِ أهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعة) رواهُ البُخاري[٢٩٩].

**دیسان فەرمووی: جارێ حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەناو كۆڕێكا قسەی بۆ یاران دەكرد، كابرایەكی دەشتەكی هات گوتی: ئەی كەی قیامەتە؟ حەزرەت لەسەر فەرموودەكەی خۆی رۆیشت، یارانیش هەندێكیان گوتیان: پێغەمبەر گوێی لەقسەكەی بوو، وەلێ قسەكەی بەدڵ نەبوو، بۆیەكا وەڵامی نەدایەوە، هەندێكی تریشیان گوتیان نا نەیبیست. كاتێ حەزرەت فەرمایشتەكەی تەواوكرد فەرمووی: ئەوە كێ بوو لە قیامەتی پرسی؟ كابراكە گوتی: ئەوە من بووم ئەمەتام لە خزمەتتا ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: هەركاتێ ئەمانەت واتە: سپاردە پامالّ كرا ئیتر چاوەڕوانی داهاتنی رۆژی قیامەت بكە. ئەعرابیەكە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن چۆنی پامالّ دەكرێ؟ فەرمووی: هەركاتێ كاروباری میللەتو فەرمانڕەوایی موسوڵمانان سپێردراو درایە دەستی ناكەس ئیتر چاوەنواڕی قیامەت بكە (ب).**

١٨٣٨/٣١- وعنْهُ أنَّ رسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) قَالَ: (يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإنْ أصَابُوا فَلَكُمْ، وإنْ أخْطَئُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ) رواهُ البُخاريُّ[٣٠٠].

**دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پێشەواكانتان نوێژتان بۆ دەكەن، جا ئەگەر بەدروستی كردیان ئەوە خێری ئێوەش و خێری ئەوانیش دەگا، بەلاّم ئەگەر بەهەڵە كردیان ئەوە خێری ئێوە دەگاو گوناهی ئەوان (ب).**

---

[٢٩٩] بوخاری (٤٨١٤) موسلیم (٢٩٥٥).
[٣٠٠] بوخاری (٥٩) (٦٤٩٦).

١٨٣٩/٣٢- وَعَنْهُ (رضي اللّٰه عنه): {كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أخْرِجَتْ لِلنَّاسِ} قَالَ: خَيْرُ النَّاسِ لِلنَّاسِ يَأْتُونَ بِهِمْ فِي السَّلاسِلِ فِي أعْنَاقِهِمْ حَتَّى يَدْخُلُوا فِي الإسْلَامِ[٣٠١].

**ديسان ئەبو هورەيرە** (رەزای خوای لێ بێ) **لەتەفسيری ئايەتی: {كنتم خير أمة أخرجت للناس} (آل عمران ٣/١١٠)دا فەرمووی: ئێوە چاكترين كەسن بۆئەم خەڵكە، چونكە ديليان دەكەن‌و كۆت‌و زنجير دەخەنە گەردنيان‌و لەسەر ئەو حاڵە دەيانهێنن هەتا موسوڵمان دەبن، كەوابوو ئێوە بۆ ئەوان دەبن بەمايەی بەختيارى‌و كليلی بەهەشت كەفەرموودەی (لا إله إلا الله)يە دەدەنە دەستيان (ب).**

١٨٤٠/٣٣- وَعَنْهُ عَنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (عَجبَ اللّٰه عَزَّ وَجَلَّ مِنْ قَوْمٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ فِي السَّلاسِلِ) رواهُما البُخاري. معناها يؤسرون ويقيدون ثم يسلمون فيدخلون الجنة[٣٠٢].

**ديسان فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خودای بالآدەست‌و خاوەن شكۆ سەيری دێ لە كۆمەڵێ، بەكۆت‌و زنجيرەوە دەچنە ناو بەهەشت! (ب). مەبەست ئەوەيە بەكافری ديل دەكرێن‌و كۆت‌و زنجير دەكرێتە گەردنيان، تا لەدوايی دا موسوڵمان دەبن‌و دەچنە بەهەشت!.**

١٨٤١/٣٤- وَعنْهُ عَنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (أَحَبُّ الْبِلاَدِ إلى اللّٰه مَساجِدُهَا، وأبَغضُ الْبِلاَدِ إلى اللّٰه أسواقُهَا) روَاهُ مُسلم[٣٠٣].

**ديسان ئەو لەحەزرەتەوە** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: خۆشەويسترين شوێنی هەموو وڵاتێ لەلای خودا مزگەوتەكانيەتی، وە دزێوترين‌و ناخۆشەويسترين شوێنی هەموو وڵاتێ لەلای خودا بازاڕەكانييەتی، چونكە جێگەی فڕوفێڵ‌و درۆو دەلەسەو سوێندی درۆو دەستبڕينە (م).**

---

[٣٠١] بوخاری (٣٠١٠).
[٣٠٢] بوخاری (٣٠١٠).
[٣٠٣] موسليم (٦٧١).

١٨٤٢/٣٥- وَعَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسيِّ (رضي اللّه عنه)منْ قَولِـهِ قَـال: لاَ تَكُـونَنَّ إن اسْتَطعْتَ أوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ السُّوقَ، وَلا آخِرَ مَنْ يَخرُجُ مِنْهَا، فَإِنَّهَا مَعْرَكَةُ الشَّيْطَان، وَبهَا ينْصُبُ رَايَتَهُ. رواهُ مسلم هكذا[٣٠٤].

ورَوَاهُ البرْقَانِي في صحيحه عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: قَالَ رسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (لا تَكُنْ أَوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ السُّوق، وَلا آخِـرَ مـنْ يَخْـرُجُ مِنْهَـا، فِيهَـا بَـاضَ الشَّيْطَانُ وَفَرَّخَ).

سـەلمانی فارسـی (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ئەگـەر بـۆت دەكـرێ تـا دەتـوانی یەكـەم كـەس مەبـە كـە بچـی بـۆ بـازاڕو دواتـرین كەسـیش مەبـە كەلـەبازاڕ دەردەچـیت، چـونكە بـازاڕ شـەڕگەی شـەیتانەو ئـاڵای خـۆی لـەوێ هەڵـدەدا. (موسـلیم (ڕەزای خوای لێ بێ) ئـاوا بـە مـەوقوفی سـەر سـەلمان دەیگێڕێتـەوە، بـەڵام بەرقانی لـە صـەحیحەكەی خـۆی دا بەمـەرفوعی دانـاوەو ئـاوا دەیگێڕێتـەوە: سەلمان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: نە یەكەم كەس بە بچیت بۆ بازاڕو نە دواتـرین كەس بە لێی دەرچیت، شەیتان لەبازاڕ هێلانە دەكاو گەراو بەچكەی تێدەكا.

١٨٤٣/٣٦- وعَنْ عاصِمِ الأحْوَل عَنْ عَبْدِ اللّه بن سَرْجِسَ (رضي اللّه عنه)قَـالَ: قُلْتُ لِرَسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): يَا رَسُولَ اللّه غَفرَ اللّه لكَ، قَالَ: (وَلَكَ) قَالَ عَاصِمٌ: فَقلْتُ لَهُ: اسْتَغْفَرَ لَكَ رَسُولُ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)؟ قَـالَ: نَعَـمْ وَلَكَ، ثُمَّ تَلاَ هَذه الآيةَ: {واستغفِرْ لِذَنْبِكَ ولِلْمُؤمِنِينَ والمُؤْمِنـاتِ} ﴿ محمـد: ١٩ ﴾، رَواهُ مُسلم[٣٠٥].

عاصمی ئەحوەل (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبـدوڵای كـوڕی جـەرجیس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی خۆشەویستم كـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! خـودا لێت خۆش بێ، فەرمووی: لـەتۆش خـۆش بـێ عاصـیم فـەرمووی: پـێم گـوت: ئـەدی پێغەمبـەر داوای لێخۆشـبوونی بـۆ كـردووی؟ فـەرمووی: ئـەدی، داوای لێخۆش بـوونی بـۆ تـۆیش‌و بـۆ هـەموو موسـوڵمانێكی تـریش كـردووە ئینجا عەبدوڵا بۆ چەسپاندنی ئەم قسەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە كە پشتگیری ئەم

---

[٣٠٤] موسلیم (٢٤٥١).

[٣٠٥] موسلیم (٢٣٤٦).

باسه دەكا كە دەفەرموێ: واتە: ئەی خۆشەویست! ئەی پێغەمبەر! وەك ئەزانی بەختەوەری هی خاوەن بڕواكانەو چارە ڕەشیش هی ناموسوڵمانەكانە، كەواتە: لەسەر (عیلمولیەقین)ی خۆت بەیەكتایی خودا بەردەوام بەو داوای لێخۆشبوون لەخودا بكە كە لەگوناهەكانت ببورێ، هەروەها بۆ موسوڵمانیش بۆ نێرو مێ یان بپاڕێرەوەو لەخودا داوای لێبوردنیان بۆ بكە. (م- ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

١٨٤٤/٣٧- وَعَنْ أبي مسْعُودٍ الأنْصَارِيِّ (رضي الله عنه)قَالَ: قَالَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (إنَّ مِمَّا أدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلامِ النُّبوَّةِ الأولَى: إذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنعْ مَا شِئْتَ) رواهُ البُخَاريُّ[٣٠٦].

ئەبو مەسعودی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو فەرمایشتەی كە دەفەرموێ: ئەگەر شەرم ناكەی چی دەكەی بیكە، لەفەرمایشی پێغەمبەرە پێشینەكانە، كە هەتا ئێستا ماوەو گەیشتووە بەم خەڵكە! (ب).

ئەم فەرموودەیە: ئەم دوو واتایە هەڵدەگرێ، یەكەم: هەرشتێ كە دەتەوێ بیكەی، ئەگەر دانەدەنرا بەبێ شەرمی چ لەحزوری خودادا، چ لەلای خەڵك ئەوە دروستەو بیكە، دووەم: هەڕشەیە، ئەگەر شەرمو حەیات نەبوو حاڵت حاڵی ئاژەڵو وڵاخە. یاساو دەستورو شەریعەتیش بۆ ئادەمیزادە نەوەك بۆ كەروگا. (وەرگێڕ).

١٨٤٥/٣٨- وَعَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه)قَالَ: قَالَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يوْمَ الْقِيَامةِ في الدِّمَاءِ) مُتَّفَقٌ علَيْهِ[٣٠٧].

ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەڕۆژی قیامەتا یەكەم شت كە ئادەمیزاد لەسەری مەحكەمە دەكرێ مەسەلەی خوێن ڕشتنو پیاو كوشتنە (ش).

---

[٣٠٦] بوخاری (٥٧٦٩).

[٣٠٧] بوخاری (٦٨٨٤) موسلیم (١٦٧٨).

١٨٤٦/٣٩- وَعَنْ عَائِشَةَ رضي اللّٰه عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (خُلِقَتِ المَلائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخلِقَ الجَانُّ مِنْ مَارِجٍ منْ نَارٍ، وخُلِق آدمُ مِمّا وُصِفَ لَكُمْ) رواهُ مسلم[٣٠٨].

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: فریشتە لەنورو ڕوناکی دروستکراون، جانیش کە باوکی بەرەی جنۆکەیە لە بلێسەی ئاگری پوختەی بێ دوکەڵ دروست کراوە، ئادەمیش لە قوڕێکی وشکەوەبووی وەکوو سواڵەت دروستکراوە، وەکوو خودا لە قورئان دا بەیانی کردووە بۆتان، لەسەرەتاوە لەخۆڵ، وەك دەفەرموێ: (منها خلقناكم..)واتە: ئێمە ئێوەمان لەسەرەتاوە لەخاك دروست کردووە.

لەپاش دا شێلراوەو بووە بەقوڕ، وەکوو دەفەرموێ: {قال: أنا خير منه خلقتني من نار وخلقته من طين} (٧٦/٢٨). واتە: ئیبلیس کە خودا لێی پرسی: ئەی ئیبلیس! بۆ کڕنوشت بۆ ئادەم نەبردو فەرمانەکەی منت لەم بارەیەوە شکان؟ ئیبلیس گوتی: من بە سروشت لە بنەڕەت دا لەو گەورەترم، تۆ منت لە ئاگرێکی ناسكو نورانی دروست کردووەو ئادەمت لە قوڕێکی خەستی تاریك دروست کردووە، ئیتر چۆن سوجدەی بۆ دەبەم. لەپاش ئەم قۆناغەش ماوەیێ بە قوڕی ماوەتەوە تا گۆڕاوەو ڕەش هەڵگەڕاوەو وەك سواڵەت ڕەق بووە، وەك دەفەرموێ: {خلق الإنسان من صلصال كالفخار} واتە: خودا ئادەمی لەقوڕێکی وشکەوەبووی وەکوو سواڵەت دروست کردووە. (م.خ-موسلیم (ڕەزای خوای لێ بێ)).

١٨٤٧/٤٠- وَعنْهَا رضي اللّٰه عَنْهَا قَالَتْ: (كَانَ خُلُقُ نبِي اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)الْقُرْآنَ) رواهُ مُسْلِم في جُمْلَةِ حدِيثٍ طويلٍ[٣٠٩].

دیسان عائیشە خۆشنودی خوای لێبێ فەرمووی: ڕەوشتی پێغەمبەری خودا ڕەفتارکردن بوو بە فەرمانەکانو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز (م- ڕەحمەتی خودای لێبێ).

---

[٣٠٨] موسلیم (٢٩٩٦).

[٣٠٩] موسلیم (٧٤٦).

١٨٤٨/٤١- وَعَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (مَنْ أحَبَّ لِقاءَ اللَّهِ أحبَّ اللَّه لِقَاءَهُ، وَمنْ كَرِهَ لِقاءَ اللَّه كَرِهَ اللَّه لِقَاءَهُ) فَقُلْتُ: يَا رسُولَ اللَّه، أكَرَاهِيَةُ المَوْتِ؟ فَكُلُّنَا نَكْرَهُ المَوْتَ، قَالَ: (لَيْس كَذَلِك، وَلَكِنَّ المُؤمِنَ إذَا بُشِّر بِرَحْمَةِ اللَّه وَرِضْوانِهِ وَجنَّتِهِ أحَبَّ لِقَاءَ اللَّه، فَأَحبَّ اللَّه لِقَاءَهُ وإنَّ الْكَافِرَ إذَا بُشِّرَ بعَذابِ اللَّه وَسَخَطِهِ، كَرِهَ لِقَاءَ اللَّه، وَكَرِهَ اللَّه لِقَاءَهُ).رواه مسلم[310].

**دیسان عائیشه** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەرکەسێ حەز بەدیداری خودا بکا خوداش حەز بەدیداری ئەودەکا، وە هەرکەسێ حەز لەدیداری خودا نەکا خوداش حەز لەدیداری ئەو ناکا منیش گوتم: جا خۆ کەسمان حەز لەمردن ناکەین، گوایە دەبێ خوداش حەز لە ئێمە نەکا؟ فەرمووی: مەبەست ئەمە نییە کە تۆ تێی گەیشتوویت، بەڵام موسوڵمان لەسەرەمەرگا فریشتە مژدەی ڕەحمەتو ڕەزامەندییو ڕێز لێگرتنی خودای دەدەنێ لەگەڵ نازو بەهرەی بەهەشتا، ئیتر ئەویش هیچی تری وەك ئەو دنیا پێخۆش نابێ، وە حەز لەدیداری خودا دەکاو خوداش حەز بەدیداری ئەو دەکا، کافرو بێبڕواش کاتێ کە مردن قورتمی دەگرێ، وە مژدەی سزاو تۆڵە لێسەندنی خودای پێدەدرێ، ئیتر هیچی تری وەك ئەو دنیا پێناخۆش نابێ، وە حەز لەدیداری خودا ناکاو خوداش حەز بەدیداری ئەو ناکا (م-**(ڕەزای خوای لێ بێ)**).**

١٨٤٩/٤٢- وَعَنْ أُمِّ المُؤْمِنِينَ صَفِيَّةَ بنْتِ حُيَيّ رَضِيَ اللَّه عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مُعْتَكِفاً، فَأَتَيْتُهُ أزُورُهُ لَيْلاً. فَحَدَّثْتُهُ ثُمَّ قُمْتُ لأنْقَلِب، فَقَامَ مَعِي لِيَقْلِبَنِي، فَمَرَّ رَجُلانَ مِنَ الأنْصارِ رضي اللَّه عَنْهما، فَلمَّا رَأيَا النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أسْرعَا. فَقَالَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (عَلَى رِسْلُكُمَا إنَّهَا صَفِيَّةُ بنتُ حُيَي□) فَقالاَ: سُبْحَانَ اللَّه يَارسُولَ اللَّه، فَقَالَ: (إنَّ الشَّيْطَانَ يَجْري مِنْ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ، وَإنِّي خَشِيتُ أنْ يَقذِفَ في قُلُوبِكُمَا شَرا أوْ قَالَ: شَيْئاً) متفقٌ عليه[311].

---

[310] موسليم (٢٦٨٤).

[311] بوخاری (٢٠٣٥) موسليم (٢١٧٥).

دایکی موسوڵمانان صەفییەی کچی حویەی، هاوسەری پێغەمبەر درودی خودا لەخۆی و ڕەزای خودا لە هاوسەرەکانی بێ فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) خەڵوەی دەکێشا، شەوێ چووم بۆ دیدەنی، تاوێ قسەو گفتوگۆم لەگەڵ کردو هەڵسام بچمەوە بۆ ماڵەوەم، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵما هات تا ڕەوانەم بکاتەوە، وەماڵی صەفییە لەخانووەکەی ئوسامەی کوڕی زەیددا بوو، جا لەو کاتەدا دوو پیاو لە یاریدەدەران (ئەنصار) (ڕەزای خوایان لێ بێ) لەوێوە ڕەت بوون، کاتێ کە پێغەمبەریان دی لەگەڵ من دا پێیان هەلگرت، ئەویش فەرمووی: پەلە مەکەن و مەپەشۆکێن، ئەمە صەفییەی کچی حویەییە کەژنی خۆمە ئەوانیش گوتیان: سوبحانەڵلا! نامە خوا لەکاری خوا! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە چۆن دڵ لەتۆپیس دەکەین! فەرمووی: ئاخر شەیتان لەناو جەستەی ئادەمیزاددا بۆ چاندنی تۆوی شەڕ وەکوو خوێن هاتوچۆ دەکات، لەبەر ئەوە ترسام کە شەیتان شتێ یا گومانێکی بەد بخاتە ناو دڵتانەوەو دڵتان لەمن کرمێ ببێ و ببێ بەهۆی فەوتانتان. (شەیخان (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

٤٣/١٨٥٠- وَعَنْ أبي الفَضْل العَبَّاسِ بـن عَبْـدِ الْمُطَّلِـب (رضـي اللّـه عنـه)قَـالَ: شَهِدْتُ مَعَ رسُول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَوْمَ حُنَين فَلَزمْتُ أنَا وَأبُو سُفْيَانَ بـنُ الحَارِثِ بنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَسُول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)لَمْ نفَارِقْهُ، ورَسُولُ اللّـه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)على بغْلَةٍ لَهُ بَيْضاءَ.

فَلَمَّا الْتَقى الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْركُونَ وَلَّى الْمُسْلِمُونَ مُـدْبِرينَ، فَطَفِـقَ رسُـولُ اللّـه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، يَرْكُضُ بَغْلَتَهُ قِبل الْكُفَّارِ، وأنَا آخِذٌ بِلِجَام بَغْلَةِ رَسُول اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)أَكُفُّهَا إرادَةَ أنْ لا تُسْرِعَ، وأبو سُفْيانَ آخِذٌ بِركَابِ رَسُـولِ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم).

فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أيْ عبَّاسُ نـادِ أصْـحَابَ السَّـمُرَةِ) قَالَ العبَّاسُ، وَكَانَ رَجُلاً صَيِّتاً: فَقُلْتُ بِأعْلَى صَوْتِي: أيْن أصْحابُ السَّمُرَةِ، فو اللّه لَكَأَنَّ عَطْفَتَهُمْ حِينَ سَمِعُوا صَوْتِي عَطْفَةَ الْبَقرِ عَلَى أوْلادِهَا، فَقَالُوا: يالَبَّيْكَ يَالَبَّيْكَ،

فَاقْتَتَلُوا هُمْ والْكُفَارُ، والدَّعْوةُ في الأنْصَار يقُولُونَ: يَا مَعْشَرَ الأنْصـارِ، يـا مَعْشـر الأنْصَار، ثُمَّ قَصُرَتِ الدَّعْوةُ عَلَى بنِي الْحَارِثِ بن الْخزْرَج.

فَنظَرَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)وَهُوَ على بَغْلَتِهِ كَالْمُتَطَاول عليْهَـا إلَـى قِتَالِهِمْ فَقَال: (هَذَا حِينَ حَمِـيَ الْـوَطِيس) ثُـمَّ أخَـذَ رَسُـولُ اللَّـه (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم)حصياتٍ، فَرَمَى بِهِنَّ وَجُوه الْكُفَّارِ، ثُمَّ قَال: «انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ» فَذَهَبْتُ أنْظُرُ فَإذَا الْقِتَالُ عَلَى هَيْئَتِـهِ فِيمـا أرَى، فَواللَّـه مـا هُـو إلاَّ أنْ رمَـاهُمْ بِحَصَـيَاتِهِ، فَمَازِلْتُ أرَى حدَّهُمْ كَلِيلاً، وأمْرَهُمْ مُدْبِراً. رواه مسلم[٣١٢].

ئەبولفاضل عەباسی کوڕی عەبدولموطەلیب، مامەی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ)و ڕەزای خوداش لەوبێ فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەر خۆی دا ئامادەی غــەزای حونــەین بــووم، خــۆم و ئەبوســوفیانی کــوڕی حاریســی کــوڕی عەبدولموتــەلیب لــە خزمــەتی دا بــووین و بەهەناســە لێــی جیــا نەبووینــەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەسواری ئەو هێسترە سپییەی خۆی بوو کە فەروەی کوڕی نوفاثەی جوذامی بە دیاری بۆی هێنا بوو، جا کاتێ موسوڵمانەکان و نـا موســوڵمانەکان بــەرەنگاری یــەکتر بــوون و دایــان بەیــەك دا موســوڵمانەکان لەسەرەتاوە شکان و بەرەو دوا هەڵهاتن، بەڵام پێغەمبــەر خــۆی (درودی خوای لەسەر بێ) متمانەی تەواوی بــەخودای خــۆی هــەبوو لەبــەر ئــەوە هێســترەکەی ژێرخــۆی بەرەو لەشکری نا موسوڵمانەکان تاودەدا، منــیش لــەغاوی هێســترەکەیم تونــد گرتبــوو، نــەم دەهێشــت خێــرا بــڕوات، ئــەبو ســوفیانیش ئاوزەنگییەکــەی پێغەمبەری گرتبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی عەبباس! بـانگ کە ئەی دەستەی پەیمانی خۆش نودی! ئەی یارانی بەیعەتولڕضوان! ئەی ئەو کۆمەڵەی کە لەڕووداوەکەی حودەیبییەدا لــەژێر دارســەموورەکەدا پــەیمانتان بەســت لەگــەڵ پێغەمبــەردا! عــەبباس پیــاوێکی دەنــگ گــەورە بــوو، عــەبباس فەرمووی: جامنیش بەهەموو دەنگی خــۆم هــاوارم کــرد: هــۆ یــارانی پــەیمانی خۆشنودی، هۆ... هاوڕێیانی بەیعــەتولڕضــوان! کوان و لــەکوێن؟ بــەو خودایــە

[٣١٢] موسلیم (١٧٧٥).

ئیتر هەر ئەوەندە کە دەنگی منیان بیست هەموو بەپەلە گەڕانەوە بۆلای حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) وەك چۆن چێڕێ بەچکەی لێبەجێمابێ بەهەڕاکردن دەچێتەوە بۆ سەری، ئەوانیش ئاوا، ئیتر لەهەر چوارلاوە بەیەك دەنگ دەیانگوت: بەسەر سەر، بەسەر سەر، واهاتین، سەرمان لەڕێتایە، ئەوجا لەگەڵ نا موسوڵمانەکان دا پێك هەڵپرژان، خۆش خۆشیش هەر بانگەواز لە یاریدەدەران دەکراو دەیانگوت: ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئینجا بەتایبەتی بانگەواز لەنەوەی حارثی کوڕی خەزرەج دەکراو دەیانگوت: هۆ نەوەی حاریث! هۆ نەوەی حاریث!

جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەسەر پشتی هێسترەکەی خۆیەوە بەرەو شەڕگەکە نواڕیو سەرنجێکی کوشتارەکەی داو فەرمووی: وا ئێستا تەندوری جەنگ گەرم بوو! بەڕاستی شەڕ گەرم بوون وادەبێ! ئەوسا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) مشتێ چەوی هەلگرتو وەشاندی بەڕووی ناموسوڵمانەکان داو فەرمووی: بەخودای موحەممەد، کە خودا یاربێ قەت پشتی نادا لەعەرد، لەسایەی خوداوە وا شکان! فەرمووی: منیش چووم تەماشای هەراکەم کرد، بەڵام لەبەر چاوی من هێشتا کوشتار وەك خۆی گەرم بوو، بەدیمەن هەردوو بەرەکە بەرامبەر بوون، کەچی هەر ئەوەندە بوو کە مشتە چەوەکەی بەڕوویان دا وەشان، ئیتر بەوخوایە سەرنجم دەدا دەم بەدەم ناموسوڵمانەکان کزو لاواز دەبوونو بەربەرە گلۆڵەیان دەکەوتە لێژی (م).

١٨٥١/٤٤- وعَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (أَيُّهَا النَّاسُ إنَّ اللّٰه طيِّبٌ لا يقْبلُ إلاَّ طيِّباً، وَإِنَّ اللّٰه أمَر المُؤمِنِينَ بِمَا أمَر بِهِ المُرْسلِينَ، فَقَال تَعَالَى: {يَا أَيُّها الرُّسْلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّباتِ واعملوا صَالحاً} وَقَال تَعالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمنُوا كُلُوا مِنَ طَيِّبَات مَا رزَقْنَاكُمْ} ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَر أشْعَثَ أغْبر يمُدُّ يدَيْهِ إلَى السَّمَاءِ: يَاربِّ يَارَبِّ، وَمَطْعَمُهُ حَرامٌ، ومَشْرَبُه حرَامٌ، ومَلْبسُهُ حرامٌ، وغُذِيَ بِالْحَرامِ، فَأَنَّى يُسْتَجابُ لِذَلِكَ،؟) رواه مسلم[٣١٣].

---

[٣١٣] موسلیم (١٠١٥).

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویسـت (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: هەی مـەردووم! ئـەی نـەوەی ئـادەم! بـزانن خـودا بۆخۆی پـاكو خاوێنە هەرچیش پـاكو خـاوێنو حـەلاڵ نـەبێ وەرینـاگرێو قـەبووڵی ناكا، بزانن خودا چی فەرمانێكی بە پێغەمبەران كردووە، لەبارەی كردنی حەلاڵو نەكردنی حەرامەوە، هەمان فەرمانیشی بـە موسـوڵمانانو خـاوەن باوەڕەكـان كردووە، ئەوەتانێ بە پێغەمبەرەكان دەفـەرموێ: {يـا أيهـا الرسـل كلـوا مـن الطيبات واعملـوا صـالحا} ٥١/٢٣ واتـە: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بخۆن لـە خواردەمەنی حەلاڵو پاك، وەكارو كـردەوەی بـاش بكـەن وە بەموسـوڵمانانو خاوەن باوەڕەكانیش دەفـەرموێ: {يا أيهـا الـذين آمنـوا كلـوا مـن طيبـات مـا رزقناكم} ١٧٢/٢ واتە: ئەی كەسانێ كە باوەڕتان هەیـە بـەخودا! بخۆن لـەو خواردەمەنیە باشو پاكو حەڵاڵانە كە ئێمە كردومانن بە ڕزقو ڕۆزی ئێوە.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ئـەوجا حـەزرەت باسـی هەنـدێ كەسـی كـرد كـە تاعـەتێكی جـوانی خـودا دەكـەن بـەڵام نـانو ئاوەكـەیان حەرامـە، فەرمووی: هەندێ كەس دەچن بۆ سەفەری دورو درێژ وەك حەجو غەزا، جا قـژیان گـڤ دەبـێو چـڵكو تـەپوتۆزیان لێدەنیشـێو سـەرگەرمی بەنـدەیی خودانو بەكوڵو دڵ دەسـت درێـژ دەكـەن بـەرەو ئاسمـان كـە قیبلـەگای نـزاو پاڕانەوەیەو دەڵێن: خودایە! ئـەوەم پـێ بـدە، خودایـە! لـەو دەردو بەڵایـە لام بدە، ئەو خواردنـە كـەی حەرامـە، خواردنەوەكـەی حەرامـە، بەحـەرام گۆش كراوە، ئیتر لەكوێ دوعاو نزای ئەو جۆرە كەسەیە گیرا دەبێ! (م-(ڕەزای خوای لێ بێ)).

١٨٥٢/٤٥- وَعنْهُ (رضي اللّه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (ثَلاثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمْ اللّه يوْمَ الْقِيَامةِ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلا ينْظُرُ إلَيْهِمْ، ولَهُمْ عذَابٌ أليمٌ: شَيْخٌ زَانٍ، ومَلِكٌ كَذَّابٌ، وَعَائِل مُسْتَكْبِرٌ) رواهُ مسلم[٣١٤].

⇦ (ب/٢ ز/٧٢ ژ-٦١٧/٦ = لاپەڕە/١٦٢ چاپی دووەم).

[٣١٤] موسلیم (١٠٧).

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا ئەم سێ کەسە خودا نەقسەیان لەگەڵ دەکاو نە تاریفیان دەکاو نە لە تاوان پاکیان دەکاتەوەو نە بەچاوی میهرەبانی تەماشایان دەکا، سەرەڕای ئەوەش سزاو ئازارێکی بە ئێشیان بۆهەیە، یەکەم پیری شەروالپیس، دووەم: پاشای درۆزن، سێیەم: هەژاری فیزنی خۆ بەزل زان. (موسلیم** (ڕەزای خوای لێ بێ)**).**

١٨٥٣/٤٦- وَعَنْهُ (رضي اللّه عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (سيْحَانُ وجَيْحَانُ وَالْفُراتُ والنِّيلُ كُلٌّ مِنْ أنْهَارِ الْجَنَّةِ) رواهُ مسلم[٣١٥].

**دیسان فەرمووی: حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: سەیحان‌و جەیحان‌و فوڕات‌و نیل ئەم چوار ڕووبارە گەورەیە لە ڕووبارەکانی بەهەشتن‌و لەوێوە ماکەکەیان دەست پێدەکات (م)•.**

---

[٣١٥] موسلیم (٢٨٣٩).

• لەسەر فەرموودەی دەلیل‌و الفالحین (ڕەزای خوای لێ بێ) شێخی سیوتی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (هو على ظاهرة ولها مادة الى الجنة) واتە: ڕووکارو زاهیری فەرموودەکە کەبەستەو پێویست بە تەئویل ناکا، بەواتا ئەم ڕووبارانە ماکیان دەچێتەوە سەر ڕووبارەکانی بەهەشت. مونجید دەڵێ: (المادة: مايتركب منها الشيئ ويقوم بـه). مامۆستا هەژاری هێژاو هۆزان، لە هەنبانە زێرینەدا دەقی ئەم پێناسەیەمان ئاوا بۆ دەکا بە کوردی: ماك: هەر ڕەگەزو بنچینەیێ کە شتی لێپێك هاتووە، هۆی دروست بون، فارسی: مادە: تەماشای (نهاية الغريب)و شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم‌و هەنبانە بۆرینەو مونجید بکە. لە ئوصولی فیقهـ دا دەفەرموێ: الإجتهاد هو بذل الوسع من المجتهد في طلب العلم بأحكام الشريعة. مەبەستم لەم ڕوونکردنەوەیە ئەمەیە: خودا یاربێ بەپێی تەوانای کەم سنووری خۆم هەوڵ‌و تەقەلایەکی چاك دەدەم‌و کتێبی شەرح‌و فەرهەنگەکان دەپشکنم، هەتا دڵنیا دەبم لەراستی‌و دروستی وەرگەڕاوە کوردییەکە نەوەکا خوا نەخواستە توشی تەحریف‌و دروستی دەسکاری فەرموودەکان ببم. دەنا مەبەستم ئەوە نییە کەلافی ئیجتیهاد لێبدەم!

داخەکەم نوسەری کوردی، ناڵێم خۆی متمانەی بەخۆی نییە، بەڵکوو خوێنەر بڕوای بەقسەی کەمە، لەبەرئەوە دەبێ هەمیشە پارێزەری خۆی بێ‌و هێرشی خلەو بلە بەرپەرچ بداتەوە.

لەخودا داوا دەکەم کارو کردەوەمان ساخ بۆ ڕەزای خودا بێ‌و دوور لە چاوەو بەخۆنازین بێ.

وەرگێڕ

سلێمانی/مامۆستایان-١١/١١/١٩٩١

١٨٥٤/٤٧- وَعَنْهُ قَال: أخَذَ رَسُولُ اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بِيَدِي فَقَالَ: (خَلَقَ اللَّه التُّرْبَةَ يوْمَ السَّبْتِ، وخَلَقَ فِيهَا الْجِبَالَ يَوْمَ الأحَد، وخَلَقَ الشَّجَرَ يَوْمَ الإثْنَيْن، وَخَلَقَ المَكْرُوهَ يَوْمَ الثُّلاثَاءِ، وَخَلَقَ النُّورَ يَوْمَ الأَرْبَعَاءِ، وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَوْمَ الخَمِيسِ، وخَلَقَ آدَمَ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ يَوم الجُمُعَةِ في آخِرِ الْخَلْقِ في آخِرِ سَاعَةٍ مِنَ النَّهارِ فِيمَا بَيْنَ الْعَصْرِ إلى الَّليلِ).رواه مسلم [٣١٦].

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی گرتمو فەرمووی: لەڕۆژی شەممەدا خودا خاکی دروست کرد، لەڕۆژی یەك شەممەدا خودا کێوەکانی دروست کرد، لەڕۆژی دوو شەممەدا دارو درەختی دروست کرد، لە ڕۆژی سێ شەممەدا ناخۆشی (مەکروه)ی دروست کرد، لەڕۆژی چوارشەممەدا روناکی (نور)ی دروست کرد، لە ڕۆژی پێنج شەممەدا خشۆكو زیندەوەرانی بەناو زەوی دا پەخشو پرش کردەوە، لەپاش عەصری ڕۆژی هەینیش لەدوا تاوی ڕۆژدا، لەبەینی عەصرو شێوان دا، لەئاخرو ئۆخری دروستکراوان دا خودای گەورە ئادەمی دروست کرد (دروودی خوای لەسەر بێ). (م).

١٨٥٥/٤٨- وعنْ أبي سُلَيْمَانَ خَالِدِ بن الْوَلِيدِ (رضي اللَّه عنه)قال: (لَقَدِ انْقَطَعَتْ في يَدِي يَوْمَ مُؤتَةَ تِسْعَةُ أسْيافٍ، فَمَا بقِيَ في يَدِي إلا صَفِيحةٌ يَمَانِيَّةٌ).رواهُ البُخاري [٣١٧].

ئەبو سولەیمان خالیدی کوڕی وەلید (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لەڕۆژی غەزای موئتەدا، بوو بەشەڕێکی وا گەرمو سەخت بەرودوا نۆ شمشێرم بەدەستەوە شکا، هیچم بەدەستەوە نەما شمشێرە پانکەڵەیەکی یەمەنی نەبێ. (بوخاری، ڕەحمەت لەخۆیو کەسو کاری).

١٨٥٦/٤٩- وعَنْ عمْرو بْنِ الْعَاص (رضي اللَّه عنه)أنَّهُ سَمِع رسُولَ اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)يَقُولُ: (إذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ، فَاجْتَهَدَ، ثُمَّ أصاب، فَلَهُ أجْرانِ وإنْ حَكَم وَاجْتَهَدَ، فَأَخْطَأَ، فَلَهُ أجْرٌ) متفقٌ عَلَيْهِ [٣١٨].

---

[٣١٦] موسليم (٢٧٨٩).

[٣١٧] بوخاری (٤٢٦٥).

عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم ژنەوت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: دادپرس (حاکم) ئەگەر تێکۆشیو لەمەسەلەکە باش وردبێتەوە بۆ گەیشتن بەهەق، لەهەمان کات دا شیاوی ئەوەشی هەبێ، ئینجا بڕیارەکە دەرکا، ئەوا لەم حاڵەدا ئەگەر بڕیارەکەی ڕاست بوو ئەوە دوو پاداشی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر بڕیارەکەی هەڵە بوو ئەوە یەك پاداشی بۆ هەیە (ش).

١٨٥٧/٥٠- وَعَنْ عائِشَةَ رضي اللّٰه عَنْهَا أنَّ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّم فأبْرِدُوهَا بِالمَاءِ) متفقٌ عليه[٣١٩].

لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: تا لە هاڵاوی دۆزەخە بەئاو فێنکی بکەنەوە (ش).

١٨٥٨/٥١- وَعَنْهَا رضي اللّه عَنْهَا عَنِ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ:((مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صَوْمٌ، صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ) متفقٌ عَلَيْهِ.

وَالُمخْتَارُ جَوَازُ الصَّوْمِ عَمَّنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صَوْمٌ لِهَذَا الْحَدِيثِ، والُمرَادُ بالْوَلِيِّ: الْقَرِيبُ وَارِثاً كَانَ أوْ غَيْرِ وَارِثٍ[٣٢٠].

دیسان لەوەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕنەوە: دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ بمرێ وە ڕۆژوی لەسەر بێ کەسو کارەکەی دەتوانن لەباتی ئەو بەڕۆژو بنو بۆی قەزا بکەنەوە (ش).

ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: بەپێی دەقی ئەم فەرموودەیە ڕای پەسەند ئەوەیە کە دروستە ڕۆژوو بۆ مردوو قەزا بکرێتەوە، مەبەستیش لەکەسو کار هەموو خزمێکی مردووەکەیە، چ نزیك بێ چ دوور. فەرمایشتەکەی نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) هاتە کۆتایی.

---

[٣١٨] بوخاری (٧٣٥٢) موسلیم (١٧١٦).

[٣١٩] بوخاری (٣٢٦٣) موسلیم (٢٢١٠).

[٣٢٠] بوخاری (١٩٦٥) موسلیم (١١٤٧).

بسم الله الرحمن الرحيم

گەلێ بەپەلەم لە تەواوکردنی ئەم نامە پیرۆزانە، چونکە بەڵاو مەینەت لەگشت لاوە وەك قیسپو تەورو تەوراس دادەبارێن. خودا پەنامان بدا. (ئەمجارەیش خودایە: ٢٠٠٣/٣/٦).

لەگەڵ ئەوەش دا زۆرجاران، بەزۆری زۆرداریی دەورو بەر دەمهێنێتە قسەو تێچەنێکی لاوەکی بەبەندە تۆمار دەکا، گەرچی من گشت کات لە بارودۆخی گشتی ناو جەماوەرە موسوڵمانەکە خۆشبینو گەشبینم، وەلێ ئەوە مەعنای ئەوە نییە کە لەئاستی گێرەشێوێینی بەدکارەکان خۆمان کەڕو کوێرو لاڵ بکەین. بەزەینم ئەم پەراوێزو سەرنجانەی من لە چوارچێوەی ئەم شیعرە دەناچن:

کەم کەمە دڕک لەناو باخچەی گوڵ
کێش دەکا بۆخۆی سەرنجی بولبول
گەلێکم دیوە هێلکەی کەمێ شل
لەبنجێ دڕکا، دەق لەشێوەی دڵ

لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا خەریکە بەرەبەرە دین دەخرێتە ناو چوارچێوەی مزگەوتەکانو جەماعەتی مەحصورو تاكو تەرای موسوڵمانان لێرەو لەوێ پەیڕەوی بکەنو بەس!.

بەتایبەتی کەسانێ پەیدا بوون، بەدیمەن موسوڵمانن، بەدڵ جەجاڵن، بەناو سەراسەری وڵاتی ئیسلام دا بڵاو بونەتەوە، مامەڵەو بازرگانیو سەودا بەئایینەوە دەکەن، ئەم دینە نازدارەیان کردووە بە دەزگرو بە پاشکۆی قەومیەتو ڕەگەز پەرستی کە ئیشیان پێی نەبوو ناوی دەنێن فۆلکلۆرو ئەحواڵ شەخصیو توراثو شتی وا، کە کاریشیان پێی بوو دەڵێن: {أطيعوا الله وأطيعوا الرسول وأولي الأمر منكم} ئیتر هەر قسەی هەقەو دەیڵێنو مەبەستیان پێی ناهەقە، بۆ مەبەستی گڵاوی خۆیان گاڵتە بەخودا، بەهەق، بەخوێنی مرۆڤ، بەقورئان، بەهەموو شتێکی ڕێزدارو پیرۆز دەکەن، هەموو

شتێ رێزدارو بێ رێز، بۆ سودو بەرژەوەندی خۆیان وەك ماشەو مەقاش بەکاردەهێنن.

دروشمی رێبازە چەپەڵەکەیان ئەم قسە قۆڕەیە کە دەڵێن:

الغاية تبرر الوسيلة: لەپێناوی هاتنەدی مرازدا، هەموو ئامرازێ، با نەهەقیش بێ، ڕەوایە!!

بەڕاستی ئەم فێڵ لەخۆکەرانە سەریان لەئێمە مانانیش تێکداوە، کە بەعەزرەتەوەین گەلەکەمان سەربەرزو سەرفرازی هەردوو جیهان بێ!

هاکا مرۆی موسوڵمان لەناو کۆڕی رۆشنبیرەکان دا نەوێرێ باسی بابەتی دین‌و قەبرو قیامەت‌و پیاوچاکانی پێشینی ئەم گەلی ئیسلامە بکا، دەنا لەهەر چوار لاوە خێسەی لاقرتی‌و بزەی تیزپێکردن دەست پێدەکا، بێشەرمانە دێنەوە بەگژ دەمتا، بەتایبەتی جەهێڵە هەڵەشە هەڵخەڵەتاوەکانمان بەهەلی دەزانن‌و بەتەوس‌و تەڵفیسیەوە دەڵێن: ئەمیرولموئمینینی دوێنێکە جیاوازی نییە لە ئەمیرولموئمینینی ئەمرۆکە، ئەوەندە هەیە کۆنەکان مەلەفەکانیان پێچراوەتەوەو بە پڕو پاگەندەیەکی زۆر لەبەرچاوی خەڵك شیرین کراون، دەنا دەقاو دەق هەریەکەیان فیرعەون‌و نەمروودی چەرخی خۆی بووە!!

لەڕاستی دا ئادەمیزاد بەزەیی بەپێشنان‌و پاشینانی ئەهلی دین دا دێتەوە، کەچۆن بەدەست ناکەسەوە بوون بەپەند، وەلێ مەرد ئەو مەردەیە چاکی پیاوەتی لێبکا بەلاداو گوێ بەلاژگە لاژگی گەوج‌و نەفامان نەداو لەبەر باری خودادا خۆگرو بە حەوصەلە بێ، ئەم بارودۆخ‌و حاڵەش چەشنە تاقیکردنەوەیەکی خودایە، خۆ ئێمەی ئومەت لە پێغەمبەرەکان زیاتر نین، ئەوەتا هەریەکەیان ملۆزمێ بەدیار سەریەوە بووە، ئادەم: شەیتان، ئیبراهیم: نەمروود، موسا: فیرعەون، موحەممەد: ئەبوجەهل‌و ئەبو لەهەب.

ئەی برای کوردی مەرد! ئەی کاکەی موسوڵمانی چاکی پاك! بزانە دین دینی خودایە، ئیسلام نوری خودایە، بەری رۆژ بە بێژنگ ناگیرێ، کەواتە ئەگەر خۆت بەتەنها لەسەر رێگەی حەق ماوی‌و خەڵکانی تر لەسەر ئەوە

لێت بوون بە دوژمن دەربەست مەیە، تۆ لەگەڵ خودای خۆت دا ئاشت بە با لەسەر ئەوە هەموو دنیا لەگەڵ تۆدا تۆرابێ، تۆ براوەی ئەوان دۆڕاون!

براکەم! ئەوانەی کەلەئەوان بازرگانی بەئاینەوە دەکەن و ئەوانەی کەلەخۆمان دەڵێن: ئێمە کوشتەی دەستی ئەم دینەین ئەم دوو گرۆهە سەرەڕای ئەوەی کە بێڕێزی بەدین دەکەن و ئاگری کورەی ڕق و توڕەیی خودا خۆش دەکەن بەردی بنچینەی ژینیش هەڵدەتەکێنن، زوربەی ئەمانە نەلەدین تێگەیشتوون و نەلە ژین! بزانن دین و ژین هاوکارو تەواکەری یەکترین، ئەگەر ژین شانەی هەنگوین بێ دین شیلەکەیەتی، دین چاوە بۆ ژین، ژین بەبێ تیشکی دین بەرەلاّییە، بێ ڕەوشتییە، دەق ئاژەڵییەتە، دین هەوێنی ژینە، بەبێ ئەو هەوێنەیە قەد نامەیێ، بەڵکوو هەمیشە دەبزرکێ.

بەکورتی و کوردی عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم: بزانن دین دوو بەشی سەرەکییە، بەشی یەکەم: پتەوکردنی پەیوەندی بەندەیە بەخودای پەروەردگارییەوە، بەکردنی تاعەت و خواپەرستی ڕاست و دروست، لەسایەی خوداوە ئەم بەشەیان لەئاینی ئیسلام دا زۆر ڕوون و ئاشکراو خۆش و ئاسانە، لەخودا بەزیاد بێ ئەم لایەنە لەکتێبی شەریعەت دا روونکراوەتەوە، پێویستی بە ڕوونکردنەوەی تر نییە، بۆئەمە نەلە قسەی ئەو کتێبانەو نە لەقسەی مەلاکانمان دەرمەچن. بەمن بێ تەنانەت پیاو لەناو قورئانێکا دەوری قورئان بکاتەوە کە دووسەد ساڵ لەمەو پێش نوسرابێتەوە، چونکە ئەمڕۆ خەڵك ئەمانەتیان کەم بووە!

بەشی دووەم: دین بینایی ژینە، ڕێکخەری ژینە، مامۆستاو چاودێرێکی دڵسۆزە بەسەریەوە، بە ڕشتەیەکی پتەو ڕیزو چینەکانی ئادەمیزاد بەیەکەوە شیرازەو جووت بەقێ دەکا، وەك جوتیارێکی لێزان تۆوی دۆستایەتی و برایەتی و هاوکاری و یەکیەتی و ڕەحم و خۆشەویستی و ڕەفتاری شیرین بەناو کێڵگەی کۆمەڵگەی مرۆڤ دا دەوەشێنێ، لەهەر لا گوڵ و گوڵزار پەخش و پرش دەکاتەوە، لەگشت لا چقڵ و دڕوو درەو دەکا، هەروەك چۆن عیلمی نەحو قەیدی زینەتە بۆ ئاخاوتن و زمان لەهەڵەو غەڵەت دەپارێزێ، یا وەك چۆن

عەرووزو زانینی کێش‌و سەروا قەیدی زیینەتن بۆ شیعرو ناهێڵن کە شیعر لەنگ بێ، گەلێ بەناسك‌و نازداری لەنگەری کێش دەگرن، دینیش ڕێك ئاوا بەبێ زیادو کەم قەیدی زیینەتە بۆ ژین، ئەگەر پێوەندی دین لە پێی دەریای ژین دا نەبێ، ژین دەبێ بە جەنگەڵێ، دۆزەخ لەچاویا بەهەشت دەبێ!

بەڵێ سوێندم بەیەزدانی پاك ئەگەر لغاوی خودا نەبێ لەدەمی هەندێ کەس دا گۆی زەوی بەیەك دەم دەکا بەگۆمی خوێن! چونکە لغاوی خودا لەدەمی خودا نەناسەکانیشا هەر هەیە. ئیتر با لەمە پتر بەقسەی بێ سەروبەری خۆم سەرت نەیێشێنم، بزانە سێبەری دین چەتری ڕەحمەتی سەر سەری ژینە، لەپەنا دینا سەر ڕەحەتە، دڵ پڕ ڕەحمەتە، ژین خۆش‌و نازدارو بەقەدرو بەنرخە. خۆ مەبەستیشم ئەوە نییە کە گشتمان ببین بە کاك أحمەدی شێخ‌و حەزرەتی غەوث (قدس الله سرهما العزيز)، قەیناکە بەندەیەکی گوناهباربە، بەڵام خۆت بەبەندەی خودا بزانە، نەك بەبەندەی شەیتان، چەند خۆشە بەندەی گوناهبار هەمیشە چاوی لەقاپی ڕەحمەتی خودا بێ‌و چاوەنواڕی لێبوردن‌و چاوپۆشی بێ. لەکێ؟ لە خودای خۆی!

هاوڕێیەکی گیانی بەگیانیم هەیە، زوربەی کاتی فەقێیەتیمان وەك لازم‌و مەلزوم وابووین ئێستاش لەسایەی خوداوە وەك دوو برای ئاشت‌و خۆشەویست واین، مەبەستم لەم برا ئازیزو بەڕێزەم جەنابی مامۆستا عەبدولغەفوری حاجی ئەحمەدی کانی سپیکەییە، کە داخەکەم ئەویش وەك من خەسار بوو، چونکە نەقڵی خزمەتی لەئەوقافەوە کرد بۆ تەربیە، وە ئێستا مامۆستایە، گومانم نییە کە ئەم زاتەو گەلێکی تری وێنەی ئەم زاتە، ئەگەر لەشوێن‌و ڕێی خۆیان هەڵنەکەندرانایەو لەناو کۆڕی مەلاو مزگەوت‌ومەجالی خزمەتی دین دا بمانایەتەوە، هەریەکەیان مەلایەکی چاکی گەورەی زانای دانای لێدەردەچوو، مانەندی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارەو شێخ نوری بابە عەلی‌و قازی شێخ موحەممەدی خاڵ‌و مەلای کۆیەو مەلای هەولێرو مەلای جەزیری‌و مامۆستا مەلا صاڵحی تریفە، وە ئێستا ئاوا جێگەیان چۆڵ نەدەبوو، وە ئەو هەموو مزگەوتە نازدارانە ئاوا لەبەر بێ مەلایی بێ ناز نەدەکەوتن!

بەڕاستی گەلێ لەمەلاکانمان جبەو مێزەرەکەیان حەرام کردووە، یا بێ تەقوان، یا نەخوێندەوارن، ئەگەر جبەو مێزەرەکە دانێن خۆزگەیان بە عەوامو ڕەشە خەڵکەکە!

جا منو مامۆستا عەبدولغەفور لە پریسی سەروو بووین سوختەی مامۆستا شێخ عەبدولعەزیزی پاڕەزانی بووین (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) کە جەنابی موستەعید بوو لەخزمەتی مامۆستا مەلا عوسمانی مامۆستا مەلا عەزیزی پریسی دا، کە دەرهەق بە پیاو چاکی ئەم گوندە شاعیر دەڵێ:

بڕی وە باڵای کاڵای ڕەئیسی

(رجال الغيب)ە ئەحمەد پریسی

کاك عەبدولغەفور مەشرەب صۆفی بوو، فەقێیەکی زیرەكو لاوێکی خودا ناس بوو، جاروبار نەفسو شەیتان هەڵەیێ، نەزەرێ، شتێکی ئاوایان پێ دەکرد، لەدوایی دا پەشیمان دەبووەوە، وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: {إنَّ الذين اتَّقوا إذا مسهُم طائف من الشيطان تذكروا فإذا هم مبصرون} (٧/٢٠١- سورة الأعراف) جا کاك فەقێ غەفوور پڕ هەردوو ناو لەپی خۆی دەکرد لەتفو شتی واو باش باش هەڵی دەسوی لەڕووی خۆیو گەلێ بەسەرو پۆلاکی خۆی دا دەهاتو لەخۆی دەبووەوەو ئەوجا دەچوو دەستنوێژێکی جوانی دەگرتو تەوبەی تازە دەکردەوەو دوو ڕکات نوێژی تەوبەشی دەکرد!

دەی برا! گوناهی ئاوا لەسەر سەرم! چونکە گوناهی واو تەوبەی وا، پیاو نازانێ کامیان لەکامیان جوانترن!

لەگەڵ ئەم مامۆستا عەبدولغەفورەدا لەم حوجرەو مەدرەسانە خوێندومانە، هەمیشە سەماعی دەرسی یەکتریمان دەکرد، مزگەوتی مامۆستا مەلا حوسەینی پیسکەندی، عەربەت، مزگەوتی حاجی فەرەج، دێی کۆلێتان لەنزیك پێنجوێن، شێخ سەلام، پریس، خانەقای مەحوی، خانەقای مەولانا، شێخ مەحمودی قەرە چێوار، مزگەوتی چوارباغ، شێخ موصطەفای نەقیب، خومخانە، کە مامۆستا شێخ عەبدولعەزیز، حازر نەبوایە مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی خومخانە، لەبەر ئەوەی کاك غەفوری خۆشەویست، خۆی دەرسی پێ دەگوتین، هۆی ئەوەش مامۆستا حەمە سەعید خۆی تاقەتی ئیمامەتی نەمابوو، مامۆستا غەفوور لەباتی ئەو ئیمامەتەکەی دەکرد، کە مامۆستا شێخ

عبدالعزيز پارەزانی ئیجازەبوایە. لەعەربەتیش ئەگەر مامۆستا مەلا عەبدولقادر لەماڵ نەبوایە دەچووین بۆ چوارتاق لای مامۆستا مەلا مەحمود دەرسەکەمان دەخوێند!

کاتێ کە ویستم بچم بۆ پریس، میزانیەی حوجرەکە فەقێی تری هەڵ نەدەگرت، لەسەر تەگبیری کاك غەفوور کاغەزێکم لەمامۆستا مەلا عەبدولڕەحیمی پەرخی وەرگرت، بۆلای مامۆستا مەلا عوسمان، مامۆستا مەلا عوسمان نامەکەی ماچ کردو فەرمووی: پێشەکی چی داوایەکی تیابێ بەبان چاو. کاك غەفووریش مەردانە بۆئەوەی کە حوجرەکەی پریس لەئەزمەی ئیقتصادی ڕزگار بکا کە بەهۆی منەوە پەیدابوو بوو هەموو ڕۆژێ دەچوو ڕاتووی دێی هانەسورەی دەکرد!

ئەم هەڵوێستە مەردانەکەی حاجی مامۆستا مەلا عینایەتم یاد دەخاتەوە، کە حاجی مامۆستا مەلا موحەممەدی گەلاڵە، مەشهور بە (ڕەئیس) دەیەوێ لەخزمەتی مامۆستا مەلا شێخ عومەری قەرەداخی لەخانەقا جێگە بخوازێ، فەقێکان زۆر دەبن و ڕاتووش کەم دەبێ، هەر فەقێی بەژمارە ڕۆژی سێ نانی بەردەکەوێ، حاجی مەلا عینایەت نان و لەتێکی خۆی دەدا بەحاجی مەلا موحەمەد، دەفەرموێ بە فەقێکانی تر: ئەگەر حەزیش دەکەن ئێوەش لەناو خۆتان دا بەسەرو تیکەیێ یاریدەمان بدەن! دۆستایەتی نێوان ئەم دوو بنەماڵەیە کە تا ئێستاش بەردەوامە بناغەی لەسەر ئەو نان و لەتە پاکەیە بۆیە وا بەبەرەکەتە. با ئەم ئورجوزەیەش دیاری ئەم باسە بێ و نیشانەی ئەوە بێ کە ئێمە شانازی بەزمانی برا عەرەبەکانمانەوە دەکەین، چونکە زمانی قورئانی پیرۆزە، خودا پەنای ئێمەو ئەوانیش بدا لە پەنای دا.

بسم الله الرحمن الرحيم

| | |
|---|---|
| آياتــه لحسـنها تـبين | قيـود زينـة الحيـاة الـدين |
| ومنـه مـا يكـرم أو يهـين | والقيـد قـد يـزين أو يشـين |
| لشـرح مـا نقولـه معـين | هـاك مثـال قيـد مـا يـزين |
| فضـاءت المقلـة والجـبين | كحلـت العيـونَ حـورعينُ |

| | |
|---|---|
| إذا تقيدت تكون الشين | ومن محاسن القيود السين |
| والدين فيها نورها المبين | أن الحياة جوهر ثمين |
| فيها لماء نهرها المعين | أن الحياة روضة والدين |
| بالروح، فهو روحنا الأمين! | وكلنا لديننا مدين |
| ويحتمي بعدله الجنين! | وكلُّ ظالم ديننا يدين |
| بشرى الخلاص لهما تحين | في ظله الطلِّيق والسجين |
| (المتقى ذو شرفٍ مكين!) | وعندنا هذا هو اليقين |
| (تدان - يا هذا! - كما تدين) | هذا المثال صادق رصين |
| (نور الحياة ديننا المتين!) | خلاصة القول ايا رزين |
| تسألني؟ أجيب يار قرين | نوري لماذا دائما حزين |
| في يومنا، ويكرم المهين | وكيف لا؟ وقد يهان الدين |
| تصحبه الحسرة والحنين! | فحقه البكاء والأنين! |

سليمانى/ماموستايان/١٤-١١-١٩٩١

المترجم

١٨٥٩/٥٢- وَعَنْ عَوْفِ بن مَالِكِ بنِ الطُّفَيْلِ أنَّ عَائِشَةَ رضي الله عَنْهَا حُدِّثَتْ أنَّ عَبْدَ اللَّه ابنَ الزُّبَيْر رضي اللَّه عَنهُمَا قَالَ في بيْعٍ أوْ عَطَاءٍ أعْطَتْهُ عَائِشَةُ رضي اللَّه تَعالَى عَنْها: وَاللَّه لَتَنْتَهِيَنَّ عَائِشَةُ، أوْ لأحْجُرَنَّ عليْهَا، قالتْ: أهُوَ قَالَ هَذَا؟ قَالُوا: نَعمْ، قَالَتْ: هُو، للَّهِ عليَّ نَذْرٌ أنْ لا أُكَلِّم ابْنَ الزُّبيْرِ أبَداً، فَاسْتَشْفَع ابْنُ الزُّبيْرِ إليها حِينَ طالَتِ الْهِجْرَةُ. فقَالَتْ: لاَ وَاللَّهِ لا أُشَفِّعُ فِيهِ أبَداً، ولا أتَحَنَّثُ إلَى نَذْري. فلَمَّا طَال ذَلِكَ على ابْنِ الزُّبيْر كَلَّم المِسْورَ بنَ مخْرَمَةَ، وعبْدَ الرَّحْمنِ بْنَ الأسْوَدِ بن عبْدِ يغُوثَ وقَال لهُما: أنْشُدُكُما اللَّه لمَا أدْخَلْتُمَاني علَى عائِشَةَ رضي اللَّه عَنْهَا، فَإنَّهَا لاَ يَحِلُّ لَهَا أنْ تَنْذِر قَطِيعَتِي، فَأَقْبَل بهِ المِسْورُ، وعَبْدُ الرَّحْمن حَتَّى اسْتَأْذَنَا علَى عائِشَةَ، فَقَالاَ: السَّلاَمُ علَيْكِ ورَحمةُ اللَّه وبركَاتُهُ، أَنَدْخُلُ؟ قَالَتْ عَائِشَةُ: ادْخُلُوا. قَالُوا: كُلُّنَا؟ قَالَتْ: نَعمْ ادْخُلُوا كُلُّكُمْ، ولاَ تَعْلَمُ أنَّ معَهُما ابْنَ الزُّبيْرِ، فَلمَّا دخَلُوا، دخَلَ ابْنُ الزُّبيْرِ الْحِجَابَ، فَاعْتَنَقَ عائِشَةَ رضي اللَّه عنْهَا، وطَفِقَ يُنَاشِدُهَا ويبْكِي، وَطَفِقَ المِسْورُ، وعبْدُ الرَّحْمنِ يُنَاشِدَانِهَا إلاَّ كَلَّمتْهُ وقبلَتْ

مِنْهُ، ويقُولان: إنَّ النبـيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)نَهَى عَمَّا قَدْ عِلِمْتِ مِـنَ الْهِجْـرةِ. وَلاَ يَحلُّ لُمسْلِمٍ أنْ يهْجُر أخَاهُ فَوْقَ ثَلاثِ لَيَـال. فَلَمَّـا أكْثَـرُوا علَـى عَائِشَـةَ مِـنَ التَّذْكِرةِ والتَّحْرِيجِ، طَفِقَتْ تُذَكِّرُهُما وتَبْكِي، وتَقُولُ: إنِّي نَـذَرْتُ والنَّـذْرُ شَـدِيدٌ، فَلَمْ يَزَالا بَهَا حتَّى كَلَّمتِ ابْنِ الزُّبيْر، وَأعْتَقَتْ في نَذْرِهَا أرْبعِينَ رقَبةً، وَكَانَتْ تَذْكُرُ نَذْرَهَا بعْدَ ذَلِكَ فَتَبْكِي حتَّى تَبُلَّ دُمُوعُهَا خِمارَهَا. رواهُ البخاري[٣٢١].

عەوفی کوڕی مـالیکی کوڕی طوفـەیل (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: میسـوەری کوڕی مەخرەمە بـۆ عائیشـە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتـەوە کە عەبـدوڵڵای کوڕی زوبێر (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: بـەخودا یـا دەبـێ عائیشە واز لـەم جۆرە ئیسـرافو دەست قرپییە بێنێ، یا دەست بەستەی دەکەمو حیجر دەخەمـە سـەر مـاڵی! عائیشەش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خوشکەزاکەم بووە بەو پیـاوە قسـەی وا ڕەق بە پوری خۆی بڵێ، پور کەلە جێگەی دایکە ئـاوا دڵـی بشـکێنێ؟! ئامـادەبوان گوتیان: بەڵێ، وادەڵێ، زوبەیر بۆیە وای گوتبوو چونکی عائیشە خانوویـەکی خۆیی فرۆشتبوو، یا دەسەنەیەکی بەکەسێ دابوو، ئەوجا عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەسا ئاهو نەزر بێ بۆ خودا لەسەرم کە هـەتا مـاوم هـەرگیز قسـە لەگەڵ ئیبنو زوبەیر نەکەم.

کاتـێ ئـەم قسـە دابـڕینو عـاجز بوونـە درێـژەی کێشـا، ئیبنـو زوبـەیری قەڵس کرد، لەبەرئەوە تکاکاری نارد بۆلای عائیشە کە لەگەڵی ئاشت ببێتەوە، وەلـێ فەرمووی: نەبـەخوا لـەم بارەیـەوە تکـای کـەس قـەبووڵ ناکـەم بـەهۆی شـکاندنی نەزرەکەمـەوە خـۆم گوناهبـار ناکـەم، جـا کـە ئـەم بارودۆخـە پـتر درێـژەی کێشـا ئیبنـو زوبـەیر قسـەی لەگـەڵ میسـوەری کـوڕی مەخرەمـەو ئـەوڕەحمانی کوڕی ئەسوەدی کـوڕی عەبـدی یـەغوث کـردو پێـی فـەرموون: توخوا ئەگەر نەمبەن بۆلای عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) چونکە دروست نییە بۆی کە نەزر بکات دەنگ لەمن دا ببڕێ، جا میسوەرو عەبدولڕەحمان بردیان بـۆلایو

---

[٣٢١] بوخاری (٦٠٧٣، ٦٠٧٤، ٦٠٧٥).

كه گەیشتنه بەر ماڵ عائیشه گوتیان (السلام علیك ورحمة الله وبركاته) سلاوو میهرەبانیو پیرۆزی خودات لێ بێ، ڕوخسەت هەیه بێینه ژوورەوە؟

عائیشه فەرمووی: وەرنه ژوورەوە، گوتیان: هەموومان؟ فەرمووی: بەڵێ هەموتان فەرموون وەرنه ژوورەوە، وەلێ عائیشه نەیدەزانی که ئەم دوو کەسەیه ئیبنو زوبەیریان لەگەڵ دایە، که ئەوان چوونه ژوورەوەو چونه ناو کولێنەکەی عائیشەوە، ئیبنو زوبەیر دەستی کردە مل عائیشەی پوریو دەستی کرد به پاڕانەوە لێیو دەستی کرد به گریان، هەروا میسوەرو عەبدولڕحمانیش لێی پاڕانەوە که دەبێ قسەی لەگەڵ دا بکاو عوزری لێ قبوڵ بکا، خۆش خۆش دەیانگوت: خۆت بەباشی دەزانیت که پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جڵەو گیری کردووە لەدەنگ دابڕینو ئەمەی که تۆیش دەیکەیت بەر ئەو نەهیەی پێغەمبەر دەکەوێ، که دەفەرموێ: دروست نییه بۆهیچ موسوڵمانێ، کەلەبەر هۆیەکی خۆیی، نەوەك خودایی، پتر لەسێ شەو دەنگ لەبرای موسوڵمانی خۆی دابڕێ. جا که نەوازشتو دڵنەوایەکی زۆریان بۆ عائیشه کردو تەنگیان پێ هەڵچنیو ڕازو گلەییەکی زۆریان لێی کردو گەلێ شتیان وەبیر هێنایەوە، ئەویش دەستی کرد بەگریانو ئامۆژگاری ئەوانی دەکردو فەرمووی: ئاخر من نەزرم کردووە، نەزر زۆر گرانه، چۆن نەیبەمه سەر، وەلێ لەکوڵکی نەبوونەوە هەتاکوو عائیشه کەفارەتی شکاندنی ئاهەکەی دا چل بەندەی ئازاد کرد، کەچی هێشتا بەوەش دڵی ئاوی نەخواردەوەو لەوەو دوا گەلێ کات باسی ئەو نەزرەی دەکردو لەپەشیمانی دا که ئەو بێ شەرعییەی کردووە دەگریاو به فرمێسکی پەشیمانی چارشێوەکەی تەڕ دەکرد! (بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ)).

١٨٦٠/٥٣- وعَنْ عُقْبَةَ بنِ عامِرٍ (رضي اللّه عنه)أنَّ رسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)خَرجَ إلَى قَتْلَى أُحُدٍ. فَصلَّى علَيْهِمْ بعْد ثَمان سِنِين كالمودِّع للأحْياءِ والأمْواتِ، ثُمَّ طَلَعَ إلى المِنْبرِ، فَقَالَ: إنِّي بيْنَ أيْدِيكُمْ فَرَطٌ وأنَا شهيد علَيْكُمْ وإنَّ موْعِدَكُمُ الْحوْضُ، وَإنِّي لأنْظُرُ إليه مِنْ مَقامِي هَذَا، وإنِّي لَسْتُ أخْشَى عَلَيْكُمْ أنْ

تُشْرِكُوا، ولَكِنْ أخْشَى عَلَيْكُمْ الدُّنيا أنْ تَنافَسُوهَا» قَالَ: فَكَانَتْ آخِرَ نَظْرَةٍ نَظَرْتُها إلَى رَسُولِ اللَّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)، متفقٌ عليه.

وفي روايةٍ: (ولَكِنِّي أخْشَى علَيْكُمْ الدُّنيَا أنْ تَنَافَسُوا فِيهَا، وتَقْتَتِلُوا فَتَهْلِكُوا كَما هَلَكَ منْ كَان قَبْلكُمْ) قَالَ عُقبةُ: فَكانَ آخِرِ ما رَأيْتُ رَسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)عَلَى المِنْبرِ.

وفي رِوَايةٍ قال: (إنِّي فَرطٌ لَكُمْ وأنَا شَهِيدٌ علَيْكُمْ، وَإنِّي واللّه لأنْظُرُ إلَى حَوْضِي الآنَ، وإنِّي أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الأرض، أوْ مَفَاتِيحَ الأرْضِ، وَإنِّي واللّهِ مَا أَخَافُ علَيْكُمْ أنْ تُشْرِكُوا بعْدِي ولَكِنْ أخَافُ عَلَيْكُمْ أنْ تَنَافَسُوا فِيهَا).

وَالمُرادُ بِالصَّلاةِ عَلَى قَتْلَى أُحُدٍ: الدُّعَاءُ لَهُمْ، لاَ الصَّلاةُ المعْرُوفَةُ[٣٢٢].

**عوقبەی کوڕی عامر** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەر بێ) **لەدوا هەشت ساڵ ڕۆژێ لەماڵ دەرچوو، چوو دوعای بۆ مردوانی غەزای ئوحود کرد، وەك کەسێ خودا حافیزیو ماڵاوایی هەم لە زیندوانو هەم لە مردوان بکا وابوو، لەپاش دا ڕۆشتە سەر دوانگەو فەرمووی: خۆم لەپێش ئێوەوە دەڕۆم، خۆم دەبم بە پێشڕەوو بەرایی ئومەتم، خۆم چاودێرم بەسەرتانەوەو شایەتییان بۆ دەدەم، وەك خودا لەقورئان دا فەرموویەتی: {فكيف إذا جئنا من كل أمة بشهيد وجئنا بك على هؤلاء شهيدا} (٤/ ٤١) واتە: دەبێ حاڵی ئەم نا موسوڵمانانە، لەڕۆژی قیامەتا چۆن بێ، کەلەسەر فەرمانی ئێمە پێغەمبەرەکان دێن، هەرکەسەیان شایەتی لەسەر ئۆمەتی خۆی دەدا، وە تۆیش دێیت شایەتی دەدەی لەسەر ئۆمەتت، ژوانگەمان سەر حەوزی کەوثەربێو خوا یاربێ بەڵێنمان ئەوێ بێ لەوێ یەك دەگرینەوە، بەخوا من ئا ئێستاکە لەم دەمەم دا حەوزی کەوثەر کە حەوزی تایبەتی خۆمەو پێشوازی ئۆمەتمی لەسەر دەکەم لەبەهەشتا تا ئێستا لەبەر چاومەو بەچاوی سەر تەماشای دەکەم، وە کلیلەکانی خەزێنەو گەنجینەکانی زەوی دراون بەمن یا فەرمووی: کلیلەکانی زەوی دراون بەمن، زوو یا درەنگ گەلی ئیسلامی من**

---

[٣٢٢] بوخاری (١٣٤٣) موسلیم (٢٢٩٦).

دەست دەگرن بەسەر ئەو ولاّتانەدا، بەخودای خۆم من تازە لەوە ناترسم کە ئێوە جارێکی تر دەست بکەنەوە بە بتپەرستیو شتی وا، بەپشتی خودا شتی وا تازە لەتێکڕای ئومەتم ڕوو ناداتەوە، تاكو تەراش ئەو گرنگییەی نییە، بەلاّم مەترسی ئەوەم لێتان هەیە کەلەناو خۆتانا لەسەر پڕوپیتی جیهان بەربەرەکانیو ڤینەبەری بکەن. عوقبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیتر ئەوجارە دواجار بوو کەلەسەر میمبەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ببینم (ش). لەگێڕانەوەیەکی موسیلم دا: بەلاّم ترسی ئەوەم لێتان هەیە کە پەلاماری دنیا بدەنو لەسەر پڕوپیتی جیهان بچن بەگژ خۆتانداو لەناو خۆتان دا خوێنی یەکتری برێژن ئەو حەلە ئێوەش وەك ئەو گەلانەی لەمەو پێش لەبەر هەمان شت لەناو چوون ئاوا لەناو بچن!

ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خوای لێ بێ) و خودای گەورە لەبەرخاتری ئەو، لەدەردو بەلاّو دەربەدەریو بەلاّی ناگەهانو چەپۆڵەی زاڵم بمانپارێزێ خۆمانو ماڵو منالّو شارو گەرەكو ولاّتمان ئامین خودایە ئەمجارەیش، دەفەرموێ: مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژی لەسەر شەهیدەکانی ئوحود کردووە مەبەست ئەوەیە دوعاو نزای بۆیان کردووە بۆیان پاراوەتەوە، دەنا مەبەست نوێژی مردووی ئاسایی نییە، فەرمایشتەکەی نەوەوی تەواو.

١٨٦١/٥٤- وعَنْ أبي زَيْدٍ عمْرُو بنِ أخْطَبَ الأنْصَارِيِّ (رضي اللّٰه عنه)قَال: صلّى بنا رَسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)الْفَجْر، وَصعِدَ المِنْبَرَ، فَخَطَبنَا حَتَّى حَضَرَتِ الظُّهْرُ، فَنَزَل فَصلَّى. ثُمَّ صَعِدَ المِنْبَر فخطب حَتَّى حَضَرتِ العصْرُ، ثُمَّ نَزَل فَصلَّى، ثُمَّ صعِد المنْبر حتى غَرَبتِ الشَّمْسُ، فَأخْبرنا مَا كان ومَا هُوَ كَائِنٌ، فَأَعْلَمُنَا أحْفَظُنَا. رواهُ مُسْلِمٌ[٣٢٣].

ئەبو زەیدی عەمری کوڕی ئەخطەبی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆکردین، ئەوجا

[٣٢٣] موسلیم (٢٨٩٢).

تەشریفی چوە سەر دوانگەو دەستی کرد بە گوتار خوێندنەوە بۆمان هەتا کاتی نوێژی نیوەڕۆ داهات، ئەوجا دابەزیو بەکۆمەڵ نوێژی نیوەڕۆشی بۆکردین، ئەوجا دیسانەوە سەرکەوتەوە سەر دوانگەو وتاری دا تا نوێژی عەصر داهات، ئەوجەلە دابەزیو نوێژی عەصری بۆکردین، دیسانەوە سەرکەوتەوە سەر دوانگەو هەر خوتبەی بۆمان دەدا هەتا خۆرئاوا بوو حەزرەت لەم گوتارانەدا ئەوەی لەمەوبەر بووەو ئەوەی لەمەولا دەبێ هەمووی باس کرد بۆمان، ئیتر ئەوەمان زاناترە کەزیاتری لەو وتارانە لەبەرە. (م).

١٨٦٢/٥٥- وعنْ عائِشَةَ رضي اللّٰه عَنْهَا قَالَتْ: قال النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (مَنْ نَذَرَ أن يُطِيع اللّٰه فَلْيُطِعْهُ، ومَنْ نَذَرَ أنْ يعْصِيَ اللّٰه، فلا يعْصِهِ) رواهُ البُخاري[٣٢٤].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ فوتو (نەذر)ی کرد کە فەرمانبەری خودا بکا ئەوە با نەزرەکەی بەجێ بهێنێ، وە کەسێ نەزری کرد کە نافەرمانی خودا بکا ئەوا با نافەرمانی خودا نەکاو نەزرەکەی نەباتەسەر. (ب-(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)).

١٨٦٣/٥٦- وَعنْ أُمِّ شَرِيكٍ رضي اللّٰه عنْهَا أن رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)أمرَهَا بِقَتْلِ الأوزَاغِ، وقَال: (كَانَ ينْفُخُ علَى إبْراهيمَ) متفقٌ عَلَيْهِ[٣٢٥].

ئوممو شەریك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کە شەوگەرد بکوژم حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: چونکە کاتی خۆی فووی لەئاگری مەنجەنیقەکەی ئیبراهیم دەکرد. (ش= بوخاریو موسلیم (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

١٨٦٤/٥٧- وَعنْ أبي هُريرةَ (رضي اللّٰه عنه)قال: قَالَ رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (منْ قَتَلَ وزَغَةً في أوَّلِ ضَرْبةٍ، فَلَهُ كَذَا وكَذَا حسنَةً، وَمَنْ قتَلَهَا في الضَّرْبَةِ

[٣٢٤] بوخاری (٦٦٩٦).

[٣٢٥] بوخاری (٣٣٠٧) موسلیم (٢٢٣٧).

الثَّانِية، فَلَهُ كَذَا وكَذَا حَسنَةً دُونَ الأولَى، وإنَّ قَتلَهَا في الضَّرْبَةِ الثَّالِثَةِ، فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً).

وفي رِوَايةٍ: (مَنْ قَتَلَ وزَغاً في أوَّل ضَرْبَةٍ، كُتِبَ لَهُ مائةُ حسَنَةٍ، وَفي الثَّانِيَةِ دُونَ ذَلِكَ، وفي الثَّالِثَةِ دُونَ ذَلِكَ). رواه مسلم[٣٢٦].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ بەیەکەم لێدان شەوگەردێ بکوژێ واوا خێری بۆهەیە، وە ئەو کەسەی کە بە دووەم لێدان بیکوژێ واوا خێری بۆهەیە، وەلێ کەمتر لە لێدانی یەکەم، وە ئەگەر بەسێهەم لێدان بیکوژێ واوا خێری بۆهەیە، بەلاّم لە لێدانی دووەم کەمتر. لە گێڕانەوەیەکا کەسێ بەیەکەم لێدان شەوگەردێ بکوژێ سەد چاکەی بۆ دەنووسرێ{بەدووەم لێدان کەمتر، بەسێهەم لێدان کەمتریش. (م).

١٨٦٥/٥٨- وَعَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي اللّه عنه)أنَّ رسُول اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (قَال رَجُلٌ لأتَصدقَنَّ بِصَدقَةٍ، فَخَرجَ بِصَدقَته، فَوَضَعَهَا في يَدِ سَارق، فَأصْبَحُوا يتَحدَّثونَ: تَصَدِّقَ الليلة علَى سارق، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ لأتَصدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدقَتِهِ، فَوَضَعَهَا في يدِ زانيةٍ، فَأصْبَحُوا يتحدَّثونَ تُصُدِّق اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ، فقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زانِيَةٍ؟، لأتَصدَّقَنَّ بِصدقة، فَخَرَجَ بِصَدقَتِهِ، فَوَضَعَهَا في يد غَنِي، فأصْبَحُوا يتَحدَّثونَ: تُصُدِّقَ علَى غَنِيّ، فَقَالَ اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ علَى سارِق، وعَلَى زَانِيةٍ، وعلَى غَنِي، فَأتِي فَقِيل لَهُ: أمَّا صدَقَتُكَ علَى سَارق فَلَعَلَّهُ أنْ يَسْتِعفَّ عنْ سرِقَتِهِ، وأمَّا الزَّانِيةُ فَلعلَّها تَسْتَعِفَّ عَنْ زِنَاهَا، وأمَّا الْغنِيُّ فَلَعلَّهُ أنْ يعْتَبِر، فَيُنْفِقَ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ) رَواهُ البخاري بلفظِهِ، وَمُسْلِمٌ بمعنَاهُ[٣٢٧].

لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ دەڵێ دەبێ خێرێ بکەم، جا خێرەکەی دەباو دەیخاتە ناو دەستی دزێکەوە، بۆ بەیانی خەڵك دەڵێن: هەی هەی! ئەم شەو خێر

---

[٣٢٦] موسلیم (٢٢٤٠، ١٤٦، ١٤٧).

[٣٢٧] بوخاری (١٤٢١) موسلیم (١٠٢٢).

دراوه به دزێ، پیاوەکەش دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆتۆ لەسەر ئەم خێرە بەم دزە، چونکە ئەمە خواستی تۆی لەسەر بووە، خواستی تۆیش بێ حیکمەت نییە بەخوا دەبێ خێرێکی تر بکەم، جا دیسان خێرەکەی دەباو دەینێتە ناو دەستی ژنێکی داوێن پیسەوە، بۆ بەیانی خەڵك دەڵێن: ئەمشەو خێر بەژنی داوێن پیس کراوە! پیاوەکە دیسان دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆتۆ لەسەر ئەم خێرەش بەم ژنە داوێن پیسە، بەخودا دەبێ خێرێکی تر بکەم، جا خێرەکەی دەباو دەینێتە ناو دەستی پیاوێکی دەوڵەمەندەوە، بەهەژاری دەزانێ، دیسان بۆ بەیانی خەڵك دەڵێن: پەککو! ئەمشەو خێر بەدەوڵەمەندێ دراوە! پیاوەکەش دەڵێ: سوپاس بۆتۆ لەسەر ئەم خێرەش بەم دەوڵەمەندە خودایە، سوپاس بۆتۆ لەسەر خێر بەدز، لەسەر خێر بەژنی خراپ، لەسەر خێر بەپیاوی دەوڵەمەند، جا خودا لەسەر نیازی پاکی مژدەی دەداتێ کە خێرەکەی جێی خۆی گرتووەو لەخەون دا دەچنە خەوی و پێی دەڵێن: هەرسێ خێرەکانت گیرا بوون سا بەڵکوو ئەو دزە بەهۆی خێرەکەی تۆوە واز لە دزی کردن بێنێ، بەڵکوو ژنە سەڵیتە (داوێنپیسە)کەش بەهۆی خێرەکەی تۆوە دەست لەو ئیشە خراپە هەڵبگرێ، بەشکم دەوڵەمەندەکەش پەند وەربگرێو شەرم لەخۆی بکاو دەست بکا بە بەخشینو خێر کردن لەو ماڵو سامانەی کە خودا داوێتی پێی. (ب/م).

١٨٦٦/٥٩- وعنه قال كنا مع رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم) في دعوة فرفع إليه الذراع وكانت تُعجبه فَنَهسَ منها نَهسَةً وقال: أنا سيد الناس يوم الْقِيَامَةِ، هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذَاكَ؟ يَجْمعُ اللّٰه الأوَّلِينَ والآخِرينَ في صعِيدٍ وَاحِد، فَيَنْظُرُهمُ النَّاظِرُ، وَيُسمِعُهُمُ الدَّاعِي، وتَدْنُو مِنْهُمُ الشَّمْسُ، فَيَبْلُغُ النَّاسُ مِنَ الْغَمِّ والْكَرْبِ مَالاَ يُطيقُونَ وَلاَ يحْتَمِلُونَ، فيَقُولُ النَّاسُ: أَلاَ تروْنَ إلَى مَا أَنْتُمْ فِيهِ، إلَى ما بَلَغَكُمْ؟ أَلاَ تَنْظُرُونَ مَنْ يشْفَعُ لَكُمْ إلَى رَبِّكُمْ؟.

فيَقُولُ بعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: أَبُوكُمْ آدَمُ، ويأتُونَهُ فَيَقُولُونَ: يَا أدمُ أَنْتَ أَبُو الْبَشرِ، خَلَقَكَ اللّٰه بيدِهِ، ونَفخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وأَمَرَ الملائِكَةَ فَسَجدُوا لَكَ وَأَسْكَنَكَ الْجَنَّةَ، أَلا تَشْفعُ لَنَا إِلَى ربِّكَ؟ أَلاَ تَرى مَا نَحْنُ فِيهِ، ومَا بَلَغنا؟ فَقَالَ: إنَّ

رَبِّي غَضِبَ غضباً لَمْ يغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ. وَلاَ يَغْضَبُ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ، فَعَصَيْتُ. نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي. اذهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ. فَيَأْتُونَ نُوحاً فيقُولُونَ: يَا نُوحُ، أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُل إِلى أَهْلِ الأَرْض، وَقَدْ سَمَّاك اللَّه عَبْداً شَكُوراً، أَلا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا بَلَغَنَا، أَلاَ تَشْفَعُ لَنَا إِلَى رَبِّكَ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَأَنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُ بِهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُونَ: يَا إِبْرَاهِيمُ أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَإِنِّي كُنْتُ كَذَبْتُ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى. فَيأْتُونَ مُوسَى، فيقُولُون: يا مُوسَى أَنْت رَسُولُ اللَّه، فَضَّلَكَ اللَّه بِرِسَالاَتِهِ وبكَلاَمِهِ على النَّاس، اشْفعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إلى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيقول إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ وَإِنِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْساً لَمْ أُومرْ بِقَتْلِهَا. نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى. فَيأْتُونَ عِيسَى. فَيقُولُونَ: يا عِيسى أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَكلمتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرِيم وَرُوحٌ مِنْهُ وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ. اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ. أَلاَ تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ، فيَقولُ:: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ ذَنْباً، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُحمَّد (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم). فيأْتون محمداً (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم).

وفِي روايةٍ: (فَيَأْتُونِي فيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، وَخاتَمُ الأَنْبِياء، وقَدْ غَفَرَ اللَّه لَكَ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَما تَأَخَّر، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى ما نَحْنُ فِيهِ؟ فَأَنْطَلِقُ، فَآتي تَحْتَ الْعَرْشِ، فأَقَعُ سَاجِداً لِرَبِّي) ثُمَّ يَفْتَحُ اللَّه عَلَيَّ مِنْ مَحَامِدِهِ، وحُسْن الثَّنَاءِ عَلَيْهِ شَيْئاً لِمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ قَبْلِي ثُمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ ارفع رَأْسكَ، سَلْ تُعْطَهُ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرفَعُ رَأْسِي، فَأَقُولُ أُمَّتِي يَارَبِّ، أُمَّتِي يَارَبِّ، فَيُقَالُ: يامُحمَّدُ أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتك مَنْ لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنَ الْباب الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ

الْجَنَّةِ وهُمْ شُركَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوِيَ ذَلِكَ مِنَ الأَبْوَابِ) ثُمَّ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيدِهِ إِنَّ مَا بَيْنَ المصراعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ كَمَا بَيْن مَكَّةَ وَهَجَر، أَوْ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى) متفقٌ عليه[٣٢٨].

**ديسان ئەبو هورەيرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لە دەعوەتێکا لەخزمەتی حەزرەت دا** (درودی خوای لەسەر بێ) **بووین، دەستێ گۆشتی خواردنیان بۆدانا، حەزرەت** (درودی خوای لەسەر بێ) **خۆی حەزی لە خواردنی گۆشتی دەست بوو، جا قەپێکی لێگرت‌و فەرمووی: ڕۆژی قیامەت خۆم گەورەی بەرەی ئادەمیزادم، ئایا دەزانن ئەوە لەبەر چی وایە؟ خودای گەورە پێشینان‌و پاشینان هەموویان لەیەك دەشتا کۆدەکاتەوە، تەماشاکەر بەچاوی سەر گشتیان دەبینێ، دەنگی بانگەوازکەریش بەگشتیان دەگا• وەخۆر لێیان نزیك دەبێتەوەو دێتە سەر تەوقەسەریان بەقەد میلێکی دەمێنێ بۆیان، ئیتر مەردومەکە دەکەونە خەم‌و پەژارەو تەنگانەیەکی واوە، وزەو تەوانایان نامێنێ، بۆیە لەناو خۆیان دا دەڵێن: سەیری خۆتان ناکەن چیتان بەسەرهاتووە، حاڵتان چەند شڕو شلۆقە، ئەدی ئەوە بۆچی هانا نابەنە بەر کەسێ لەلای خودای خۆتان تکاتان بۆ بکا، تا لەم تەنگانەیە قوتارتان بکا؟ دەڵێن: ئادەم کە بابەگەورەتانە بۆ ئەم کارە زۆرباشە، جا دەچنە خزمەتی‌و عەرزی دەکەن ئەی ئادەم تۆ باوکی بەرەی ئادەمیزادی، خودا بەدەستی خۆی تۆی دروست کردووە، وە لەگیانی خۆی کردووە بەبەرتا، سەرەڕای ئەوەیش قەدرو ڕێزی گەلێ گەورەت هەیە لەلای خودا چونکە فەرمانی کردووە بەفریشتەکان کە کڕنوشی ڕێزو قەدرزانی یان بۆ بردی‌و لەناو بەهەشتا نیشتەجێی کردی، دەی بفەرموو لەلای پەروەردگاری خۆت تکامان بۆبکە، خۆ خۆت بەچاوی خۆت دەبینی کە ئێمە ئێستا لەچ بەزم‌و گۆبەندێکاین‌و توشی چی تەنگانەیێ بووین، ئادەم**

---

[٣٢٨] بوخاری (٤٧١٢) موسلیم (١٩٤).

• لەم سەردەمەی ئێمەدا نمونەی گچکە کراوەی ئەم حاڵە هەیە، لەسەراسەری جیهان دا خەڵك لەیەك کات دا دەنگ‌و ڕەنگی قسەکەرێ دەبینن‌و دەبیستن، بەهۆی تەلەفۆن‌و رادیۆو تەلەفزیۆنەوە، کەواتە شتی وا لەقیامەتا بۆ خودا گەلێ ئاسانترە. (وەرگێڕ).

دەفەرمویٚ: ئەوە بەمن ناکریٚ، چونکە خودا کە خودای هەموانە ڕقیٚکی گەورەی وای هەستاوە، نەلەمەبەرو نەلەمەدوا ڕقی وا نەبووەو نەدەبیٚ، لەهەمان کات دا هۆیەکی تریش بۆ ئەمە هەیە کە ئەویش ئەمەیە: کاتی خۆی خودا قەدەغەی لەمن کرد لە بەهەشتا لەبەری دارەکە نەخۆم، بەلاّم من فەرمانەکەیم شکاند، هەربۆ خۆم دەپاڕیٚمەوەو بەس: خۆم، خۆم، خۆم! بۆ تکا بچن بۆ لای کەسیٚکی ترو لەمن گەڕیٚن بڕۆن بۆلای نوح، جا دەچنە خزمەتی نوحو عەرزی دەکەن: ئەی نوح! تۆ یەکەم پیٚغەمبەر بووی کە خودا تۆی کرد بە فرستادەو ڕەوانەی کردی بۆسەر هەموو خەلّکی سەر ڕووی زەوی، لەگەلّ ئەوەش دا کەخودا بۆخۆی ناوی ناوی، عەبدیٚکی شەکوورو بەندەیەکی سوپاسگوزارو شوکوربژیٚر، وەك لەقورئان دا فەرموویەتی: {ذرية من حَمَلْنَا مع نوح إنه كان عبداً شكورا} (٣/١٧) واتە: تەوراتمان بەخەلاّت نارد بۆ پیٚغەمبەر موسا، کە نامەیەکی خودا بوو پڕ لەداناییو زانایی بوو، بوو بوو بە چرایەکی ڕۆشن بۆ ڕیٚنماهی نەوەی یەعقوب پیٚغەمبەر (درودی خوای لەسەر بیٚ) کە مەشهورن بەبەنی ئیسرائیل، وە فەرمانمان پیٚکردن کە ئیٚوە نەوەی نووح پیٚغەمبەرن، کە بەندەیەکی باشی سوپاسگوزاری خودا بوو، کەواتە دەبیٚ ئیٚوەش ڕیٚگە ڕاستەکەی ئەو بگرن. خۆ خۆت دەبینی ئیٚمە لە چ حالّیٚکی ناخۆشداین، دەی بفەرموو لەخزمەت پەروەردگارت دا تکامان بۆبکە ئەویش دەفەرمویٚ: ئەوە بە من ناکریٚ چونکە خودا کە خودای هەموانە ڕقیٚکی گەورەی وای هەلّساوە نەلەمەو بەرو لەمەودوا ڕقی وای نەهەلّساوەو نە هەلّدەستیٚ، وە من کاتی خۆی لە جیهان دا نزایەکم هەبوو ئەو نزایەم لەگەلی خۆم کرد، وە خودا گیرای کرد وەك لەقورئان دا دەفەرمویٚ: {وقال نوح رب لا تذر على الأرض من الكافرين ديارا} (٢٦/٧١) واتە: نوح فەرمووی: هۆ خودا! ئەوەی کافرە لەسەر ڕووی زەوی قەلاچۆی تیٚخەیو بنەبڕی بکەی. من هەر مشوری خۆم خۆم دەخۆمو بەس، بچن بۆلای کەسیٚکی تر، بڕۆن بۆلای ئیبراهیم، جا دەڕۆنە خزمەتیو عەرزی دەکەن: ئەی ئیبراهیم! تۆ هەم پیٚغەمبەریو هەم دۆستو (خەلیل)ی ئەویو لەناو

هەموو خەڵكی سەر زەوی دا تۆی گرتووە بەدۆستی خۆی، وەك لەقورئان دا فەرموویەتی: {واتخذ الله إبراهيم خليلاً} (١٢٥/٤) واتە: ئیبراهیم دۆستی خودایەو خودا كردویەتی بە ئاشنای خۆی، كەواتە بفەرموو لەخزمەت پەروەردگاری خۆتا تكامان بۆبكە، ئەدی وا بەبەرچاوی خۆتەوە كە ئێمە لەچی سەختەتێك دا دەژین، ئەویش پێیان دەفەرموێ: ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕاستەو وایەو زیادی هەیەو كەمی نییە، بەڵام خودای پەروەردگاری من كە خودای هەموومانە ئەمڕۆ ڕقێكی گەورەی وای هەڵساوە نەلەمەو بەرو نەلەمەدوا ڕقی سەختی وای نەهەڵساوەو نەهەڵدەستێ، لەهەمان كات دا هۆیەكی تریش هەیە: من كاتی خۆی لەجیهانی یەكەم دا سێ درۆم كردووە لەبەر ئەوە لە ڕووم نایە بۆ كارێكی وا گەورە ڕوو لەخودا بێنم! من هەر مشوری كاری خۆم دەخۆم، خۆم، خۆم، خۆم، خۆم، بڕۆن بۆلای كەسێكی تر جگە لەمن، بڕۆن بۆ لای موسا، جا دەچنە خزمەتی ئەویش‌و عەرزی دەكەن ئەی موسا! تۆ پیاوێكی خاترداری لەلای خودا، تۆ تەنها پێغەمبەرێكی كە خودا ئەم پایە گەورەیەی پێبەخشیوی، پەیامی پێغەمبەری داوێتێ‌و لەناو هەموو خەڵكیش دا، قسەو گفتوگۆی بەس لەگەڵ تۆدا بەبێ پەردەو ناوەندیار كردووە، دەی كەوایە بفەرموو لەخزمەت خوداتا تكامان بۆ بفەرموو، خۆ خۆت چاوت لێیەتی كەلە چی حاڵێكدا دەژین، ئەویش دەق وەك پێغەمبەرەكانی پێش خۆی عوزر دەهێنێتەوەو باسی توڕەیی خودا دەكاو ئەوجا دەڵێ: سەرەڕای ئەوەش دەڵێ: من پیاوێكم لە دنیادا كوشتووە، لەبەرئەوە من بەس خەمی خۆم دەخۆم‌و دەیاننێرێ بۆلای عیسا، جا دچنە خزمەتی ئەویش‌و دەڵێن: ئەی عیسا! تۆ خاوەن خاتری لەلای خودا، تۆ هەم پێغەمبەری خاوەن پەیامی خودای‌و هەم وشەی خودای‌و بەبێ باب بەوشەی (كن=ببە) دروست بووی، لەكاتی خۆی دا خودا تۆی بەهۆی ئەو تاقە وشەیەوە لەناوسكی مەریەم دا دامەزراندو گیانێكی تایبەتی بووی لەتەرەفی خودا خۆیەوە دروست كراوی، بەبێ هۆو دەسكەلا، هەر بەمناڵی هێشتا ساوا بووی‌و لەناو بێشكەدا بووی قسەو گفتوگۆی جوان‌و پڕ لە حیكمەتت لەگەڵ

مەردوم دا دەكرد، وەك خودا لەقورئانا دەفەرموێ: {إنما المسيح عيسى بن مريم رسول الله وكلمته ألقاها} واتە: لەڕاستی دا قسەی ڕاستو دروست ئەوەیە كە عیسای كوڕی مەریەم كە مەشهورە بەمەسیح، نە خودایەو نە كوڕی خودایە، بەڵكوو ئەویش وەك ئەو خەڵكەی تر بەندەی خودایە، وە پێغەمبەرێكیش بووە لە پێغەمبەرەكان، ئەوەندە هەیە پەیدابوونی ئەو بە وشەی خودا بوو، هەر لەگەڵ فەرمووی: (كن فكان = ببە ئیتر ئەویش بوو)، خودا ئەو وشەیەی ڕەوانە كرد بۆ لای مەریەم، سەرەڕای ئەوەش عیسا زاتێكی پاكو گیانێكی بێخەوشی بێ گەردی دوور لە هەوەسبازیو دەروون پەرستی بوو، لەخوداوە بەلێشاوی خواستی ئەوو بەس دروست بوو هەروەك لەلایەكی ترەوە خوا لەقورئان دا دەفەرموێ: {فأشارت إليه قالوا كيف نكلم من كان في المهد صبيا} (٢٩/١٩) واتە: مەریەم (سڵاوی خودای لەسەر بێ) ئیشارەتی كرد بۆلای عیسا، كە ساوایەكی مەلۆتكە بوو بە باوەشیەوە، كەلەو بپرسن! ئەوانیش بەسەر سوڕمانەوە گوتیان: چۆن چۆنی قسە لەگەڵ منالێكی بەر بێشكەدا بكەین، دەی تۆ كە ئەوەندە خاتر داری لەلای خودا، لەلای خودای خۆت تكامان بۆ بكە، خۆ خۆت ئاگات لە حاڵی پڕ مەینەتیمانە، جا عیساش دەق وەك پێغەمبەرەكانی پێش خۆی عوزر خوایی دەكا، وەلێ باسی گوناهی خۆی ناكا دەفەرموێ: هەر مشوری چاری خۆم دەخۆمو بەس، خۆم، خۆم، خۆم بچن بۆلای كەسێكی تر، جگە لەمن، بڕۆن بۆلای موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) جا ئەوانیش دەچن بۆلای موحەممەد درودو میهرەبانیو سڵاوی خوای گەورەو مەزنی لەسەر بێ لە گێڕانەوەیەكا جا دەچنو دەڵێن: ئەی موحەممەد! تۆ پێغەمبەری خودایتو دواهەمین پێغەمبەریتو خودا بە دەقی قورئان لەگشت گوناهێكت خۆش بووە، گریمان ئەگەر گوناهت بووبێ، وەك دەفەرموێ: {ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخرً} دەی لەلای پەروەردگاری خۆت تكامان بۆ بكە، كەلەم سەختڵەتییە ڕزگارمان بكا، ئەدی تەماشا ناكەی كە ئێمە لەچی بارودۆخێكی ناهەمواردایین؟ ئەوكاتە منیش لەسارای مەحشەرەوە دەڕۆم بۆ بەر بارەگای خوداو لەژێر عەرشا لەپەورو

کڕنوشێ بۆخودا دەبەم، ئەو سەجدەیە بەقەد هەفتەیێ دەبێ، جا ئەوجا خودا دەرگای ستایش‌و وەسپی جوان‌و ئەناخوانی جوانی خۆیم بۆ دەکاتەوە، بە ڕەنگێکی وا کەلەوەو بەر بۆ کەسێکی تری نەکردبێتەوە، ئیتر تاریف‌و پەسن‌و سوپاسێکی گەلێ نازداری خودا دەکەم، هەتا خودا بە جوبرائیل دەفەرموێ: بە موحەممەد بلێ، ئەی موحەممەد! سەرت لەسەجدە هەڵبڕە، داوات چییە بیکە جێبەجێ دەکرێ، هەرچی داوا دەکەی بە تۆ دەدرێ، هەرتکایەکت هەیە بیکە تکات قەبووڵ دەکرێ!

ئەوجا منیش سەرم بەرزەوە دەکەم‌و دەڵێم: ئەی پەروەردگارم! ئوممەتەکەم بۆ ڕزگار بفەرموو، ئەی خودایە! بگەرە فریای ئومەتم، ئەی خودایە! فریای گەلی من بکەوە، ئەوجا پێم دەبێژرێ: ئەی موحەممەد! ئەو حەفتا هەزار کەسەی لە ئومەتت کە حیساب‌و پرسینەوەیان لەسەر نییە، لەدەرگای لای ڕاستی هەشت دەرگاکەی بەهەشتەوە بیانکەرە ژوورەوە، ئەوانی تری ئومەتیشت لەگەڵ ئەو خەڵکەی تر لەحەوت دەرگاکەی تری بەهەشتەوە بچنە ژوورەوە، ئەوجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە مابەینی هەردو لاشیپانی گشت دەرگاکانی بەهەشت وەك مابەینی مەککەو شاری هەجەر وایە کەوا لە ولاتی بەحرەین، یا فەرمووی: وەك نێوانی مەککەو بوصرا لەیەك دوورن، بوصرا شارێکە لەشام سێ قۆناغ لە دیمەشقەوە دوورە، لەمەککەوە بەپێ مانگە ڕێیەکە. (ش).

١٨٦٧/٦٠- وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّه عَنْهُمَا قَالَ: جاءَ إِبْرَاهِيمُ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)بِأُمِّ إِسْمَاعِيل وَبابنِهَا إِسْمَاعِيلَ وَهِي تُرْضِعُهُ حَتَّى وَضَعَهَا عِنْدَ الْبَيْتِ عِنْدَ دَوْحَةٍ فوْقَ زَمْزَمَ في أَعْلَى المسْجِدِ، وَلَيْسَ بمكّةَ يَوْمئذٍ أَحَدٌ وَلَيْس بِهَا مَاءٌ، فَوضَعَهمَا هُنَاكَ، وَوضع عِنْدَهُمَا جِرَاباً فِيه تَمرٌ، وسِقَاء فيه مَاءٌ. ثُمَّ قَفي إِبْرَاهِيمُ مُنْطَلِقاً، فتَبِعتْهُ أُمُّ إِسْماعِيل فَقَالَتْ: يا إِبْراهِيمُ أَيْنَ تَذْهَبُ وتَتْرُكُنَا بهَذا الْوادِي لَيْسَ فِيهِ أَنِيسٌ ولاَ شَيءٌ؟ فَقَالَتْ لَهُ ذَلكَ مِراراً، وجعل لاَ يلْتَفِتُ إِلَيْهَا، قَالَتْ لَه: آللَّهُ أَمركَ بِهذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَت: إِذًا لا يُضَيِّعُنا، ثُمَّ رجعتْ.فَانْطَلَقَ إِبراهِيمُ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)، حَتَّى إِذا كَانَ عِنْدَ الثَّنِيَّةِ حيْثُ لا يَروْنَهُ. اسْتَقْبل بِوجْههِ الْبيْتَ، ثُمَّ

دعا بهؤلاءِ الدَّعواتِ، فَرفعَ يديْه فقالَ: {رَّبَّنا إنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ} حتَّى بلَغَ {يشكُرُونَ}. وجعلَتْ أُمُّ إسْمَاعِيل تُرْضِعُ إسْماعِيل، وتَشْرَبُ مِنْ ذَلِكَ المَاءِ، حتَّى إذَا نَفِدَ ما في السِّقَاءِ عطشت وعَطِش ابْنُهَا، وجعلَتْ تَنْظُرُ إلَيْهِ يتلوَّى أَوْ قَالَ: يتَلَبَّطُ فَانْطَلَقَتْ كَراهِيةَ أَنْ تَنْظُر إلَيْهِ، فَوجدتِ الصَّفَا أَقْربَ جبَلٍ في الأرْضِ يلِيهَا، فَقَامتْ علَيْهِ، ثُمَّ استَقبَلَتِ الْوادِيَ تَنْظُرُ هَلْ تَرى أَحداً؟ فَلَمْ تَر أَحَداً. فهَبطَتْ مِنَ الصَّفَا حتَّى إذَا بلَغتِ الْوادِيَ، رفَعتْ طَرفَ دِرْعِها، ثُمَّ سَعتْ سعْيَ الإنْسان المجْهُودِ حتَّى جاوزَتِ الْوَادِيَ، ثُمَّ أَتَتِ المرْوةَ، فقامتْ علَيْهَا، فنظَرتْ هَلْ تَرى أَحَداً؟ فَلَمْ تَر أَحداً، ففعَلَتْ ذَلِكَ سَبْع مرَّاتٍ. قال ابنُ عبَّاسٍ رَضِي اللَّه عنهُمَا: قَال النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (فَذَلِكَ سعْيُ النَّاسِ بيْنَهُما). فلَمَّا أَشْرفَتْ على المرْوةِ سَمِعتْ صوتاً، فَقالَتْ: صهْ تُريدُ نَفسهَا ثُمَّ تَسمَعَتْ، فَسمِعتْ أَيْضاً فَقَالتْ: قَدْ أَسْمعْتَ إنْ كَانَ عِنْدكَ غَواثٌ.فأَغِث. فإذَا هِي بالملَكِ عِنْد موْضِعِ زمزَم، فَبحثَ بِعقِبِهِ أَوْ قَال بِجنَاحِهِ حَتَّى ظَهَرَ الماءُ، فَجعلَتْ تُحوِّضُهُ وتَقُولُ بِيدِهَا هَكَذَا، وجعلَتْ تَغْرُفُ المَاءَ في سِقَائِهَا وهُو يفُورُ بَعْدَ ما تَغْرفُ وفي روايةٍ: بِقَدرِ ما تَغْرِفُ. قَال ابْنُ عبَّاسٍ رضِيَ اللَّه عَنْهُمَا: قالَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (رحِمَ اللَّه أُمَّ إسماعِيل لَوْ تركَتْ زَمزَم أَوْ قَالَ: لوْ لَمْ تغْرِفْ مِنَ المَاءِ، لَكَانَتْ زَمْزَمُ عيْناً معِيناً قَال فَشَربتْ، وأَرْضعَتْ ولَدهَا.

فَقَال لَهَا الملَكُ: لاَ تخَافُوا الضَّيْعَة فإنَّ هَهُنَا بَيْتاً للَّهِ يبنيه هَذَا الْغُلامُ وأَبُوهُ، وإنَّ اللَّه لا يُضيِّعُ أَهْلَهُ، وَكَانَ الْبيْتُ مُرْتَفِعاً مِنَ الأَرْضِ كَالرَّابِيةِ تأْتِيهِ السُّيُولُ، فتَأْخُذُ عنْ يمِينِهِ وَعَنْ شِمالِهِ. فَكَانَتْ كَذَلِكَ حتَّى مرَّتْ بِهِمْ رُفْقَةٌ مِنْ جُرْهُمْ، أو أَهْلُ بيْتٍ مِنْ جُرْهُم مُقْبِلين مِنْ طَرِيقِ كَدَاءَ، فَنزَلُوا في أَسْفَلِ مَكَةَ، فرَأَوْا طَائراً عائفاً فَقَالُوا: إنَّ هَذا الطَّائِر لَيدُورُ عَلى ماء لَعهْدُنَا بهذا الوادي وَمَا فِيهِ ماءَ فَأرسَلُوا جرِيّاً أَوْ جَرِيَّيْن، فإذَا هُمْ بِالماءِ، فَرجَعُوا فَأَخْبَرُوهم فَأقْبلُوا، وَأُمُّ إسْماعِيلَ عند الماءَ، فَقَالُوا: أَتَأْذَنِينَ لَنَا أَنْ ننزلَ عِنْدكِ؟ قَالتْ: نَعمْ، ولكِنْ لا حَقَّ لَكُم في الماءِ، قَالُوا: نَعمْ. قال ابْنُ عبَّاسٍ: قَالَ النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (فَأَلفي ذلكَ أُمَّ إسماعِيلَ، وَهِي تُحِبُّ الأُنْسَ. فنزَلُوا، فَأَرْسلُوا إلى أَهْلِيهِم فنزَلُوا معهُم، حتَّى إذا كَانُوا بهَا أَهْل

أبياتٍ، وشبَّ الغُلامُ وتَعلَّم العربيَّةَ مِنهُمْ وأَنْفَسَهُم وأَعجَبَهُمْ حِينَ شَبَّ، فَلَمَّا أَدْركَ، زَوَّجُوهُ امرأَةً منهُمْ، ومَاتَتْ أُمُّ إسمَاعِيل.

فَجَاءَ إبراهِيمُ بعْد ما تَزَوَّجَ إسماعِيلُ يُطالِعُ تَركَتَهُ فَلم يجِدْ إسْماعِيل، فَسأَل امرأَتَهُ عنه فَقَالت: خَرَجَ يبْتَغِي لَنَا وفي رِوايةٍ: يصِيدُ لَنا ثُمَّ سأَلَهَا عنْ عيْشِهِمْ وهَيْئَتِهِم فقَالَتْ: نَحْنُ بَشَرٌ، نَحْنُ في ضِيقٍ وشِدَّةٍ، وشَكَتْ إليْهِ، قَال: فإذا جاءَ زَوْجُكِ، اقْرئى عَلَيْهِ السَّلامَ، وقُولي لَهُ يُغيِّرْ عتبةَ بابه. فَلَمَّا جاءَ إسْماعيلُ كأَنَّهُ آنسَ شيْئاً فقَال: هَلْ جاءَكُمْ منْ أَحدٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، جاءَنَا شَيْخٌ كَذا وكَذا، فسأَلَنا عنْكَ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَسألني كَيْف عيْشُنا، فأَخبرْتُهُ أَنَّا في جَهْدٍ وشِدَّةٍ. قَالَ: فَهَلْ أَوْصاكِ بشَيْءٍ؟ قَالَتْ: نَعمْ أَمَرني أَقْرأ علَيْكَ السَّلامَ ويقُولُ: غَيِّرْ عتبة بابكَ. قَالَ: ذَاكِ أَبي وقَدْ أَمرني أَنْ أُفَارِقَكِ، الْحَقِي بأَهْلِكِ. فَطَلَّقَهَا، وتَزَوَّج مِنْهُمْ أُخْرى. فلَبِث عَنْهُمْ إبْراهيم ما شَاءَ اللَّه ثُمَّ أَتَاهُم بَعْدُ، فَلَمْ يجِدْهُ، فَدَخَل على امْرَأَتِهِ، فَسَأَل عنْهُ. قَالَتْ: خَرَج يبْتَغِي لَنَا. قَال: كَيْفَ أَنْتُمْ، وسأَلَهَا عنْ عيْشِهِمْ وهَيْئَتِهِمْ فقَالَتْ: نَحْنُ بِخَيْرٍ وَسعةٍ وأَثْنتْ على اللَّهِ تَعالى، فقَال: ما طَعامُكُمْ؟ قَالَتْ: اللَّحْمُ. قَال: فما شَرابُكُمْ؟ قَالَتِ: الماءُ. قَال: اللَّهُمَّ بَارِكْ لهُمْ في اللَّحْمِ والماءِ، قَال النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): «وَلَمْ يكنْ لهُمْ يومَئِذٍ حَبٌّ وَلَوْ كَانَ لهُمْ دَعَا لَهُمْ فيهِ) قَال: فَهُما لاَ يخْلُو علَيْهِما أَحدٌ بغَيْرِ مكَّةَ إلاَّ لَمْ يُوافِقَاهُ.

وفي روايةٍ فَجاءَ فقَالَ: أَيْنَ إسْماعِيلُ؟ فقَالَتِ امْرأَتُهُ: ذَهبَ يَصِيدُ، فقَالَتِ امْرأَتُهُ: أَلا تَنْزِلُ، فتَطْعَم وتَشْربَ؟ قَالَ: وما طعامُكمْ وما شَرابُكُمْ؟ قَالَتْ: طَعَامُنا اللَّحْمُ، وشَرابُنَا الماءُ. قَال: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ في طَعامِهِمْ وشَرَابِهِمْ قَالَ: فَقَالَ أَبُو القَاسِمِ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: «بركَةُ دعْوةِ إبراهِيم (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)» قَالَ: فَإذا جاءَ زَوْجُكِ، فاقْرئي علَيْهِ السَّلامَ وَمُرِيهِ يُثَبِّتْ عتَبَةَ بابهِ. فَلَمَّا جاءَ إسْماعِيلُ، قَالَ: هَلْ أَتَاكُمْ منْ أحد؟ قَالتْ: نَعمْ، أَتَانَا شيْخٌ حسَن الهيئَةِ وَأَثْنَتْ عَلَيْهِ، فَسأَلَني عنْكَ، فَأَخْبرتُهُ، فَسأَلَني كيفَ عَيْشُنَا فَأَخبَرْتُهُ أَنَّا بخَير. قَالَ: فأَوْصَاكِ بِشَيْءٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، يَقْرأُ عَلَيْكَ السَّلامَ، ويأْمُرُكَ أَنْ تُثَبِّتَ عَتَبَة بابكَ. قَالَ: ذَاكِ أَبي وأَنتِ الْعَتَبةُ أَمرني أَنْ أُمْسِكَكِ. ثُمَّ لَبِثَ عنْهُمْ ما شاءَ اللَّه، ثُمَّ جَاءَ بعْد ذلكَ وإسْماعِيلُ يبْري

نَبْلاً لَهُ تَحْتَ دَوْحةٍ قريباً مِنْ زَمْزَمَ، فَلَمَّا رآهُ، قَامَ إِلَيْهِ، فَصنعَ كَمَا يصْنَعُ الْوَالِد بِالْوَلَدُ والوالد بالْوالدِ، قَالَ: يا إِسْماعِيلُ إِنَّ اللّه أمرني بِأَمْرٍ، قَالَ: فَاصْنعْ مَا أَمركَ ربُّكَ؟ قَالَ: وتُعِينُني، قَالَ: وأُعِينُكَ، قَالَ: فَإِنَّ اللّه أَمرني أَنْ أَبْني بيْتاً ههُنَا، وأَشَار إِلى أَكَمَةٍ مُرْتَفِعةٍ على ما حَوْلَها فَعِنْد ذلك رَفَعَ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبيْتِ، فَجَعَلَ إِسْماعِيل يأْتي بِالحِجارَةِ، وَإِبْراهِيمُ يبْني حتَّى إذا ارْتَفعَ الْبِناءُ جَاءَ بِهَذا الحجر فَوضَعَهُ لَهُ فقامَ عَلَيْهِ، وَهُو يبْني وإِسْمَاعِيلُ يُنَاوِلُهُ الحِجَارَة وَهُما يقُولاَنِ: (ربَّنا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ).

وفي روايةٍ: إِنَّ إِبْراهِيم خَرَج بِإِسْماعِيل وأُمِّ إِسْمَاعِيل، معَهُم شَنَّةٌ فِيهَا ماءٌ فَجَعلَتْ أُم إِسْماعِيلَ تَشْربُ مِنَ الشَّنَّةِ، فَيدِرُّ لَبنُها على صبِيِّها حَتَّى قَدِم مكَّةَ. فَوَضَعها تَحْتَ دَوْحةٍ، ثُمَّ رَجَع إِبْراهيمُ إِلى أَهْلِهِ، فاتَّبعَتْهُ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ حَتَّى لَمَّا بلغُوا كَداءَ نادَتْه مِنْ ورائِهِ: يَا إِبْراهِيمُ إِلى منْ تَتْرُكُنا؟ قَالَ: إِلى اللّهِ، قَالَتْ: رضِيتُ بِاللّهِ. فَرَجعتْ، وَجعلَتْ تَشْرَبُ مِنَ الشَّنَّةِ، وَيدِرُّ لَبنُهَا عَلَى صَبِيِّهَا حَتَّى لَمَّا فَنِي الماءُ قَالَتْ: لَوْ ذَهبْتُ، فَنظَرْتُ لَعَلِّي أُحِسُّ أَحَداً، قَالَ: فَذَهَبَتْ فَصعِدت الصَّفا. فَنظَرتْ وَنَظَرَتْ هَلْ تُحِسُّ أَحداً، فَلَمْ تُحِسَّ أحداً، فَلَمَّا بلَغَتِ الْوادي، سعتْ، وأَتتِ المرْوةَ، وفعلَتْ ذلكَ أَشْواطاً، ثُمَّ قَالَتْ: لو ذهَبْتُ فَنظرْتُ ما فَعلَ الصَّبِيُّ، فَذَهَبتْ ونَظَرَتْ، فإِذَا هُوَ على حَالهِ كأَنَّهُ يَنْشَغُ للموْتِ، فَلَمْ تُقِرَّها نفْسُهَا. فقَالَتْ: لَوْ ذَهَبْتُ، فَنَظَرْتُ لعلي أُحِسُّ أَحداً، فَذَهَبَتْ فصَعِدتِ الصَّفَا، فَنظَرتْ ونَظرتْ، فَلَمْ تُحِسُّ أَحَداً حتَّى أَتَمَّتْ سَبْعاً، ثُمَّ قَالَتْ: لَوْ ذَهَبْتُ، فَنَظَرْتُ مَا فعل. فَإِذا هِيَ بِصوْتٍ. فَقَالَتْ: أَغِثْ إِنْ كان عِنْدَكَ خيْرٌ فإِذا جِبْريلُ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فقَال بعَقِبِهِ هَكَذا، وغمزَ بِعقِبه عَلى الأَرْض، فَانْبثَقَ الماءُ فَدَهِشَتْ أُمُّ إِسْماعِيلَ فجعلَتْ تَحْفِنُ وذكَرَ الحَدِيثَ بِطُولِهِ.رواه البخاري بهذِهِ الرواياتِ كلها[٣٢٩].

**ئیبنو عەبباس خۆشنودی خوا لەخۆی‌و بابی فەرمووی: بۆیەکەم جار کە ژنـان پشتێنیان داهێنـا لەلایـەنی دایکی ئیسماعیلەوە بـوو، چونکە خـاتوو هاجەرە کە سکی پڕ بوو بە حەزرەتی ئیسماعیل، خاتوو سارە کە ئاغا ژنـی بوو ڕقی لێهەلگرت‌و هەوێباری لێکێشا، جا دایکی ئیسماعیل پشتێنی لەقەدی**

---

[٣٢٩] بوخاری (٣٣٦٤، ٣٣٦٥).

خۆی بەستو لەناومالْ دا دەستی کرد بە خزمەت کـردنو خـۆی وا نیشان دا کە کارەکەری خـاتوو سارایەو هـەوێی نییـە، هـەتا بـەوە ڕقـی خـاتوو سـارەی خـانمی پێبنیشـێنێتەوە، بـەلاّم سـوودی نـەبوو، لـەدوایی دا ئیـبراهیم درودو میهرەبانیو سلاّوی خودای لەسەر بێ هاجەرەو ئیسماعیلی کوڕی هاجـەرەی لە بەیتولمەقدیسەوە برد بۆ مەککە لەوێ لـەلای شوێنی ئێستای بـەیتا لـەبن شـێخەڵێکی گـەورەدا لـەژووور زەمزەمـەوە لەسـەرووی شـوێنی ئێسـتای مەسجیدولحەرامەوە دانـان، ئەوکاتـە ئیسماعیل سـاوابوو، بەرمەمکانـەبوو، کۆرپەیـەکی مەمکـە خـۆرە بـوو، دایکـی خـۆی مـەمکی پـێ دەدا، وە ئـەو سـەردەمەش مەککە ئـاوەدان نـەبوو، لـەوێ دایـانی نـاو هەمانەیـەك خورمـاو کوندەیـەك ئـاوی بـۆ دانـانو ئـیتر خـۆی بـەرەو دوا گەڕایـەوە بۆشـام، دایکـی ئیسماعیل شوێنی کەوتو پێی فەرموو: ئەی ئیبراهیم تـۆ بـۆ کـوێ دەچیتو ئێمە لـەم شیوە چۆلْو هۆلْـەدا بەتـەنیا بەجێـدەهێڵێ، کە نـەهاودەنگی، نـە شتێکی لێنییـە چـەند جارێ خـاتوو هاجـەرە ئـەم قسـەی عـەرزی حـەزرەتی ئیبراهیم کرد، بەلاّم ئیبراهیم ئاوڕی لێنەدایـەوە، هـەتا پێـی فـەرموو: توخـوا ئایــا خــودا فــەرمانی پێکــردووی کەوابکــەی؟ فــەرمووی: بــەڵێ، هاجــەرە فـەرمووی: کـەوابێ خـودا پـەکمان ناخـات، ئـیتر هاجـەرەخاتوون گەڕایـەوە، ئیــبراهیمیش ڕۆیشــت تــا گەیشــتە ســەرکەلْو لەدانــەی ســەروو ئــاوا بــوو کەلەوانەوە دیارنەبوو، ئەوجا ڕووی کردە بەیتو بـەم وشـەو نـزا پیرۆزانـەی کەلـەقورئانی پـیرۆزدا بـاس کـراون نـزای کـرد، هـەردوو دەسـتی هـەلْبڕیو فـەرمووی: {ربنا إني أسكنت من ذريتي بوادٍ غير ذي زرع عند بيتك المحرم ربنـا ليقيموا الصلاة فأجعل أفئدة من الناس تهوى اليهم وارزقهم مـن الثمـرات لعلـهم يشكرون} (١٤/٣٧) واتە: ئـەی خودایـە ئـەی کەسـی بێکەسـان وا مـن بـازێ لەوەچەو نەوەی خۆمم جێگەنشین کرد لەناو ئەم شیوە چۆلْو هۆلْـەدا، کـە دۆڵی مەککەیەو شیوێکی وشکی بێ کشتوکاڵە، لەپـەنای ئـەم خانـەی خۆتـەدا کە ڕێزیت گرتووەو قەدەغـەیت کـردووە کـە کەسـێ ڕێـزی بشکێنێو قـەدری نەزانێ، دیارە ئەرکی بەنـدە ئەوەیە کە نوێژو بەنـدەیی ساخ بۆ تۆ بکا منیش بۆ ئەوەم لێرەدا داناون، پەروەردگاری ئێمە ڕووی دڵـی موسـوڵمانانیان تێکـە، کە بەتاسەو شەوقەوە بڕۆن بۆلایـانو بچـن بـۆ دێنـی کابـەی پـیرۆز، خودایـە

هەرخۆت ڕۆزی دەری‌و بەس، دەی بەمیهری خۆت هۆو مایەی ڕۆزی‌و بەش‌و بارەی باش‌و زۆری هەردوو جیهانیان بۆ فەراهەم بێنە، میوەو سەوزەوات‌و بەری دارودرەختیان پێ بدە، بەڵکوو ئەوانیش سوپاسی تۆ بکەن، ئیتر دایکی ئیسماعیل لەو ئاوەی دەخواردەوەو مەمکی دەدا بە ئیسماعیل کە ئاوەکە بڕایەوە ئەوسا خۆی‌و کوڕەکەی توونیان بوو، دایکی ئیسماعیل تەماشای کرد، ئیسماعیل لەتاو تینوێتی گنگڵە دەداو تەپاوتل دەکا، ئیتر ئۆقرەی پی نەگیراو چاوی بەرایی نەدەدا کەلەسەر ئەوحاڵە تەماشای جگەر گۆشە نۆبەرەکەی بکا لەبەر ئەوە ڕۆیشت، ڕوانی کەوا کێوی صەفا نزیکترین کێوە لێیەوە لەو شوێنەدا، سەرکەوتە سەری‌و لەسەری وەستاو ڕووی کردە ناو شیوەکە، سەیری دەکرد تا بزانێ کەسێك دەبینێ، بەڵام کەسی نەدی، لەصەفا هاتە خوارەوە، تا گەیشتە ناو شیوەکە، لەوێ داوێنی کراسەکەی خۆی هەڵکردو خۆی گورج کردەوەو چاکی کرد بەلادا، ئینجا وەك مرۆڤێکی شەکەت‌و ماندوو، بەڵام تێکۆشەرو کۆڵنەدەر تا ئاخر هەناسە دەستی کرد بە لۆقەکردن تا لەشیوەکە پەڕییەوە، ئەمجا سەرکەوتە سەر مەڕوەو لەسەری ڕاوەستاو تەماشای ئەملاو ئەولای کرد ئایا کەسێ دەبینێ، وەلێ دیسان کەسی نەدی، حەوجار وای کرد. ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەبەر ئەمەیەو بۆ یادگاری ڕووداوو داستانی ئەم ئافرەتە مەردە نەبەردەیە کە ئێستا لەکاتی حەج‌و عەمرەدا حەوت جار خەڵکی هەڕا دەکەن لەنێوانی ئەم دوو گردەدا. کەلەسەرەی جاری حەوتەما هاجەرە کە سەرکەوتە سەر تەپۆلکەی مەڕوە دەنگێ بەرگوێی کەوت، خۆی بە خۆیی گوت: ئاوس کە گوێی بەباشی هەڵخست، دەنگەکەی بەباشی بیست، گوتی: گوێم لەدەنگتە، لێقەوماوم، ئەگەر بەهاواری ئێمەوە هاتووی تا زووە فریامان بکەوە!

کە سەرنجی دا وا فریشتەکە لەلای شوێنی زەمزەمدایە، لەپەنا ئیسماعیل دا، بە پاژنەی پێ یا فەرمووی: بەباڵی خەریك بوو زەویەکەی هەڵدەکۆڵییەوە، هەڵی کۆڵی تا ئاوی لێدەرکەوت، ئیتر دایکە هاجەرە لەخۆشیان دا بەخۆڵ کردی بە گۆمیلکەو بەدەستی ئائاوای لێ دەکرد، تا ئاوەکەی بڵاو نەبێتەوە، وە خۆش خۆش بە مشت ئاوەکەی هەڵدەهێنجاو

دەیکردە کوندەکەیەوە، ئاوەکەش لەدوا دەستەکەی ئەوەوە خۆش خۆش هەڵدەقوڵایەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دایکی ئیسماعیل (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەگەر لەکاتی خۆی دا دەستکاری زەمزەمی نەکردایە، یا فەرمووی: ئەگەر بەلا لەویێ هەڵی نەگۆزیبایە هەتا هەتایە زەمزەم دەبوو بەکانیاو بەخوڕ لەبەری دەڕۆیشت، ئیتر دایکی ئیسماعیل هەم خۆی ئاوی خواردەوەو هەم شیری دا بە کوڕەکەی، جوبرائیل پێی فەرمو: مەترسن، پەکتان ناکەوێ، چونکە خانەی خودا ئا لێرەدا هەیە، ئەم کوڕەو باوکی دروستی دەکەن، وە خودا ئەهلو کەسی ئەوخانەی خۆیە زایە ناکاو داڵدەیان دەدا. بەیتیش ئەو سەردەمە پارچەیێ زەوی قۆقز بوو، وەك تەپۆڵکە وابوو، لافاو لێی دەداو لە ڕاستو چەپیەوە لێی دەبرد، ئیتر دایکی ئیسماعیل هەروا بەو شێوەیە لەوێ مایەوەو ئاوی زەمزەمی دەخواردەوەو برێتی نانو ئاو دەکەوتو مەمکی دەدا بە ئیسماعیل، هەتا کاروانێکی جورهومی یا خێزانێکی جورهومی لە ڕێگەی کەلی کەدا ئەوە هاتن، لەخوار مەککەوە خستیان کەچی باڵندەیەکیان دی گڕی دەخوارد بەسەر ئاوەکەوە، گوتیان: ببێو نەبێ ئەم مەلە بەسەر ئاوەوە دەگەڕێ، ئەم دۆڵەش ئێمە شك بەرین شێوێکی وشكو برینی بێ ئاوە، دەی دەبێ ئەمە چی بێ؟ جا نوێنەرێ، دوو نوێنەریان نارد، کە چوون ئاوەکەیان دۆزییەوەو گەڕانەوەو هەواڵی ئاوەکەیان بۆیان بردەوە، ئەوانیش چوون بۆلای ئاوەکە، دایکی ئیسماعیل لەسەر ئاوەکە بوو، گوتیان پێی: ڕێگەمان دەدەی کەلەلای تۆ هەوار هەڵ دەین؟

گوتی: بەڵێ، بەڵام ئاوەکە هی منەو مافی ئێوەی پێوە نییە مەگەر بەڕەزای من سوودی لێوەربگرن، گوتیان: بەڵێ باشە، ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جا ئاوا ئەو خێڵە لەسەر ئەو حاڵە دایکی ئیسماعیلیان دۆزییەوەو توشی بوون، لەکاتێکی وادا کە خۆشی حەزی لەئاوەدانی بوو، ئەڵهای هاودەمو ئاو دەنگی دەکرد، ئیتر خۆیان لەوێ

بەزین‌و ناردیان بەشوێن کەس‌و کاریان دا، ئەوانیش هاتن‌و لەگەڵ ئەوانا لەوێ کۆچ‌و باریان خست‌و مەککەیان ئاوەدانکردەوە!

هەتا لەوێ بەرەبەرە بوون بەچەند ماڵێ‌و زۆر بوون، لەولاشەوە کوڕەکەش گەورەبوو، تا بوو بە هەرزەکارو هەر لەوانەوە فێری زمانی عەرەبی بوو، کە گەورە بوو دڵیان گرتی‌و کە ڕەسیدە بوو ژنێکیان لە خۆیان بۆهێنا، ئەوجا هاجەرە خاتوون دایکی ئیسماعیل مردو فەرمانی هەقی بەجێهێنا• تەمەنی نەوەد ساڵ بوو ئیسماعیلی کوڕی (دروودی خوای لەسەر بێ) لە حیجرا ناشتی، پاش ژنهێنانی ئیسماعیل ئیبراهیم هات سەر لەخێزانە جێماوەکەی بدا، وا ڕێدەکەوێ ئیسماعیل لەماڵ نابێ، لەژنەکەی ئیسماعیل دەپرسێ: مێردەکەت لەکوێیە؟ دەڵێ: چووە شتێکمان بۆ پەیدا بکا، لە گوزەران‌و حاڵ‌و بارودۆخی ژیانیان دەپرسێ، ژنەکە دەڵێ: حاڵمان شڕەو زۆر خراپەو لەتەنگانەو سەخڵەتداین!

وەشکات‌و سکالایەکی زۆری لای ئیبراهیم کرد، ئیبراهیم درودو سلاوی خوای لەسەر بێ فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سلاوی لێ بکەو پێی بڵێ: ئاسانەی دەرگاکەی بگۆڕێ، کە ئیسماعیل هاتەوە وەك سوسەو بۆنی شتێ بکا، دەفەرموێ: کەسێ هاتووە بۆلاتان؟ ژنەکەی دەڵێ: بەڵێ پیرەمێردێ لەم ڕەنگە لەم حاڵە هاتبوو، پرسیاری تۆیشی کرد، منیش پێم گوت، پرسیشی کە گوزەرانمان چۆنە؟ گوتم: حاڵمان شڕە، زۆر پەرۆش‌و سەخڵەتین! فەرمووی: ئایا هیچ ئامۆژگارییەکی نەکردیت؟ دەڵێ: با، فەرمووی: کە سلاوت لێ

---

• مردنی مەردان سەرەتای ژینە
ئەمەی من دەیڵێم فەرموودەی دینە
ڕەمزێ وا لەناو سورەی عەنکەبووت:
"خانەی جیهانە: أوهن البيوت
خانەی ژیانی بەراستیش قوربان!
دار الآخرة هي الحيوان!"
ئەم دوو ئایەتە وان لە سورەتی عەنکەبوت دا (وەرگێڕ)

بکەمو دەشی فەرموو: ئاستانەی دەرگاکەت بگۆڕە، فەرمووی: ئەو پیاوە باوکمەو فەرمانی پێکردووم کە لەتۆ جیاببمەوەو دەستت لێ بەردەم بڕۆرەوە بۆلای کەسو کاری خۆت. تەلاقی داو ژنێکی تری لێ مارەکردن.

جا چەندەی کە خوا حەزبکا ئەوەندە ئیبراهیم مایەوەو نەهاتەوە بۆلایان، لەپاشا کە هاتەوە بۆلایان دیسان ئیسماعیلی نەبینی، چوو بۆماڵەوە بۆلای ژنە تازەکەی‌و هەواڵی ئیسماعیلی لێپرسی، گوتی: دەرچووە پێبژێوییەکمان بۆ پەیدا بکا، دەفەرموێ: ئێوە چۆنن‌و حاڵ‌و گوزەرانتان چۆنە؟ دەڵێ: زۆرباشین‌و لەخودا بەزیاد بێ گوزەرانمان زۆر باشە، عەرزی کرد: قوربان! بفەرموو دابەزە پشوویێ بدە، نانێ ئاوێ بخۆ، دەفەرموێ: خۆراکتان چییە؟ دەڵێ: گۆشتە، دەفەرموێ: ئەی خواردنەوەتان چییە؟ دەڵێ: ئاوە، دەفەرموێ: خودایە! پیت‌و فەڕو بەرەکەت بخەرە گۆشت‌و ئاویانەوە بۆیان. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو سەردەمە دانەوێڵەیان نەبوو، ئەگینا بۆ ئەویش نزای پیت‌و فەڕی بۆیان دەکرد، ئیبنو عەبباس فەرمووی: هەرکەسێ لە شوێنێکی تر، جگە لە مەککە، خۆراك‌و خواردنەوەی تەنیا ئاوو گۆشت بێ، پێی ناکەوێ بەڵام لەمەککە پێی دەکەوێ، ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی موحەممەد، کە بەناوی قاسمی کوڕییەوە، کە بەمناڵی مردووە، پێی دەگوترێ ئەبولقاسم، یا باوکی قاسم، فەرمووی: بەبەرەکەتی ئەم نزایەی حەزرەتی ئیبراهیمە کە خواردن‌و خواردنەوەی مەککە بەپیت‌و فەڕن، ئیبراهیم فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سڵاوی لێبکەو پێی بڵێ: ئاسانەی دەرگاکە واتە داری ژێر دەرگاکەی لەجێی خۆی چەسپ بکاو بیهێڵێتەوە، کە ئیسماعیل دێتەوە دەفەرموێ: کەس هاتووە بۆلاتان، دەڵێ: بەڵێ، پیرەمێردێکی نورانی شێوە شیرین هاتەماڵمان، گەلێ وەسپی باشی کرد، پرسیاری تۆی لێکردم، هەواڵی تۆم بۆی باس کرد لە گوزەرانی پرسین پێم گوت کە زۆر باشین فەرمووی: ڕاسپێری کردیت؟ گوتی ئا، سڵاوی لێدەکردیت‌و دەیفەرموو: کە ئاستانەی دەرگایەکەت مەحکەمتر بکەی، فەرمووی: ئەوە باوکمە، ئاستانەی دەرگاکەیشم مەبەست تۆیە، ژن

بەردی بنچینەی ماڵە، باشیو خراپی خانوو بەندە لەسەر بەردی بناغەکەی، بۆیەکا فەرمانی پێ کردووم کەلەلای خۆم بتهێڵمەوەو بەرەڵات نەکەم، جا چەندەی کە خودا حەزی لەسەر بوو ئیبراهیم مایەوەو نەهاتەوە بۆلایان، لەوایيی دا کەهاتەوە ئیسماعیل لەبن ئەو شێخەڵە گەورەدا کە خۆی یەکەمجار لەوێ داینان، کە لەنزیکی بیری زەمزەمەوە بوو، خەریك بوو تیرێکی دادەداو دەیتاشی، کەچاوی بەباوکی کەوت بەرزەپێ لەبەری هەڵساو چوو بە پیریەوە لەسەر شێوەی بابو کوڕ دەستو مۆچانو ئەمەیان کردو لەپاشا ئیبراهیم فەرمووی: ئیسماعیل! خودا فەرمانێکی داوە بەسەرما ئایا تۆ دەتوانی کۆمەکیم بکەی؟ فەرمووی: فەرمانی پەروەردگارت بەجێ بێنە، منیش یارمەتیت دەدەم، ئیبراهیم تەپۆلکەیەکی بە ئیسماعیل پێنیشان دا، کە دەیڕوانی بەسەر دەورو بەری خۆی داو فەرمووی: خودای گەورە فەرمانی پێفەرمووم کە ئا لێرەدا خانەیەك دروست بکەم، فەرمووی: ئیتر ئەو حەلە دەستیان کرد بە بناغەدانانی بەیتی خانەی خوداو بەرەبەرە بناغەی بەیتیان بەرزکردەوە، ئیسماعیل شاگرد بوو بەردی دەهێناو ئیبراهیمیش وەستا بوو چین بەچین دروستی دەکرد، یەك شاگردو یەك وەستا، تا خانوەکە بەرز بووەوە ئەوسا ئیسماعیل ئەم بەردەی بۆ باوکی هێنا، کە پێی دەگوترێ بەردەکەی ژێرپای ئیبراهیم، یا حەجەری مەقامی ئیبراهیم، بەردەکەی بۆداناو ئیبراهیم لەسەری وەستاو خانووەکەی دروست دەکردو ئیسماعیل بەردی بۆدەهێناو دەیدایە دەستیو ئەویش لە ڕیزی دیوارەکەدا دای دەناو، پێکەوە بەیەك دەنگو یەك دڵ بەسۆزەوە دەپاڕانەوەو دەیان فەرموو: خودایە! ئەم کردەوەیەمان لێ قبوڵ بفەرموو، چونکە هەرخۆت گوێت لە دەنگمانەو ئاگات لەحاڵی دڵمانە. (بوخاری. ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).

١٨٦٨/٦١- وعنْ سعِيدِ بْنِ زيْدٍ (رضي اللّٰه عنه)قَال: سمِعتُ رسول اللّٰهِ (صلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسلّم)يقُولُ: «الْكَمأَةُ مِنَ المنِّ، وماؤُهَا شِفَاءٌ للْعَينِ» متفقٌ عليه[٣٣٠].

---

[٣٣٠] بوخاری (٥٧٠٨) موسلیم (٢٠٤٩).

سـەعیدی کـوڕی زەیـد (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لـە حـەزرەتم ژنـەوت فەرمووی: دومەڵان لەچەشنی ئەو گەزۆیە کە دەباری بۆنەوەی ئیسرائیل، وە ئاوەکی دەرمانە بۆ دەردی چاو. (ش=بوخاری‌و موسلیم (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

**٣٧١- نامەی پاڕانەوەو داوای لێبوردن (كتاب الإستغفار)**

قال الله تعالى: {واستغر لذنبك ولمؤمنين والمؤمنات} (ز: ٣٧٠ ذ/٣٦-١٨٤٢).

وقال الله تعالى: {واستغفر الله أن الله كان غفورا رحيما}

واتــە: وەداوای چاوپۆشــی لــەخودا بکــە، بەڕاســتی خــودا چاوپۆشــیکارو میهرەبانە.

وقال الله تعالى: {فسبح بحمد ربك واسغفره إنه كان توابا} (١١٠/٣).

واتە: کاتێ بەچاوی خۆت دیت کەوا ئایینی ئیسلام سەرکەوت‌و نیشانەی گەورەی ئەوەهاتە دی کە گرتنی شاری مەککەیەو ئەو خەڵکەت بینی کە پۆل پۆل‌و کۆمەڵ کۆمەڵ دێنە سەر دینی ئیسلام کە تاقە دینـی هـەقی خودایـە لەم چەرخەی تۆ بەدواوە، کاتێ ئەمە بوو، تۆش نوێژ بۆ خودای خـۆت بکـەو تەسـبیح‌و حەمـدو ئیسـتغفاری تیـا بکـە، چـونکە بەڕاسـتی خـودا بـەزۆری تەوبەو پەشیمانی گیرا دەکا.

{زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنْ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنْ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الـدُّنْيَا وَاللَّـهُ عِنْـدَهُ حُسْنُ الْمَآبِ (١٤) قُلْ أَؤُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ ذَلِكُمْ لِلَّـذِينَ اتَّقَـوْا عِنْـدَ رَبِّهِـمْ جَنَّـاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنْ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ (١٥) الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّـارِ (١٦) الصَّـابِرِينَ وَالصَّـادِقِينَ وَالْقَـانِتِينَ وَالْمُـنْفِقِينَ وَالْمُسْـتَغْفِرِينَ بِالأَسْـحَارِ (١٧)} (١٤/٣-١٧).

واتە:

ڕەهبــەر! بفــەرمووە پــارەو پــول‌و مــاڵ پایــــەو شــــان‌و کــــەماڵ‌و جــــەماڵ،
زێــڕو زیــوی زۆر، ژن کــەل‌و منــاڵ بەوگو نـــاژەڵ‌و زەوی‌و کشـــتوکاڵ
نــارەزوو و نــازو بــەزم‌و ڕەزمــی خــۆش سـەیران‌و سـەفاو کـەیف‌و عـەیش‌و نـۆش!

ئەمانە هەموو ڕەونەقی دنیان
ڕاستە نازدارن وەک گوڵی تەنیان

وەلێ ئارامگەی خۆشی گیانی پاک
وا لەلای خودای بێ هاوەڵی تاک

تاپۆیە لەسەر خاوەنی بڕوا
کە دڵی پڕ بێ لە نووری تەقوا

دەزانی تەقوا یانی چی برا؟!
دەکرێ بە نووری دڵ وەکوو چرا

پارێز لە گوناه یانی هَا تەقوا
تەقوا یانی ها بترسە لەخوا

دەستمایەی گەورە تەقوای خودایە
گەر بازرگانی، کوانێ دەستمایە؟

خاوەنی تەقوا لەلای خودای خۆی
چەن بەهەشتێ خۆش دانراون بۆی

باغو بۆڵاخو تەلارو ڕووبار
وا لەناویان دا بەسەدان هەزار

پەری شۆخو شەنگ ناسکو نازدار
پاکو پاکیزەو خۆشڕوو، خۆشڕەفتا

هاوسەری ژینی جاویدانیانن
وەک پەروانەو شەم دەستەملانیانن

لەگشتی خۆشتر خۆشنودی خوایە
سەرشاری مەستیی هەتا هەتایە

لافاوی مەستیی عەشقی خودایە
دەریا ئاسایە قەد لەبن نایە

خوا بەندەیی خۆی تەواو بینایە
دەزانێ بەندەی چی لەشانایە،

خاوەنی تەقوا ئەوانەن بە کوڵ
بە سینەیێ ساف پڕ بەسۆزی دڵ

دەپاڕێنەوە، دەلاڵێنەوە
وەک سۆزی دەروێش هەر دەڵێنەوە

پەیمانی ئیمان تازەو نفتو نۆ
دەبەستین گشت کات خوایە لەگەڵ تۆ

دەسمایەی دەسمان تەقوایەو ئیمان
بپۆشە خودا هەموو گوناهمان

صابیر لەبەر باری خودادا
ڕاستی پەروەرن، لێی نابن جودا

سۆفیلکەن خواناس، خێر خواو خێرکەرن
بەرە بەیانیان دەرگای خوا دەگرن

چەن جوانە ڕیشی بە فرمێسک ئەخشاو
چاو وەکوو نێرگز پڕ بێ لە خوناو

دەس بەرەو ئاسمان ڕوو بەرەو قیبلە
دڵ لەلای خودا، دەم بە تەلیلە!!

وقال تعالى: {وَمَنْ يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرْ اللَّهَ يَجِدْ اللَّهَ غَفُوراً رَحِيماً} (٤/١١٠).

واتە: هەرکەسێ کارێکی خراپی وابکا کە زیانی بۆ غەیری خۆی ببێ، یاخود زۆرو ستەم لەخودی خۆی بکا، لەپاشان تەوبەی بەڕاستی لێبکاو داوای لێبوردنیش لەخودا بکا، ئەوە بەبێ سوو و گومان خودا لێی خۆش دەبێو میهرەبانی لەگەڵ دەنوێنێ.

وقال تعالى: {وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّـهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ} (٨/٣٣).

واتە: لەبەر خاتری تۆ خۆشەویست هەتا تۆ وای لەناویانا خودا سزایان نادا، هەروا هەتا ئەوان ترسی خودایان هەبێو لێی بپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبوونی لێبکەنو خودا بەخودای خۆیان بزانن، خوداش سزاو تۆڵەی سەختیان ناداو بە چورتمو قۆرتو بەڵای گەورە قریان ناکا.

وقال تعالى: {وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ}

ڕاڤەکەو ئایەتەکە لەم باسەدا ڕابوورد: کەسێك شتێکی ناڕەوای لێ قەوما چی بکاو چی بڵێ باشە ← (ب/٤ ز/٣٦٩ ئایەتی سێیەم).

والآيات في الباب كثيرة معلومة: واتە: ئایەتی تری ئا لەم بابەتە زۆرو زانراون ئەگەر لەبەرتە!

١٨٦٩/١- وَعن الأَغَرِّ المُزَنِيِّ (رضي اللّه عنه)أَنَّ رسُول اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (إِنَّهُ لَيُغَانُ على قَلْبِي، وَإِنِي لأَسْتغْفِرُ اللّه في الْيوْمِ مِئَةَ مرَّةٍ) رواهُ مُسلِم[٣٣١].

ئەغەڕی موزەنی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوی ڕاست بێ جاروبار منیش گەرد لەدڵم دەنیشێو تارمایی تەم بەرچاوی دڵم دەگرێ، جا بۆیە هەموو ڕۆژێ سەد جار، بگرە پتریش لەخودا دەپاڕێمەوەو داوای لێبوردنی لێدەکەم. (م.خ).

١٨٧٠/٢- (ب/١ ز/٢ والله إني لا أستغفر الله ژ/١-١٣ ز/٢)[٣٣٢].

١٨٧١/٣- فەرموودەی: (لو لم تذنبوا...) ژ/٤٢٢ ز/٥١)[٣٣٣].

---

[٣٣١] بوخاری (٥٧٠٨) موسلیم (٢٠٤٩).

[٣٣٢] بوخاری (٦٣٠٧) موسلیم (ژمارە١٥/٣١ ز/٢ ب/١).

[٣٣٣] موسلیم (٢٧٤٩).

١٨٧٢/٤- وعَنِ ابْنِ عُمر رضِي اللّٰه عنْهُما قَال: كُنَّا نَعُدُّ لِرَسُول اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)في المجلس الْواحِدِ مائة مـرَّةٍ: (ربِّ اغْفِـرْ لـي، وتُـبْ علـيَّ إنَّـكَ أنْـتَ التَّوابُ الرَّحِيمُ) رواه أبو داود، والترمذي، وقال: حديث صحيح[٣٣٤].

ئيبنو عومەر خۆشنودى خودا لـەخۆى‌و بابى فـەرمووى: لەيـەك كۆڕى دانيشتن دا سەدجار دەمانژمارد كە پێغەمبەر (دروودى خواى لەسەر بێ) دەيفەرموو: ئەى پـەروەردگارم! لـێم خۆشـبەو تەوبـەم گيرا بفـەرموو، بەڕاسـتى تـۆ گيراكـەرى تەوبەيت‌و ميهرەبانى. (د/ت-ح-ص).

١٨٧٣/٥- وعنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضِي اللّٰه عنْهُما قَال: قالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (منْ لَزِم الاسْتِغْفَار، جعل اللّٰه لَهُ مِنْ كُلِّ ضِيقٍ مخْرجاً، ومنْ كُلِّ هَمّ فَرجاً، وَرَزَقَهُ مِنْ حيْثُ لا يَحْتَسِبُ) رواه أبو داود[٣٣٥].

ئيبنـو عـەبباس (ڕەزاى خوايـان لـێ بـێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خـواى لەسـەر بـێ) فـەرمووى: هەركەسـێ هـۆبگرێ بـە ئيسـتيغفارو داواى لێبوردن لـەخودا بكـا، خودا لەهەموو تەنگانەيەكا دەرووى ڕەحمەتى لێدەكاتەوەو لەهـەموو خـەم‌و پەژارەيێ ڕزگارى دەكاو خـەمى دەرەوێنێتـەوە، وە لەشـوێنێكى واشـەوە ڕزق‌و ڕۆزى بۆ دەرەخسێنێ كە بەخەيالّى خۆيا نەيێ. (ئەبو داوود — (ڕەزاى خواى لێ بێ)).

١٨٧٤/٦- وعنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رضي اللّٰه عنه)قال: قال رسُولُ اللّٰه (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (منْ قال: أَسْتَغْفِرُ اللّٰهَ الذي لا إلَهَ إلاّ هُو الحيَّ الْقَيُّومَ وأَتُوبُ إلَيهِ، غُفِرَتْ ذُنُوبُهُ وإنْ كَانَ قَدْ فَرَّ مِـنَ الزَّحْـفِ) رواه أبـو داود والترمـذي والحـاكِمُ، وقـال: حدِيثٌ صحيحٌ على شَرْطِ الْبُخَارِيِّ ومُسلمٍ[٣٣٦].

ئيبنـو مەسـعود (ڕەزاى خوايـان لـێ بـێ) فـەرمووى: خۆشەويسـت (دروودى خـواى لەسـەر بـێ) فەرمووى: هەركەسێ ئەم وشە پيرۆزەيە بەزمان بڵێ‌و بـە دڵ ملكەچ بـێ بـۆ ناوەرۆكەكەى خـودا لـە گوناهـەكانى خـۆش دەبـێ، تەنانـەت ئەگـەر لـەڕيزى شەڕى بەرامبەرى كافريش هـەڵهاتبێ خـودا هـەر لێـى خـۆش دەبـێ، ئەمـەش وشەكەيە بڵێ: {أستغفر الله الذي لا إله إلا هو الحي القيوم وأتـوب إليـه} واتـە:

---

[٣٣٤] ئەبوداوود (١٥١٦) تيرميزى (٣٤٣٠).

[٣٣٥] ئەبوداوود (١٥١٨).

[٣٣٦] ئەبوداوود (١٥١٧) تيرميزى (٣٥٧٢) حاكم لە المستركا: ٥١١/١.

داوای لێخۆشبوون تەنها لەو خودایە دەکەم کە هەر خۆی خودای تاك‌و تەنهایە، پەرستراوی بەڕاستی خۆی نەبێ کەسی تر نییە، زیندووی نەمر بەس خۆیەتی‌و بەس، وە تەوبەو پەشیمانی خۆم عەرزی بارەگای ئەو دەکەم. (د/ت-حاکم).

١٨٧٥/٧- وعنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رضي اللّه عنه)عن النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قالَ: (سيِّدُ الاسْتِغْفار أَنْ يقُول الْعبْدُ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لا إِلَه إِلاَّ أَنْتَ خَلَقْتَني وأَنَا عَبْدُكَ، وأَنَا على عهْدِكَ ووعْدِكَ ما اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما صنَعْتُ، أَبوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ علَيَّ، وأَبُوءُ بذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لا يغْفِرُ الذُّنُوبِ إِلاَّ أَنْتَ. منْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِناً بِهَا، فَماتَ مِنْ يوْمِهِ قَبْل أَنْ يُمْسِيَ، فَهُو مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، ومَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وهُو مُوقِنٌ بها فَمَاتَ قَبل أَنْ يُصْبِح، فهُو مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ) رواه البخاري[٣٣٧].

شەدداى کوڕی ئەوس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پاڕانەوەی هەرە گەورەو سەروەری گوناهپۆشی ئەوەیە بە سۆزی دڵ بڵێی: {اللهم أنت ربي، لا إله إلا أنت خلقتني، وأنا عبدك، وأنا على عهدك ووعدك مااستطعت، أعوذ بك من شر ما صنعت، أبوء لك بنعمتك علي، وأبوء بذنبي، فأغفر لي، فأنه لا يغفر الذنوب إلا أنت} واتە: خواوەند! هەرتۆ پەروەردگاری منیت، لەتۆ زیاتر خودای تر نییە، من بەندەو عەبدی تۆم‌و تۆ منت لە نەبوون دروست کردووە تا بتوانم پەیمان‌و بەڵێنی تۆ ناشکێنم، کە نەشم توانی ئەوە لەدەسەوەسانی مە، چونکە ستەمە کە بەندە بتوانێ تەواوی ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ بهێنێ، پەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی کردەوەی خۆم، کە دەبێ بەمایەی سزاو تۆڵە بۆم، تۆ سەرچاوەی نازو نیعمەتی بۆمن‌و هەمیشە چاکەو نیعمەتی بێ شوماری تۆم لەبەرچاوەو پێ دەنێم لە گوناهباری خۆم، کەواتە لێم خۆشبە، بەڕاستی تۆ نەبی کەسی تر ناتوانێ‌و هیچ کەس ڕادەی ئەوەی ناکەوێ کەلە گوناهی بەندەی خودا خۆش بێ.

---

[٣٣٧] بوخاری (٦٣٠٦).

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ لە ڕۆژدا ئەمە بەدەم بڵێ، وە بەدڵ باوەڕی تەواوی پێی هەبێ، وە بەر لە داهاتنی شەو لەو ڕۆژەدا بمرێ ئەوە بەهەشتییە، وە هەرکەسێ بەشەو ئەمە بڵێ وە بەدڵ باوەڕی پێی هەبێ وە بەر لەهاتنی ڕۆژ بمرێ ئەوە بەهەشتییە. (بوخاری – (ڕەزای خوای لێ بێ)).

١٨٧٦/٨- وعَنْ ثوْبانَ (رضي اللّه عنه)قال: كَانَ رسـولُ اللّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)إذا انْصرفَ مِنْ صلاتِهِ، استَغْفَر اللّه ثلاثاً وقَالَ: (اللّهُمَّ أنْتَ السَّلامُ، ومِنْـكَ السَّلامُ، تَبارَكْتَ ياذَا الجلال والإكْرام) قيلَ لِلأوزاعِـيِّ وهُـوَ أَحـدُ رُواتِـهِ: كَيْـفَ الاسْتِغْفَارُ؟ قَال: يقُولُ: أَسْتَغْفِرُ اللّه، أَسْتَغْفِرُ اللّه. رواه مسلم[٣٣٨].

تەرجەمەی ئەم فەرموودەیە لەسەرەتای (كتـاب الأذكـار)دا ڕابـوورد (➔ بڕوانە ژمارە/١٤١٥ ز/٢٤٤).

١٨٧٧/٩- وعَنْ عَائِشَةَ رَضي اللّه عنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ قَبْل موْتِهِ: (سُبْحانَ اللّهِ وبحمْدِهِ، أَسْتَغْفِرُ اللّـه وأَتُـوبُ إِلَيْـهِ) متفقٌ عليه[٣٣٩].

عائیشـە هاوسـەری حـەزرەت دروودی خـوا لـەخۆی و ڕەزای خـودا لـە هاوسـەرەكانی بـێ فـەرمووی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) لـەپێش مردنـی دا بەزۆری دەیفەرموو: سبحان الله وبحمده، أستغفر الله وأتوب إليه. (ش).

١٨٧٨/١٠- ➔ (ب/٢ بڕوانە: ژمارە/٤٤٢/٣ ز/٥٢)[٣٤٠].

١٨٧٩/١١- وَعَن ابنِ عُمَرَ رضِي اللّه عنْهُما أَنَّ النبِـيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَال: (يا معْشَرَ النِّساءِ تَصَدَّقْنَ، وأَكْثِرْنَ مِنَ الاسْتِغْفَار، فَإِنِّي رَأَيْـتُكُنَّ أَكْثَـرَ أَهْلِ النَّـار) قالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: مالَنا أَكْثَرَ أَهْلِ النَّار؟ قَالَ: (تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وتَكْفُـرْنَ العشِـيرَ مَـا رأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عقْلٍ ودِينٍ أَغْلبَ لِذِي لُبّ مِـنْكُنَّ) قَالَـتْ: مـا نُقْصـانُ الْعقْـل والدِّين؟ قال: (شَـهَادَةُ امـرأَتَيْنِ بِشـهَادةِ رجُـلٍ، وتَمْكُـثُ الأَيَّـامَ لا تُصَـلِّي) رواه مسلم[٣٤٢].

---

[٣٣٨] موسلیم (٥٩١).

[٣٣٩] بوخاری (٨١٧) و (٤٩٦٧) موسلیم (١/٣٥١ رقم/٢١٨).

[٣٤٠] بڕوانە بەرگی دوو ز/٥٢ ژ/٤٤٢/٣.

[٣٤١] موسلیم (٧٩).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر دروودو سڵاوو ڕەحمەتو میهرەبانی خودای گەورەو سەروەری لەسەر بێ فەرمووی: ئەی ژن گەل! خێرو خێرات زۆر بکەنو زۆریش بپاڕێنەوەو داوای لێبوردن لەخودا بکەن، چونکە من لەشەوی میعراج دا دیم کە ئێوە زۆربەی خەڵکی دۆزەخ بوون، ئافرەتێکی بەدەمو پلیان تیا بوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبەرچیمان کەوا ئێمە زۆربەی خەڵکی ئاگرین؟ فەرمووی: زۆر ڕەفو نەفرین دەکەنو سپڵەیی لەگەڵ مێرد دەکەنو چاکەی ئەوتان لەبەرچاو نییە، کەسم نەدیوە کە وەك ئێوە هەم کەم هۆشو هەم کەم ئایین بێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشا پیاو بەو هەموو زیرەکیو زرنگییەوە دەیخەڵەتێننو بۆڕی دەدەن، ژنەکەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کەم هۆشو کەم ئاینییەکەمان کامەیە؟ فەرمووی: کەم هۆشییەکەتان بریتییە لەوە کە شایەتی دووژن بەشایەتی تاقە پیاوێ حلێبە، ئەمە کەم هۆشییەکەتان ئافرەتیش لەکاتی بێنوێژی دا چەند شەوێ دەمێنێتەوە نە نوێژ دەکاو نە ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێ، ئەمەش کەم ئاییینییەکەتان. (م-(ڕەزای خوای لێ بێ)).

**٣٧٢- باسی ئەو خۆشیو بەهرانەی کە خودا لەبەهەشت دا ئامادەی کردوون بۆ بڕوادارانو موسوڵمانان (باب بيان ما أعده الله تعالى للمؤمنين في الجنة)**

قال تعالى: إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ، ادْخُلُوهَا بِسَلامٍ آمِنِينَ، وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَاناً عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ، لا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُمْ مِنْهَا بِمُخْرَجِينَ} . (١٥/٤٥-٤٨).

وقال تعالى: يَا عِبَادِ لا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ الْيَوْمَ وَلا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ، الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ، ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ، يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِصِحَافٍ مِنْ ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الأَنفُسُ وَتَلَذُّ الأَعْيُنُ وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ، وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ، لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِنْهَا تَأْكُلُونَ. (٤٣/٦٨-٧٣).

وقال تعالى: إنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ، فِي جَنَّاتٍ وَعُيُون، يَلْبَسُونَ مِنْ سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَقَابِلِينَ، كَذَلِكَ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ، يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَاكِهَةٍ آمِنِينَ، لا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلاَّ الْمَوْتَةَ الأُولَى وَوَقَاهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ، فَضْلاً مِنْ رَبِّكَ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ. (٤٤/٥١-٥٧).

وقال تعالى: إنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ، عَلَى الأَرَائِكِ يَنظُرُونَ، تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ، يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ، خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسْ الْمُتَنَافِسُونَ، وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ، عَيْناً يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ. (٨٣/٢٢-٢٨).

والآيات في الباب كثيرة معلومة.

زۆتـر مەبەسـتی سـەرەکی ئـەم ئایەتـە پیرۆزانـە ئەوەیـە کـە سـەرنجی ئادەمیزاد بۆ بـەهرەو نـازو نیعمەتـەکانی بەهەشـت ڕابکێشـن دەنـا مەبەسـت بـەیانی جوزئیـاتو وردەکاری نییـە، جـا لـەم ڕوانگـەوە ئـەم زانیارییانـە لـەم ئایەتە پیرۆزانەوە دەردەکەوێ: لەخوا ترسـەکان وان لـەناو بەهەشـتی بـەرین دا، خاوەنی پلەو پایەی بەرزو پڕ لە هێمنیو ئاسایشن، یەکەم جار کە دەچنە نـاو بەهەشـتەکانی خۆیانــەوە، پـۆل پـۆل فریشـتە دەچـن بـە پیریانــەوەو بەخێرهاتنیان لێدەکەنو زۆر بە ڕێزەوە فەرموویان لێدەکـەنو دەفـەرموون: بفەرموون خۆتانو خاوو خێـزانو ژنو منالّـتان، ئەوانـەیان کەلەسـەر ئیمـان مردوون، بەخێرو خۆشیو سەلامەتیو بەبێ ترس بڕۆنە ناو جێگەو ڕێگـەی خۆتانەو، وەك خودا فـەرمووی: {واللذين آمنوا واتبعتهم ذريتهم بإيمان الحقنا بهم ذريتهم وما التناهم من عملهم من شيئ} (٢١/٥٢) جا لـەوێ دا بەکـەیفو سـەما بـزینو گەشـەو بسـکەی سـەرکەوتن لـەڕووی سـپیتان دەردەکـەوێ. لەهەمووی خۆشتر ئەوەیە کە خـودای گـەورە بۆخـۆی نازیـان دەگـرێو ڕووی قسەیان تێدەکاو دەفەرموێ: ئەی بەنـدە نازدارەکـانی خـۆم! مـژدەی هێمنـیو ئاسایشی هەتا هەتاتان لێبێ، لەم ڕۆ بەدواوە ترسی هیچتان نەبێ، ئیتر خەمو خەفـەت بـۆهیچ مـەخۆن، بفـەرموون خۆتـانو ژنـەکانتانو منالّـەکانتان لەبەهەشتا دانیشنو بـەو پـەڕی شـادییەوە ڕابـوێرن، بەهەشـت پـڕ لـە بـاخو بۆلاخو ئاوی ڕەوانو جۆبارو ڕوبارو داری بـەریو کۆشـكو تـەلارو سـەیرانگاو

سەر چەشمەی دلگیرو تاڤگەو فوارەو گوڵو گوڵزارو مەلو مۆری جۆراوجۆری ڕەنگین‌و خنجیلەو نەشمیلەو سەوزەو شینایی‌و مێرگ‌و مێرغوزار، کۆشك‌و تەلارەکان پڕن لە تفاقی جوانی گرانبەهای ڕێك‌و پێك، لەفەرش‌و قاڵی‌و ئۆرتەی نایاب، لەتاقمە قەنەفەی ڕازاوەی بەرابەر، قاپ‌و قاچاخی بەهەشت زۆرو زەبەندەن، پڕ لەکاسەی زێرو زیوو لەگۆزەو سوراحی‌و پەرداخ‌و پیاڵەو مێزو شتی وا، میوەی زۆرو زەبەندەی واتیادا، سەرو مڕ میوەی لێنابڕێ، بە ئارەزووی خۆیان بەبێ قەدەغە لێی دەخۆن، هەموو میوەیێ بەفرەیی هەیە، بەکوردی‌و بە کورتی: هەموو دڵخوازێ لەبەهەشتا هەیە، بەهەرەیەکی تری گەورەو گرنگ ئەوەیە کە ژیانی بەهەشت قەت نابڕێتەوە، بەهەشت‌و نازو نیعمەتەکەی تاپۆکراوە لەسەریان، لەپاداشی کردەوەی باشیان دا، بەڕاستی ئەوکەسانە کە لەدنیادا خۆیان دەپاراست‌و لەخوداو سزای خودا دەترسان لەدوا ڕۆژدا وان لە شوێنێکی هێمن دا، ترسی هیچ جۆرە ئازارو ناخۆشیەکیان نییە، بەرگ‌و پۆشاکی چاکی نایاب دەپۆشن، لە ئاوریشمی زبرو نەرم، لەبەهەشتا وەکوو خەم‌و خەفەت‌و ترس نییە، کینەو ڕق‌و قاریش نامێنێ خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: دڵ‌و دەروون‌و سینەی بەهەشتییەکان کە لەڕق‌و کینەو دەغەزو قار پاك دەکەینەوە، لەناو خۆیان دا وەك برای دڵسۆزی خۆشەویست دەژین، لەکاتی دینی‌و سەردانی یەکتردا لەسەر قەنەفەو کورسی قەشەنگ‌و جوان بەرابەری یەکتری وەکوو برایەکی ئازیز دادەنیشن‌و قسەو گفتوگۆی خۆش دەکەن، ببڕای بیڕای تووشی ماندویی‌و شەکەتی لەش‌و گیان نابن، هەیە بۆ بەهەشتییەکان پەری شۆخ‌و شەنگ، ناسك‌و نازدار، پاك‌و پاکیزەو خۆشڕوو، خۆشڕەفتار، چاو ڕەشی قەوی وەك چاوی ئاسك نازەنین، سپی، تا بڵێی ناسك. مردنی دنیا نەبێ، کە تەنها مردنێکە چەژتوویانە، ئیتر هەتا هەتایە مردن ناچێژن، خودا لەسایەی خۆیەوە لە سزای دۆزەخ پاراستونی، بەڕاستی گەیشتن بەم جۆرە پایە هەتا هەتاییە زیادە کەرەمێکە لەلایەنی خوداوە زۆر گەورەیە، قسەی ساخ ئەوەیە: پیاوچاکان وان لەناو نازونیعمەتی بەهەشتا، لەسەر کورسی‌و قەنەفەی بەڕیزی بەرز دادەنیشن‌و

سەیرو سەفای ناو بەهەشت دەکەن، ناسكو نازداری نیعمەت پەروەری لەڕوویان دیارە، هەمیشە سەرو دڵ خۆشنو بسکەی لێویان دێ، بادە نۆشییان بۆ ساز دەدرێ، لەشەرابێ دەرخواردیان دەدرێ کەوا لەناو شوشەو بلووری سەر بە مۆردا، سەری شوشەکان لەباتی قوڕ بەمیسك مۆر کراوەو بادەکە بۆنی میسکی گرتووە، وە ئەو بادەیە کەوا نایابە وەك ئارەقو مەیی دنیا نییە، کەدەبێ بەهۆی تێکچونی هۆشو سەرخۆشیو بەدمەستی، ئەو شەرابە بەئاوێ دەشکێننەوە کەلەسەرچاوەی (تەسنیم) هێنراوە، کە سەرچاوەیەکە نزیکانی بارەگای خودا ئاوی لێدەخۆنەوە، دەی هەرکەسێ دەیەوێ بەئاواتی هەتا هەتایی خۆی بگا، با هەوڵو تەقەلای بێوچان بۆ نازو نیعمەتی ئاوا بدا.

١/١٨٨٠– وعنْ جَابِرٍ (رضي اللّٰه عنه)قَالَ: قَالَ رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (يَأْكُلُ أَهْلُ الجَنَّةِ فِيهَا ويشْرَبُونُ، ولا يَتغوَّطُونَ، ولا يَمْتَخِطُونَ، ولا يبُولُونَ، ولكِنْ طَعامُهُمْ ذلكَ جُشَاء كَرشْحِ المِسْكِ يُلهَمُونَ التَّسبِيح وَالتكْبِير، كَما يُلْهَمُونَ النَّفَسَ) رواه مسلم[342].

جابیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خەڵکی بەهەشت لەبەهەشتا شت دەخۆنو دەخۆنەوە، بەڵام نە پیسایی دەکەنو نە چڵمو کڵمیان هەیەو نە گمیز دەکەن، ئەو خواردنەوەی کە دەیخۆنەوە وەك ئاورنگی مسك دەبێ بەئارەقو لەشیان نم نم دەری دەدا، ئەو خواردەمەنیەشی کە دەیخۆن بە قرقێنەی بۆنخۆشی وەك گوڵاو دەڕوا، وەك چۆن بە سروشت بەهاسانیو بە خۆشی، بەبێ ئەركو زەحمەت، هەناسە دەدەن، ئاوەهاش لەخوداوە یادو زیکری خوا دەکەن، بەتایبەتی زیکری (سبحان الله) و (الحمد لله). (موسلیم. (ڕەزای خوای لێ بێ)). لەصەحیحی موسلیم دا ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە.

٢/١٨٨١– وعَنْ أَبِي هُرَيْرةَ (رضي اللّٰه عنه)قَال: قَال رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (قَال اللّٰه تَعالَى: أَعْددْتُ لِعِبادِيَ الصَّالِحِينَ مَا لاَ عـيْنٌ رَأَتْ، ولاَ أُذُنٌ

[342] موسلیم (٢٨٣٥) (١٩).

سَمِعتْ ولاَ خَطَرَ علَى قَلْبِ بَشَرٍ، واقْرؤُوا إنْ شِئتُمْ: {فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ ما أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جزَاءً بِما كَانُوا يعْمَلُونَ} ﴿ السجدة: ١٧ ﴾ متفقٌ عليه[343].

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: خوای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەو بەهرەو نازو نیعمەتو خۆشیو شادییە، کە خۆم ئامادەم کردووەو هەڵم گرتووە بۆ بەندە باشو خاسەکانی خۆم ئەوەندە باشو نایابن نە بەچاو بینراونو نە بەگوێ بیستراونو نەبەدڵی کەس دا هاتوونو نەبە خەیاڵی دا ڕابوردوون، ئەوە جگە لەوەیش کە خۆتان ئاگادارینیو لەقورئانو حەدیثا باس کراوە بۆتان، ئەگەر حەزیش دەکەن بۆ پشتگیری ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتە بخوێنن کە دەفەرموێ: {فلا تعلم نفس ما أخفي لهم من قرة أعين جزءا بما كانوا يعملون} (١٧/٣٢) واتە: کەس نازانێ کەچی خێرو خۆشیو نازو نیعمەتێکی نایابی زۆری بێ مانەند لەپشت پەردەی غەیبەوە بۆ ئەو خودا پێداوانە ئامادەکراوە، کەدەبێ بەمایەی ڕۆشنی چاوو دڵو دەرونیان، ئەوەیش لەپاداشی باوەڕی ساغو کردەوەی باشیان دا (ش=شەیخەین = بوخاریو موسلیم** (ڕەزای خوایان لێ بێ)**).**

٣/١٨٨٢– وعَنْهُ قَالَ: قال رسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): (أَوَّلُ زُمْـرَةٍ يدْخُلُونَ الْجنَّةَ على صُورَةِ الْقَمرِ لَيْلَةَ الْبدْرِ. ثُمَّ الَّذِينَ يلُونَهُمْ علَـى أَشَـدِّ كَوْكَـبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّـمَاءِ إضَـاءَةً: لاَ يُبولُـونَ ولاَ يتَغَوَّطُـونَ، ولاَ يتْفُلُـونَ، ولاَ يمْتَخِطُـون. أَمْشاطُهُمُ الذَّهَبُ، ورشْحهُمُ المِسْكُ، ومجامِرُهُمُ الأُلُوَّةُ عُودُ الطِّيبِ أَزْواجُهُم الْحُورُ الْعِينُ، علَى خَلْقِ رجُلٍ واحِد، علَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدم سِتُّونَ ذِراعاً في السَّماءِ) متفقٌ عليه.

وفي روايةٍ للبُخَارِيِّ ومُسْلِمٍ: آنيتُهُمْ فِيهَا الـذَّهَبُ، ورشْـحُهُمْ المِسْـكُ، ولِكُـلِّ واحِدٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَان يُرَى مُخُّ سُوقِهما مِنْ وراءِ اللَّحْـمِ مِـنَ الْحُسْـنِ، لاَ اخْـتِلاَفَ بينَهُمْ، ولا تَبَاغُضَ: قُلُوبهُمْ قَلْبُ رَجُلٍ واحِدٍ، يُسَبِّحُونَ اللَّه بُكْرَةَ وَعَشِيّاً»[344].

---

[343] بوخاری (٣٢٤٤) موسلیم (٢٨٢٤).

[344] بوخاری (٣٢٤٥) موسلیم (٢٨٣٤، ١٥).

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: یەکەم دەستە کە دەڕۆنە ناو بەهەشت ئەوەندە ڕووگەش‌و ڕووخۆش‌و ناسك‌و نازدارن دەق لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن، دەستەی دوای ئەوان، بۆ گەشی‌و جوانی، ڕێك وەك گەشترین ئەستێرەی درەخشانی ئاسمان وان، کە بەئاسمانەوە دەدرەوشێنەوەو ورشە ورشیانە، بەهەشتییەکان نە گمیز دەکەن نە سەراو دەکەن نەتف‌و نەبەڵغەم‌و کلم‌و چلمیان هەیە، نە نەخۆش دەکەون، شانەکانیان زێڕو زیوە، ئارەقیان میسکە، بخوردانەکانیان دارعودیان تیادا دەسوتێ، کە دارێکی زۆر بۆن خۆشە، هاوسەری پەرییە نازدارە چاو جوانەکانن، چ ڕەوشتی جوانیان، چ شێوەی شیرینیان، وەك هی یەك کەس وایە، هەموویان دەڵێی یەك کەسن، بەغیلی‌و حەسوودی‌و کینەو دەغەزو ڕقیان لەناودا نییە، هەمووشیان دەق لەسەر شێوەی ئادەمی بابە گەورەیان دروست کراون، وەك ئەو باڵایان شەست باڵ دەچێ بە حەوادا (ش).

لە گێڕانەوەیەکی بوخاری‌و موسلیم دا: حاجەتەکانیان زێڕو زیوە، ئارەقیان میسکە، هەرکەسەی لەژنانی جیهان بەلایەنی کەمەوە دوو ژنی هەیە، ئەوەندە ناسك‌و نازدارن مۆخی ناو لولاقیان لەسەر گۆشتەوە دیارە، وەك دەڵێن: مێوژە ڕەشکە بخۆن لە گەردنیانەوە دیارە!

جیاوازی‌و ناکۆکی‌و ناڕێکیان لەناودا نییە، کینەو دەغەزو ڕقە لەیەکتری ناکێشن، چونکە تابڵێی لەناو خۆیان دا تەباو ئاشت‌و نێوانخۆش، هەموو دڵیان یەکە، ئەوەندە لەناو خۆیان دا ڕێکن، دەڵێی: یەك کەسن، بەیانیان‌و ئێواران ئەناخوانی‌و ستایشی خودا دەکەن!

٤/١٨٨٣- وَعَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رضي اللّه عنه)عنْ رسُولِ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (سَأَل مُوسَى (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ربَّـهُ، مـا أَدْنَـى أَهْـلِ الْجنَّـةِ مَنْزِلَةً؟ قَالَ: هُو رَجُلٌ يجِيءُ بعْدَ ما أُدْخِل أَهْلُ الْجنَّةِ الْجنَّةَ، فَيُقَالُ لَهُ: ادْخِلِ الْجنَّةَ. فيقُولُ: أَيْ رَبِّ كَيْفَ وقَدْ نَزَل النَّـاسُ منَـازِلَهُمْ، وأَخَـذُوا أَخَـذاتِهِم؟ فَيُقَـالُ لَـهُ: أَتَرضي أَنْ يكُونَ لَكَ مِثْلُ مُلْك مَلِـكٍ مِـنْ مُلُـوكِ الـدُّنْيا؟ فَيقُـولُ: رضِـيتُ ربِّ، فَيقُولُ: لَكَ ذَلِكَ ومِثْلُهُ ومِثْلُهُ ومِثْلُـهُ ومِثْلُـهُ، فَيقُـولُ في الْخامِسَـةِ: رضِـيتُ ربِّ،

فَيَقُولُ: هَذَا لَكَ وعشَرَةُ أَمْثَالِهِ، ولَكَ ما اشْتَهَتْ نَفْسُكَ، ولَـذَّتْ عَيْنُـكَ. فَيَقُـولُ: رضِـيتُ ربِّ، قَـالَ: ربِّ فَـأَعْلاَهُمْ منْزِلَـةً؟ قـال: أُولَئِـكَ الَّـذِينَ أَرَدْتُ، غَرسْـتُ كَرامتَهُمْ بِيدِي وخَتَمْتُ علَيْهَا، فَلَمْ تَر عيْنٌ، ولَمْ تَسْمعْ أُذُنٌ، ولَمْ يخْطُرْ عَلَى قَلْبِ بشَرٍ) رواهُ مُسْلم[٣٤٥].

موغیرەی کوڕی شوعبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: موسـا پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) جـارێ لـە گفتوگۆیـەك دا لـە پەروەردگاری خۆی دەپرسێ: خاوەنی نزمترین پلە لە بەهەشتا حاڵو شانی چۆنە؟ خـوا دەفـەرموێ: ئـەوە پیاوێکـە کـە دێ، دەبینـێ بەهەشـتییەکان چوونەتە بەهەشتەوە، پێی دەڵێن: بچۆرە ناو بەهەشتەوە ئەویش دەڵێ: ئەی خـودای خـۆم بچـمە کوێـوە ئـەو خەڵکە هەرکەسـە جێگـەی خـۆی گرتـووە، جێگەی کەسێکی تریان نەهێشتووەتەوە، پێی دەگوترێ: ئایا ڕازی دەبی لەناو بەهەشتا بەقەد موڵکی پاشایێ لە پاشاکانی جیهان موڵكو سامانت بـدرێتێ؟ دەڵێ: ئـا ڕازیـم ئـەی پـەروەردگارم! جـا دەفـەرموێ: دەوا ئەوەنـدەی موڵكو سامانی پاشایێ لەپاشاکانی جیهان درا بـە تـۆ، واتـە: بەقـەد هـەموو دنیـا، وە ئەوەندەی تریش، وە ئەوەنـدەی تـریش، وە ئەوەنـدەی تـریش، وە ئەوەنـدەی تریش! جا بەندەکە لەسەری جاری پێنجـەما دەفـەرموێ: ئـەی پـەروەردگارم ڕازیم! دەفەرموێ: دە ئەوەو دە ئەوەندەی تریش بۆتۆ، واتە: پەنجا ئەوەندەی دنیا، ئەوا سەرەڕای ئەوەیش دام بەتۆ، هەرچی تـر کـە دڵـت حـەزی پێـدەکاو چاوت خۆشی لێوەردەگرێ دەڵێ: ئەی پـەروەردگارم! بەڕاستی خـۆش نـوودم. موسـا دەفـەرموێ: ئـەی پـەروەردگارم! ئـەی پایـە بەرزترینـەکانیان شـانیان چۆنە؟ دەفەرموێ: ئەوانە هەڵبژاردەی ویستی خۆمنو خـۆم بەدەسـتی خـۆم باخی شەرەفمەندیو قەدرزانی ئەوانم ناشتووەو مۆرم کردووە، تا کەسـی تـر پەیی پێ نەبا جگە لەخۆم، ئەو پایەو شانەی کە بـۆ ئـەوانم ئامـادە کـردووە،

---

[٣٤٥] موسلیم (١٨٩).

نه بەچاو بینراوە، نە بەگوێ بیستراوە، نە بەدڵی کەس دا ڕابووردووە، نە خەیاڵی ئادەمیزاد بۆ ئەوە ئەچێ. (موسلیم. (ڕەزای خوای لێ بێ)).

٥/١٨٨٤- وعن ابْنِ مسْعُودٍ (رضي اللّٰه عنه)قال: قَال رسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم): (إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّار خُرُوجاً مِنها، وَآخِرَ أَهْلِ الْجنَّةِ دُخُولاً الْجنَّة. رجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ حبْواً، فيقُولُ اللّٰه عزَّ وجَلَّ لَهُ: اذْهَبْ فَادخُلِ الْجنَّةَ، فيأْتِيها، فيُخيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا ملأَى، فيرْجِعُ، فيقُولُ: يارَبِّ وجدْتُهَا مَلأى، يَقولُ اللّٰه عزَّ وجلَّ لهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الجنَّةَ، فيأْتِيها، فيُخَيَّل إِلَيْهِ أَنَّهَا ملأى، فَيرْجِعُ. فيَقُولُ: يارَبِّ وجدْتُهَا مَلأى،، فَيقُولُ اللّٰه عزَّ وجلَّ لهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجنَّةَ. فإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيا وعشَرةَ أَمْثَالِها، أَوْ إِنَّ لَكَ مِثْل عَشرَةِ أَمْثَال الدُّنْيا، فيقُولُ: أَتسْخَرُ بِي، أَوَه أَتضحكُ بِي وأَنْتَ الملِكُ) قَال: فَلَقَدْ رأَيْتُ رَسُول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)ضَحِكَ حَتَّى بدت نَواجذُهُ فكَانَ يقُولُ: (ذَلِكَ أَدْنَى أَهْلِ الْجنَّةِ منْزِلَةً) متفقٌ عليه[٣٤٦].

لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: من زۆر بەباشی دەزانم کە دواهەمین کەس کە لەدۆزەخ دەردەچێو دەبێ بە دواهەمین کەس کە دەچێتە ناو بەهەشت کێیە، پیاوێکە بە سکەخشێو چنگە گرێو گاگۆڵکە لە دۆزەخ سەردەردەکا، جا خودای بالادەستو خاوەن شکۆ پێی دەفەرموێ: بچۆ بڕۆرە ناو بەهەشتەوە، ئەویش کە دەچێو دەگاتە بەردەرگا وادەزانێ کە بەهەشت پڕەو جێگەی ئەو نابێتەوە، لەبەر ئەوە دەڵێ خودایە! سیخناخەو جێگەی من نەماوە، دیسان خوای بالادەستو خاوەن شکۆ دەفەرموێتەوە: بچۆ بڕۆرە ناو بەهەشتەوە، جا دیسان کە دەچێ بەخەیاڵ وادەزانێ پڕەو دەگەڕێتەوە دەڵێ: خودایە! چووم بەلام دەبینم پڕەو سیخناخە ئەو حەلە خوای بالادەستو خاوەن شکۆ دەفەرموێ: دەبڕۆ بچۆرە ناو بەهەشت، بەقەد دنیاو دە ئەوەندەی تریش لەبەهەشت بۆ تۆبێ، پیاوەکەش باوەڕ بەخۆی ناکا کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێ

[٣٤٦] بوخاری (٦٥٧١) موسلیم (١٨٦).

بەخاوەنی نازو بەهرەی وا لەبەر ئەوە دەڵێ: دیارە کە مەزاقم پێ دەکەی، یا فەرمووی: دەڵێ: دیارە پێم پێ دەکەنیو بۆ پێکەنین وام پێدەڵێی، خۆ تۆ لای خۆت یەکە پادشای بەڕاستی کەچی گاڵتە بەهەژارێکی وەکوو من دەکەی!؟ ئیبنو مەسعوود فەرمووی: حەزرەتم بینی بەچاوی خۆم کەبەم قسە خۆشەی ئەو کابرایە پێدەکەنی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) پێکەنینی تەواو پێکەنی، تەنانەت دانەکانی پاشەوەی وەدەرکەوتن. حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئەو پیاوە خاوەنی نزمترین پلەو پایەیە لەبەهەشت دا. (ش).

٦/١٨٨٥- وَعَنْ أَبِي مُوسَى (رضـي اللّـه عنـه)أَنَّ النبـيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلّم)قَالَ: «إنَّ للْمُؤْمِنِ في الْجَنَّةِ لَخَيْمةً مِنْ لُؤْلُؤةٍ وَاحِدةٍ مُجوَّفَةٍ طُولُهَا في السَّماءِ سِتُّونَ ميلاً. للْمُؤْمِنِ فِيهَا أَهْلُونَ، يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُ فَلاَ يَـرى بعْضُـهُمْ بَعْضـاً». متَّفقٌ علَيْهِ[347].

ئەبو موسا (رەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: موسوڵمان لەبەهەشت دا چادری وای هەیە، بریتییە لە یەك دەنك گۆی مرواری هڵۆڵ، پانایییەکەی شەست میلە، هەروا درێژاییەکەشی شەست میلە، لەهەموو گۆشەیەك دا لە گۆشەکانی خێزانێکی تێدایە، کە هەمیشە چاویان بڕیوەتە هاوسەرەکانی خۆیانو دڵیان لای کەسی تر نییە، ئەوانەی کەوان لەناو یەکێ لەم گۆشایانەدا چاویان لەو خێزانەی تر نییە کەوان لەناو گۆشەکانی تری ئەم چادرەدا، ئیتر پیاوە موسوڵمانەکان بەئارەزووی دڵی خۆیان دەسوڕێنەوە بەسەر ئەم خێزانانەی خۆیانداو لەگەڵیان دا بەخۆشی ڕادەبوێرن. (ش=شەیخەین = بوخاریو موسلیم (رەزای خوایان لێ بێ)).

٧/١٨٨٦- وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي اللّه عنه)عَنِ النبـيُّ (صَـلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَال: «إنَّ في الْجَنَّةِ لَشَجرَةً يسِيرُ الرَّاكِبُ الْجوادَ الْمُضَمَّرَ السَّـرِيعَ مِائَـةَ سنَةٍ مَا يَقْطَعُهَا» متفقٌ عليه.

---

[347] بوخاری (٣٢٤٣) موسلیم (٢٨٣٨).

وَرَوَياهُ في (الصَّحِيحَيْن) أَيْضاً مِنْ روَايَةِ أَبِي هُرِيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)قالَ: (يَسِيرُ الرَّاكِبُ في ظِلِّهَا مِائَةَ سَنَةٍ مَا يَقْطَعُهَا)[٣٤٨].

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لەبەهەشت دا درەختێ هەیە ناوی توبایە، سواری ماینی خێرای تیژڕۆ، کە ئامادەکرابێ بۆ قۆچو تەراتێن‌و ڕمبازی‌و پێشبڕکێ، بەغار سەد ساڵ بەژێری دا بەتاو دەڕوا هێشتا ناگاتە ئەوپەڕی! (ش).

لە گێڕانەوەیەکی تری صەحیحی شێخی بوخاری‌و صەحیحی شێخی موسلیم دا (ڕەزای خوایان لێ بێ) بەڵام لەئەبو هورەیرەوە سوار سەد ساڵ بەبن سێبەرەکەی دا واتە: بەبن لقەکانی دا، چونکە هەتاوو گەرماو سەرما لەبەهەشت نییە دەڕوا هێشتا ناگاتە ئەوپەڕی.

٨/ ١٨٨٧- وَعَنْهُ عَن النبيُّ (صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (إنَّ أَهْلَ الْجنَّةِ لَيَتَراءُوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الْغَابِرَ فِي الأُفُقِ مِنَ المَشْرقِ أَوِ المَغْربِ لتَفَاضُلِ ما بَيْنَهُمْ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰه، تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ لاَ يبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: (بلَى وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ رجَالٌ أَمَنُوا بِاللّٰهِ وصَدَّقُوا المُرْسلِينَ) متفقٌ عليه[٣٤٩].

دیسان ئەبو سەعید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست دەفەرموێ: پایەو پلەی بەهەشتییەکان لەناو خۆیان دا بەرزونزمی هەیە، لەبەرئەوە کە هەندێ خەڵکی بەهەشت کە دەیانەوێ سەیری دانیشتوانی باڵەخانەکان بکەن، کەوان لەسەرو ئەوانەوە بەچاوگێڕان چاویان بۆ دەگێڕن‌و لەخوارەوە لەدوور دوورەوە تەماشایان دەکەن، دەق وەك ئێستای ئێوە چۆن چاو دەگێڕن بۆ ئەو ئەستێرە گەشانەی کە تەواو دوور کەوتوونەتەوەو گەیشتونەتە ئەوپەڕی ئاسۆو لەکەناری ئاسمانەوە لەخۆرهەڵاتەوە یا لەخۆرئاواوە خەریکن ئاوا دەبن!

---

[٣٤٨] بوخاری (٦٥٥٣) موسلیم (٢٨٢٨، ٢٨٢٦).

[٣٤٩] بوخاری (٣٢٥٦، ٦٥٥٦) موسلیم (٢٨٣١).

یاران (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خوا! دیارە ئەوانە بارەگای پێغەمبەرەکانن بۆیە ئەوەندە وان بەبەرزەوە، کەواتە ئەوان نەبێ کەسی تر نایانگەنێ!

حەزرەت فەرمووی: با، بەوکەسە کە گیانی منی وا لەدەسا کەسانی تریش سەرەڕای پێغەمبەرەکان دەگەنە ئەو تەلارو بالآخانە هەرەبەرزانە، بەلأم بەبەلاش نا، بەڵکوو لەبەر ئەوە حاڵیان وابووە باوەڕی ساخی تەواویان بەیەزدانی پاك‌و بە پێغەمبەرە نازدارەکانی هەبووەو کارو کردەوەی زۆر چاك‌و نایابیشیان هەبووە! (ش).

٩/١٨٨٨- وعنْ أَبي هُرَيْرةَ (رضي اللَّه عنه)أَنَّ رسُول اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (لَقَابُ قَوْسٍ في الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِمَّا تَطْلُعُ علَيْهِ الشمْسُ أَوْ تَغْربُ) متفقٌ عليهِ[٣٥٠].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دروودو صەلأت‌و میهرەبانی خودای گەورەو سەروەری لەسەر بێ‌و ڕۆح‌و ماڵ‌و منالۆ هەست‌و نەست گشتی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی بێ دەفەرموێ: بەقەد جێگەی کەوانێ لەبەهەشتا لەگشت جیهان باشترە. (ش).

١٠/١٨٨٩- وعنْ أَنَسٍ (رضي اللَّه عنه)أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: (إِنَّ في الْجنَّةِ سُوقاً يأْتُونَهَا كُلَّ جُمُعةٍ. فتَهُبُّ رِيحُ الشَّمال، فَتحثُو في وُجُوهِهِمْ وثِيَابِهِمْ، فَيزْدادُونَ حُسْناً وجَمالاً. فَيرْجِعُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ، وقَدْ ازْدَادُوا حُسْناً وجمالاً، فَيقُولُ لَهُمْ أَهْلُوهُمْ: وَاللَّهِ لَقَدِ ازْدَدْتُمْ حُسْناً وجمالاً، فَيقُولُونَ: وأَنْتُمْ وَاللَّهِ لَقَدِ ازْددْتُمْ بعْدَنَا حُسناً وَجمالاً،)) رواهُ مُسلِمٌ[٣٥١].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە بەهەشتا بازاڕێك هەیە، هەموو هەینییەك دەچن بۆ ئەوێ، شنەبای شەماڵ لێیان هەڵ دەکا، لەگولأوو میسك‌و عەتری جۆراو جۆری بەهەشت دەپرژێنێ،

---

[٣٥٠] بوخاری (٣٢٥٣) ولم أجده في مسلم.

[٣٥١] موسلیم (٢٨٣٣).





لەڕەنگ‌و ڕوخسارو لەجل‌و بەرگیان، ئیتر ئەوەندەی تر نازدارو شیرین‌و جوانیان دەکا، جا کەلەسەر ئەو حاڵە، کە گەلێ لەجارانیان جوانترن، دەگەڕێنەوە بۆلای کەس‌و کاریان، کەس‌و کارەکانیان پێیان دەڵێن: بەخودا گەلێ گەلێ لەجاران نازدارترو جوانتر بوون! ئەوانیش دەڵێن: بەخوا ئێوەش لەجاران گەلێ گەلێ نازدارترو جوانتر بوون! (م = ئیمامی موسلیم، پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنوورو ڕەحمەت بێ).

١١/١٨٩٠- وعنْ سَهْلِ بْنِ سعْدٍ (رضي اللّه عنه)أَنَّ رسُولَ اللّه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَالَ: «إِنَّ أَهْلَ الْجنَّةِ لَيَتَراءَوْنَ الْغُرفَ في الْجنَّةِ كَمَا تَتَراءَوْنَ الْكَوْكَبَ في السَّماءِ» متفقٌ عليه[٣٥٢].

لەسەهلی کوڕی سەعدەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەهەشتییەکان چاو دەگێڕن بۆ نهۆم‌و باڵەخانەکان وەك ئێستای ئێوە چۆن لەخوارەوە چاو دەبڕنە ئەستێرە هەرە بەرزەکانی ئاسمان! (ش=شەیخان=بوخاری‌و موسلیم).

١٢/١٨٩١- وَعنْهُ (رضي اللّه عنه)قَال: شَهِدْتُ مِنَ النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)مجْلِساً وَصفَ فِيهِ الْجَنَّةَ حتَّى انْتَهَى، ثُمَّ قَالَ في آخِرِ حدِيثِهِ: «فِيهَا ما لاَ عيْنٌ رأَتْ، ولا أُذُنٌ سمِعَتْ، ولاَ خَطَر عَلى قَلْبِ بشَر، ثُمَّ قَرأَ {تتجافى جُنُوبُهُمْ عَنِ المضَاجِعِ} إلى قَوْلِهِ تَعالَى: {فَلاَ تعْلَمُ نَفْسٌ ما أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْينٍ}. رواهُ البخاري[٣٥٣].

دیسان سهل خۆش نوودی خوای لێ بێ فەرمووی: لە کۆڕێکی دانیشتنی حەزرەت دا (درودی خوای لەسەر بێ) ئامادەبووم حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) باسی ناسك‌و نازداری نازو نیعمەت‌و بەهرەو خۆشیەکانی بەهەشتی دەفەرموو، هەتا هاتە سەرئەوە لە کۆتایی فەرموودەکەی دا فەرمووی: ئەو نازو بەهرانەی کەلەبەهەشتا هەن شتی وا خۆش‌و ناسك‌و نازدار، نە بەچاو بینراون، نە

[٣٥٢] بوخاری (٦٥٥٥) موسلیم (٢٨٣٠).

[٣٥٣] بوخاری (٣٢٤٤، ٤٧٧٩) موسلیم (٢٨٢٥، ٢٨٢٤).

بەگوێ بیستراون، نەبەدڵی کەس دا ڕابووردون و نە بەخەیاڵی دا هاتوون، ئەوجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ، فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ} (السجدة-٣٢/١٦-١٧)، واتە: بەشەو لاڵ و پاڵ ناکەون، بەڵکوو دوورە پارێز لەنوێن دەگرن و خەو لەچاوی خۆیان دەزڕێنن، هەر خەریکی شەونوێژو تاعەت دەبن، بولبولن عاشق بەگوڵن، نەفس مردوو زیندە دڵن، بەکوڵی دڵ لەخودا دەپاڕێنەوە، لاڵەو پاڵە لەدەرگای پەروەردگاری خۆیان دا دەکەن، چونکە سوودو زیانی هەردوو جیهانیان و بەرزو نزمی هەردوو ژیانیان هەر لەو دەزانن، سەرەڕای ئەوەش لەسزاو تۆڵەی سەختی و لەبێ باکی و قاری دەترسن و لەهەمان کات دا بەتەمای ڕێژنەی ڕەحمەتی ئەو خودا بەخشندەو میهرەبانەن، ڕەوشێکی تری جوانیان هەیە لەو زانستو خاترو ماڵ و سامان و ڕزق و ڕۆزییە پاك و حەلاڵەی کە خودا پێیانی داوە، خێرو خێراتی باش و پیاوەتی لێدەکەن و بۆ ڕەزامەندی خودا پێیانی داوە، خێرو خێراتی باش و پیاوەتی لێ دەکەن و بۆ ڕەزامەندی خودا فەقێ و فێرخوازان فێری زانستی باش دەکەن، دەی بزانن ئەم کەڵە پاڵەوانانەی کە ئەمە ڕەفتاریانە مەگەر هەر خودای گەورە بۆخۆی بزانێ و بەس، کەلەباتی ئەم کردەوە باشانەیان و لەچاکەی ئەم کردەوە چاکانەیان دا، خودای مەزن لەپەنامەکییەوە، لە ژێر پەردەی غەیبەوە چی خێرو خۆشی و نازو نیعمەتێکی هەم زۆری هەم ناسك و نازداری بۆیان ئامادەکردووە! (ئیمامی بوخاری – نوقمی لێشاوی میهرەبانی خودا بێ) کە مامۆستاو گەورەی هەموو فەرمووەدزان و موحەدیثەکانە، لە کتێبی صەحیحی بوخاری دا، کە ساغترین و دروستترین کتێبە لەدوا قورئانی پیرۆز، لەسەر ڕای زوربەی زانایانی ئیسلام ئەم پێشەوا نازدارە لەم کتێبە فەرپدارەی خۆی دا ئەم فەرموودە پیرۆزەی گێڕاوەتەوە.

١٨٩٢/١٣- وعنْ أَبي سعِيدٍ وأَبي هُرَيْرةَ رضِي اللَّه عنْهُمـا أَنَّ رسُول اللَّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم)قَال: (إِذَا دخَلَ أَهْلُ الْجنَّةِ الجنَّـةَ يُنَـادِي مُنَـادٍ: إِنَّ لَكُـمْ أَنْ

تَحْيَوْا، فَلا تَمُوتُوا أَبداً وإنَّ لكُمْ أَنْ تَصِحُّوا، فَلاَ تَسْقَمُوا أَبداً، وإنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلا تهْرَمُوا أَبداً وإِنَّ لَكُمْ أَن تَنْعمُوا، فَلا تبؤسوا أَبَداً) رواهُ مسلم[٣٥٤].

ئـەبو سـەعيدو ئـەبو هـورەيرە ڕەزاو خۆشـنودى خوايـان لەسـەر بـێ فەرموويان پێغەمبەرى خۆشەويستو نازدار (دروودى خواى لەسەر بێ) دەفـەرمویّ: کاتـێ بەهەشتییەکان سەرجەم چوونە ناو بەهەشتەوە ئیتر جارچی جاڕ هەڵدەدا ئەم مژدە خۆشەیان بۆ پەخش دەکاتەوە: ئەی دانیشتوانی بەهەشت! ژیـانی نەبڕاوەی پـڕ خێـرو خۆشـی تاپۆیـە لەسـەرتان ئـیتر هـەتا هەتایـە لـەم نـازو نیعمەتە دا دەژینو هەرگیز نامرن، هەتا هەتایە بەلـەش سـاغو بـەبێ دەردو ئازارو نەخۆشی بەئاسودە بـۆ خۆتـان دەژیـن، هەمیشـە جـەهێڵو لاو دەبـنو قەت قەت پیرو ئیختیارو کەفتەکار نابن، هەمیشەش لەخۆشیو نازو نیعمەتا دەبنو قەت قەت فەقیرو هەژارو کەساس ناکـەون! (ئیمـامی موسـلیم نـوقمی دەریـای ڕەحمـەتی خـودای میهرەبـان بـێ کـە دووەمـی هـەموو فـەرموودە زانەکانـە، لـە کتێبـی صـەحیحی موسـلیم دا، لـەدوای صـەحیحی بوخـاری وا لەپایەی دووەم دا ئەم پێشەوا گەورەیە لـەو کتێبـە زێڕینـەدا ئـەم فـەرموودە پـیرۆزەی بەڕشـتـەو سـەنەدی خـۆی تـا سـەر حـەزرەتی پێغەمبـەری خۆشەویسـتو نـازدارو گـەورەو سـەروەر تکاکـاری هـەموو موسـوڵمانێ گێڕاوەتەوە.

حەزرەتی مەولەوی ڕەزای خوای لـێ بێ دەفەرموێ:

پیریو هەژاریو کەساسی هەرسێ — نەبن بەباری شانی هیچ کەسێ

منـیش بەبۆنـەی ئـەم فـەرموودە نـازدارەوەو ئـەم شـیعرە ناسـکەی مەولەوییەوە دەڵێم جەنابی مەولەوی!:

مردن یاساغ بوو، تا سەرە ژیان — پیریو هەژاریو کەساسیش نەمان

بەخۆشمان دەڵێم:

ئەم سێ میراتەی مەولەوی خۆمان — خەڵاتی خودایە مانەوە بۆمان

(وەرگێڕ)

[٣٥٤] موسلیم (٢٨٣٧).

١٤/١٨٩٣- وعَنْ أَبِي هُرِيْرَةَ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رَسُول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَالَ: (إِنَّ أَدْنَى مقْعَدِ أَحدِكُمْ مِنَ الْجنَّةِ أَنْ يقولَ لَهُ: تَمنَّ فَيَتمنَّي ويتمنَّي. فَيقُولُ لَهُ: هلْ تَمنَّيْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعمْ فَيقُولُ لَهُ: فَإِنَّ لَكَ ما تَمنَّيْتَ ومِثْلَهُ معهُ) رَواهُ مُسْلِمٌ[٣٥٥].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار دروودو صەلاتو سەلامی خوای لەسەر بێ دەفەرموێ: ئەو کەسانەتان کە خاوەنی پایەی هەرە خواروون لەبەهەشتا ئەو کەسانەن کە خودا خۆی یا فریشتەیێ لە فریشتەکانی پێی دەفەرموێ: بەئارەزووی دڵی خۆت هەتا دەتوانی خۆزگە بخوازەو دڵت چی دەخوازێ داوای بکە، ئەوسا خودا پێی دەفەرموێ: ئایا خۆزگەی تەواوت خواست؟ دەڵێ: بەڵێ، ئەویش پێی دەفەرموێ: بەقەد خۆزگەی خۆتو ئەوەندەی تریش بۆتۆ بێ. (موسلیم (ڕەزای خوای لێ بێ)).

١٥/١٨٩٤- وعنْ أَبِي سعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رسُول اللّٰه (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلّم)قَال: (إِنَّ اللّٰه عزَّ وجلَّ يقُولُ لأَهْل الْجنَّةِ: يا أَهْلَ الْجنَّة، فَيقُولُونَ: لَبَّيْكَ ربَّنا وسعْديْكَ، والْخيرُ في يديْك فَيقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيقُولُونَ: وما لَنَا لاَ نَرْضَى يا رَبَّنا وقَدْ أَعْطَيْتَنا ما لَمْ تُعْطِ أَحداً مِنْ خَلْقِكَ، فَيقُولُ: أَلاَ أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيقُولُونَ: وأَيُّ شَيْءٍ أَفْضلُ مِنْ ذلِكَ؟ فيقُولُ: أُحِلُّ عليْكُمْ رضْوانِي، فَلا أَسْخَطُ عليْكُمْ بَعْدَهُ أَبَداً) متفق عليه[٣٥٦].

ئەبو سەعیدی خودری ڕەزاو خۆشنودی خوای گەورەی لەسەربێ دەفەرموێ: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست دروودو صەلاتو سەلامی خوای گەورەو مەزنی لەسەربێ دەفەرموێ: خودای باڵادەستو خاوەن شکۆ بە بەهەشتییەکان دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەوانیش بەیەك دەنگ دەڵێن: بفەرموو ئەی پەروەردگارمان، هەمیشە ئێمە بەندەی کەمەر

[٣٥٥] موسلیم (١٦٧/١ رقم/٣٠١).
[٣٥٦] بوخاری (٦٥٤٩) موسلیم (٢٨٢٩).

بەستەین‌و ئامادەین بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانت، سەرچاوەی گشت خێرو خۆشی‌و بەهرەیێ، وا لەهەردوو دەستی تۆدا، خودای گەورە دەفەرموێ: ئایا بەبەش‌و باری باشی خۆتان لە بەهەشتا ڕازین‌و پێی خۆشنودن؟ دەڵێن: ئەی بۆ ڕازی نیین، لەم بەش‌و بارە باشە کە تۆ داوتە بەئێمە دەبێ لەمە باشتر هەبێ؟ خودا دەفەرموێ: ئەدی دەڵێن چی ئەگەر لەوەیش باشترتان پێ بدەم؟ دەڵێن: جا شتی وا هەیە، دەبێ چی هەبێ لەوە باشتر بێ؟ دەفەرموێ: خۆشنودی‌و ڕەزامەندی خۆمتان دەدەمێ‌و لێزمەی ڕازیبوونی خۆم دەبارێنم بەسەرتان داو لەناو بەهەشتی ریضوانی خۆم دا جێتان دەکەمەوەو ئیتر بەهۆی ئەوەوە هەتا هەتایەو هەرگیزاو هەرگیزو قەت‌و قەت‌و بڕای بڕای لەم ڕۆ بەدواوە لێتان نارەنجێم. (ش= ب+م = ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم (ڕەزای خوایان لێ بێ)).

١٦/١٨٩٥- وعنْ جرير بْنِ عبْدِ اللّٰهِ (رضي اللّٰه عنه)قال: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)فَنَظَرَ إِلَى الْقَمرِ لَيْلَةَ الْبدْرِ، وقَال:«إِنَّكُمْ ستَرَوْنَ رَبَّكُمْ عِياناً كما تَرَوْنَ هَذَا الْقَمرَ، لاَ تُضامُونَ فِي رُؤْيتِهِ مُتَّفَقٌ علَيْهِ[٣٥٧].

ئەم فەرموودە پیرۆزە لە پێشەوە لەم جێگەیەدا ڕابوورد: بەرگی سێیەم، زنجیرە سەدو هەشتاو هەشت فەرموودەی ژمارە پێنج = ژمارە: ١٠٥١,/٥

١٧/١٨٩٦- وعنْ صُهَيْب (رضي اللّٰه عنه)أَنَّ رسُول اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)قَال: (إِذَا دَخَل أَهْلَ الْجنَّةِ الجنَّةَ يقُولُ اللّٰه تَبارَكَ وتَعالَى: تُرِيدُونَ شَيْئاً أَزِيدُكُمْ؟ فيقُولُونَ: أَلَمْ تُبيِّضْ وُجُوهَنَا؟ أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ وتُنَجِّنَا مِنَ النَّار؟ فَيَكْشِفُ الْحِجابَ، فَما أُعْطُوا شَيْئاً أَحبَّ إِلَيهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ) رواهُ مُسْلِمٌ[٣٥٨].

صوهەیب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ بەهەشتییەکان سەرتاپا دەچنە ناو بەهەشت، خودا تبارك وتعالى پێیان دەفەرموێ: ئەرێ شتێکی ترتان دەوێ هەتا بۆتانی

---

[٣٥٧] بوخاری (٥٥٤) موسلیم (٦٣٣).

[٣٥٨] موسلیم (١٨١).

پتر بکەم؟ ئەوانیش عەرزی دەکەن: گوایە لەمە زیاتر دەبێ چی بێ، چی ماوە تا پێمان بدەی، ئەوەتانێ ڕووت سپی کردووین‌و سەربەرزت کردووین‌و لەناو بەهەشتا دامانت ناوەو لەئاگری دۆزەخ ڕزگارمانت کردووە!

جا خودا پەردەی ناوەندی خۆی‌و ناوەندی بەندەکانی هەڵدەماڵێ‌و بەندەکانی بەچاوی سەر تەماشای زاتی پەروەردگاری خۆیان دەکەن، ئیتر هەرگیز شتی وا خۆش‌و خۆشەویست لەوەو پێش خەڵات نەکراوە پێیان، وەك ئەوە بەچاوی سەر تەماشای زاتی پەروەردگاری خۆیان بکەن. (موسلیم (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە).

قَالَ تَعالَى: {إنَّ الَّذِينَ آمنُوا وعمِلُوا الصَّالِحاتِ يهْدِيهِمْ ربُّهُمْ بِإِيمـانِهِمْ تَجْـري مِنْ تَحْتِهِمُ الأَنْهَارُ في جنَّاتِ النَّعِيم، دعْوَاهُمْ فِيهَا: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ، وتَحِيَّـتُهُمْ فِيهَـا سلامٌ وآخِرُ دعْواهُمْ أَن الْحمْدُ للَّهِ رَبِّ العالِمِينَ} ﴿يونس: ٩﴾.

الْحَمْدُ للَّهِ الَّذِي هَدانا لِهَذَا وما كُنَّا لنَهْتَدِيَ لَوْلاَ أَنْ هَدَانَا اللَّه: اللَّهُـمَّ صـلِّ عَلَى سيدِنَا مُحَمَّدٍ وعلَى آلِ مُحمَّدٍ، كَمَا صلَّيْتَ عَلَى إبْراهِيم وعلَى آل إِبْـراهِيمَ. وبارِكْ علَى مُحَمَّدٍ وعلَى آلِ مُحمَّدٍ، كَمَا باركْتَ علَى إِبْرَاهِيمَ وعلَى آل إِبْراهِيمَ، إِنَّكَ حمِيدٌ مجِيدٌ.

قَال مُؤَلِّفُهُ يحيى النوَاوِيُّ غَفَر اللَّه لَهُ: (فَرغْتُ مِنْهُ يوْمَ الاثْنَيْن رابِعَ عَشرَ شهر رمضَانَ سَنَةَ سبْعِينَ وَستِّمائة بدمشق).

پێشەوای بەهەشتی دانەری ئەم (ریاض الصالحین)ە پیرۆزە دەفەرموێ: لەم کتێبە لێبومەوە بە ڕێکەوتی ڕۆژی دووشەممە، ڕۆژی چوارەمی مانگی ڕەمەزانی ساڵی شەش سەدو حەفتای کۆچی لەشاری دیمەشق. بەندەیش (کە وەرگێڕی ئەم نامە پیرۆزەیەم) عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم.

لەکاتی خۆی دا، لەکۆتایی ڕەشنووس (موسوەدە)ی تەرجەمەی ئەم کتێبە پیرۆزەدا ئەمەم نووسیوە:

لێبوومەوە لە وەرگێڕانی ئەم نامە پیرۆزە، بۆسەر زمانی شیرینی کوردی لە ڕۆژی یەکشەممەدا، ڕێکەوتی ڕۆژی هەژدەهەمی مانگی جومادای دووەمی ساڵی هەزارو سێ سەدو نەوەدو دووی کۆچی، بەرامبەر ١٩٧٢/٧/٣٠ز. لە

هۆدەكەی خۆم دا، لە نەخۆشخانەی سەربازی كەركوك، لەشاری كەركوكی خۆشەویستو نازدارو خۆشەویست، خودا بە ڕەحمەتی خۆی، لەهەموو دەردو بەلایێ، لەگەڵ شارەكانی تری كوردستانو عێراقی خۆشەویستمان بیانپارێزێ.

ئێستاكەیش، كە بەدەستی خۆم لە پاكنووسی ئەم ریاضە پیرۆزە دەبمەوە، كە ئەمجارەیان دەقی مەتنی حەدیثەكانیشم، بۆ موبارەكیو بۆ زیادە بەهرەو سود، لەپێش تەرجەمە كوردیەكەوە بەعەرەبی نوسیویەتەوە لێرانەدا دەڵێم: بە یارمەتی خوای گەورەو میهرەبان وەرگێڕانو تەرجەمەی ئەم كتێبی ریاضە هاتە كۆتایی، لە ڕۆژی شەممە، ڕێكەوتی ٢٩-جومادی دووەم ساڵی ١٤١٢ كۆچی، بەرامبەر ٥-١٢-١٩٩١ز. ڕۆژی پێنجەمی مانگی دوازدەی ساڵی هەزارو نۆسەدو نەوەدو یەكی زاینی. لەماڵی خۆمان (خودا بەڕەحمەتی خۆی بۆ هەمیشە بە نوری قورئانی پیرۆزو بە تیشكی فەرمووده نازدارەكانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاوەدانو ڕۆشنو پڕ لە خێرو بێری دینو دنیای بفەرموێ) لەشاری سلێمانی خۆشەویستو نازدار، شارە سەربەرزەجوانەكەی دینو دنیای كوردان، بووكی رووسوری كوردستان، گوڵاڵە سوورەكەی باكوری عێراقی نیشتمانی خۆشەویستمان، باخی بەهەشتی پڕ لە مەلاو مزگەوتو قورئانو موسوڵمان، لەگەڕەكی مامۆستایان، كە بەڕاستی بۆتە لانەو خانەو یانەی كۆمەڵێ مامۆستای زانای تەوانای دانای خاوەنی خۆشیو بەهرەی دوو جیهان خودای گەورە هەموو لایەك لەدەردو بەلاو چەپۆڵەی ڕەشی زاڵم هەتا سەر بپارێزێ. ئامین. ئێستا من وام لە خزمەتی شەرحی دەلیلولفالحین دا، كە شەرحی ئەم (ریاض الصالحین)ە پیرۆزەیە، بەڕاستی شەرحی وا بۆ كتێبی وا دەقاو دەق: (نور علی نور)ە.

جا بە ئیقتباس لەو نزاو پاڕانەوەو دووعا پیرۆزانەی كە گەورەو سەروەرمان، پایە بەرز مامۆستا مەلا موحەممەد كوڕی عەلان، لە كۆتایی ئەم شەرحەی خۆی دا كردوویەتی، بەندەیش روو لەقاپی خودای گەورەو میهرەبان دەكەمو دەلاڵێمەوەو دەڵێم: خودایە! تۆ خودای هەموانی،

